د. محەممەد ئیحسان

# ململانێیە نێو دەوڵەتییەکان

## لە سەدەی بیستەمدا



وەرگێڕانی

ئاسۆ کەریم

کامەران ئەحمەد

# International Conflicts

## In the 20th Century

*By*

***Dr. Mohammed Ihssan***

***Translated by***

***Aso Kareem***
***Kamaran Mantk***

**Kurdistan - Iraq**
**2001**

---

د. محەمەد ئیحسان

وەرگێرانی

ئاسۆ کەریم
کامەران مەنتک

د. محەمەد ئیحسان

# ململانێیە نێو دەوڵەتییەکان

## لە سەدەی بیستەمدا

وەرگێڕانی

ئاسۆ کەریم
کامەران مەنتک

چاپی یەکەم - هەولێر

2001

# پێرست

## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

## بەشی شەشەم



## بەشی حەوتەم

## بەشی هەشتەم

## لە جیاتی پێشەکی

ئەم کتێبە (ململانێیە نێو دەوڵەتییەکان لە سەدەی بیستەمدا) وەک د. محەمەد ئیحسان دەڵێ: دەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە ئاکادیمییە شرۆڤەکارییە، کە لە هەردوو قۆناغی ماستەر لە کۆلیجی «دیراساتی ئاسیایی و ئەفریقی» *School of Oriental & African Studies* لە زانکۆی لەندەن و دکتۆرا لە پەیمانگای «دیراساتی عەرەبی، ئیسلامی»دا، ئەنجامم داوە.

ئێمە لەم پێشەکییە کورتەدا، باس لە گرنگی بابەتی کتێبەکەو تا چەند کەلێنێ لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ دەکاتەوە ناکەین، هەڵسەنگاندنی کتێبەکە بۆ خوێنەران جێ دەهێڵین و وەک دەڵێن با کتێبەکە شەرعی خۆی بکات.

لە راستیدا تەرجەمەکردنی کتێبێکی لەو بابەتە، ئاسان نییە، هێشتا ئەو تێرم و زاراوانەی لە بواری پەیوەندییەکانی دەولیدا بەکاردێن لە زمانی کوردیدا، جێگەی خۆیان نەگرتووەو بەدواداچوون و گفتوگۆ هەڵدەگرن.

ئەم کتێبە پارەکە بۆ یەکەمجار بە زمانی عەرەبی لە ژێر ناوی (الصراعات الدولیة في القرن العشرین) لەلایەن دەزگای ئاراس -ەوە چاپ و بڵاوکرایەوە.

ئەم کتێبە کە هەشت بەشە، بەشی یەکەم و بەشی هەشتەمی لەلایەن ئاسۆ کەریم و بەشەکانی دیکەی کتێبەکە لەلایەن کامەران ئەحمەدەوە تەرجەمەکراون. خوا دەزانی هەر هەندەمان لێ زانیوە، خوایاربێ لە چاپی دووەمدا، ئەگەر ماین، دەستی پێدا دەهێنینەوە.

هەردوو وەرگێڕ

# ئایا ململانێ لە دنیادا مەنتیقێکی چەسپاوی هەیە؟

## دوو نەریتی تیۆریی: واقیعیەت و لیبرالیزم

تا دێ دنیا لە نێوان دەوڵەتان و کەساندا بچووک و وێک دێتەوە. کەشتی (مای فلاوەر May flower) بەسێ مانگان ئەوجا لە ئۆقیانوسی ئەتلەنتی پەڕییەوە. ساڵی ١٩٢٤ فرینی چارلس لندبرگ Charles Lindber بەسەر هەمان ئۆقیانوسدا، ٢٤ سەعاتی برد، بەڵام ئەمڕۆ فڕۆکەی کۆنکۆرد سێ سەعاتی پێدەچێ، کەچی رۆکێتی خۆڕاپسکێن بە ٣٠ چرکە ئەمسەرو ئەوسەر دەکا. لە شەستەکاندا کرێی سەرێکی فڕۆکە بەسەر ئەو ئۆقیانۆسەدا تەنیا ١/٣ی کرێی پەنجاکان بوو. هەنوکە ئاخاوتنێکی تەلەفۆنی لە نیۆرکەوە بۆ لەندەن ٢ ٪ی کولفەی ناوەڕاستی سەدەی رابردووی تێدەچێ، تەماسگرتن لە رێگای ئەنتەرنێتەوە بە لەحزە دەکرێ. ئەگەر ویستمان وێنەیەکی هەرە تەڵخ و لێڵ بە بەڵگە بهێنینەوە دەڵێین: چەکی نیوکلیاری Nuclear Weapon رەهەندێکی تازەی بۆ شەڕ زێدەکرد کە نووسەرێک ناوی «مردنی دوولایەنە»ی لێناوە. مەبەستی کابرای نووسەر لەمە ئەوەیە کە مردن تەنیا کەسان ناگرێتەوە بەڵکە لە هەندێ باردا هەڕەشە لە تەواوی رەگەزو توخمی مرۆڤایەتیش دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا لە سیاسەتی دەولیدا هەندێ کاروبار هەن لە هەموو سەردەمێکدا وەک خۆیان ماونەتەوەو دەقیان گرتووە. تۆمارکردنی بەڵگەنامەکانی شەڕی نێوان سپارتەو ئەثینا لەلایەک و پیلۆپۆنیزییەکان Pelopnnesia لەلایەکی دیکەوە بەر لە ٢٥٠٠ ساڵ لەلایەن (توسایدیدس ـ Thucydides)ەوە[1] نیشانی دەدات کە ئەو شەڕە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن لە چەند رووێکەوە بەشەڕ و ململانەی دوای ساڵی

١- توسایدیدس (٤٧٠-٤٠٠ پ. ز) مێژوونووێکی ناسراوو بەشۆرەتی یۆنانی بووەو ساڵی ٤٢٤ی پ. ز سەرکردایەتی شەڕی کردووە دژی پیلوپونیزییەکان، وەلێ نەشیا بەشەڕ ئامانجەکانی خۆی وەدیبهێنێ و پاشان بەدیل گیراو نەفی کرا. لە تاراوگەدا، توسایدیدس دیرۆکی شەڕی پیلوپونیزی نووسیەوە کە بەیەکێ لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی مێژووی پێوەندییەکانی دەولی دادەنرێ.

١٩٤٧ی نێوان عەرەب- ئیسرائیل دەچێت. دنیا لە ئاخیرو ئۆخری سەدەی بیستەمدا بووە کۆکتێلێکی سەرسوڕهێن لە بەردەوامبوون و گۆڕانکاری. هەندێ لایەنی سیاسەتی دەولی لە زەمانی توسایدیدسەوە تا هەنوکە نەگۆڕاون. لێرە دژە مەنتیقێکی دیار هەیە، گرفتێک کە پێوەندی بە تەناهییەوە هەبێ، شانبەشانی سیاسەتی نێوان دەوڵەتان رێ دەکات، هاوبەندی و هاوسەنگیی هێزەکان و (خیار)ی سیاسیی لەنێوان شەڕو ئاشتی و پێ رازیبوون بە درێژایی هەزاران ساڵ وەکو خۆیان ماونەتەوە.

پاشان هەرگیز توسایدیدس باکی بە چەکی نوکلیاری و چینی ئۆزۆنەوە نەبووەو نیگەرانیان نەکردووە. ئەرکی خوێندکارو توێژەرانی سیاسەتی دەولی ئەوەیە بە پشت بەستن بە رابردوو نەک کەوتنە داوییەوە، لە شێوەکانی بەردەوامبوون و گۆڕانکارییەکان حاڵی بن. لەسەرینی ئەمەوە پێویستە تیورییە کلاسیکەکان دیراسە بکەین و دواتر بەسەر هەلومەرجی ئێستادا پیادەیان بکەین.

دەکرێ سیاسەتی دەولی بگۆڕێت ئەگەر دەوڵەتە لێک جوداو سەربەخۆکان هەڵبوەشێنەوەو نەمێنن، بەڵام حکومەتێکی جیهانیش بەم زووانە دروست نابێ. هەنوکە خەڵک لە ١٨٦ دەوڵەتدا لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەژین، سەربەخۆیی خۆیان، نەریت و خووخدەی خۆیان، زمانی جودا جودای خۆیان خۆش دەوێ، بەهەق هەستی نەتەوایەتی و داخوازیی دروستکردنی دەوڵەتی جودا «سەربەخۆ» ون نەبووە، بەڵکە زێدەش بووە. سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم ژمارەی دەوڵەتان زیاد دەبێ نەک کەم دەبێتەوە.

هەروا حکومەتێکی جیهانیش ناتوانێ ئۆتۆماتیکیانە کێشەی شەڕوشۆڕ چارەسەر بکات. چونکە هەنوکە زۆربەی شەڕەکان، شەڕی ئەهلین. لە راستیدا شەڕە هەرە خوێناوییەکانی سەدەی نۆزدەم شەڕی نێوان وڵاتە ئەوروپاییە پێک ناکۆکەکان نەبوون، بەڵکە شەڕی هەرە خوێناوی، شەڕی ئەهلیی ئەمریکا بووە. ئێمە هەر لە دنیای دەوڵەتانی لێکجودا دەژین، گرنگ ئەوەیە لەوە حاڵی ببین کە ئەم حاڵە سەبارەت بە ئومێدو خواستی ئێمە، چی دەگەیەنێ.

## سیاسەتی دەولی چییە؟

لە هەموو سەدەکاندا، سێ چەشن و تەرزی سەرەکیی سیاسەت لە دنیادا هەبووە: لە «سیستەمی ئیمپریالیی جیهانیدا» یەک حکومەت دەستی بەسەر زۆربەی ناوچەکانی دنیادا، کە بەوەوە بەسترابوونەوە، رادەگەیشت. باشترین نموونەی ئەمە لە

دنیای رۆژئاوادا ئیمپراتۆریای رۆمانی بووه. له سه‌ده‌ی شانزه‌هه‌مدا ئیسپانیاو له کۆتایی سه‌ده‌ی حه‌ڤده‌مدا فه‌ره‌نسا هه‌وڵیان دا حوکمڕانێتییه‌کی له بابه‌تی ئیمپراتۆریای رۆمانی پێکه‌وه بنێن، وه‌لێ سه‌رنه‌که‌وتن. له سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌مدا ئیمپراتۆریای به‌ریتانیا په‌لوپۆی بۆ هه‌موو کون و قوژبنێکی دنیا هاویشت، به‌ڵام ته‌نانه‌ت به‌ریتانییه‌کانیش ناچاربوون له‌گه‌ڵ وڵاتانی دیکه‌ی به‌هێزدا، جیهان له نێوان خۆیاندا دابه‌ش بکه‌ن، هه‌رچی ئیمپراتۆریه‌ته کۆناراکانی: سۆمه‌ری، فارسی، چینی بوون، له راستیدا ئه‌وانه ئیمپراتۆریای ئه‌قلیمگیر بوون و بڕایه‌وه، ئه‌وانه پێیان وابوو حوکمی هه‌موو دنیا ده‌که‌ن، به‌ڵام ئه‌وه‌ی له پێکدادان و پێک هه‌ڵپژانی ئیمپراتۆریاکانی دیکه‌ی ده‌پاراستن، نه‌بوونی ئه‌سپابه‌کانی ته‌ماسگرتن بوو.

دووه‌م چه‌شنی سه‌ره‌کی له چه‌شنه‌کانی سیاسه‌تی ده‌ولی «سیسته‌می ده‌ره‌به‌گایه‌تی»یه، که «ولاء»ه‌کانی مرۆڤ و ئیلتیزاماتی سیاسی به سنووری زه‌وی و زار به‌ستراونه‌ته‌وه. دوای هه‌ره‌سهێنانی ئیمپراتۆریای رۆمانی، ده‌ره‌به‌گایه‌تی له رۆژئاوا بڵاوبۆوه‌و هه‌ر که‌سه بووه به‌رفه‌رمانی ئاغا خۆجێییه‌که‌ی، هه‌روا ده‌شبوو تاکه‌که‌س ئه‌رک و فه‌رمانی ئاغایه‌کی دووره ده‌ست یان قه‌شه‌یه‌ک یان پاپای رۆمای بکه‌وتبایه سه‌رشان و ئه‌رکێکی بۆ راپه‌ڕاندبوایه. ئیلتیزاماتی سیاسی تا راده‌یه‌کی زۆر به ویستی ئاغاکان بوون، ئه‌گه‌ر حوکمڕانێ ژنی بهێنابایه، سه‌رپاکی ناوچه‌که‌و خه‌ڵکه‌که ده‌بوونه موڵکی ژنه‌که وه‌ک به‌شێک له‌ماره‌یی، له‌سه‌رینی ئه‌مه‌وه ئیلتیزاماته‌کانی ئه‌و خه‌ڵکه‌ش ده‌گۆڕان، خه‌ڵکی شارێک که وه‌ک فه‌ره‌نسیه‌ک له دایک ببوون، له‌پڕ خۆیان ده‌بینییه‌وه بوونه‌ته فیلمنکی یان به‌ریتانی. جارجار شاری گه‌وره‌و کۆمه‌ڵه شار، که‌سایه‌تییه‌کی نیمچه سه‌ربه‌خۆی تایبه‌تیان هه‌بوو، به‌ڵام ئاگری شه‌ڕ هاوڕێی رۆژه‌ڤی ده‌ره‌به‌گایه‌تی بوو، وه‌ک گومانمان بۆده‌چێ به شه‌ڕو شۆڕی ئه‌قلیمگیری ئێستا نه‌ده‌چوو، ئه‌و شه‌ڕانه له‌ناویه‌ک خاکدا ده‌کران و بنه‌چه‌شیان گۆڕانی (ولاءات)و ئه‌و ململانێیه‌ی لێی ده‌که‌وته‌وه، بوو.

ته‌رزی سێیه‌می سیاسه‌تی ده‌ولی «سیسته‌می ئه‌نارشیستی ده‌وڵه‌تان»ه که تا راده‌یه‌ک له چه‌ند وڵاتێکی به یه‌که‌وه گونجاو پێکده‌هات، هه‌رچه‌نده حکومه‌تێکی باڵاتریان به‌سه‌ره‌وه نه‌بووه، نموونه‌ی ئه‌م جۆره سیسته‌مه، ده‌وڵه‌ته- شاره‌کانی یۆنانی کۆن و ئیتاڵیای ماکیاڤیلی سه‌ده‌ی پانزه‌هه‌مه. نموونه‌یه‌کی دیکه‌ی ده‌وڵه‌تی ئه‌نارشیستی، ده‌وڵه‌تی خاک و زه‌مینی بنه‌ماڵه موڵکداره‌کانه که یه‌کگرتوویی ئه‌و چه‌شنه ده‌وڵه‌ته بۆ زه‌بر به‌ده‌ستی و پێ راگه‌یشتنی ماڵباته حوکمڕانه‌که ده‌گه‌ڕێته‌وه،

دەتوانرێ نموونەی ئەم چەشنە دەوڵەتە لە هیند یان لە چینی سەدەی پێنجەم بدۆزینەوە. لە ئەورووپاش لەدەوروبەری ساڵی ١٥٠٠دا، بنەماڵە موڵکدارە گەورەکان وەدەرکەوتنەوە، ئەمە لەکاتێکدا شێوەکانی دیکەی سیاسەتی دەولی وەک دەوڵەتە شارەکان (دەوڵەتۆکە) یان کۆڕو کۆمەڵە دەربەگایەتییە پەرت و بڵاوەکان بەرەو لەناوچوون دەچوون. ساڵی ١٦٤٨ پەیماننامەی ئاشتیی ویستەڤالیا westphalia (شەڕی ٣٠ ساڵە)[٢]ی بە کۆتا هێنا کە جار جارە بە دواهەمین شەڕی گەورەی ئایینی و یەکەمین شەڕی نێوان دەوڵەتە هاوسەردەمەکان دەژمێردرێ، لەبەرانبەردا پەیماننامەکە، دەوڵەتە زەوی خودان سەروەری بەو پێیەی شێوەیەکی باڵادەستی تەنزیمی دەولییە، چەسپاند.

ئا ئاوا، کاتێک لە سیاسەتی دەولی دەدوێین، هەمیشە مەبەستمان لەم سیستەمە، ئەم دەوڵەتی زەوییەیە. «سیاسەتی دەولی»ش وەک پێناسەی دەکەین سیاسەتێکە بەبێ بوونی حوکمڕانێکی گشتی، سیاسەتێک لەمابەینی قەوارەکاندا کە حوکمڕانێکیان بەسەرەوە نەبێ. زۆربەی جاران سیفەتی ئانارشیزم دەدرێتە پاڵ سیاسەتی دەولی، کەچی وشەی (Monarchy) واتە بوونی حوکمڕانێکی تاک و تەنیا و وشەی (Anarchy)یش واتە نەبوونی هیچ حوکمڕانێک. سیاسەتی دەولی سیستەمێکە خۆی یاریدەی خۆی دەدا.

**تۆماس هۆبز** Thomas Hobbes فەیلەسوفی بەریتانی لەسەدەی حەڤدەهەم ناوی «دەوڵەتی سروشت»ی لەم بابەتە سیستەمە ئەنارشیستانە ناوە. ڕەنگە کە ناوی دەوڵەتی سروشت دێ بەلای هەندێ کەسەوە مێگەلە پەزێکیان بێتە بەرزەین کە بەدڵنیاییەوە بچەرێ. بەڵام هۆبز مەبەستی ئەوە نەبووە. دەق شارێکی تکساس بەبێ (شەریف - سەرکار-عمدە-حوکمڕان) لە ڕۆژانی یەکەمی ئاکنجی بوون لە ڕۆژئاوای ئەمریکادا بێنە بەر خەیاڵت، یان لوبنانی دوای هەرەسهێنانی حکومەتەکەی لە حەفتاکاندا. دەوڵەتی سروشتیی هۆبز دەوڵەتێکی دڵ [illegible]ازو فەقیرۆکەو سەرسەلامەت نییە، بەڵکە شەڕی هەمووانە دژی هەمووان لەبەر نەبوونی کاربەدەستێکی گەورە، کە ڕژێم Order بەسەر هەمووان‌دا بسەپێنێ، ژیان هەروەکو هۆبز دەڵێ: دنیایەکە خولیاو مەیلی شەڕانی و دڕندانەو کورتخایەنی هەیە.

ئەنجامەکەی ئەوەیە کە جیاوازی و ناتەبایی قانونی و سیاسی و کۆمەڵایەتی لە

---

٢- مەبەست لە شەڕی ٣٠ ساڵە، ئەو شەڕەیە کە لەنێوان پرۆتستانت و کاتۆلیکەکانی ئەورووپادا هەڵگیرساو ٣٠ ساڵ دەوامی کرد.

نێوان سیاسەتی خۆجێیی و سیاسەتی دەولیدا هەیە. بە گشتی قانونی خۆجێی ئەو گاڤە جێبەجێ دەکرێ ئەگەر پۆلیس و دادگا سزای ئەو کەسانە بدەن کە قانونیان پێشێل کردووە. لەکاتێکدا قانونی دەولی لەسەر بنەمای کێبەڕکێ لە نێوان سیستەمە قانونیەکاندا هەڵچنراوەو بە تەواوی قانون ناسەپێندرێ، چونکە پۆلیسی دەولی نییە تا قانون بسەپێنێ.

دیارە هێز لەسیاسەتی خۆجێیدا دەورێکی جیای هەیە لەوەی کە لە سیاسەتی دەولیدا هەیەتی. لەرژێمی سیاسیی خۆجێی کارامەدا، بەکارهێنانی هێز تەنیا بەدەست حکومەتەوەیە، لەکاتێکدا لە سیاسەتی دەولیدا کەسێک نییە بەکارهێنانی هێزی بەدەستەوەبێ، ئەگەر سیاسەتی دەولی بە تەنگ خۆخزمەتکردنەوە Slef Help بێ و هەندێک دەوڵەت لە هەندێکی دیکە بەهێزترین، ئیدی هەمیشە مەترسی پەنابردنە بەر بەکارهێنانی هێز لەگۆڕێدا دەبێ. کاتێ بەکارهێنانی هێز کارلێکی دووری نەبێ، ئەنجامەکەی گومان و دڵ پیسکردن لەیەکتر دەبێ.

هەروا بێتەوە سیاسەتی خۆجێی و سیاسەتی دەولی لە هەستی ناوەکییان، لە تێڕوانینیان سەبارەت بە کۆمەڵ، لێکجودان.لە کۆمەڵێکی خۆجێی باش ڕێکخراودا، هەستێکی مەودا فراوان لەناو کۆمەڵدا هەیە، ئەم هەستە، (ولاءات)ی گشتی و پێوەرەکانی دادپەروەری و بیروڕا لەمەڕ دەسەلاتی شەرعی دەبزوێنێ. لە سیاسەتی دەولیدا، خەڵکی کە بەسەر تایفەکاندا دابەشبوونە، هەمان (ولاء) یان نییە و هەستکردن بە یەکێتیی جیهانی لاوازە. زۆربەی جاران خەڵکان سەبارەت بە کامە شت دادپەروەرانەو ڕەوایەو کامەشت ڕەوا نییە تێک ناکەنەوە، ئەمەش کەلێن ودرزێکی فراوانی لەنێوان دوو بەهای سیاسیی سەرەکی لێ دەکەوێتەوە: ڕژێم و دادپەروەری. لە دنیایەکی ئاوادا زۆربەی خەڵک، عەدالەتی نیشتمانی دەخەنە پێش عەدالەتی دەولییەوە. قانون و ڕەوشت (ئاکار) لە سیاسەتی دەولیدا دەورێکیان هەیە، بەڵام لەبەر نەبوونی هەست کردن بە کۆمەڵ، قانون و ڕەوشت ئەو توانای (پابەندبوون)ەیان نییە وەک لە سیاسەتی خۆجێیدا هەیانە.

## دوو ڕوانگەی سیاسەتی ئەنارشیستی

سیاسەتی دەولی لەو ڕووەوە کە حکومەتێکی بالای تێدا نییە، ئەنارشیستانەیە، بەڵام تەنانەت لە فەلسەفەی سیاسیشدا دوو بیروڕای لێک جودا هەن: سەبارەت بەوەی کە ئایا دەوڵەتی سروشت تا چەند پێویستی بە زەبر و زەنگ بەکارهێنان هەیە.

دەبینین هۆبز لە بەریتانیای سەدەی حەڤدەهەمدا کە لە نێو بەرداشی شەڕی ئەهلیدا وردوهەڕا ببوو، نووسیویەو جەختی لەسەر هێز و خەبات و نەبوونی دڵنیایی کردۆتەوە لە پێناو مانەوەدا. هۆبز ئەو دەوڵەتەی لە دەوڵەتی شەڕدا پوختەکردۆتەوە..دوای نیوە سەدە، پاش ئەوەی بەریتانیا ئێش و ئازاری کەمتربۆتەوە **جۆن لۆک** John Locke گوتوبەتی: هەرچەند دەوڵەتی سروشت فەرمانڕەواییەکی گشتیی هاوبەشی نییە، وەلێ خەڵکان دەتوانن رایەڵکە و هاوبەندیی نێوان خۆیان پتەوو پەرە پێ بدەن، لەوما ئەنارشیزم هەڕەشەیەکی گەورە دروست ناکات. ئەم دوو بۆچوونە سەبارەت بە دەوڵەتی سروشت لە باری فەلسەفییەوە رێگەو زەمینەیان بۆ دوو بۆچوون لە سیاسەتی دەولیدا خۆشکردووە کە یەکێکیان تا بڵێی ڕەشبین و ئەوەی دیکەشیان تا بڵێی خۆش باوەڕو گەشبینە: مەبەست هەردوو دەروازەی واقیعی و لیبرالییە لە سیاسەتی دەولیدا.

«**ریالیزم**» نەریتی باوی بیرکردنەوە بووە لە سیاسەتی دەولیدا. گرفتی مەرکەزی لە سیاسەتی دەولیدا بە تێڕوانینی هزرمەندێکی واقیعبین، بریتییە لە شەڕو بەکارهێنانی هێز، دەوڵەتانیش نوێنەرە ناوەندییەکانن. سیاسەت و نووسینەکانی **ریچارد نیکسۆن** سەرۆکی ئەمریکا و **هنری کیسنجەری** وەزیری دەرەوە دەربڕی ریالیزمن لە ئەمریکای هاوچەرخدا، هزرمەندی واقیعبین لە گریمانەی سیستەمی ئەنارشیستی دەوڵەتانەوە دەست پێ دەکات. بۆ نموونە **نیکسۆن و کیسنجەر** هەوڵیان دا شان وشەوکەتی هێزی ئەمریکا مەزن بکەنەوەو لە توانای وڵاتانێکی کە هەڕەشە لە ئاسایش و تەنایی ئەمریکا دەکەن، کەم بکەنەوە. کابرای واقیعی پێی وایە سیاسەتی دەولی بە تاک دەوڵەت و کارلێکی ئەو دەوڵەتە لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا دەست پێ دەکات و کۆتایی دێ.

نەریتی دیکە(**لیبرالیزم**)ی پێ دەگوترێ، نەک لە سۆنگەی سیاسەتی خۆجێی ئەمریکاوە، بەڵکە ئەگەر بەدوای شونەواری لیبرالیزم بکەوین لە فەلسەفەی سیاسی ڕۆژئاوادا دەچێتەوە سەر **بارۆن مۆنتسکیۆ** Baron de Montesquieu **و ئەمانۆیل کانت** Immanuel Kant لە فەرەنساو ئەڵمانیای سەدەی هەژدەهەم، **جۆن ستیوارت مل** Stuart Mill John ـ ی فەیلەسوفی بەریتانی لە سەدەی نۆزدەهەمدا، نموونەی تازەی ئەمریکاش لە نووسین و سیاسەتی سیاسەتناس و سەرۆک (**ودرۆ ولسن**) Woodrow Wilson دەدۆزینەوە.

لیبرالەکان، کۆمەڵێکی جیهانی لە تەک دەوڵەتەکاندا دەبینن کە نەخشەی بەش پاژێک لە رەوتی دەوڵەتان دەکێشێ.ئەوەتا بازرگانی لە سنوورەکان دەپەڕێتەوە و

خەڵکان پێوەندی بەیەکدیەوە دەکەن(وەک ئەوقوتابیانەی لە هەندەران دەخوێنن) هەروا دامودەزگای دەولی وەک UN لە گۆڕێدا هەن، ئەمانە تێکڕا (ڕەوت)ێک دەخولقێنن کە ئەو بۆچوونە واقیعییەی بەس قسە لە ئانارشیزمێکی پوخت دەکات، پڕبەپڕی مەسەلەکان نەبێ. لیبرالەکان گازاندە لە واقیعییەکان دەکەن کە ئەوانەی دوایی پێیان وایە دەوڵەتان وەک هەڵماتی شووشەی ڕەنگاو ڕەنگ وان وهەریەکەیان بەم لاو ئەولادا پاڵ بەوی دیکەیانەوە دەنێ وەک هەوڵدانێک بۆ ڕاگرتنی پارسەنگیی هێزەکان، بەڵام ئەمە بەس نییە و خەڵکان تەنیا لە ڕێگەی سنوورەوە پێوەندی بەیەکەوە ناکەن، بەڵکە کۆمەڵگایەکی دەولیش Internatioal Community لە گۆڕێدا هەیە. واقیعییەکان زێدە ڕۆیی دەکەن لە جیاوازی دانان لە نێوان سیاسەتی خۆجێی و سیاسەتی دەولیدا. چونکە وێنەی ئەنارشیزم لە ڕوانگەی واقیعییەکانەوە لەسەر بنەمای ئایدیای هۆبز لەمەڕ(دەوڵەتی شەڕەوە) هەڵچنراوە، هەروا پێ لەسەر بارودۆخی پەڕگیر دادەگرن ونەشونمای پشت بەیەک بەستنی دوو لایەنەی ئابوری و پەرەگرتنی کۆمەڵگای دەولی بان سنووری نەتەوەیی پشت گوێ دەخەن.

واقیعییەکانیش بە وتەیەکی هۆبز وەڵامی ئەمە دەدەنەوە:

(ئاسمان و هەوای تووش هەمیشە بارانی پێوە نییە)(*)، هەروا دەوڵەتی شەڕیش مانای شەڕو شۆڕی بەردەوام نییە، وەک چۆن خەڵکی لەندەن لە ڕۆژانی خۆرەتاوی نیساندا چەتریان پێیە، ئیحتمالی شەڕ هەڵگیرسان لە ڕژێمی ئانارشیستیدا وادەکات دەوڵەتان تەنانەت لەکاتی ئاشتیشدا، سوپاو لەشکریان هەبێ، هەروا واقیعییەکان ئاماژە بۆ پێشبینیە چەوتەکانی لیبرالەکان دەکەن. بۆ نموونە سەرۆکی زانکۆی ستانفۆرد لە ساڵی ١٩١٠دا گوتی: لە ئایندەدا شەڕ ناقەومێ چونکە میللەتان تاقەتیان لە شەڕ چووە. کتێبی واش دەرچوون کە دەڵێن شەڕ مەسەلەیەکە کۆن بووە، شارستانێتی Civilization، بازی بە سەر مەسەلەی شەڕ داوە وپشت پێ بەستنی دوو لایەنەی ئابوری و هاوبەندیی نێوان سندیکاکانی کرێکاران وچینە ڕووناکبینەکان و وەگەڕکەوتنی سەرمایەگوزاری، سەرجەم بەیەکەوە شەڕیان کردۆتە کارێکی کەس نەکردە، هەڵبەت ئەم پێشبینیانە بە شێوەیەکی کارەساتهێن ساڵی ١٩١٤ بێ ئاکام دەرچوون و بەم شێوەیە پەرێزی واقیعییەکان پاک بۆوەو نەمێژوو نە دیالکتیک لە ساڵی ١٩١٤دا لە جێگەی خۆیاندا لە مۆڵەق ڕانەوەستان. لە ساڵانی حەفتاکاندا

---

(*) لەناو کورداندا دەوترێ: لە هەموو هەوران، باران ناباریٚ (وەرگێڕ).

جارێکی دیکه داوای لیبرالەکان هاتەوه گۆڕێ که دەڵێن بەرزبوونەوەی تێکڕای پشت بەیەک بەستنی دوو لایەنەی ئابوری و کۆمەلآیەتی، بەره بەره سروشتی سیاسەتی دەولی گۆڕیوه. له هەشتاکاندا پرۆفیسۆر **ریچارد رۆزکرانس** Rosecrance Richard له زانکۆی کالیفۆرنیا گوتی «دەوڵەتان دەتوانن له دوو ڕێگەوه خۆیان بەهێز بکەن یان ئەوەته له ڕێگەی داگیرکردنەوه یان به ئاشتی له ڕێگەی بازرگانییەوه» ئەو پرۆفیسۆره تاقیکردنەوەی ژاپۆنی به نموونه هێناوەتەوه: له سیەکاندا ژاپۆن ڕێگەی داگیرکردن و زەوتکردنی خاکی گەلانی دیکەی تاقیکردەوه، کارەساتی شەڕی دووەمی جیهانی بەسەردا هات. بەلآم لەو وەختەوەی ژاپۆن بۆته دەوڵەتێکی بازرگانی، بووەته دووەم زلهێزی ئابوری له دنیاداو دەوڵەتێکی زلهێز له ڕۆژهەلآتی ئاسیادا. ژاپۆن بەبێ ئەوەی پێویستی به هێزێکی عەسکەری گەوره هەبێ، سەرکەوت، ئا لێرەوه ڕۆزکرانس و لیبرالیسته تازەکان دەڵێن گۆڕانێک له سروشتی سیاسەتی دەولیدا هاتۆته ئاراوه. نەک هەر ئەوه بەڵکه هەندێ له لیبرالیسته تازەکان دوورتر لەمه دەڕوانن ئاسۆی پاشەڕۆژ و پێیان وایه ئەو نەشونما هەست وروژێنەی پشت بەیەکدی بەستنی ژینگەیی، دەرفەتی دیتنی جیاوازی له نێوان سیاسەتی خۆجێی و سیاسەتی دەولیدا، لێڵ و تەڵخ دەکات و مرۆڤایەتی بەرەو دنیایەکی بێسنوور پێشدەکەوێ. بۆ نموونه هەر کەسێک بگری، کزبوونی ئۆزۆنی له چینەکانی فەزادا پێ ناخۆشه که دەبێته هۆی شێرپەنجەی پێست بەبێ گوێدانه سنووری نێوان ولآتان، ئەگەر کەڵەکەبوونی دووەم ئۆکسیدی کاربوون، کەشوهەوا گەرم دابهێنێ و کلآوی بەستەڵەکی جەمسەر بتوێنێتەوه، ئەوا بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی دەریاکان کار له سەرجەم ولآتانی قەراخ دەریاو ئۆقیانۆسەکان دەکات، هەروا هەندێ گرفتی وەک نەخۆشی ئایدز و مادده بێهۆشکەرەکان به ئاسانی له سنوورەکان دەپەڕنەوەو وامان لێ دەکەن که بڕوا بەوه بکەین که ئێمه له ڕێگەیەکداین بەرەو دنیایەکی دیکەی جیاواز. دکتۆر **ریچارد فالک** Richond Falk له زانکۆی برنستن پێیوایه گرفتی نێوان نەتەوەکان و بەهاکان، (ولاءات)ی نا هەرێمایەتی تازەی لێ دەکەوێتەوەو ئەو سیستەمەی دەوڵەت که به درێژایی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی باو بووه، دەگۆڕێ، ئەو هێزانەی سنووره نەتەوایەتییەکان دەبەزێنن، «ئاشتی ویستڤالیا» هەڵدەوەشێننەوەو مرۆڤایەتی بەرەو شێوەیەکی تازەی سیاسەتی دەولی هەنگاو هەڵدێنێتەوه.

ساڵی ۱۹۹۰ واقیعییەکان وەلآمیان دانەوەو گوتیان: «ئەم قسەیه به سەدام حوسێن بڵێن!» عێراق نیشانی دا که هێزو شەڕ هەمیشه دوو خەتەری بەرچاون،

وەڵامی لیبراڵەکان ئەوەبوو کە سیاسەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ریزپەڕێکی تازە نییەو، دەڵێن: بە تێپەڕبوونی کات، دنیا بەرەو ئاستێک دەڕوا کە لە سیستەمی ئانارشیستی دەوڵەتی بالادەست تێدەپەڕێنێ.

ئەمە تێڕوانینی جودا جودان سەبارەت بە سروشتی سیاسەتی دەولی و چۆن چۆنی گۆڕان، بەڵام دیارە ئەو سروشتە لەکاتێکی نزیکدا بە بارێکدا ناکەوێ، چونکە واقیعییەکان پێ لەسەر مەسەلەی بەردەوامبوون دادەگرن و لیبرالەکانیش جەخت لەسەر گۆڕانکاری و نوێبوونەوە دەکەنەوە، هەردوو گروپ پرۆپاگەندە بۆ خۆیان دەکەن کە لەسەر زەمینەی واقیع وەستاون.

لیبرالەکان بەو چاوە سەیری واقیعییەکان دەکەن کە رەشبینن وخۆیان بەرابردوو دەبەستنەوەو چاویان گۆڕانکاری نابینێ. لە بەرانبەریشدا واقیعییەکان، بە لیبرالەکان دەڵێن ئێوە خەونی خۆش دەبینن و بەجیهانی بوون Globalone بە بیرکردنەوەی خۆتانەوە دەنێن. کێهە لا راستە؟ هەردووکیان راستن و هەردووکیشیان هەڵەن.

وەڵامدانەوەیەکی دیاریکراو، کارێکی باشە، بەڵام کارێکی درشت و کەمتر سەرنجڕاکێشە. ئەم کۆکتێلی بەردەوامبوون و گۆڕانکارییە کە جیهانی ئەمڕۆی پێ دەناسرێتەوە، جیهانێک کە پێ دەنێتە سەدەی بیست و یەکەمەوە، کارێکی ناشیاوە کە بگەینە تاکە لێکدانەوەیەکی ئاسان. هەمیشە لە تیۆرییەکاندا، هەم خاڵی چەسپاوو و هەم خاڵی بەگومانیش هەن، مادام سیاسەتی دەولی رێچکەی گۆڕاوی مرۆڤایەتی دەگرێتە بەر، هەرگیز فیزیک ئاسا نابێ و تیۆرییەکی قەدەری- حەتمی- بەهێزی نابێ.

## ئاقمکاری

«نوێنەران، ئامانجەکان و ئامرازەکان» سێ پرەنسیپی سەرەکیین لەتیوریزەکردنی سیاسەتی دەولیدا، بەڵام هەریەکەیان بگری لە گۆڕان دایە. (نوێنەر)ە گرنگە تاک و تەنیاکانی سیاسەتی دەولی بەلای واقیعییە کلاسیکەکانەوە: دەوڵەتانن. لە راستیدا لێرە بەتەنیا مەبەست دەوڵەتە مەزنەکانە، وەلێ ئەم مەسەلەیە لەگۆڕان دایە. دوای شەڕی دووەمی جیهان، ژمارەی دەوڵەتانی جیهان زۆر زیادی کردووە. ساڵی ١٩٤٥، دەوروبەری ٥٠ دەوڵەتێک لە دنیادا هەبوون، ئێستا UN زێتر لە ١٨٠ دەوڵەتە ئەندامی هەیەو هی دیکەش بەڕێوەن، لە ژمارەی دەوڵەتانیش گرنگتر ئەوەیە کە نوێنەرانی دیکە جگە لە دەوڵەت هاتوونەتە پێش لەوانە کۆمپانیا زەبەلاحە فرە

ڕەگەزەکان کە سنووری دەولی دەبڕن و جاری واهەیە دەستبەسەر سەرچاوەی ئابوری ئەوتۆدا دەگرن کە لەو سەرچاوەیە گەورەترە کە دەوڵەت هەیەتی. (١٢) کۆمپانیای فرە ڕەگەز هەن کە بەهای شمەکە فرۆتەنییەکانیان لە بەهای بەرهەمی گشتی ساڵانەی GNP نیوەی دەوڵەتانی دنیا، زێترە. بەهای فرۆتەنییەکانی کۆمپانیایەکی وەک (شل یان IBM یان جەنراڵ مۆتۆرز) زێترە لە بەرهەرمی گشتی ساڵانەی (داهاتی نەتەوەیی) دەوڵەتێکی وەک مەجەر یا ئەکوادار یان زائیر، بەڵام ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانە، ئەسپابەکانی دیکەی هێزیان نییە وەک هێزی عەسکەری کە بەندیوارییەکی بەتینی لەگەڵ ئامانجە ئابورییەکانی ئەم وڵات و ئەو وڵاتدا هەیە، بە زمانی ئابوری، کۆمپانیایەکی وەک IBM بەلای بەلجیکاوە گرنگترە لە بۆرۆندی، کەونە کۆلۆنیی پێشووی بەلجیکا.

وێنەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەبێ دەوڵەتە پێکناکۆکەکان و دەوڵەتە دەرەکییە گەورەکان بە هەموو مانایەکەوە تەڵخ و پەرپووتە، بەڵام وێنەیەکی خەمناکی ناتەواوە ئەگەر نوێنەرە جیاجیاکانی غەیرەز لە دەوڵەتانی تێدا نەبێ، کۆمپانیا فرە ڕەگەزە زەبەلاحەکانی وەک شل و کۆمپانیای پترۆڵی بەریتانی BP و مۆبیل Mobil چەشنێکی ئەو جۆرە نوێنەرانەن. بەڵام نوێنەرانی دیکەش هەن: وەک ڕێکخراوی دەولی UN و هی دیکەی گچکەتر، مینا ڕێکخراوی دەوڵەتانی ئەمریکایی و جامیعەی عەرەبی و (ئۆپک)، هەروا NG O ی وەک خاچی سوور Red Cross و لێبوردنی دەولی (Amnesty) هەن، هەروابێتەوە ژمارەیەکی زۆر لە گروپ و کۆمەڵەی نەتەوەیی فرە ناسنامەی وەک گەلی کورد کە خاک و نیشتمانەکەی لە نێوان تورکیاو سوریاو ئێران و عێراقدا دابەشکراوە هەن کە بوونەتە نوێنەرێکی ڕاستەقینە لەهەر پەرەگرتنێکدا کە تایبەت بێ بە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەو وڵاتانەی پێوەی لکاون یان ئەرمەن کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و قەوقازدا بڵاوبوونەتەوە، جوڵانەوەی پێشمەرگایەتی وشەڕی پارتیزانی و کارتلاتی ماددەی بێهۆشکەرو ڕێکخراوەکانی مافیا، سنوورەکانی ئەم وڵات و ئەو وڵات دەبڕن و داهات لە چەندان وڵاتەوە بەدەست دەهێنن، بزووتنەوە ئایینییە دەولییەکان بەتایبەتی ئیسلامی سیاسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیا، ڕەهەندێکی تازەیان خستە سەر مەودای نوێنەرانی غەیرەز لە دەوڵەتانەوە

پرسیارەکە ئەوە نییە کە ئایا کۆڕو گروپیی غەیرەز لە دەوڵەتان پڕ بایەخترن یان نا؟ چۆن ئەو ئیئتیلافە تازە پێکهاتووانە کار دەکەنە سەر سیاسەتی ناوچەیەک،

بەرێگەیەک کە تێڕامانی کلاسیکی ناتوانێ پەردەیان لەسەر لابدا. ڕاستە دەوڵەتان نوێنەری سەرەکین لە سیاسەتی هەنوکەی دەولیدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوان بەتەنیا لەسەر تەختەی شانۆ نین.

**ئەدی ئامانجەکان؟**

ئامانجی هەرەبەهێزی دەوڵەت لە سیستەمی ئانارشیستدا، وەک باوە، ئاسایش و تەنایی عەسکەرییە. ئاشکراشە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، وڵاتان بایەخ بەتەنایی سوپایی خۆیان دەدەن، بەڵام بەهەمان ئەندازەو زیاتریش گرنگی بەسەروەت و سامانی ئابوری و کاروباری کۆمەڵایەتی خۆشیان دەدەن وەک بڵاوبوونەوەی ماددە بێهۆشکەرەکان و نەخۆشی ئایدزو گۆڕانکاری ژینگەیی. پاشان گۆڕانی هەڕەشەکان دەبێتە هۆی گۆڕانی پێناسەی ئەمنیەت (ئاسایش). چونکە تەنایی سوپایی تاکە ئامانج نییە کە دەوڵەتان خەباتی بۆ بکەن و هەوڵی دەستەبەرکردنی بۆ بدەن، ئەگەر سەیری پێوەندی نێوان ئەمریکاو کەنەدا بکەین، دەبینین شیمانەی شەڕ لە نێوان ئەو دووانەدا لاوازە، دەبینین دیپلۆماتێکی کەنەدایی دەڵێ: ئەو لە ئەمریکا ناترسێ کە پەلاماری کەنەدا بداو جارێکی دیکە تورنتۆ Tornto وەک ساڵی ۱۸۱۳ داگیر بکاتەوە، بەڵکە لەوە دەترسێ کە لە تکساس پرۆگرام بۆ کۆمپیوتەر دابنرێ و تورنتۆ بخاتە دەرەوەی بازنەوە، بە ڕاستی ئەمە وەک ئاریشەو گرفتەکانی دەوڵەتی کلاسیکی نییە لە سیستەمی ئانارشیستیدا. ئامانجە ئابورییەکان جێگەی ئامانجی تەنایی سوپایی ناگرنەوە (هەر وەک کوێت لە ڕۆژی داگیرکردنی لەلایەن عێراقەوە لە ۲ی ئاب ۱۹۹۰ دۆزییەوە)[۳] بەڵام بەرنامەکاریی سیاسەتی دەولی زۆر ئاڵۆز بووە.

خاڵی سێیەم: «**ئامرازەکان**»ە، ئامرازەکانی سیاسەتی دەولی دەگۆڕێن. تێڕامانی کلاسیکی، هێزی عەسکەری بە ئامرازێکی هەرە گرنگ دەزانێ لە وەسفکردنی دنیای پێش شەڕی ۱۹۱٤. مێژوونووسی بەریتانی (A. J. P. Taylar) زلهێز وا پێناسە دەکا کە ئەو هێزەیە بتوانێ لە شەڕدا، باڵادەست بێ.

ئاشکرایە حاڵی حازر وڵاتان هێزی سوپایی بەکاردەهێنن، بەڵام لەنیوەی سەدەی ڕابردووەوە دەوری هێزی سوپایی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، زۆر لە دەوڵەتان بەتایبەتی گەورەکان، پێیان وایە کە بەکارهێنانی هێزی سوپایی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان زۆر لە پێشان زیاتر پارەی تێدەچێ و بەرای پرۆفیسۆر **ستانلی هوفمان**

---

۳- لەم توێژینەوەیەدا زۆر لەسەر شەڕی دووەمی کەنداو وەستاوم بەو پێیەی نموونەیەکی هەرە روونە بۆ زۆر کاری نهێنی و کاکە برالەو بنقە بنقە لە بواری پێوەندی و سیاسەتی دەولیدا.

Stanley Hoffmann له زانکۆی هارڤارد پێوەندی و هاوبەندیی نێوان هێزی سوپایی و دەسکەوتی ئیجابی شل و خاو بۆتەوە. هۆیەکان چین؟ یەکێک لەو هۆیانە هەڵسوڕاندنی ئامرازی هەرەگرنگی هێزی سوپایی، کە چەکی نوکلیارییە، وەک پیشاندانی ماسولکەو خۆگیڤ کردنەوە وایە، وێڕای کە ژمارەی چەکی نوکلیاری ٥٠ هەزار بەسەرەوەیە، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٥-ەوە تا ئێستا دانە چەکێکی لێ بەکار نەهاتووە. جیاوازی هەرە گەورە لە قەبارەی ئەو کاولکارییەیە کە چەکی نوکلیاری دەینێتەوەو ئامانجگەلێکی سیاسی ماقوڵ وای لە سەرکردەی وڵاتان کردووە کە لە بەکارهێنانی ئەو چەکە سل و دوور بکەونەوە. ئەم شێوە ئەوپەڕەی هێزی سوپایی (مەبەست چەکی نوکلیارییە)کە پارەی زۆری تێدەچێ دەرفەتی دەعەمەل هێنانی ئەو چەکەی لە شەڕدا کەمکردۆتەوە. تەنانەت هێزی کلاسیکیش بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو خەڵکانەی لە رووی سیاسییەوە بەئاگان، خەرجیەکی زۆری دەوێ. لە سەدەی نۆزدەهەمدا وڵاتانی ئەوروپا توانیان بە چەند ئوردوە سەربازێکی دەست بەچەکی مۆدێرنەوە کۆنترۆڵی بەشەکانی دیکەی جیهان بکەن و کاروباری ئەو وڵاتانە بە ئوردوی سەربازیی کەم بەڕێوە ببەن، بەڵام لەسەردەمی دانیشتوانی سازدراوی کۆمەڵایەتیدا، زەحمەتە حوکمی وڵاتێک بکرێ کە گەلەکەی لەباری نەتەوەییەوە بە ئاگاهاتبنەوە. ئەمریکاییەکان لە حەفتاکاندا ئەمەیان لە ڤێتنام هەست پێکرد. لە هەشتاکاندا سۆڤییەتییەکان ئەم راستییەیان لە ئەفغانستان بۆ ساغ بۆوە نەک لەبەر ئەوەی ڤێتنام و ئەفغانستان لەو دوو دەوڵەتە زلهێزە نوکلیارییە بەهێزتر بوون، بەڵکە کۆنترۆڵکردنی ئەو گەلە بە ئاگاهاتووانە زۆر گران لەسەر ئەمریکاو سۆڤیەت راوەستا. بۆ نموونە لەسەر ئاستی رۆژهەڵاتی ناڤیندا، حکومەتە یەک بەدوای یەکدا هاتووەکانی عێراق لە بەکارهێنانی هێزی سوپاییدا بەهەڵەداچوون بۆ کۆنترۆڵکردنی بزاڤی نەتەوەیی کورد کە مستەفا بارزانی سەرکردایەتی دەکرد بۆ داکۆکیکردن لەمافە سیاسی و کلتورییەکانی گەلی کورد. ئەم عەقڵیەتە میلتارییەی سەرکردایەتیی پێشان و ئێستای عێراق، وڵاتی بەرەو هەڵدێر بردو چەندان شەڕیماڵکاولکەری لێکەوتەوە.

گۆڕانی سێیەم کە بەسەر دەوری هێزی سوپایی داهاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئاستەنگ و کۆسپی نێوخۆیی. بەتێپەڕبوونی کات، رەوشت و ئاکاری دژ بە خولیای عەسکەرتاری نەشونمای کردووە بەتایبەتی لە وڵاتانی دیموکراتیکدا. ئەم تێڕوانینە ناتوانێ بەکارهێنانی هێز قەدەغە بکات، بەڵکە بەکارهێنانی هێز بەگران لەسەر سەرکردەکان دەکەوێ بەتایبەتی ئەگەر هاتوو بە فراوانی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن

بەکاربێ، هێز ئامرازێکی ستۆک نییە، بەڵکە ئەمڕۆ بەکارهێنانی هێز پتر لە جاران پارەو خەرجی تێدەچێ.

دواتر هەندێ کێشە هەن بە زەبروزەنگ چارەسەر ناکرێن. بۆ نموونە سەرنجی پێوەندیی ئابوری نێوان ئەمریکاو ژاپۆن بدە. ساڵی ١٨٥٣ کۆمۆدۆر پیری، بەچەند کەشتییەکەوە بەندەرێکی ژاپۆنی داگیرکردو هەڕەشەی لە ژاپۆن کرد ئەگەر بەندەرەکانی خۆی لەبەردەم بازرگانیی ئەمریکاییدا نەکاتەوە ئەوا لە شارەکە دەدات.

هەنوکە ئەم ڕێگەیە بۆ چارەسەرکردنی ناتەبایی بازرگانی لە نێوان ئەمریکاو ژاپۆن زۆر سوودی نییە. ڕاستە هێز لە سیاسەتی دەولیدا کارایە، بەڵام تاکە هۆکاریش نییە. هەندێ جار پشت بەیەکتر بەستنی ئابوری وتەماسگرتن و دامەزراوەکانی دەولی و نوێنەرانی غەیرەز لە دەوڵەتان، دەورێکی گەورەتر لە دەوری هێز دەگێڕن. هێزی سوپایی، ئامرازێک نییە وەختی بەسەر چووبێ، بەڵام ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر تێچوون (كلفة) و ڕادەی کارایی ئەو ئامرازە داهاتوون، وایان کردووە کە سیاسەتی دەولی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئاڵۆزتر ببێ.

لەگەڵ ئەوەشدا گەمەی بنچینەیی تەناهی، بەردەوامە. پێنج ساڵ بەر لە شەڕی کەنداو، لێکۆڵینەوەیەکی «ئامۆژگای لێتوژینەوەکانی ئاشتی دەولی لە ستۆکهۆڵم» Stokholm Institute of International Peace دەڵێ: لە ٣٦ شەڕدا، (٣ تا ٥) ملیۆن مرۆڤ کوژراون. سیاسەتزانان پێیان وایە، کە هاوسەنگیی هێزەکان لەلایەن یەکە دەوڵەت یان دەوڵەتی باڵادەستەوە بڕیار دەدرێ وەک ئیسپانیای سەدەی شازدەم و فەرەنسای سەردەمی لویسی چواردەم و بەریتانیای سەدەی نۆزدەم و ئەمریکای زۆربەی زۆری سەدەی بیستەم. پاشان دەوڵەتی هەرەبەهێز لە کۆتاییدا ڕووبەڕووی بەرەنگاری دەبێتەوەو ئەمەش ئاگرێکی فراوانی لێدەکەوێتەوە کە ئێمە ناوی لێ دەنێین ململانێ لەسەر کۆنترۆڵکردن یان شەڕی جیهانی. پاش شەڕی جیهانیش، پەیماننامەی تازە، چوارچێوەیەکی تازە بۆ پێوەندی دەولی و ڕەوشی دەولی دادەنێ:

پەیماننامەی ئوتریختی ساڵی ١٧١٣، کۆنگرەی ڤیەنای ١٨١٥، نەتەوەیەکگرتووەکانی پاش ساڵی ١٩٤٥.

لەساتەوەختی ململانە لەسەر ڕێبەرایەتی لە نێوان سپارتەو ئەثیناوە شتێکی بنەڕەتی ئەوتۆ لە سیاسەتی دەولیدا ڕووی نەداوە. ئایا بەرەنگارییەکی دیکەی تازە دێتە ئارا کە ببێتە مایەی شەڕێکی دیکەی جیهانی یان سووڕو خولی شەڕی کۆنترۆڵخوازی کۆتایی هاتووە؟ ئایا تەکنۆلۆجیای نیوکلیاری وای کردووە شەڕ زۆر

کاولکارانە بێ؟ ئایا پشت بە یەکتر بەستنی ئابوری وای کردووە، شەڕ خەرجییەکی ئێجگار زۆری بوێ؟ ئایا کۆمەڵگای سەر زەوی لە رووی کۆمەڵایەتی و رەوشتەوە، شەڕی لە بیرکردنەوەی خۆی دەرهاویشتووە؟ هیوامان وایە ئەمە وابێ، چونکە شەڕی کۆنترۆڵخوازی ئایندە، رەنگە دوا شەڕ بێ، بەڵام پێویستە هەوەلجار لە مەسەلەی بەردەوامبوون حاڵی ببین.

## شەڕی پیلۆ پۆنیزی

Peloponnesian war

**توسایدیدس** باوکی ریالیزمە. زۆربەی ئەو خەڵکانەی بیر لە مەسەلەی سیاسەتی دەولی دەکەنەوە پێڕەوی لەم تیۆرییە (ریالیزم) دەکەن، تەنانەت بەوانەشەوە کە خۆشیان نازانن پێڕەوی لەم تیۆرییە دەکەن. دیارە تیوری ئەو ئامرازەیە کە بۆ رێکخستنی فاکتەکان ناکرێ دەسبەرداری ببین. (**جۆن میناردکینیز**)ی ئابوریناس Maunard Keanes دەڵێ: ئەو خەڵکە عەمەلیانەی کە گومانیان لەوە هەیە پێویستیان بە تیۆرییەک هەبێ، رەنگە دیلی دەستی نووسەرێکی کەس پێنەزان و لەبیرکراوبن. ئەمڕۆ زۆر لە سیاسەتکاران و نووسەران و سەروتارنووسان، تیورگەلی ریالیستی، بەکاردەهێنن با ناوی توسایدیدسیشیان نەبیستبێ. (**روبرت گیلفن**) Gil- phen Robert کە یەکێکە لە واقیعییەکان دەڵێ «ئەگەر هەقتان دەوێ، پێویستە بەدوای ئەوەدا بگەڕێین کە ئایا قوتابیانی پێوەندیگەلی دەولی لەسەدەی بیستەمدا شتێ لەو راستییە دەزانن کە توسایدیدس و هاوڕێ نیشتمانپەروەرەکانی لەسەدەی پێنجەمی پێش زایینداا شتێکیان لە بارەی رەفتارو ئاکاری دەوڵەتان نەدەزانی». ئەو زاتە هەر خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێ «سیاسەتی دەولی وەک چۆن توسایدیدس وەسفی کردووە ئێستاش هەر ئاوا وەسف دەکرێ».

ئەم مەسەلەیە جێگەی قسەلێکردن و پیلەکەیە، بەڵام بۆ ئەوەی قسەی لێبکەین، دەبێ بزانین توسایدیدس چۆن مەسەلەکەی باسکردووە.

ئایا چ لەوە باشتر هەیە کە بۆ پێناساندنی تیوریی ریالیزم، چیرۆکێکی مەزنی مێژوویی بگێڕینەوە؟ بەڵام وەک هەر چیرۆکێکی مەزن،ئەم چیرۆکەش سنووری خۆی هەیە. یەکێ لەو مەسەلانەی لە شەڕی پیلۆپۆنیزی فێری دەبین ئەوەیە کە چۆن خۆمان لە ئەوپەڕی سادەکردنەوە، بپارێزین-واتە ساویلکەیی- لە خوێندنەوەی مێژوودا.

## پوختەی چیرۆکێکی درێژ

لە سەرەتای سەدەی پێنجەمدا، ئەثینا و سپارتە هاوپەیمانی یەکتربوون، بۆ تێکشکاندنی ئیمپراتۆریای فارس (٤٨٠ پێش زایین) هاریکاری یەکتریان دەکرد. سپارتە دەوڵەتێکی کۆنەپارێزو گیرۆدەی زەویوزار بوو، پاش سەرکەوتن بەسەر فارسەکاندا، خەریکی دەستپێدا هێنانەوەی کاروباری ناوخۆیی خۆی بوو، لەکاتێکدا ئەثینا دەوڵەتێکی بازرگانی و خودان مەیل و ئارەزووی دەریایی بوو، بەرو رووی لە دەرەوە بوو.

لە ناوەڕاستی سەدەکەدا پەنجا ساڵ گەشەکردنی بەخۆوە بینی بوو، ببووە ئیمپراتۆریاو (هاوبەندیی دیلیسی) پێکەوەنابوو.

ئەو هاوبەندییە بریتی بوو لە هاوپەیمانیی ئەو دەوڵەتانەی کە لەسەر دەریای ئیجە بوون و پشتێنەیەکی بەرگریی یۆنانییان لە رووی فارسەکاندا دروست کردبوو، لەلایەکی دیکەوە سپارتە دراوسێکانی خۆی لە نیمچە دورگەی پیلۆپۆنیزی لە پاکتێکی دیفاعیدا کۆکردبۆوە. ئەو دەوڵەتانەی کە هاوپەیمانی ئەثینا بوون دژی فارسان، لە پڕ خۆیان دیتەوە دەبێ باج و سەرانە بە ئەثینا بدەن. بەهۆی بەهێزبوونی ئەثیناو بەرەنگاربوونەوەی زوڵم و زۆرداریی ئیمپراتۆریای ئەثینا لە ساڵی ٤٦١ی پێش زاییندا شەڕ قەوما. شەڕی یەکەمی پیلۆپۆنیزی بە کۆتا هات و پەیماننامەیەک مۆر کراو بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ ئاشتی بەرقەرار بوو. گریکەکان ماوەیەک لەئاشتی و تەناهیدا ژیان بەر لەوەی شەڕی دووەم یان شەڕی هەرە گەورەی پیلۆپۆنیزی هەڵبگیرسێ.

لە ساڵی ٤٢٤ی پێش زایینا شەڕێکی ئەهلی لە دەوڵەتۆکە شارێکی سەر سنوور (ئیپیدامنوس) قەوما. وەک ئەو بەردو دارەی کە دەبێتەمایەی رنوە بەفر، ئەم رووداوە زنجیرەیەک کاردانەوەی بەدواداهات و لە کۆتاییدا شەڕی پیلۆپۆنیزی لەسەر قەوما، چونکە زۆربەی جاران ململانەی گەورە لەسەر تەنگ و چەڵەمە و کێشەی تا رادەیەک بچووک و لە جێگەی دووری حیساب بۆ نەکراو دەقەومێ، هەر وەک دەبینین کاتێ باس لە شەڕی یەکەمی جیهان دەکەین.

دیموکراتەکان و ئۆلیگارشیەکان لە ئیپیدامنوس لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵاتەکە ململانەیان بوو، دیموکراتەکان هانایان بۆ دەوڵەتە شاری کورسایرا برد کە پێشتر یارمەتی دامەزراندنی ئیپیدامنوسی دابوو، بەڵام دیموکراتەکان بە هەناسە ساردی گەڕانەوەو روویان لە دەوڵەتە شارێکی دیکە (کورنث) کرد. کورنثییەکان

بڕیاریان دا یارمەتیان بدەن ، ئەمە بووە هۆی ئەوە کە خەڵکی کورسایرا تورە بن و کەشتیگەلێکیان بۆ داگیرکردنەوەی ئیپیدامنوس کە رۆژێ لە رۆژان کۆلۆنی ئەوان بوو، بەرێکرد.

لەو ماوەیەدا کورسایراییەکان، کەشتیگەلەکەی کورنثیان بەزاندو (کورنث)یش زۆر تووڕە بوو شەڕی دژی کورسایرا راگەیاند. کورسایرا لە پەلاماری کورنث ترساو پەنای بۆ ئەثینا هێنا، ئیدی هەریەک لە کورسایراو کورنث نوێنەریان بۆ ئەثینا نارد.

ئەثینییەکان پاش ئەوەی گوێیان لە هەردوو لا راگرت، نەیانزانی چ بکەن و نەیان دەویست ئەو ئاگربڕە بشکێنن کە دە ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو، وەلێ ئەگەر کورنثییەکان (کە پێوەندییەکی بەتین و پتەویان لەگەڵ پیلۆپۆنیزییەکاندا هەبوو) بەسەر کورسایرادا سەرکەوتن و دەستیان بەسەر کەشتیگەلە گەورەکەی داگرت، ئەوا تەرازووی هێز لەنێوان دەوڵەتەکانی یۆناندا بە زەرەری ئەثینا لەنگ دەبێ، خەڵکی ئەثینا هەستیان کرد کە لە بەرژەوەندی ئەوان دانییە لێ بگەڕێن کەشتیگەلی کورسایرییەکان بکەوێتە دەستی کورنثییەکانەوە، بۆیە بڕیاریان دا «کەمێ خۆیان تێوەبگلێنن»و شالاوێکی گچکەیان بۆ ترساندنی کورنث هێنا، بەڵام کردەوەی بەرپەرچدانەوە نوشستی هێناو بە پێچەوانەوە کورنث هێرشی هێنا. کاتێ نیشانەی تێشکانی کورسایراییەکان بە دەرکەوت، کەشتییەکانی ئەثینا زیاتر لەوەی کە بڕیار درابوو، چوونە ناو شەڕەکەوەو بەشداریی ئەثینییەکان، کورنثییەکانی هارتر کردو ئەثیناییەکانی خستە بارێکی نیگەرانییەوە کە کورنث گرفت لە پوتیدایا کە هەم پێوەندی مێژوویی لەگەڵ کورنث هەبوو، هەم هاوپەیمانی ئەثیناش بوو، بنێتەوە. سپارتە بڕیاری دا یارمەتی کورنث بدا ئەگەر ئەثینا پەلاماری پوتیدایا بدا، کاتێ شۆڕش لە پوتیدایا قەوما، ئەثینا هێزێکی بۆ کپ کردنەوەی شۆڕشەکە نارد، لەو دەمەدا پیلەکەیەکی توند لە سپارتە هەبوو، ئەثیناییەکان داوایان لە سپارتەییەکان کرد کە بێلایەن بن، لە کاتێکدا کورنثییەکان هانی سپارتەیان دا کە شەڕ بکەن و **خەڵکەکەیان لە بەهێزبوونی ئەثینا** وریا دەکردەوە، شارێکی گرنگی دیکەش کە **میگارا بوو بەپیر داوای کورنثەوە هات**، چونکە ئەثیناییەکان **سەرباری پەیماننامەش، بازرگانییان لە میگارا قەدەغە کردبوو**، سپارتە کەوتە بن فشارەوە، بەڵام سپارتەییەکان بە قازانجی شەڕ دەنگیان داو لەوە ترسان ئەگەر ئەثینا بەرزەفت نەکرێ، دەست بەسەر تەواوی یوناندا دەگرێ. لەسەرینی ئەمەوە سپارتە هاتە ناو شەڕەکەوە بۆ پاراستنی تەرازووی هێز لەنێوان دەوڵەتە شارەکانی یۆناندا.

ئەثینا دوا ئاگادارکردنەوەی سپارتای رەتکردەوەو سپارتە لە ساڵی ٤٣١ی پێش زایین پەلاماری دان.

هەرچی ئەثینییەکان بوون بە مەزنیی ئیمپراتۆریاکەی خۆیانەوە دەنازی و شانازییان بە وڵاتپارێزیی شارەکەیان و رژێمە کۆمەڵایەتییەکەیانەوە دەکردو بڕوایان بە سەرکەوتن بەهێز بوو. لە قۆناخی یەکەمی شەڕدا هەردوولا وەک یەک وابوون، پاش دە ساڵ شەڕ، ئاگربڕ کرا (٤٢١ پێش زایین)، بەڵام ئاگربڕێکی لەرزۆک بوو، شەڕ سەرلەنوێ هەڵگیرسایەوە، ساڵی ٤١٣(پ - ز) ئەثینا کەڵەوەکێشیەکی خەتری دیکەی کرد، دوو کەشتی و تابورە سەربازی پیادەی بۆ داگیرکردنی سەقلیە ـ دوورگەی هەرە گەورەی خوارووی ئیتاڵیا ـ نارد کە چەند کۆلۆنییەکی یۆنانیی هاوپەیمانی سپارتە بوون، لە ئەنجامدا تووشی تێکشکانێکی گەورەبوو. لە هەمان کاتدا سپارتەکان پارەو پولێکی زۆریان لە فارسەکان کە دڵیان زۆر خۆش ببوو بە تێکشکانی ئەثینابیەکان، وەرگرت. پاش تێشکانی سەقلیە، ئەثینابیەکان لەناوەخۆ تێک بەربوون. ساڵی ٤١١ی پێش زایین ئۆلیگارشییەکان بەسەر دیموکراتەکاندا سەرکەوتن و (٤٠٠) کەسێکیان ویستیان حوکمی ئەثینا بکەن. بەڵام ئەم رووداوانە دوا رووداو نەبوون، دوای ئەوە ئەثینا رابووەوە سەرپێی خۆی، ساڵی ٤١٠ (پ. ز) ئەثینا سەرکەوتنێکی دەریایی بەدەست هێناو پاش (٥) ساڵان سپارتەییەکان شەڕیان بردەوەو ساڵی ٤٠٤ (پ. ز) ئەثینابیەکان داوای ئاشتەواییان کردو سپارتە مەرجی بۆ دانان کە دەبێ ئەثینا ئەو شوورە درێژانە لە رووی دەشت و دەوروبەرییەوە بڕوخێنێ. بەم شێوەیە ئەثینا دەستی دارێ تفەنگێی شکا.

## هۆو تیورییەکان

ئەمە چیرۆکێکی کارتێکەرو بەهێزە. چ هۆکارێک لە پشت شەڕ هەڵگیرسانەکە بوو؟ لەمبارەوە ڕای توسایدیدس زۆر روونە. توسایدیدس ئەوەی لە ئیپیدامنوس و کورسایرا قەوماون، دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەوانە هۆکاری راستەقینەی شەڕەکە نەبوون، ئەوەی بووە هۆی قەومانی شەڕ و کە چ چارو مەفەرێکی دیکە جگە لەشەڕ نەمێنێ، بەهێزبوونی ئەثینا بوو، سپارتەش لەسەرینی ئەمەوە ترس و خۆفی لێ نیشت. ئایا ئەثینا هیچ رێگەیەکی دیکەی هەبوو؟ ئەگەر ئەثینا دووربین بووایە، ئایا دەیتوانی خۆی لەو کارەساتە لابدات؟ **پیرکلیس** پێشەوای ئەثینا لە رۆژانی شەڕی بەراییدا، وەڵامێکی شایان بایەخ پێدانی هاووڵاتیانی خۆی داوەتەوەو دەڵێ: «راستەو دەبێ و

کارێکی لەبارە ئێوە پشتی کەرامەتی ئەثینای ئیمپراتۆریا بگرن. ئێستا ئیمپراتۆریای ئێوە دەستی زۆر دەڕوا: رەنگە هەڵە بێ پەسندی ئەم دەستڕۆیشتن و ستەمکارییەی ئەثینا بکەن، بەڵام پڕ خەتەرە لێ بگەڕێن ئەثینا هەرەس بهێنێ» بە واتایەکی دیکە پیرکلیس ڕێگەیەکی دیکەی لەبەردەم هاووڵاتیاندا نەهێشتەوە. رەنگە لە بارێکی تردا بویان، بەڵام لە دارەتی ئەو دەمی ئیمپراتۆریا نەدەکرا شتێکی دیکە بکەن غەیرەز لە زێتر پڕکێشی کردن و خۆخستنە ناو تالوکەو مەترسییەوە، هەر بۆیە پیرکلیس شەڕی پەسند کرد، وەلێ دەنگی دیکەی ئەوتۆش لەناو ئەثینا هەبوون وەک دەنگی نێردە ئەثینییەکان کە ساڵی ٤٣٢ داوای گفتوگۆکردنیان لەگەڵ سپارتەدا دەکردو دەیانگوت:

«بیر لەو لایەنە گەورەیە بکەنەوە کە پەرەسەندنی نا چاوەڕوانکراو لە شەڕدا ڕوودەدا، باش بیر لەمە بکەنەوە پێش ئەوەی بەکردەوە بچنە ناو شەڕەکەوە، چەند شەڕ درێژە بکێشێ، مەسەلەکان زێتر پشت بە ڕێککەوت دەبەستن» ڕووداوەکانی دواتر ساغیان کردەوە کە ئەو ڕێنوێنیانە باش و ڕاست بوون.

کەواتە ئیدی لەبەر چ ئەثینایییەکان بە قسەیان نەکردن؟ رەنگە حەماسی نیشتمانی و رق و کینە کوێری کردبن، بەڵام شیمانەیەکی دیکەش هەیە کە شایانی تێڕامانە: رەنگە ئەثینایییەکان عاقڵانە بیریان کردبێتەوە، چونکە بە ئاریشەیەکی ئاسایش ئامێز دەورە درابوون.

ئاریشەگەلی تەناهی دەگەڕێنەوە بۆ خەسڵەتێکی بنچینەیی سیاسەتی دەولی ئەویش (ڕێکخستنی ئەنارشیستانەیە) واتە نەبوونی حکومەتێکی باڵا. لە سیستمی ئانارشیستیدا رەنگە ڕێ و شوێنێکی سەربەخۆ لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ پتەوکردنی ئاسایشی ناوخۆ، ببێتە مایەی نائەمنیەتی هەموو وڵاتانی دیکە. ئەگەر دەوڵەتێ هێزی پێکەوە نا تا دەوڵەتێکی دیکە نەشێ دەستدرێژیی بکاتە سەر، دەوڵەتەکەی دیکە کە دەبینێ دەوڵەتی بەرامبەر خۆی قایم دەکا، ئەویش هێز پێکەوە دەنێ تا خۆی لە بەڵای ئەو دەوڵەتە بپارێزێ. لە ئەنجامدا هەوڵ و تەقەلای هەریەکەیان بۆ پێکەوەنانی هێزی تایبەت بەخۆیان وپتەوکردنی ئاسایش و تەناهی خۆیان دەبێتە مایەی ئەوە کە هەر دوو دەوڵەت لەناتەناهیدا بژین. ئەمە ئاکامێکی ورووژێنەرانەی گاڵتەجارییەکی تاڵە با هەر دوو دەوڵەتیش بە ئاقڵانە رفتاریان کردبێ، چونکە هەر کام لەو دوو دەوڵەتە لەسەرینی لەخۆیایی بوون و رق وکینەوە رەفتاریی نەکردووە بەڵکە هەر لایەنە لەسەرینی بەهێزبوونی ئەوی دیکەوە، رەفتاری کردووە، پاشان پێکەوەنانی ئەسپابی بەرگری لە خۆکردن، وەڵامدانەوەیەکی ئاقڵانەی هەڕەشەیەکی

شیمانە ئامێزە.

دەوڵەتان دەتوانن بۆ خۆلادان لە گیروگرفتی لەم جۆرەی تەناهی، لە نێوان خۆیاندا هاریکاری یەکتر بکەن، واتە دەتوانن لەسەر ئەوە رێکبکەون کە هەریەکەیان هێزی بەرگریی تایبەت بەخۆی پێکەوە نەنێت، ئیدی ئەو دەمە هەموو شتێ وەک پێویست دەڕوا، کەواتە روون بۆوە دەوڵەتان دەتوانن و دەبێ یارمەتی یەکتر بدەن، کەواتە بۆ چی واناکەن؟ دەشێ وەڵام لەو گەمەیەی کە ناوی «ئاریشەی زیندانی ـ المعضلة السجین»ی لێ نراوە، بدۆزینەوە.

ئاریشەی ئەمنیەت، تەرزێکی دیاریکراوە لە ئاریشەی زیندانی.. سیناریۆی ئاریشەی کابرای زیندانی بەم شێوەیەیە: ئەوە بێننە بەر زەینتان کە پۆلیس دوو کەس لە جێگەیەک دەگرن و هەریەکەیان بڕێکی کەمی ماددەی بێهۆشکەری پێ دەبێ کە سزای ساڵێکی بەدواوەیە. پۆلیس لەو بڕوایەن کە ئەو دوو پیاوە بەراستی بازرگانی بە ماددەی بێهۆشکەرەوە دەکەن، بەڵام بەڵگەی تاوانبارکردنی تەواویان بەدەستەوە نییە. ئەگەر بۆیان ساغ بۆوە کە ئەوانە بازرگانی بەماددەی بێهۆشکەرەوە دەکەن، ئەوا ئاسانە حوکمی ٢٥ ساڵ زیندانی بۆ هەردووکیان ببڕنەوە. پۆلیس ئەوە دەزانێ ئەگەر یەکێکیان دژی ئەوی دیکە شایەدی بدا، ئەوە تاونبارەکە ئەو پەڕی سزای خۆی وەردەگرێ. پۆلیس گفت بەهەر یەک لەو دوو پیاوە دەدا ئەگەر شایەدی لە دژی ئەوی دیکە بدا کە بازرگانیی بە ماددەی بێهۆشکەرەوە کردووە ئەوا ئەو ئازاد دەکرێ، هەروا پۆلیس هەر دوو لا ئاگادار دەکاتەوە ئەگەر هەر دووکیان زمان لە یەکدی بدەن ئەوا هەریەکەیان حوکمی ١٠ ساڵ زیندانی بۆ دەبڕێتەوە، هەروا پۆلیس دەگاتە ئەو ئەنجامە کە ئەو دوو کەسە یان ئەوەتا بۆ ماوەی ١٠ساڵ لەو کارە دوور دەکەونەوە یان بۆ ماوەی ساڵێک بەند دەکرێن و پاشان دەگەڕێنەوە سەر بازرگانی کردن بە ماددەی بێهۆشکەرەوە.

هەر یەک لە دوو گومانلێکراوەکە لە دوو ژووری جیاواز دادەنرێن و پێوەندی نێوانیان دەبڕدرێ. هەریەک لە دوو تاوانبارەکە رووبەرووی ئەو گرفتە دەبێتەوە:

دەتوانێ ئەوی دیکە پێوە بکا و خۆی قورتار بکاو لە زیندان بچێتە دەرەوە یان بێ دەنگی لێ بکاو ساڵێک لە زیندان پاڵ بداتەوە، بەڵام ئەگەر هەر دووکیان لە دژی یەکتر شایەدی بدەن ئەوا هەر دووکیان بە ١٠ ساڵ زیندانی حوکم دەدرێن، هەر یەکەیان بیر دەکاتەوە: «باشتر وایە زمانی لێ بدەم،ئەگەر ئەو بێ دەنگ بێ و منیش قسەنەکەم ئەوا دەبێ ساڵێک لە بەندیخانە بمێنمەوە. بەڵام ئەدی ئەگەر ئەوی دیکە

قسەی کرد؟ ئەگەر منیش شایەدی لەسەر بدەم ئەوا ١٠ساڵ زیندانی دەکرێم بەڵام ئەگەر دەنگ نەکەم ئەوا ٢٥ ساڵ لە بەندیخانە دەمێنمەوەو ئەویش بەر هەڵدا دەکرێ و دەبمە گێلە پیاو. ئەگەر یارمەتی بدەم و قسان نەکەم ، کێ دەستەبەری ئەوە دەکا ئەو غەدرم لێ ناکا؟ ئەمە گرفتی بنیادگەرانەی بنچینەیی رەفتارکردنێکی ئاقڵانەی سەربەخۆیە.

باشترین ئاکام بۆ هەریەکێکیان ئەوەیە کەزمان لەوی دیکە بداو خۆی بەرەڵلا ببێ. خراپترین ئاکام ئەوەیە کە یەکێکیان گێلە پیاو دەرچێ و خۆی بێ دەنگ بکا، بەڵام ئەوەی دیکە زمانی لێ بداو ئیدی ٢٥ ساڵ لە زیندان بباتە سەر.

ئەگەر هەر یەک لەوان چ باشە بۆ خۆی بکا ئەوا هەر دووکیان تووشی خراپترین ئەنجام دەبنەوە. دیارە هەڵبژاردنی سەرەنجامی هەرەباش، واتە ئازادی، (بەراورد)ێکی ئاقڵانەی پێ دەوێ، بەڵام ئەگەر هەر یەک لەو دوو پیاوە سەربەخۆ سەرەنجامی هەرەباشی بۆ خۆی هەڵبژارد، ئەوا ئاکامێکی خراپی بۆ هەر دووکیان تێدادەبێ، بەڵام هاریکاری بەبێ بوونی تەماسگیریی کارێکی زەحمەتە، ئەگەر هەر دوو پیاوەکە بیان توانیایە قسان لەگەڵ یەکتردا بکەن، شیمانەی هەرە بە هێز ئەوەیە کە لەسەر بێ دەنگی و خۆکرکردن رێک بکەون و ساڵێک لە بەندیخانە لیی پاڵ بدەنەوە.بەڵام تەنانەت ئەگەر تەماسگرتن و پێوەندیش لە نێوانیاندا هەبێ، گرفتێکی دیکە هەیە: متمانەو راستگۆیی. با هەر لەسەر خوازراوەی (گرفتی کابرای گیراو) برۆین دەشێ هەر تاوانبارێ بەخۆی بڵێ:(هەر دووکمان بازرگانی مادده بێهۆشکەرەکانین، من بە کردەوەی وی دەزانم، کێ دەزانێ پاش ئەوەی رێک دەکەوین کە قسان نەکەین، ئەو قسان ناکا؟ پراڤۆ! بروام پێ هێناوە کە قسان نەکا، ئێستا دەتوانم دەستەگوڵی خۆم لێدەم بێ ئەوەی لە داو بکەوم).

لە سیاسەتی دەولیش هەر ئاوایە. نەبوونی پێوەندی و متمانە بەیەککردن هانی دەوڵەتان دەدا ئاسایشی خۆیان پتەو بکەن، با ئەو هەوڵەش سەرجەم دەوڵەتان بگەیەنەتە بارێکی نەبوونی ئاسایش و تەناهی. بەواتایەکی دیکە دەبینین دەوڵەتێ بە دەوڵەتێکی دیکە دەڵێ:(خۆت پڕ چەک مەکە و منیش خۆم پڕ چەک ناکەم و ئاوا هەر دوو لامان لە ئاشتی و تەناهیدا دەژین) بەڵام دەوڵەتی دووەم رەنگە بپرسێ ، ئایا چ گەرەنتییەک هەیە تا متمانە بە دەوڵەتەکەی دیکە بکات.

سپارتەییەکان لەکاتی گفتوگۆکردندا لە سپارتە،بە ئەثینییەکانیان گوت: رێگە چارەی ئەو کێشەیە ئەوەیە ئەو شورەو دیوارانەی دەوری ئەثینایان داوە تێک بدەن و

بەرگریی خۆتان کەم بکەنەوە و ئیدی زۆر لە ئێوە نیگەران نابین و دەتوانین متمانەتان پێ بکەین، بەڵام هەر کە ئەثینییەکان پاش ئەو گفتوگۆیە گەڕانەوە شاری خۆیان شورەکانی خۆیان نەک هەرنەڕوخاند بەپێچەوانەوە بەرزتریان کردنەوە، چونکە ئەوانیش بڕوایان بە سپارتەییەکان نەدەکرد. ڕەوشی ئەثینییەکان لە ساڵی ٤٣٢ی پێش زایین، بە ئاریشەی کابرای زیندانی دەچێ، لە ناوەڕاستی سەدەکەدا ئەثینا و سپارتەییەکان ڕێککەوتن کە بۆ هەر دوولایان باشترە ئاگربڕ مۆر بکەن. ئەثیناییەکان لە پێشێلکردنی ئاگربڕ تەنانەت دوای ڕووداوەکانی ئیپیدامنۆس و ناکۆکی نێوان کورسایراو کورنثیش خۆیان دەپاراست. دواییەکەی کورسایراییەکان، ئەثینایان بەو ڕێککەوتنامەیە بڕوا پێ هێنا: « سێ هێزی دەریایی خودان شیان هەن ئەوانیش ئەثینا و کورسایراو کورنث ـ ن، ئەگەر لە سەرەتاوە کورنث بەسەرماندا زاڵ بوون، وا دەکەن کەشتیگەلی ئێمە لەگەڵ کەشتیگەلی ئەوان یەکبگرێ و ئیدی ئێوە ناچار دەبن بەگژ هەر دوو کەشتیگەلدا پێکرا بهێنەوە. بەڵام ئەگەر ئێمە پێکەوە هاوپەیمان بین، بەکەشتیگەلی ئێوەو ئێمە دەچینە ناو شەڕەکەوە» ئایا دەبوایە ئەثینا هەر هاوکاری پیلۆپۆنیزییەکانی بکردبوایەو ئەو پێشنیارو بۆچوونەی کورسایرای ڕەت بکردبوایەوە؟ ئەگەر وایان بکردبوایە چ ڕووی دەدا، ئەگەر پۆلۆپۆنیزییەکان پەنایان بۆ تەڵەکەبازی و لەخشتەبردن ببردبوایە و کەشتیگەلی کورسایرایان دەست بەسەر دا گرتبا؟ ئەودەمە شەڕێکی دەریایی دەقەوما کە دوو بەیەک دەبوو دژی ئەثینا: ئایا دەبوایە ئەثینا بڕوای بەگفت و بەڵێنی پیلۆپۆنیزییەکان بکردبوایە؟ توسایدیدس هۆیەکەیمان پێ دەڵێ کە:«بڕوای باو ئەوە بوو کە چار نییە، شەڕ لەگەڵ پیلۆپۆنیزییەکان هەر دەقەومێ، بێ گوێدانە ئەوەی کە چ بووەو چ ڕووی داوە» ئەگەر ئەمە ڕاست بێ ئەثینا هەرگیز ڕێگەی نەدەدا کەشتیگەلی کورسایرا بکەوێتە دەستی کورنثییەکانەوە.

## حەتمیەت و سێبەری دوارۆژ

ئەوە پارادۆکسە کە تەنیا بڕوابوون بە حەتمیەتی شەڕ، دەورێکی گەورە لە هەڵگیرساندنی جەنگدا بگێڕێ. ئەثینا بیری کردەوە کە چارنییە شەڕ دەقەومێ، ئیدی بۆ ئەو باشترە دوو بەیەک بێ نەک بە پێچەوانەوە. بڕوا بەحەتمی بوونی شەڕ کە چار نییە هەر دەقەومێ، دەورێکی یەکلاکەرەوەی لە وەرگرتنی بڕیارەکەدا هەبوو. ئەم حەتمیەتە بۆ؟ با بۆ ئاریشەی کابرای زیندانی، بگەڕێینەوە. یەکەمجار وا دێتەپێش چاو کە بۆ هەردوو زیندانییەکە وا باشترە هەریەکەیان ئەوی دیکە دەست خەڵەت بدات

و بە قوربانی خۆی بکات، بەلام مادام هەردووکیان ئەوە دەزانن ئەگەر متمانە بەیەکدی بکەن پێویستە هەولبدەن رێگەچارەی دووەم و هەرە باشتر بگرنەبەر، ئەوژی هاریکاری کردنی یەکتری و بێدەنگ بوونە لە ئاست یەکتردا، بەلام هاریکارییەکی لەم بابەتە ئاسان نییە، چونکە گەمەکە تەنیا جارێک دەکرێ و دەبڕێتەوە. لە رێگەی دووبارەبوونەوەی یاریدا، خەلکان فێردەبن چۆن هاریکاری یەکتر بکەن، بەلام ئەگەر گەمەکە تەنیا جارێک بوو بەس، کامەیان بتوانێ ئەوی دیکە دەست خەلەت بدا ئەوا گرەوەکە دەباتەوەو ئەوەی هەلوێستی خۆی لەسەر متمانەکردن بەوی دی بنیات بنێ، ئەوا مایەپوچ و دەبەنگ دەردەچێ، **رۆبرت ئەکسلرۆدی** سیاسەتزان، ئاریشەی کابرای زیندانی بەستراتیژیای جۆربەجۆرەوە خستە ناو پرۆگرامی کۆمپیوتەرەوەو پاش چەند گێمێک بینی باشترین ئەنجامی وەدەستهاتوو لە رێگەی ستراتیژیای (یەک بەیەک)ەوەیە؛ «چیت پێ کردووم، وات پێدەکەم» ئەگەر لە هەنگاوی یەکەمدا ساختەم لێبکەی،منیش ساختەت لێدەکەم. ئەگەر جارێکی دیکە فێلم لێبکەی منیش جارێکی دیکە فێلت لێدەکەمەوە، ئەگەر هاریکاریم بکەی، منیش هاریکاریت دەکەم، ئەگەر دووبارە یاریدەم بدەی، یاریدەت دەدەمەوە، بە تێپەڕبوونی کات، هەردوو یاریزان تێدەگەن قازانجی هەردوولا لە یاریدا زۆرتر دەبێ ئەگەر هەردوولا فێربوون چۆن هاریکاری یەکتر بکەن، بەلام **ئەکسلرود** وریامان دەکاتەوە کە رێگای «یەک بەیەک» کەلکی نییە مەگەر یارییەکە ماوەیەک بخایەنێ، کاتێ «سێبەری ئایندەیەکی دوورودرێژ» لە ئارادا هەبێ، کاتێ تۆ دەزانی بە سایەی گەمان لەگەل هەمان خەلکدا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، دەتوانی فێرە هاوکاری کردن ببی.

لەبەر ئەم هۆیە دەبینین برواهێنان بە حەتمی بوونی شەڕ لە سیاسەتی دەولیدا وەختی بەسەرچووە، کاتێ بڕوات وابێ کە هیچ چارو مەفەرێکی دیکە بێ لە شەڕ بەولاوە نییە، تۆ زۆر لەدوا جوولەی خۆت نزیک بوویتەوە، کاتێ دەگەیتە دواجوولە (کە رەنگە لە ژیاندا بمێنیتەوە، ئەگەر لە تواناداهەبوو لە بنەچەکەدا بەشداری لە یارییەکەدا بکەی) ئەو دەمە تۆ هەقتە نیگەران ببی کە تا چەند دەکرێ بڕوا بە ناحەزەکەت (غەنیمەکەت) بکەی یان نا، ئەگەر گومانت پەیدا کرد کە ناحەزەکەت دەست خەلەتت دەدا باشتر وایە پشت بە خۆت ببەستی و لە جیاتی هاریکاری کردن لێی دوور بکەویەوە، ئەثینایییەکانیش هەر وایان کرد. لەبەردەم برِوابوون کە چار نییە شەڕ هەر دەقەومێ، بریاریاندا، لە بارێکدا کە هیچ گەرەنتی و پاساوێک نییە تا متمانە بە کورنثییەکان یان سپارتەییەکان بکەن، باشتر وایە بدەنە پال کەشتیگەلی

کورسایرا لە جیاتی ئەوەی دژیان بوەستن، کاتێ دیتیان ئەوە دوا هەنگاوە لە یارییەکەو چار نییە شەڕ هەر دەقەومێ.

**ئەرێ بە راست هەر دەبوایە شەڕی پیلۆپۆنیزی بقەومێ؟**

توسایدیدس بە چاوێکی رەشبینانەوە سەیری سروشتی مرۆڤایەتی کردووەو گوتویەتی «کاری من کارێکی ئەدەبی نییە کە بۆ ئەوە نووسرابێ خەڵکی دەوروبەرم لێ رازی بێ، بەڵکە بۆ ئەوە نووسراوەتەوە هەتا هەتایێ بمێنێتەوە» مێژووەکەی توسایدیدس، سروشتی مرۆڤایەتی، (ئاریشەی کابرای زیندانی) ئاسا، چ ئەوساو چ بە درێژایی دەورانەکانمان پێ دەناسێنێ. توسایدیدس مەبەستی دەست خەڵەتدان نەبووە، بەڵام وەک هەموو مێژووناسێکی دیکە،دەبوایە جەخت لەسەر هەندێ شت بکاتەوەو باز بەسەر هەندێکی دیکەیاندا بداو پێی وابوو هۆکاری شەڕ،بەهێزبوونی ئەثیناو ترس لێنیشتنی سپارتە بووە.

بەڵام بە بڕوای مامۆستای دیراساتی گریکی (**دونالد کاغان**)هێزو توانای ئەثینا بەر لە هەڵگیرسانی شەڕ لە ساڵی ٤٣٢دا (پێش زایین) لە خورتبوون و قەبەبوون دانەبوو، بەڵکە لەدوای ئەمەوە، هێزی ئەثینا بەرەو ژوور هەڵکشا، لەسەرووی ئەوەشەوە، هەروەک **کاغان** دەڵێ: سپارتە هێندەی لە شەڕ دەترسا هێندە لە ئەثینا نەدەترسا، چونکە هەردوو دەوڵەت کۆیلەیان لەشەڕ بەکاردەهێناو لەوە دەترسان کە چوونە ناو شەڕەوە دەرفەتی بەرپابوونی شۆڕشی کۆیلەکانی لێ بکەوێتەوە، تەنیا جیاوازی لەوە دابوو کە ٩٠ ٪ی دانیشتوانی سپارتە کۆیلە بوون و لەمێژ نەبوو سپارتەییەکان لە ساڵی ٤٦٤دا رووبەڕووی شۆڕشی کۆیلەکان ببوونەوە، لەبەر ئەوە کاغان پێی وابوو راستە سپارتە لە بەهێزبوونی ئەثینا دەترسا، وەلێ زێتر لە شۆڕشی کۆیلەکان دەترسا.

کەواتە هۆکاری راستەوخۆی شەڕ، بەلای کاغانەوە گرنگتر بوو لەوەی کە لە تیۆری توسایدیدس سەبارەت بە حەتمیەتی شەڕ داهاتبوو.

بۆ نموونە: کۆرنث پێی وابوو، ئەثینا شەڕ ناکات چونکە کۆرنث رق و بوغزی لە کۆرسایرا هەڵگرتبوو. کۆرنث لەو مەزەندەیەی خۆیدا بە هەڵەداچووبوو، بیرکلیس زیاد رۆیی بوو، لە دوا ئاگادارنەوەی پوتیدایاو لە راگرتنی بازرگانی لەگەڵ میگارا بەهەڵەچووبوو.

ئەم هەڵە سیاسیانە وایان لە سپارتە کرد کە بڕوا بەوە بکا شەڕ ئەوە دێنێ ئەو سەرکێشی و سەرچڵییەی بۆ بکرێ، هەرچی کاغانیشە پێی وابوو خورتبوونی هێزی

ئەثینا هۆکاری شەڕی یەکەمی پیلۆپۆنیزی بوو، بەڵام «ئاگر بڕی سی ساڵە» بڵێسەکەی دامرکاندەوە، بۆ ئەوەی شەڕی دووەمی پیلوپۆنیزی دەستپێبکا دەبوایە گرفتی ئەپیدامنیوس، کەیەکێ لەو پشکۆ کەمانەی هێشتا مابوونەوەو نەبووبوونە خۆڵەمێش، بگەشێنێتەوەو پاشان دەبوایە کورنشییەکان ئەو پشکۆیانە بگەشێننەوە. هەر زوو بەزوو میگارییەکان و بوتیدائیەکان و ئیجییەکان و حزبی سپارتای شەڕ هاتنە پاڵییانەوە، تا ئەو دەمە دەکرا ئەو پەنگرە بکوژێنرێتەوە ئەگەر ئەثینایییەکان لەو ساتەناسکەدا نەوتیان بەسەر ئاگرەکەدا نەکردبایە» بە واتایەکی دیکە شەڕ بەهۆی هێزی نادیارەوە نەقەوما، بەڵکە بەهۆی بڕیارگەلی نادروست و چەوتەوە لە هەلومەرجێکی سەختدا.

زەحمەتە راستوێژیی توسایدیدسی باوکی مێژوونووسان تاقی بکرێتەوە، بەڵام لە مێژوودا هیچ شتێک حەتمی نییە. رەفتاری مرۆڤایەتی دڵخوازانەیە، بەڵام لە چوارچێوەی سنووردا. کارل مارکس تێبینی ئەوەی کردووە کە پیاوان مێژوو دروست دەکەن، بەڵام لە هەلومەرجێکدا کە ئەوان هەڵیان نەبژاردوە. یۆنانییە کۆنەکان رێگەی چەوت و بەدیان هەڵبژارد، چونکە بەرفەرمانی هەلومەرجێک بوون کە توسایدیدس جوان وەسفی کردووە کە (کێشەی کابرای زیندانی) بەسەردا پەیڕەو دەکرێ. کێشەی تەنایی وای کرد شەڕ ببێتە ئیحتیمالێکی گەورە.

بەڵام ئەگەر شیمانەی شەڕ هەڵگیرسان زۆر زۆریش بێ ئەوە بەو مانایە نییە کە هەردەبێ شەڕ بقەومێ و هیچ چارو مەفەرێکی دیکە لە پێش نییە. شەڕی لە رادەبەدەری ۳۰ ساڵە کە ئەثینای ماڵوێران کرد، شەڕێکی حەتمی نەبوو، چونکە ئەسڵ بڕیاری مرۆڤایەتییە. رووداوەکان و تەرزو چەشنی کەسایەتییەکان جیاجیا دێنەوە ئەگەر لەو چوار چێوەیەدا جوولانەوە کە پەیکەرێکی گەورەتر نەخشەی بۆ دەکێشێ، وەک حاڵەتی نا ئاسوودەیی(ئاریشەی زیندانی).

دەتوانین چ دەرسێکی هاوچەرخ لەو مێژووە کۆنە هەڵبهێنجین؟ پێویستە ئاگامان لە شتە دووبارە بووەکان و گۆڕاوەکان هەبێ، هەندێ سەرو سیمای بنیادگەرانەی سیاسەتی دەولی پێشوەخت رووداوی وا دەدۆزێتەوە کە لە جیاتی بەو ئاراستەیە دابڕوا، بە سەمتێکی دیکە روودەدات. بۆیە پێویستە لە ئاریشەو کێشەکانی تەنایی و لە کێشەی کابرای زیندانی بگەین، لەلایەکی دیکەوە ئەم بارو هەڵکەوتانە، حەتمی بوونی شەڕ ساغ ناکەنەوە. هەندێ پلەی ئازادی هەن. جاری واهەیە بڕیاری مرۆڤایەتی رێگە لە روودانی کارەساتی ناخۆش دەگرێ. دەشێ هاریکاری لەپێوەندییەکانی

دەولیدا ببێ هەرچەندە بنیادی گشتیی ئانارشیزم بەلای هانەدانی هاریکاریدا دەشکێتەوە.

هەروا پێویستە ئاگامان لە روالەت و بچم و رووکارەکانی هاوتایی مێژوویی هەبێ، لە هەنگامەی شەڕی ساردا، خەلکان دەیانگوت ئەمریکای دەولەتی دیموکراتی دەریایی و سۆڤیەتی دەولەتی کۆیلایەتی وشکانی، بە ئەثینا و سپارتە دەچن و نوێنەرەوەی ململانێیەکی مێژوویی گەورەن، بەلام ئەم بەیەکچواندنە بێ تام و ساکارە ئەوە لەبیر دەباتەوە کە ئەثیناش دەولەتێک بوو کۆیلەی دەعەمەل دێناو نائارامی و تێکهەلڤژانی ناوخۆیی دەیهاڕی و هەمیشە دیموکراتەکان جلەوی حوکمیان لەوێ بەدەستەوە نەبووە، سەرباری جیاوازیی دیکەش لە شەڕی ساردا، سپارتە شەڕەکەی بردەوە.

دەرسێکی دیکە ئەوەیە کە دەبێ ئاگامان لە هەلبژاردن و دەسچنیی (انتقائیة) مێژوونووسان هەبێ، کەس ناتوانێ چیرۆک و حەکایەت بە ورد و درشتییەوە بگێڕێتەوە. ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت کە لەسەعاتی رابردوودا چ روویداوە، چ جای گێڕانەوەی سەرجەم رووداوەکانی ژیانی خۆت یان تەواوی رووداو و بەسەرهاتەکانی شەڕێک، رووداو و بەسەرهاتی لە ژمارنەهاتوو روویانداوەو گێڕانەوەی سەرجەم وردەکارییەکان هێندەی کات پێدەوێ بەقەد خودی قەومانی رووداوەکان، بۆیە هەمیشە مێژوونووسان کە مێژوو دەنووسنەوە رێگەی ئەبستراکت دەگرنەبەر، با مێژووی سەعاتێک لەمەوبەر یان رۆژی پێشووش بێ، پێویستە سادەی بکەینەوە. پێویستە هەندێ شت هەلبژێرین. ئاشکرایە، بەپێی ئەو بەهاو ئارەزوو و تیۆرییانەی لە هزرمانە، جا پێگەییوو بن یان نا، شتەکان هەلدەبژێرین.

هۆکارەکانی دلەڕاوکێ و بەهاکان لە سەردەمی خۆیاندا کار لە مێژوونووسان دەکەن. توسایدیدس بایەخی بەو بابەتە داوە کە ئایا خەلکی ئەثینا چەند دەرسیان لە شەڕەکان وەرگرتووەو لۆمەی خراپ لێکدانەوەکانی پیرکلیس و دیموکراتەکانی کردووە، ئا لێرەوە جەختی لەسەر ئەو بارەی کە ناومان لێنا «کێشەی کابرای زیندانی» کردۆتەوە، بەلام ئەو روالەتانە سەرجەمی هەقایەتەکە ورد ناکەنەوە.

توسایدیدس سەبارەت بە بڕیاری ئەثینا لەمەڕ هەلپەساردنی بازرگانی لەگەل میگارا زۆری نەنووسیوە یان سەبارەت ئەو باج وسەرانە زۆرو زەبەندەی ئەثینا لە ئەندامەکانی هەڤالبەندیی دیلیای ئەستاندن و ئەوانیش ناچار بوون بیدەن، مێژووی توسایدیدس لەسەر لەخشتەبردن یان داشکاندنێکی بەمەبەست نەبووە، بەلکە

نموونەیەکە بۆمان روون دەکاتەوە، کە چۆن لەهەر سەردەمێکا دەبێ دووبارە مێژوو بنووسرێتەوە، چونکە ئەو پرسیارانەی بۆ لێتۆژینەوە لەگۆڕێدان بەپێی کات دەگۆڕێن.

پێویستیی هەڵبژاردن (انتقاء) بەو مانایە نایەت کە هەموو شتێ ڕێژەییە یان مێژوو تەنیا قسەی قۆڕە. دەرئەنجامی لەم بابەتە راست نییە و نابێ. مێژوونووس و کۆمەڵناسی باش ئەوەیە کە چ لە توانایدا هەیە، پرسیاری تەناهی ئامێز مەترەح بکات و فاکتی ئیجابی سەبارەت بە بابەتی لێکۆڵینەوەکە بەدەستەوە بدات، بەڵام لەسەر هەردووکیان و لەسەر قوتابییەکانیان پێویستە ئاگایان لەو راستییە هەبێ کە ئەو شتەی هەڵیدەبژێرن، دەبێ بەناچاری بەشێکی هەقایەتەکە بێ، هەمیشە ئەو پرسیارانە بکەن کە نووسەر خستوونیەتەڕوو، ئەوە ساغ بکەنەوە کە نووسەر بە شێوەیەکی ئیجابی گرنگی بە فاکتەکان داوەو خۆتان لە سۆزو ئارەزوو بپارێزن، هەڵبژاردن بەشێکی گرنگە لە مێژوو و لە نووسینەوەی مێژوو. چارەسەری بەدحاڵی بوون لە مێژوو ئەوەیە کە زێتر شت بخوێنیەوە نەک بەشتێکی کەم دڵت دابکەوێ.

## پرسیاری رەوشت ئامێز و سیاسەتی دەولی

هەندێ لە واقیعییەکان لە تێڕوانینی خۆیان بۆ سروشتی کێشەی تەناهی پێیان وایە کە بایەخ و بەها ئەخلاقییەکان چ دەورێکیان لە ململانێیە دەولییەکاندا نییە، وەلێ بەهاو ئاکار- رەوشت- لە پێوەندییەکانی دەولیدا دەورێکیان هەیە با هەمان دەوریشیان لە سیاسەتی خۆجێیی نەبێ، لە زەمانی توسایدیدسەوە مرۆڤ سۆنگەو بیانووی ئەخلاقی هێناوەتەوە، کاتێ کورسایرا داوای هاوکاری لە ئەثینا کرد بە زمانی رەوشتەوە ئەو مەسەلەیەی لەگەڵدا باسکردووە «پێش هەموو شتێ، ئێوە یارمەتی خەڵکێکی شەڕانی نادەن، بەڵکە یارمەتی خەڵکانێک دەدەن کە کوشتەی دەستی شەڕخوازانن، دووەم سوپاس و رێزی ئێمە بەدەست دێنن کە هەرگیز بنی نایەت» لە جیاتی کورسایرا، بۆسنە دابنێ و لەجیاتی کورنث سربستان دابنێ دەبینن هەمان وشەی رابردوو بەسەر ئێستادا پێڕەو دەکرێ.

بروبیانووی ئەخلاقی، خەڵک دەبزوێنێ، بەو مانایە ئاکارو رەوشت لە واقیعدا هێزێکە، هەروا دەکرێ پاساوو بروبیانووی ئەخلاقی وەک پڕۆپاگەندە بۆ مەسەلەی دیکەی نزمتر بەکار ببردرێ، زۆربەی جاران بەهێزەکان، ئیعتیباراتی ئەخلاقی بەلاوە دەنێن، لەکاتی شەڕی پیلوپۆنیزیدا، ئەثینایییەکان بۆ کپ کردنەوەی شۆڕش چوونە دوورگەی میلوسەوە، قسەکەرێکی ئەثینی بە رۆڵەکانی ئەو دوورگەیەی گوت: یان

شەڕ دەکەن و دەمرن یان خۆ بەدەستەوە دەدەن. کاتێ میلوسەکان نارازی بوونی خۆیان دەربڕی و ئامادەبوون لە پێناو ئازادیی خۆیاندا شەڕ بکەن، ئەثینایییەکان وەڵامیان دانەوە: «بەهێزەکان هەر ئەو شتە دەکەن کە پێیان بکرێ و لاوازەکانیش ئەوە قەبووڵ دەکەن کە دەبێ قەبووڵی بکەن»، لە جەوهەردا ئەو قسەیەی ئەثینایییەکان کردوویانە واتە ڕەوشت، لە دنیای واقیعدا جێگای نابێتەوە، کاتێ عێراق، کوێت داگیر دەکا، یان ئەمریکا، دوورگەی گریناداو، ڕوس، شۆڕشی چیچان دادەمرکێنێتەوە تا ڕادەیەک هەموویان هەمان لۆجیک بەکار دەهێنن، بەڵام لە دنیای نوێدا، تا دێ دەرفەتی پەسندکردنی ئەو سۆنگانە بەو شێوەیەی کە ئەثینا میلۆسی پێ داگیرکرد وەک توسایدیدس بۆمانی دەگێڕێتەوە، کەمدەبێتەوە.

ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە ئێستاکە ڕەوشت شوێن و جێگەیەکی لە پێوەندییەکانی دەولیدا گرتووە؟ ئایا سیاسەتی دەولی بە پلەیەکی گەورەو کاریگەر گۆڕاوە کە دەوڵەتان گوێ بە ڕێورەسم وبەها ئەخلاقییەکان بدەن یان لەسەر هەمان ڕەوتی ڕابردوو دەڕۆن وەک هەمان کارو کردەی ئەثینا پێش دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ یان کارو کردەی عێراقییەکان یان سربەکان لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا؟

پاساو و بەڵگە ئەخلاقییەکان هەموویان وەک یەک نین، هەیانە پتر ئیلتزامی پێوە دەکرێ. ئێمە دەپرسین ئایا ئەوە شتێکی مەنتیقی و ماقووڵە، بۆ نموونە کاتێ کە (**فیلیس سلافلی**) گوتی: چەکی نوکلیاری شتێکی باشە چونکە خودا بە دنیای ئازادی بەخشیوە کە وای لێکردووین بپرسین بۆ خودا ئەو چەکەی دا بە یەکێتی سۆڤیەتی ستالین و چینی ماو؟ پاساوو بەڵگە ئەخلاقییەکان هەموویان وەک یەک نین.

مەحەکی بنچینەیی پاساوو بەڵگە ئەخلاقییکان بێ بەری بوونە لە هەواو کەیف و مەیلبازی، واتە ئەو دیدەی کە سەیری تێکڕای بەرژەوەندان بەیەک پێوانە دەکات، بەرژەوەندی تۆ بە قەد بەرژەوەندی من گرنگی پێ دەدرێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دوو نەریت و خووخدەی لێک جودا لە کولتوری سیاسیی ئەورووپیدا لە چوارچێوەی ئەو بێ بەری بوونە هەن کە لە بابەتی حوکمدان بەسەر پاساوە ئەخلاقییەکاندا دەدوێن، یەکێکیان لە(**ئەمانوئیل کانت**)ی فەیلەسوفی ئەڵەمانی سەدەی هەژدەم و دووەمیان لە دۆکترینی سوود وەرگرتن لە سەدەی نۆیەم (**جێرمی بنتهام**)ەوە هاتووە.

ئەگەر ویستت ئەو دوو دۆکترینە لە زەینی خۆتا لێکبدەیەوە وا هزر بکە کە تۆ لە گوندێکی ناوەڕاستی ئەمریکادا دەژی و هاکا تووشت بە تووشی ئەفسەرێکی سوپایی بوو کە سێ کەسی بە دیوارێکەوە بەستۆتەوەو دەیەوێ بەگوللە دەیانبێژێ و

هەلاهەلایان بکات. لێی دەپرسیت بۆچی ئەو سێ جووتیارە دەکوژیت؟ پێدەچێ خەڵکی بێ وەی و بەستەزمان بن، ئەفسەرەکە لەوەڵامدا دەڵێ: «لەو گوندە کابرایەک، شەوی چووی، پیاوێکی منی کووشت، دەزانم تەنیا کەسێکی ئەو گوندە گوناهبارە، بۆیە سێ کەسیان لێ ئیعدام دەکەم تا ببنە پەند»، تۆش دەڵێیت: «نابێ کارێکی وا بکەی! چونکە بەم شێوەیە مرۆڤێکی بێ تاوان دەکوژیت، ئەگەر گوللەیەک بتەقێت، بەلای کەمەوە دووانیان لەو سێ کابرایە، بێ تاوانن، رەنگە هەر سێکیان بێ تاوان بن، ناشێ کارێکی وابکەی». ئەفسەرەکە تفەنگێک لەیەکێ لە سەربازەکانی وەردەگرێ و بۆتێ تێهەڵدەداو دەڵێ: (باشە لە باتی من، تۆ یەکێکیان لێ گوللەباران بکەو، من دووانەکەی تر ئازاد دەکەم، ژیانی دووان رزگاردەکەی ئەگەر یەکێکیان لێ بکوژیت، دەمەوێ دەرسێکت فێربکەم کە لە شەڕی ئەهلیدا نابێ رای یەکێکی دیکە بەسەر رای تۆدا سەربکەوێ) لە تاقیکردنەوەیەکی ئاوەهادا چ دەکەی؟

دەتوانی فیلمەکانی رامبۆ ئاسا، سەربازەکان بە گوللە درووێنە بکەی، بەڵام بە فەرمانی ئەفسەرەکە سەربازێک رووی تفەنگت تێدەکا. کەواتە هیچ رێگەیەکت بۆ نەماوەتەوە یان ئەوەتا دەبێ پیاوێکی بێ وەی بکوژیت تا ژیانی دوو کەسان رزگاربکەی یان تفەنگەکە دابنێی و دەست لە مەسەلەکە هەڵبگریت، بەپێی هەڵوێستی (کانت) نابێ کارێک بکەی ئەگەر دروست نەبێ و واپێویست دەکا کە کاری بەدو شەڕخوازانە نەکەی، هەرچی هەڵوێستیی سوودگەراییە، دەڵێ دەبێ ئەو کارە بکەی ئەگەر بتەوێ ژیانی دوو کەسان لەو سێ کابرایە لە مردن رزگار بکەی. گریمان رێگەی (کانت)ت هەڵبژارد، چ دەکەی ئەگەر ژمارەکە زۆر لەوە زیاتر بوو؟ گریمان سەد کەسیان بە دیوار بەستابۆوە یان بڵێ شارێکی قەوغاو قەرەباڵغت لەبەردەمە، ئایا ئەوە رەتدەکەیەوە کە ژیانی ملیۆنێ مرۆڤ رزگار بکەی تا دەستپاک و ویژدان ئاسوودە دەربچیت؟ لە هەندێ حاڵەتدا ئەو ئەنجامانەی لەمەسەلەکە دەکەونەوە گرنگە و بە سێ رێگا حوکم بەسەر بەڵگەو پاساوە ئەخلاقییەکان دەدرێ. بەهۆی نیازو مەرام و پاڵنەرەکانەوە، بەهۆی رێ و شوێنە پەیڕەولێکراوەکانەوە، بەهۆی ئەو ئەنجامانەی دەکەونەوە یان شونەوارەکانیەوە، راستە ئەو سێ رەهەندە هەمیشە تێکناکەنەوە، کەچی پاساوی هەرە چاکی ئەخلاقی ئەوەیە کە هەموو ئەم توخمانە رەچاو بکرێ.

## ئەو سنوورو تخوبانەی، رەوشت کۆت دەکەن
## لە پەیوەندییەکانی دەولیدا

ئەخلاق لە سیاسەتی دەولیدا لەبەر چوار هۆکار دەورێکی کەمتری هەیە تا لە سیاسەتی خۆجێییدا:

١- کزی و لاوازیی یەکانگیریی دەولی سەبارەت بە بەهاکان، جیاوازی کولتوری و ئایینی لەمەڕ دادو بێدادی هەندێ لە کاروکردەکان.

٢- دەوڵەتان وەک تاکە کەسان نین. دەوڵەتان شتی (ئەبستراکت)ن. راستە سەرکردەی دەوڵەتان، تاکە کەسن، بەڵام حوکمدان بەسەر کاربەدەستانی دەوڵەت جیایە لە حکومدان بەسەر تاکە کەساندا، بۆ نموونە کاتێ دەتەوێ شەریکێک بۆ ژوورەکەت پەیدا بکەی، وەک زۆرینەی خەڵکان کەسێکت دەوێ شەڕوکوشتاری خۆش نەوێ و نەیەوێ تۆش بکوژرێی، بەڵام هەمان ئەو خەڵکانە رەنگە پالێوراوێک بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێرن و بڵێن: «بڕیارێ نادەم کە ببێتە مایەی کوژران و تیاچوونی یەکێکی دیکە جا زروف هەرچیەک بێ بابێ»، سەرۆک، ئەرکی پاراستنی بەرژەوەندی هاووڵاتیانی دەخرێتە ئەستۆوە، ئەم ئەرکە وا دەخوازێ لە هەندێ حاڵەتدا هێز بەکار بهێنێ، ئەو سەرۆکانەی بە ویژدان رەفتاریان کردووەو گەلانی خۆیان نەپاراستووە، راسپێردەی باش نەبوون، رەنگە قوربانیدان بە پێوانەی رەوشتی تاکە کەس، بالاترین هێمای ئەخلاقی بوونی کارێک بێ، بەڵام ئایا راستە سەرکردەکان قوربانی بەگەلانی خۆیان بدەن؟ لە شەڕی پیلوپۆنیزیدا ئەثینایییەکان بەسەرکردەکانی دوورگەی میلوسیان گوت ئەوا هەمووان دەکوژن ئەگەر سەرکردەکان مقاوەمەت بکەن ئیدی سەرکردەکانی میلوسی بەرەنگاربیان کردو گەلەکەیان سەربڕا، ئایا دەبوایە مل کەچ بکەن؟ لە ساڵی ١٩٦٢دا ئایا دەبوایە سەرۆک کیندی هەڕەشەی بەرپاکردنی شەڕی ئەتۆمی بکا تا سۆڤیەت ناچاربکا رۆکێتەکانی خۆی لە کوبا بکێشێتەوە، لە کاتێکدا ئەمریکا رۆکێتێکی هاوشێوەی لە تورکیا هەبوو؟ رەنگە وەڵام بە جیاوازی خەڵک، جیاوازی هەبێ، خاڵی گرنگ ئەوەیە تاکە کەسان کە وەک سەرکردەی دەوڵەتان رەفتار دەکەن تا رادەیەک بە رێگەیەکی دیکە حوکم بەسەر کارەکانیانەوە دەدرێ.

هۆی سێیەم لە پشت گچکەیی دەوری ئەخلاق لە سیاسەتی دەولیدا، ئاڵۆزیی هۆکارو ئەنجامە. زۆر زەحمەتە ئەو دەرەنجامانە بناسرێن کە لە کاروکردەوەی ناوخۆ دەکەونەوە لە کاتێکدا مەسەلەکە لە پێوەندییەکانی دەولی ئاڵۆزترە: ئەمەش لەسەرینی

کارلێکی نێوان دەوڵەتانەوەیە، ئەم ڕەهەندە زەحمەتیەکە زۆرتر دەکا سەبارەت بە پێشبینی کردنێکی وردی دەرەنجامەکان، نموونەی بەناوبانگی ئەمەش دانوستانەکانی ساڵی١٩٣٣ ی نێوان قوتابیانی زانکۆی ئۆکسفۆردە سەبارەت بە کوژرانی ٢٠ملیۆن مرۆڤ لە شەڕی جیهانیدا، قوتابیان دەنگیان بەو بڕیارەدا کە جارێکی دیکە لە پێناو مەلیک یان نیشتماندا شەڕ نەکەنەوە، ئەدۆڵف هیتلەریش گوێی لەو قسانەبوو، لەوە گەیشت کە دەوڵەتە دیموکراتەکان چروک و لاوازن و ئەو دەتوانێ فشاریان بخاتە سەر چونکە شەڕی لەگەڵدا ناکەن و لە دوا جاردا هیتلەر فشاری زۆری خستنەسەرو شەڕی دووەمی جیهانی قەوما، قوتابیان چاوەڕوانی ئەوە نەبوون، چونکە ئەوان دەنگیان دابوو کەلە پێناو مەلیک و نیشتماندا نەجەنگن، بەڵام زۆرانیان جەنگان و لێشیان کوژرا. نموونەیەکی دیکەی کەم شایانتر مشتومڕی (هامبورگر)ە، لەسەرەتای حەفتاکان لە وەختێکدا کە خەڵک دووچاری دڵەراوکێ ببوون سەبارەت بە کەمی خۆراک لە جیهاندا، ژمارەیەک قوتابی لە کۆلیژەکانی ئەمریکا گوتیان «کە دەچینە هۆلی نان خواردن گۆشت ناخۆین چونکە یەک لیبرە گۆشت بایی هەشت لیبرە گەنمە کە دەکرێ بدرێتە خەڵکی هەژارو نەدار، لەسەرانسەری دنیادا» زۆر لە قوتابیانیش هامبورگەریان نەخواردو هەستیان بە خۆشییەک دەکرد کە گوایا شتێکیان بەشت کردووە، بەڵام ئەمە بەقەدەر داوە موویەکیش یارمەتی خەڵکی برسی و نەداری هندستان و بەنگلادیشی نەدا، بۆچی؟ چونکە ئەو گەنمەی بەم شێوەیە کۆبان دەکردەوە نەدەگەیشتە برسییەکانی بەنگلادیش، چونکە برسییەکانی ئەوێ هێندە پارەیان نەبوو ئەو گەنمەی پێبکڕن، ئەو گەنمەی پاشەکەوت کرابوو لە پێویستی بازاڕی ئەمریکا زیادبوو، وای کرد نرخی گەنم لە بازار بشکێ و جوتیارەکانیش بەرهەم کەم بکەنەوە، دەبوایە ئەوانەی گەرەکیان بوو هاوکاری جوتیارانی بەنگلادیش بکەن پارەیان بۆ بنێرن تا بتوانن هەندێ لەو گەنمە بکڕن کەلە ئاکامی نەخواردنی هامبرگەرەوە پاشەکەوت کرابوو، ئا ئاوا قوتابیان لە هەڵمەتی نەخواردنی هامبرگەرەوە سەرنەکەوتن و لەوە بە ئاگانەبوون کە ئەو هەڵمەتە بە چەند کەناڵدا دەڕوا و چ لەم پرۆسەیە دەکەوێتەوە.

هەروا پاساوێکی دیکە هەیە دەڵێ دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی دەولی، چروک و لاوازن وکەلەبەرو ماوەی نێوان نیزام و عەدالەت لە بواری سیاسەتی دەولیدا فراوانترە تا لە بواری سیاسەتی نێو خۆییدا، هەم نیزام و هەم عەدالەت هەردووکیان لە سیاسەتی خۆجێیدا گرنگن بەڵام ڕژێم بە مەسەلەیەکی گرنگ دەزانین و لە ڕاستیدا خۆپیشاندەران هەندێ جار دەیانەوێ بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونی خۆیان لەمەڕ

عـەدالەت، پشـێـوی بنێنەوە، بەڵام ئەگـەر ئاژاوە بڵاوبێـتـەوە زۆر زەحـمـەتە عـەدالەت جێبەجێبکرێ، بەڵام کاتێ رژێم بەتەواوی تێکدەچێ ئەوا زۆر زەحمەتە شوێنەوارێکی عەدالەت بدۆزییەوە. سەرنجی بۆمب فڕێدان و کاروکردەی خەڵک فڕاندن و کوشت و بڕ لە هەشتـاکانی لوبنان بدە، بەڵام لە سیاسـەتی دەولیـدا نەبوونی قـانونێکی گشـتی و هەیئەتێکی ناوەندیی تەنفیزی و دام و دەزگای بەهێزی قەزایی، وا دەکەن پاراستنی رژێم زۆر بەزەحمەت بکەوێ کە بەدەوری خۆیەوە زەمینە بۆ عەدالەت خۆش دەکات.

## سێ تێڕوانین سەبارەت بە دەوری رەوشت:

بەلانی کەمەوە سێ تێڕوانینی جودا سەبارەت بە دەوری رەوشت لە پێوەندییەکانی دەولیدا هەن:

«گـومـانکەران» ، «رەوشـتـخوازانی دەوڵەت» ، «کـوزمۆپـۆلیـتـەکـان» . لایەنگرانی ریالیـزم لە شیکردنەوەی وەسـفیـانەی سیـاسـەتی جیـهـانیـدا، بەلای گـومـانکەران یان رەوشتخوازانی دەوڵەتەوە دادەشکێن لە مامەڵەیان لەگەڵ سیاسەتدا با پێوەندییەکیش لەنێـوان تێـڕوانینـی واقـیـعـیـانەی ئەوان و ئەم خـولیـاو ئارەزووەشـدا بوونی نەبێ، لەکاتێکدا ئەوانەی پێڕەوی شیکردنەوەی لیبراڵیانەی سیاسەت دەکەن، ئەو تێڕوانینە پەسند دەکەن کە ئەخلاقی بوونی دەوڵەت یان کۆزمۆپۆلیتی بوونی دەردەبڕێ.

گومانکەرەکان دەڵێن وتە ئەخلاقـییەکانی ئەرستۆتالیسی هیچ مـانایەکیان نیـیە لە پەیوەندییـەکـانی دەولیـدا لەبەر نەبوونی دامـودەزگای وا کـە نیـزام بەرقـەرار بـکا. ئەمە وێڕای هەست نەکـردن بە کـۆمـەڵگا، لەسـەرینی ئەمـەشـەوە هیـچ مـاف و ئەرکـێکی ئەخلاقی بوونی نابێ، گومانکەران پێیان وایە کە مانفـێستی کلاسیکی سەبارەت بە ئەخلاق لە سیاسەتی دەولیدا بریـتییە لە وەڵامی ئەثینایـیەکـان سەبارەت بەداخوازیی رەحمکردن بە خەڵـکی میـاوس کە دەڵێ «بەهێزەکـان ئەو شـتانە دەکەن کە دەسەڵاتیـان بەسەردا بشکێ یان دەتوانن بیکەن و، لاوازو پەرپووتەکانیش ئەو شتانە پەسند دەکەن کە دەبێ پەسندی بکەن» هێـزو توانا هەق دروست دەکـات، واتە ئەمەی دەبێ بگوترێ بەرای گومانکەرانەوە.

زۆر جاران فەیلەسوفان دەڵێن وشەی دەبێ «کە بەمانای ئیلتیزامی ئەخلاقی دێ» وشـەی دەکـرێ دەگـرێتـەخـۆی «ئیـمـکانیـەتی کـردنی شـتـێـک» . رەوشت، هەڵـبـژاردن دەخوازێ. مـوستـەحیل، ئیلتـیـزامی پێـوە ناکرێ. ئەگەر بە رووکەشی پێوەندییەکانی دەولی بنەمـــای «بکوژە یـان دەکـــوژرێی» یان بەســـەردا پەیڕەو بکرێ، واچاکـــە لە

حاڵەتێکی وادا هیچ ڕێگەیەک نەبێ، ئەمەش پاکانە بۆ هەڵوێستی گومانکارەکان دەکا.

بەڵام سیاسەتی دەولی لە ئاست مەسەلەی مانەوە گیر ناخوات، ئەگەر لە پەیوەندییەکانی دەولیدا (خیارات) هەبێ، خۆنواندن کە هیچ (خیار)ێک لەبەردەمدا نییە، ئەوە خۆی لەخۆیدا (خیار)ێکی پەنهان و داپۆشراوە، تەنیا بیرکردنەوە لە بەرژەوەندییەکانی نیشتمانی- نەتەوەیی تەسک، مەگەر دەلاندن و ئاودیوکردنی بەهاکان نییە بەبێ دانان بەوە. دپلوماتێکی فەرەنسی جارێکیان گوتی«هەرشتێ سوود و قازانجی فەرەنسای تێدابێ ئەوە ئەخلاقیانەیە» بەمەش هەولی دەدا خۆی لەو پرسە زەحمەتانە بدزێتەوە کە بۆ دەبێ تەنیا گرنگی بە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا بدرێ، کاربەدەستێکی دەوڵەت دەڵێ: «هیچ ڕێگا نییە». زۆرجاران ڕێگا هەیە با خۆشیش نەبێ ، ئەگەر پلەیەک نیزام لە پەیوەندییەکانی دەولیدا هەبێ - ئەگەر هەمیشە پێوەندییەکان (بکوژە یان دەکوژرێی) بن، ئەوا دەرفەت لەبەردەم (خیارات) دا هەیە.

وشەی (An archy) واتە بێ حکومەت، بەڵام ئەمە دەقاودەق مانای ئاژاوەو نەبوونی ڕژێم و نیزام بە گشتی نییە، کە ڕێگە لە بەردەم چەند (خیارات)ێکی گرنگ دەکاتەوە: هاوسەنگیی هێزەکان و قانونی دەولی و ڕێکخراوگەلی دەولی، هەریەک لەوانە ڕێگەیەکە بۆ حاڵی بوون لە هۆیەکانی بەس نەبوونی پاساو و بەڵگەی گومانکەران.

تۆماس هۆبز پێیوایە تاکە کەسان بۆ ئەوەی لە دەست (دەوڵەتی سروشت) ڕابکەن کە تیایدا ئیمکان هەیە یەکێک، یەکێکی دیکە بکوژێ، وازیان لە ئازادی خۆیان بۆ (حوت) یان حکومەت هێناوە بەو مەرجەی حکومەت پارێزگاریان لێ بکا، چونکە ژیان لە دەوڵەتی سروشتدا، بەدو دژوارو کورتخایەنە. ئیدی کەواتە لەبەرچی حکومەتان، حوتێکی باڵا دروست ناکەن؟ بۆ حکومەتێکی جیهانی نییە؟ هۆبز دەڵێ: هۆیەکەی ئەوەیە تەناهی لەسەر ئاستی دەولی، هێندەی تەناهی نییە لەسەر ئاستی تاکە کەس، حکومەت بایی ئەوە ڕێوشوێنی پارێزگاری لە دژی دڕندەیی ئەو تاکە کەسانە لەبەردەستدایە کە دەیانەوێ هەموو شتێ بۆ خۆیان بێ، هاوسەنگیی هێز لەنێوان دەوڵەتاندا، نیزامێک دەستەبەر دەکا، لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتان لە ترسی شەڕێکی (محتمل)، هەڵوێستێکی دژ دەگرنەبەر، دەوڵەتی سروشتی دەولی، ئەو کوێرەوەرییە ڕۆژانەیەی لە دەوڵەتی سروشتی تاکە کەسان دەکەوێتەوە، دروست

ناکات، بەواتایەکی دیکە هۆبز بڕوای وایە بوونی دەوڵەتان لە چوارچێوەی هاوسەنگیی هێزدا کەمێ لە حاڵەتی ئانارشیستی دەولی سووک دەکا بە رادەیەک کە کەم و زۆر جۆرە نیزامێک هەبێ.

لیبرالەکان ئاماژە بە بوونی قانون و عورفی دەولی دەکەن، هەتا ئەگەر ئەم جۆرە بنەماو رێسایانە سادەو هاکەزایش بن، بەرپرسیارێتی سەلماندنی شەرعیەتی پێشێلکردنی ئەو رێسایانە دەخەنە ئەستۆی ئەو کەسەی پێشێلکاریەکە دەکات، لێرەوە با لە تەنگژەی کەنداوی ساڵی ١٩٩١، بڕوانین. سەدام حوسێن بەناوی وەرگرتنەوەی پارێزگایەک کە لە دەورانی کۆڵۆنیالیزم لە عێراق زەوت کراوە، کوێتی بە عێراقەوە لکاند. ئەوەبوو زۆربەی هەرەزۆری دەوڵەتانی جیهان ئەم کارەیان بە پێشێلکردنی میساقی UN دانا، چونکە یاسای دەولی، بەزاندنی سنووری دەوڵەتان قەدەغە دەکات، ئەمەش زۆر بە روونی لەو (١٢) بڕیارەی ئەنجوومەنی ئاسایشی دەولی، دەردەکەوێت کە تێڕوانینی سەدام بۆ رەوشەکە لەگەڵ عورفی دەولی تێکناکاتەوەو یەکانگیر نابێ.

راستە یاساو داب و نەریت رێگەی لە سەدام نەگرت کوێت داگیر نەکا، بەڵام هاوپشت پەیداکردنی لێ بە زەحمەت یەخست. دیسان قانون و عورف رۆڵی لە دروستکردنی ئەم هاوپەیمانە هەبوو کە سەدامی لە کوێت وەدەرنا.

وێرای سەرەتایی بوونی دامەزراوەکانی دەولی، لەرێی ئاسانکاریی بەیەکەوە گەیاندنی دەوڵەتان و هاندانیان و جۆرە رەفتارێکی نەرم و نیانەوە، ئەندازەیەکی لە نیزام بەردەستە کردووە. لەم حاڵەتەی بەیەک گەیاندن و بەردەوامبووندا هەمیشە سیاسەتی دەولی لەسەر پرەنسیپی «بکوژە، ئەگەرنا دەکوژرێی» وەکو ئەوەی گومانکاران بانگەشەی بۆ دەکەن، دانامەزرێ.

وزەو توانای حوکمڕانان، لە هەموو کات و ساتێکدا هەر بۆ تەنایی و ئاسایش و مانەوە تەرخان نەکراوە، چونکە فەزایەکی فراوانی کارلێک و تێکەڵاو بوونی ئابوری، کۆمەڵایەتی و سەربازی هەیە کە هەم هاریکاری و (هەم ناکۆکییەکان)، هەرس دەکات. لەگەڵ ئەوەی دەربارەی واتای عەدالەت، جیاوازی کولتوری هەیە، کەچی مۆراڵەکان لە سیاسەتی دەولی رێگەی خۆیان دەکەنەوەو پرەنسیپەکان لەلایەن قانونی دەولییەوە بەشکۆوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ.

تەنانەت لە بارودۆخی شەڕیشدا کە دژواری و توندڕۆیی تێدایە، هەندێک جار یاساو مۆڕاڵ رۆڵی خۆیان دەگێڕن، «رێبازی شەڕی رەوا» کە لەسەدەی حەڤدەم لە

ڕۆژانی یەکەمی کەنیسەوە هاتۆتە گۆڕێ، دواتر بووە ڕێبازێکی دنیایی، کوشتنی خەڵکی بێ گوناه قەدەغەدەکات، پرەنسیپی قەدەغەکردنی کوشتنی خەڵکی بێ گوناه لەم گۆتەیە هەڵقوولاوە کە دەڵێ «کەس مەکوژە» ، بەڵام ئەگەر ئەم ڕاسپاردە بنەڕەتییە، ڕەوشت ئامێز بێ، ئەدی ئەسڵەن چۆن پاساو بۆ هەر کوشت و کوشتارێک دەهێنرێتەوە؟

بانگەشەکارانی ئاشتی ڕەها دەڵێن لەبەر هەر هۆیەک بێت نابێ ڕێگە بە مرۆڤ بدرێت، مرۆڤێکی دیکە بکوژێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەریتی شەڕی ڕەوا دەڵێ ئەگەر هاتوو ڕووبەڕووی یەکێک بوویتەوە کە دەیەویست بتکوژێت، تۆش بەرگری لەخۆت نەکەیت، ئەوا بەم ڕەفتارەت شەڕو خراپە باڵا دەست دەکەیت، ئەگەر یەکێک لە بەردەم مەترسی کوشتنی موهەقەقدا بوو، ئەوە بۆ سەلامەتی ڕەوشت، بۆ بەرگری لەخۆکردن بیکوژە، ئەوجا پێویستە جودایی لەنێوان ئەوانەی ڕەنگە بکوژرێن و ئەوانەی لەوانە نییە بکوژرێندا بکەین. ئەگەر سەربازێک بە چەکەوە پەلاماری یەکێکی دا، ئەوە ڕەنگە بەناوی بەرگری لەخۆکردنەوە بکوژرێ، بەڵام کاتێک سەربازەکە چەک فڕێ دەدات و دەستی خۆی هەڵدەبڕێ و دەڵێ «خۆم بەدەستەوە دەدەم» ئەو کەسە هەق نییە بکوژرێت. لە ڕاستیدا ئەم مەسەلەیە هەم لە یاسای دەولی و هەم لە یاسای سوپایی ئەمریکادا پیرۆزە.ئەگەر سەربازێکی ئەمریکایی تەقە لە سەربازێکی دوژمن بکات پاش خۆ بەدەستەوەدانی، ئەوە بە تۆمەتی ئەنجامدانی تاوانی کوشتن دەدرێتە دادگا، هەندێک ئەفسەری ئەمریکایی لە شەڕی ڤێتنام بە تۆمەتی پێشێلکردنی ئەم یاسایە بەندکران. سەرباری ئەوەی زۆرجار پێشێلکاری ڕوو دەدا، بەڵام عورف و ڕێسای دیاریکراو هەیە و لە ناخۆشترین بارودۆخی بێ جێی دەولیشدا کارکردن بەو ڕێسایانە هەردەمێنێ. لە ڕاستیدا بوونی هەستێکی بەرایی بەعەدالەت، لە یاسای دەولیدا، کە بە تەواوی پێوەی پابەندیش نابێت، بانگەشەی گومانکاران سەبارەت بە نەبوونی - خیارات- لە حاڵەتی شەڕدا بە درۆ دەخاتەوە.

ئیدی لەبەر هەندێ دەتوانین بە تەواوی گوماندارێتی ڕەتبکەینەوە چونکە لە سیاسەتی دەولیدا هەندێ دەرفەت بۆ مۆرالیزم کراوەتەوە، لێرەدا ئەخلاقیەت بە هەندێک (خیارات) پێوەست دەبێت و (خیارات)ی خودان واتاش بەپێی مەرجەکانی مانەوە شێوەی جیاجیای دەبێ، هەرچەندە هەڕەشە لە مانەوە بە هێز بێت بواری (خیار)ی ئەخلاقی دەچێتەوە یەک. کاتێک شەڕی پیلۆپۆنیزی دەستی پێکرد، ئەثینییەکان گوتیان «ئەو کەسەی بە هەق شایانی پێداهەڵدانە - ئەو خەڵکانەن کە

سروشتی مرۆڤایەتی وایان لێدەکات چێژ لە دەسەلات و سولتان وەربگرن پتر لە خەڵکانی دیکە بایەخ بە دادپەروەری بدەن ئەگەر لە جێگەی ئەوان بوون» ئەوەی مایەی نیگەرانییە، ئەوەیە کە ئەثینییەکان لە سالانی شەڕدا ئەم پەندەیان لەبیرکرد، لەبەر ئەوە دەبێ ئەوە لە بیرنەکەین کە ئەم حالەتانەی هیچ «خیار»ێکیان تێدا نامێنێتەوە، دەگمەنن، زۆر جار ئاسایشی نیشتمانی و نەتەوەیی و پلەکانی هەڕەشەکردن شاراوەن، گومانکاران هەوڵ دەدەن بە بیانووی دژبەرییەوە خۆیان لە تیزی «خیار»اتەکانی ئەخلاقی بدزنەوە.

زۆر لە نووسەرو سەرکردەکان لە شیکردنەوەی وەسفیدا ریالیستین، بەلام لە تێڕوانین بۆ بەهاکانی سیاسەتی دەولی گوماندارن، بەلام هەموو ریالیستان تەواو گومانکار نین، هەندێکیان لەگەڵ ئەو بیرو بۆچوونە کۆکن کە دەڵێ هەندێک ئیلتزاماتی ئەخلاقی هەیە بەلام لە پێشەوە نیزام دێت. ئاشتی لە باری رەوشتەوە لە پێش هەموو ئەوانەیە، هەتا ئەگەر ئاشتییەکی عادیلانەش نەبێت، ئاژاوەو هەراوزەنای شەڕ وا دەکات، دادپەروەری سەخت بێت بەتایبەتی لە سەدەی نیوکلیاریدا، واتە باشترین ئامرازی پاراستنی نیزام و دیسپلین، هێزە. نموونەی ئەمریکا وەریگرە کە زۆر خۆی بە بلاوکردنەوەی دیموکراتی یان مافەکانی مرۆڤ لەسەرانسەری جیهاندا خەریک کردووە، کە لەوانەیە ئەمە ئاژاوە بخولقێنێ و بە کردەنی زیاتر بە زەرەر بشکێتەوە تا سوود لە مەودای درێژدا.

بۆ کرۆکی بابەتەکە، ریالیستان بیانوویەکی بەجێ وتۆکمەیان هەیە. لە رووی دەولییەوە دیسپلین گرنگە، بەلام مەسەلەی پلەیە و نۆرەو نۆرەکاریش لە نێوان دادپەروەری و نیزامدا هەیە.

ئایا تا چەند پێش گەیشتن بە خالی نیگەرانی سەبارەت بە دادپەروەری، دیسپلین پێویستە؟ بۆ نموونە: پاش هەلمەتی داپلۆسێنەرانەی سۆڤیەت بۆ سەر کۆمارەکانی بالتیک لە سالی ١٩٩٠ کە لە ئەنجامدا هەندێک خەلک کوژران، هەندێک ئەمریکایی داوای برینی پێوەندییان لەگەڵ سۆڤیەتدا دەکرد. بە بۆچوونی ئەو خەلکانە دەبوایە ئەمریکا لە سیاسەتی دەرەوەیدا گوزارشت لە بەها دیموکراتییەکان و مافەکانی مرۆڤ بکا هەتا ئەگەر ناجێگیری و لە جێگە راوەستانی دانوستان، ئاستێک بۆ بەرهەمهێنانی چەکەکانیشی لێ بکەوتایەوە، بەلام هەندێکی دیکە پێیان وابوو، راستە نیگەرانی و بەپەرۆشبوون بۆ ئاشتی و مافەکانی مرۆڤ گرنگە، بەلام گرنگتر لەوە، چاودێریکردنی بەرهەمهێنانی چەکی نیوکلیاری و گفتوگۆکردنە سەبارەت بە

پەیماننامەی کەمکردنەوەی چەکەکان. لە کۆتاییدا حکومەتی ئەمریکا لەسەر گفتوگۆ بۆ دانانی ئاستێک بۆ بەرهەمهێنانی چەکەکان بەردەوام بوو، کەچی کۆمەکە ئابورییەکانی بە مەسەلەی ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤەوە گرێدا. مادامەکێ لەسەر ئاستی سیاسەتی دەولی مەسەلەکە وا خرایە روو کە مەسەلە، مەسەلەی نیزامی ڕەها نییە لە بەرامبەر یاخود دژ- بە دادپەروەری، بە قەد ئەوەی چۆنیەتی نۆرە کردنە بە (خیار)ەکان لە حاڵەتێکی دیاریکراودا. ریالیستەکان بۆچوونێکی ڕەوا - دروست - یان هەبوو، بەڵام زێدەڕۆییان تێدا دەکرد، وەختێکی دەیانگوت کە دەبێ نیزام لە پێش هەر دادپەروەرییەکەوە بێت، بەقسەی ڕەوشتخوازانی دەوڵەتەوە سیاسەتی دەولی بەچەند ڕێسایەکی دیاریکراوەوە، لە کۆمەڵگای دەوڵەتان خۆی بەپێوە گرتووە، هەتا ئەگەر ئەم بنەماو ڕێسایانەش هەمیشەو بە شێوەیەکی تەواویش پێڕەویان لێ نەکرێ.

سەروەریی نیشتمانی، گرنگترین شێوەی حوکمڕانییە. ئەم سەروەرییە ڕێگە نادات دەوڵەتێک دەست لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتێکی دیکە وەربدات و تخوب ببەزێنێ، هەر بۆ نموونە زانای کاروباری سیاسی (**مایکل والزر- ڤالستر**) پێی وایە سنووری نیشتمانی، گرنگیەکی ئەخلاقی هەیە، لەبەرئەوەی دەوڵەتان نوێنەرایەتی مافە هاوبەشەکانی تاکە گردبووەکان دەکەن لە پێناو ژیانێکی هاوبەشدا، بۆیە ڕێزگرتن لە سەروەریی دەوڵەت و یەکپارچەیی خاکەکەی بە ڕێزگرتنی تاکەکانییەوە گرێدراوە، بەڵام خەڵکی دیکە ڕایەکی تر دەخەنەڕوو کە بەسادەتر دەڵێ: ڕێزگرتنی سەروەری باشترین ڕێگەیە بۆ پاراستنی ڕژێم، پەرژینی قایم دراوسێی باشت دەداتێ.

ئەو بنەماو ڕێسایانەی هەڵسوکەوتی دەوڵەت دیاری دەکەن، چەندان جار دووبارەو سێ بارە پێشێل دەکرێن، هەر بۆ نموونە پێشی ٢٠ ساڵ، ڤێتنام پری دایە کەمبۆدیا، چین پری دایە ڤێتنام، تەنزانیا پری دایە ئۆگەندا، ئیسرائیل پری دایە لوبنان، یەکێتی سۆڤیەت پری دایە ئەفغانستان، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پری دایە گریناداو پەنەما، عێراق پەلاماری کوێتی دا.

واتە دەستتێوەردان لە کاروباری ناوخۆی خەڵک، گرفتێکی درێژخایەنە.

لە ساڵی ١٩٧٩دا ئەمریکا بە زمانێکی ئەخلاقیانەی توند سەرکۆنەی پەلاماری سۆڤیەتی بۆ سەر ئەفغانستان کرد، کەچی سۆڤیەتیش بەنۆرەی خۆی، ئاماژەی بە کۆماری دۆمینیکان کرد، کە لە ساڵی ١٩٦٥دا وڵاتە یەکگرتووەکان بە هێزێکی (٢٥) هەزار سەربازییەوە نەیهێشت حکومەتێکی شیوعی لەوێ دابمەزرێت، واتە دەستتێوەردانی ئەمریکا لە دۆمینیکان بۆ ئەوە بوو نەهێڵێ لە دەریای کاریبی

رژێمێکی ناحەز، دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت و دەستێوەردانی سۆڤێت لە ئەفغانستان بۆ ئەوە بوو نەهێڵێ لەسەر سنووری خۆی، حکومەتێکی ناحەز پێکبهێندرێت، ئەمانە هەردووکیان دوو حاڵەتی تەواو لێکچوون.

ئەوجا ئەگەر بخوازین جیاوازی نێوانیان بدۆزینەوە، پێویستە پتر لە مەبەست و نیازێک بڕوانین، هەمدیس ئەگەر ئامرازە بەکارهێنراوەکانیش وەربگرین، دەبینین لە دەستێوەردانەکەی ئەمریکا لە کۆماری دۆمینیکاندا خەڵکێکی زۆرکەم کوژران و ئەمریکا زۆر بە خێرایی لەوێ کشایەوە، بەڵام لە ئەفغانستاندا ژمارەیەکی زۆر خەڵک کوژران و هێزەکانی سۆڤیەتیش نزیکەی (١٠) ساڵێک لەو وڵاتە دایانکوتاو مانەوە، بەم دواییانە هەندێک ڕەخنەگر بەراورد لەنێوان غەزووی عێراق بۆ کوێت و غەزووی ئەمریکا بۆ پەنەما دەکەن.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٨٩دا وڵاتە یەکگرتووەکان، هێزەکانی خۆی بۆ ڕووخاندنی حوکمڕانیی دیکتاتۆری پەنەما، مانوێل نۆریگا، ڕەوانە کرد، عێراقیش لە ئابی ١٩٩٠ دا هێزەکانی بۆ ڕووخاندنی حوکمڕانیی میری کوێت ڕەوانەی کوێت کرد، بەمەش هەردووکیان وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق ڕێسای دەستێوەرنەدان لە کاروباری دەوڵەتانی دیکەیان شکاند، بەڵام دیسان دەگەڕێمەوەو دەڵێم جیاوازی لە ئامرازو دەرەنجامەکاندا هەیە.

ئەمریکا لە پەنەما حکومەتی یاسایی هەڵبژێردراوی گەڕاندەوە حوکم کە نۆریگا لای بردبوو، تا جارێکی دیکە حکومەتی شەرعی بەرپرسیارێتی بگرێتەوە ئەستۆ، بەڵام حکومەتی عێراق هەوڵیدا کوێت بە خاکی خۆیەوە بلکێنێت و لەم کردەوەیەشدا خوێنێکی زۆر ڕژا و دیسان ئەوە بەو مانایە نایێت کە کردەوەکەی پەنەما یەکاویەک ڕاست یاخود هەڵەبووبێ، بەڵام وەکو لە بەشی شەشەمدا دەبینین، زۆرجار گرفتەکان ئەوکاتانە دێنەگۆڕێ کە ڕێسایەکی سادە لە مەسەلەی سەروەری و دەستێوەرنەداندا پراکتیزە دەکەین.

کۆزمۆپۆلیتەکان لە سیاسەتی دەولیدا نەک هەر کۆمەڵەی دەوڵەتان، بەڵکە کۆمەڵگەی تاکەکانیش نابینن. دەڵێم کاتێ ئێمە لەمەڕ دادپەروەری قسە دەکەین، پێویستە لەمەڕ دادپەروەریی تاکیش قسەبکەین. واقیعییەکان جەخت لەسەر پرسەکانی شەڕو ئاشتی دەکەنەوە، ئەگەر جەختیان لەسەر مەسەلەی دادپەروەریی دابەشکردن واتە فلانە کەس چی پێ دەبڕێ و ئەوێ هێ چی پێ دەبڕێ بکردبایەوە، ئەوە تێبینی پشت بەیەکدی بەستنی ئابوری جیهانیان دەکرد.

دەستێوەردانی بەردەوامی ئابوری لە سنوورەوە، لەوانەیە ئاسەواری کوشندەی لێ بکەوێتەوە، چونکە مەسەلەکە، مەسەلەی ژیان و مردنە. بۆ نموونە ئەگەر تۆ جووتیارێکی فلیپینی بای و منداڵەکەت کە دەکرێ چارەسەر بکرێت بە هۆی نەخۆشیەوە بمرێ، لەبەر ئەوەی کوڕە فلیپینی دەرچووی کۆلێژی پزیشکی، هەنوکە لە وڵاتە یەکگرتووەکان کاردەکات بەهۆی ئەو مووچە بەرزەی لەوێ وەربدەگرێت.

کۆزمۆپۆلیتەکان پێیان وایە، سنووری نیشتمانی هیچ سەنگێکی مۆراڵی نییە، بەڵکە تەنها داکۆکی کردنە لە نایەکسانی، بۆیە ئەگەر بە زمانی دادپەروەریی دابەشکردنەوە قسە بکەین، پێویستە ئەو سنوورە بسڕێتەوە، بەڵام واقیعییەکان بەوە بەرپەرچیان دەدەنەوە کە رەنگە مەترسی شەنوکەوکردنی کۆزمۆپۆلیتەکان، هەراو زەنای گەورەی لێ بکەوێتەوەو هەوڵەکانی دابەشکردنەوە لە ریشەوە، دوور نییە پێکدادانی دژواری بەدوادابێت، چونکە خەڵکی بە ئاسانی دەستبەرداری سەروەت و سامانیان نابن، دیارە ئەو خستنەڕووە سنوور تەنگەی کۆزمۆپۆلیتەکانیش لەو بنەمایە سەرچاوەی گرتووە کە خەڵک بە زۆری بۆ (خێزان) و دۆست، دراوسێ و نەتەوە دڵسۆزن و رەنگە بۆ هەندێک تایفەی دینیش کە لە سنووری یەک وڵاتیش تێپەڕ دەکات بە پەرۆش بن، هەروەها بۆ پرەنسیپی مەینەتییە هاوبەشەکانی مرۆڤایەتی. خەڵکێکی زۆر بە تەماشاکردنی وێنەی منداڵانی ئەسیوبیا نیگەران دەبن کە برسێتی لێکی هەڵتەکاندوون، رەنگە ئەمەش لەبەر ئەوە بێت کە هەندێک هەستی بە کۆمەڵی مرۆڤ لەسەرووی ئینتیمای نیشتمانییەوەیە هەرچەندە ئەو هەستە بێ هێزیش بێت، ئێمە هەموومان مرۆڤین، کۆزمۆپۆلیتەکان وەبیرمان دێننەوە کە پێوەندییە دەولییەکان رەهەندێکی دابەشکردنیان هەیە، کە ئامادەبوونی ئەخلاق هەم لە کاتی ئاشتی و هەم لە کاتی شەڕدا بەهێز دەبێت، دەکرێ سیاسەت بۆ خزمەتکردنی پێدوایستییە بنەڕەتییەکان و مافەکانی مرۆڤایەتی دابڕێژرێت، بێ ئەوەی سیستەم تێکبدا.

لە دەروازەکانی ئەخلاقیەتی دەولیدا، واقیعییەکان خاڵێکی دروست دەخەنەڕوو، کە دەڵێن رژێم بۆ دادپەروەری زۆر پێویستە، بەڵام لە مەسەلەی ئاڵووێر و نۆرە پێکردنی نێوان رژێم و دادپەروەری خۆیان گێل دەکەن، کەچی رەوشتخوازانی دەوڵەت کە وێنەی کۆمەڵگای دەوڵەتانی خودان رێسای دژە دەستتێوەردان لە کاروباری ئیدیکە دەخەنەڕوو، وێنەی دامەزراوێتی رژێممان پێشکەش دەکەن، هەرچەندە وەڵامی تەواویشمان نادەنەوە کە لە هەندێک حاڵەتدا دەستێوەردان پاساودراوە.

لە کۆتاییشدا ئەو لۆجیکەی کۆزمۆپۆلیتەکان کە جەخت لەسەر کۆمەڵگای تاکەکان

دەکاتەوە، تێگەیشتنێکی قوڵ بۆ مەسەلەی بوونێتی هاوبەشی مرۆڤایەتی ڕەنگ پێ دەداتەوە، بەڵام لەم حاڵەتەشدا ڕێگا لە بەردەم ئاژاوەیەکی گەورەدا دەکاتەوە، دیارە زۆرینەی خەڵک هەڵوێستی دوو فاقی وەردەگرن و پێوەندییە تایبەتییەکانیش لە چاو خاڵی سەنتەر بێ بایەختر دەبن، ئەویش لەبەرئەوەی ئالۆوێرەکان و نۆرەکان لە نێوان ئەم دەروازانەدا دەبێت.

دیارە لە سیاسەتی دەولیدا بە هۆی جیاوازی نێوان سیاسەتی ناوخۆ و دەولییەوە، کارێکی سەختە کە ئەخلاقیەت پراکتیزە بکرێت، بەڵام بوونی پلورالیزم لە پرەنسیپدا، بە مانای ئەوە نایێت کە هیچ پرەنسیپێک بوونی نییە، ئەرێ تا چەند لە سیاسەتی دەولیدا ئەخلاقیەت جێبەجێ دەکەین؟

وەڵام ئەوەیە کە بە هێواشی جوولە بکەین چونکە کاتێک کۆت و ڕێساکانی ئەخلاقیەت بڕیار لەسەر هەموو شتێک دەدەن، لەوانەیە ڕێساکانی ئەخلاقیەت بەڵایەکی گەورە بنێنەوەو بوروژێنن، لەوانەیە ئەم (تووڕەییەش) مەترسی گەورەو گرانی بە دوادابێت. بەهەر حاڵ هیچ مەسەلەیەکی ئەخلاقی نییە سەبارەت بەوەی تەقەڵا دەدات، بەڵام بە ڕاستی ئێمە ناتوانین لە سیاسەتی دەولیدا مەسەلەی ئەخلاقیەت فەرامۆش بکەین و لەسەر هەموو کەسێک پێویستە ڕووداوەکان دیراسە بکات و بڕیاریش لەسەر کۆت و ئالۆوێرەکان بدا، هەرچۆنێکی لۆجیکی ململانێی دەولی بە نەگۆڕ مەزەندە بکرێت، بەڵام ئەمە توانای هەبوونی ڕێگاچارە ئەخلاقییەکان هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵکە مەسەلەکە، تێگەیشتنێکی بارودۆخە تایبەتییەکەی دەوێت کە وادەکات ئەم (خیار)اتانە زەحمەت بن.

ڕاستە کێشەکانی شەڕی پیلۆپۆنیزمی ئەخلاقی و تەناهی بێ وێنەن، کەچی لە دیرۆکدا زۆر لە کێشەکان دووبارە دەبنەوە، کاتێک بە دوای پەرەسەندنەکانی پێوەندی دەولی دادەچین، ناوە ناوە حاڵەتی گرژبوون لەنێوان واقیعیەت و لیبرالیزم، لەنێوان گومانداران و کۆزمۆپۆلیتان، لەنێوان ڕژێمی ئاناریشتی دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێوەدەوڵەتییەکاندا دەبینین و جارێکی دیکە لە «ئاریشەی کابرای زیندانی» رادەمێنین و لە بەرەنگاربوونەوەی مەسەلە تێکهەڵکشاوەکانی شەڕی ئەخلاقیدا بەردەوام دەبین، دەبینین کە چۆن کارەکتەرەکان لەسەر شانۆی جیهانی لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی کاتی خۆیاندا ناکۆک دەبن و چۆن ئامانج و ئامرازەکانیشیان جودا دەبێت.

لە دەستپێکی قسەکانمدا ئاماژەم بەوە دا کە ئەو گۆڕانکارییە دیاریکراوانەی، ئەمڕۆ سیاسەتی دەولیان پێ دەناسرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژانی تۆسایدیدس

جیاوازیان هەیە، ئەویّ دەمیّ چەکی نیوکلیاری، UN کۆمپانیا فرە رەگەزەکان و کارتێلاتیان نەبوو.

دیراسەکردنی ململانێی دەولی زانستێکی ورد نییەو مێژوو و تیۆری تێکەڵاوی یەکدی دەکات، ئێمە رێگەی خۆمان لە نێوان تیۆرەکان و ئەو نموونانەی دەیخەنەڕوو دەربڕین بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی چاکتر لە رابردوو ئێستامان بگەین و زیرەکانەش لە مەترسیەکانی پاشەڕۆژی پڕ تەمتوماندا دەربازبین. دەبێ هەوڵبدەین سەبارەت ئەوەی گۆڕاوەو ئەوانەشی وەکو خۆیان ماونەتەوە، خۆمان لە گێلی نەدەین.

# بنەماگەلی ململانێیە گەورەکان
# لە سەدەی بیستەمدا

## سیستەمەکانی دەولی و ئاستەکانی بە سۆنگە بوون

جەنگ، زۆربەی، بە زمانی سیستەمگەلی دەولی راقەدەکرێ. وەلێ سیستەمی دەولیی چییە؟ بە گوێرەی فەرهەنگ سیستەم چەند یەکەیەکی کۆکی بەیەکەوە گرێدراوە. زۆر لە سیستەمە سیاسییە خۆجێیەکان، لە سۆنگەی روونی دام ودەزگاکانی: وەک سەرۆکایەتی کۆماری، وەزارەتەکان، پەرلەمان و... هاوچەشنی ئەمانە، بە ئاسانی دەتوانرێ بناسرێنەوە. هەرچی سیستەمە سیاسییە دەولییەکانن، ئەوا لە روخسار کەمتر نێوەندی و روونن. سیستەمی دەولی، بە لەبەرچاونەبوونی نەتەوە یەککگرتووەکان، بوونەوەرێکی زیندووە.

سیستەمی سیاسیی دەولی، شێوەی پەیوەندییەکانە لە نێوان دەوڵەتاندا.

کەچی سەرباری ئەوەش بواری ئەوە مەدە بوونی چەند دام ودەزگایەک لە سیستەمی سیاسیی خۆجێیدا فریوت بدەن. چونکە چەند لایەنێکی نا بەرجەستەش دەگرنەخۆ، وەکو هەڵوێستەکانی رای گشتی و رۆڵی رۆژنامەگەری و هەندێک نەریتی نەنووسراو. خاڵی گرنگ سەبارەت هەر سیستەمێک ئەوەیە کە کۆشێوەی لە هەموو پارچەکانی گەورەترە. سیستەمەکان دەتوانن دەرئەنجامی وا بگورێنن کە لە حسێبی نوێنەرەکانیان دانەبێ. بۆ وێنە سیستەمی بازاڕ لە ئابوریدا، هەموو کۆمپانیایەک لە بازاڕی راستەقینەی خۆیدا هەوڵدەدا تا ئەوپەڕی قازانج بکا، وەلێ سیستەمی بازاڕ رکابەرایەتییەک دروست دەکا، کە قازانجەکان تا پلەی (نە قازانج - نە زیان) کەم دەکاتەوە. بەشێوەیەک کە بە سوودی بەکاربەر دەگەڕێتەوە. کابرای کارساز (رجل الاعمال) لە پێناو بەکاربەر (المستهلک) کارناکا، وەلێ شێوەی رەفتار لە بازاڕی نمونەییدا، ئەو ئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە. بە واتایەکی تر، سیستەم ئەنجامی وای لێ دەکەوێتەوە، کە دەشێ زۆر جیاوازبێ، لەوەی نوێنەرانی خودی سیستەمەکە گەرەکیان بووە.

هەر بەم چەشنە سیستەمی سیاسیی دەولی دەتوانێ بەرەو شوێنەواری وا بڕوا کە هەرگیز نوێنەرەکانی مەبەستیان نەبووە. بۆ وێنە: کاتێک بەلشەویکەکان لە ساڵی ۱۹۱۷دا، لە روسیا دەسەڵاتیان کەوتە دەست، سەرجەم سیستەمی دیپلۆماتیکی نێوان دەوڵەتانیان، بە گەمژەو کاری پڕوپووچی بۆرژوازی دانا، دەیانویست ئەو سیستەمە بە تەواوەتی هەڵبوەشێننەوە. دەبوایە شۆڕش، سنوورەکان رەتبکاتەوەو کرێکارانی جیهان یەکبخا. بەمەش هاوکاریی پرولیتاریای جیهانی، شوێنی سیستەمی مامەڵەکردنی نێودەوڵەتانی دەگرتەوە. بۆیە کاتێک **لیون تروتسکی** "Leon Trotsky"پۆستی وەزارەتی هەندەرانی روسیای گرتەدەست، گوتی ئەو نیازی وایە هەندێک مانیفێستی شۆڕشگێڕانە بۆ گەلان دەربکات، بەمەش «کەلێنەکە پڕ دەکاتەوە». وەلێ بەلشەویکەکان خۆیان وەک بەشێک لە سیستەمی مامەڵەکردنی نێوان دەوڵەتان بینییەوە! و ئەو سیستەمە کاری لە رەفتارەکانیان کرد. ئەوەبوو لە ساڵی ۱۹۲۲دا، دەوڵەتی کۆمۆنیستی نوێ، «پەیماننامەی ربالو»ی لەگەڵ ئەڵەمانیا ئیمزا کرد.

ئەو پەیماننامەیە، هاوپەیمانێتیی دزێوو نەفرەت لێکراوان بوو. واتە هاوپەیمانیی ئەو دوو وڵاتەی، کە بە ئەندامەتی لە جیهانی دیپلوماتیکی دوای جەنگی جیهانی یەکەم وەرنەگیرابوون.

لە ساڵی ۱۹۳۹دا، **جوزیف ستالین** لەگەڵ دوژمنی هەرە گەورەی ئایدیۆلۆژی خۆی، **ئەدولف هیتلر** چووە ناو هاوپەیمانێتییەکەوە، بەو مەبەستەی رووی **ئەدولف هیتلر** بەرەو رۆژئاوا وەرچەرخێنێ، ئائاوا خێرا رەفتاری سوڤیەتییەکان، وەک رەفتاری نوێنەرەکانی تری لێهات لە سیستەمی دەولی، سەرباری مانیڤستە سەرەتاییەکانیان و وێژینگەکانی تروتسکی.

دابەش بوونی هێز لەنێو دەوڵەتاندا، یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی پێشبینی هەندێک رووی رەفتاری دەوڵەتان بکەین. شوێن پێ هەڵگرتنی سیاسەتی جوگرافی، سوودی ئەوەی دەبێ کە شوێن و نزیکی، یان دووری، پێشبینی چۆنیەتی رەفتارو ئاکاری دەوڵەتان بکرێ. ئەگەر دەوڵەتێک هەستی کرد کە لەلایەن هاوسێیەکیەوە گەفی لێ دەکرێ، ئەوا ئەگەری ئەوە زۆرە کە ئەو دەوڵەتە بە لۆژیکی ئەو پەندە بجوڵێتەوە، کە دەڵێ: «دوژمنی دوژمنم، دۆستمە». ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە هەمیشە لە سیستەمە گێرەشێوێنەکاندا هەیە. بۆ نمونە نووسەری هیندی (**کاوتیلیا** Kautily) سێ سەدە بەر لە دایک بوونی **عیسا**، باسی ئەوە دەکا، کە چۆن ویلایەتەکانی نیمچە کیشوەری

هیند، بۆ پاراستنی خۆیان، حەزیان لە هاوپەیمانێتی بووە لەگەڵ ویلایەتە دوورەکاندا. چەند هاوپەیمانییەتییەکیان پێکهێناوە، کە بە تەختەی دامە دەچوون. **مەکیاڤیلیش** لە سەدەی پانزەهەمدا، هەمان رەفتاری لای دەوڵەتە شارەکانی ئیتاڵیا بینیوە. لە سەرەتای شەستەکاندا (مەبەست سەدەی بیستەمە)، کاتێک دەوڵەتەکانی رۆژئاوای ئەفریقا، لە مەداری فەرمانڕەوایی کۆلونیالی دەرچوون، ئاخاوتن لەسەر هاوکاری ئەفەریقی برەوی سەند: وەلێ دەوڵەتە نوێیەکان خێرا کەوتنە پێکهێنانی هاوپەیمانەتییەوە، کە بە تەختەی دامە دەچوو، دەق وەک ئەوەی (**کاوتیلیا**) لە هیندی کۆندا وەسفی کردووە.

غاناو غینیا و مالی لە رووی ئایدیۆلۆژییەوە توندڕەو بوون، لە کاتێکدا سەنیگال و ساحل ئەلعاج ونیجیریا، بەلای خۆپارێزی دا دەشکانەوە. وەلێ ئەو دەوڵەتانە کاریان بۆ ئەوەش دەکرد کە هاوسەنگی لەگەڵ هێزی هاوسێکانیان وەدیبێنن. نموونەیەکی تر، ئەو شێوەیەیە کە لە دوای جەنگی ڤێتنامی لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا گەشەی سەند. لەو پارچەیەدا، ئەگەر یەکێتی سۆڤیەت رەنگی رەش بوایە، ئەوا هی چین سوور بوو، ئەگەر ڤێتنام بە رەنگی رەش بوایە، ئەوا کەمبۆدیا بە رەنگی سوور دەبوو. بە واتای وشە تەختەی دامە بوو. گاڵتەجارییەکە لە ئەوەبوو: وڵاتە یەکگرتووەکان لە شەڕی ڤێتنام گلا، لە سۆنگەی تیۆری دۆمینەوە! چونکە کە دەوڵەتێک دەکەوتە دەستی کۆمۆنیستەکان، دەبووە هۆی کەوتنی دەوڵەتێکی دیکەو ئیدی پێدا برۆ. ئەگەر وڵاتەیەکگرتووەکان برێک دووربین تر بووایە، ئەوا دەیزانی بارەکە لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا، لە دامە نزیک ترە تا دۆمینە، ئەوکاتە لە دەرەوەی یارییەکە دەوەستا. شێوەی تەختەی داما، لەسەر ئەو پەندە وەستاوە، کە دەڵێ: «دوژمنی دوژمنم دۆستمە». نەریتێکی کۆنە لە جیۆپۆلەتیک Geopolitics و یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی پێشبینی بەسوود بکەین.

### ئاستەکانی شرۆڤەکردن:

سیستەمەکان تاکە ئامرازێک نین بۆ راڤەکردنی چ لە سیاسەتی دەولیدا روودەدا. **کینیث ولتز** Kenneth Waltz جیاوازی نێوان سێ ئاست لە هۆ بۆ هێنانەوە دەکات، کە پێیان دەڵێ: «وێنەکان». ئەوانیش: تاک و دەوڵەت و سیستەمی دەولین.

راڤەکردن لەسەرئاستی تاک Individual، بە تەنیا بەس نییە، چونکە سروشتی سیاسەتی دەولی لە جەوهەردا، بە شێوەیەکی نێواخن دەوڵەت دەگرێتەوە، نەک تاک.

بۆیە زۆر پێداگرتن لەسەر نیازەکانی تاک، دەشێ بەرچاو بگیرێ، لە دەرئەنجامە حسێب بۆ نەکراوەکانی کردەوەی تاک، کە سیستەمەکانی گەورەتر دەبنە سۆنگەی و تاک تیایدا دەجوولێتەوە. با باری ئەفریقا بە نموونە وەربگرین. ئەگەر سەرەتا پێمان لەسەر نیازپاکی سەرکردە ئەفریقاییەکان سەبارەت بە یەکێتی ئەفریقایی داگرت، واتە راستگۆیی نیازەکانیان، ئەوا بێگومان سەرنجی کاریگەریی بایەخی ستراکتۆری گێرەشێوێنی ئەو دەوڵەتە نوێیانەی ئەفریقا نادەین.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە تاکەکان هیچ سەنگێکیان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، سیاسەتمەدارە یۆنانییەکان جیاوازییەکیان لە شەڕی پیلوپونیزی داهێنا. «**سەدام حوسێن**»یش هۆکارێکی ترسناک بوو لە جەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١. هەروەها لە تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا لە ساڵی ١٩٦٢دا، **جۆن کینیدی و نیکیتا خروچۆف**، رووبەڕووی ئەگەری بەرپابوونی جەنگێکی ئەتۆمی بوونەوە، دوابڕیاریش لەدەست ئەواندا بوو. وەلێ ئەوان بۆچی خۆیان لەم بارە سەرسوڕهێنە بینییەوە؟! ئەمەیان دۆزێکە ناتوانرێ لەسەر ئاستی تاکەکان راڤە بکرێ! شتێکی شاراوە لە بونیاتی بارەکەدا هەبوو، کە ئەو ئەوانی گەیاندە ئەو خاڵە. هەروەها بۆ تێگەیشتن لە هۆیەکانی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم، پێویستە شتێک دەربارەی کەسایەتی هیتلەر، یاخود تەزاری ئەڵەمانیا بزانین. وەلێ ئەم لێکدانەوەیە بە تەنیا بەس نییە، دواتر دەبینین، کە لادانی راوێژکاری (سەرۆک وەزیران)ی ئەڵەمانی «**ئوتۆفون بسمارک**» لەلایەن تەزاری ئەڵەمانیاوە، لە ساڵی ١٨٩٠دا، خاڵێکی کاریگەربوو، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە هەڵایسانی جەنگی جیهانی یەکەم لە سەرەتادا بەهۆی کردەوەی تەزارەوە بوو.

پاشان فۆرمۆڵەیەکی تر هەیە بۆ وێنەی یەکەم، کە لە راڤەکردنی تایبەتمەندییەکانی تاکەکان ناکۆڵێتەوە، بەڵکو لە سیماو خەسڵەتە - تایبەتمەندە - هاوبەشەکانیان «لە سروشتی مرۆڤایەتی»یان دەکۆڵێتەوە، کە هەموو تاکەکان تیایدا بەشدارن. با رای کالڤنیەکان[1] لە سیاسەتی دەولی بە وێنە وەربگرین کە سۆنگەی جەنگ بۆ ئەو گیانی شەڕانگێزییە دەگەڕێنێتەوە کە لەهەر یەکێک لە ئێمەدا شاراوەتەوە. ئەو (واتە **کالڤن**. و) شەڕ وا لێک دەداتەوە کە ئەنجامی کەموکورییەکە لە سروشتی مرۆڤایەتیدا. وەلێ ئەو راڤەکردنە پێمان ناڵێ بۆچی هەندێک لە سەرکردە

---

١- کالڤنیزم، مەزهەبێکی پرۆتستانتیە کە قەشە (جۆن کالڤن)ی فەرەنسایی لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەهەمدا دایهێنا.

شەڕانگێزەکانی دەوڵەتان بەرەو پیلی جەنگ دەچن و هەندێک شەڕانگێزی تر وا ناکەن؟ یاخود بۆچی هەندێک لە سەرکردە خێرخوازەکان پەنا بۆ شەڕ دەبەن و هەندێکی تریان نا؟

راڤەکردن لەسەر ئاستی سروشتی مرۆڤایەتی، ناشێ وەڵامێکی تەواومان بداتەوە. لەبەرئەوەی تیۆری، زێدەڕۆیی لە پێشبینییەکان دەکات، بەو واتایەی کە توانای راڤەکردنی رێژەییە. بەنەبوونی هەستی لێک جوداکردنەوە، راڤەکردن بوونی نابێ. میلی کاتژمێری وەستاو رۆژانە دووجار بە تەواوی کاتمان پێدەڵێ، وەلێ لە زۆربەی کاتدا بە هەڵەمان دەبات!

هەروەها زێدەڕۆیی لە پێشبینی کردن ئەو هەوڵە لە باردەبا کە دەیەوێ سیاسەتی دەولی، لەسەر ئاستی دووەمی شرۆڤەکردن لێک بداتەوە. واتە لەسەر ئاستی سروشتی دەوڵەت، یاخود کۆمەڵگا. لێرەدا پرسیارێکی هاوچەشن هەیە، ئەگەر جۆرێکی دیاریکراوی کۆمەڵگا ببێتە سۆنگەی جەنگ، کەوابێ بۆچی هەندێک کۆمەڵگای خراپ، یاخود دەوڵەتی خراپ پەنا بۆ جەنگ نابەن؟

دەشێ وشەی «خراپ» بە هەر وشەیەکی تر بگۆڕی کە پێت خۆشە. وەکو «باش»و «بێ کەلک»، و «دیموکراتی»و «کۆمونیستی»و «سەرمایەداری» یاخود هەر ناوێکی تر. بۆ نموونە: دوای جەنگی جیهانی دووەم، ئەم بڕوایە بەجۆش و خرۆش بوو کە دەیگوت: سەرکەوتنی سیستەمگەلی دیموکراسیی، واتا کەمبوونەوەی هەلی بەرپابوونی جەنگ. وەلێ ئەوە روون بووەوە، کە دەشێ سیستەمە دیموکراسییەکانیش تێکەڵ بە جەنگ ببن و زۆر جارانیش وا دەکەن. وێنەی ئەمەش ئەثینایە، کە دیموکراسی بوو!

هەرچی تیۆرڤانە مارکسیستەکانن دەڵێن جەنگ تەنیا ئەو کاتە نامێنێ، کە هەموو دەوڵەتان ببنە کۆمۆنیست - تێبینی چین و یەکێتی سۆڤیەت یاخود ڤێتنام و کەمبودیا بکە - لەمەوە دەردەکەوێ کە سروشتی کۆمەڵگا، دیموکراسی بێ، یاخود کۆمۆنیست، بە شێوەیەکی تەواو دیارناکەوێ کە ئامادەیە بچێتە ناو جەنگەوە یاخود نا.

**لێرەدا بۆچوونێک هەیە «دواتر گفتوگۆی لەسەر دەکەین» کە دەڵێ:**

دەوڵەتە دیموکراتەکان جەنگ قبوڵ ناکەن. لە راستیدا ئاستەنگە حاڵەتێک بدۆزینەوە کە دیموکراتە لیبرالیستەکان، لە نێو خۆیاندا کەوتبنە شەڕ، وەلێ سیستەمە دیموکراتەکان، زۆرجاران شەڕی سیستەمە دکتاتۆرییەکانیان کردووە. سۆنگەی ئەم دۆزینەوەیەش کە بەندە بە (استقراء)ەوە، مەودای خۆڕاگرتنی لە دوارۆژدا روون نییە، وەلێ ئاماژە بۆ ئەگەری هەبوونی شتێک دەکا، کە شایەنی لێ گەڕان و

تاقیکردنەوەیە، لە ئاستی ئەم شرۆڤەکردنەی دووەمدا.

هەندێک لە راڤەکردنەکان، لە زۆربەی کاتدا، کارلێککردنی نێوان هەردوو ئاستی: دووەم «دەوڵەت، یاخود کۆمەڵگا»و سێیەم «سیستەمی دەولی» دەگرنەخۆ، وەلێ کام لەم دووانە گرنگ ترە: سیستەم، یاخود سروشتی دەوڵەتەکان لە سیستەمدا؟ شرۆڤەکردن لەسەرئاستی سیستەم، راڤەکردنێکە تەنیا لە سەرهەڵکێشانێکی دەرەوە کەوتۆتەوە. واتە تێبینی کردنی ئەو رێگایەی کە سیستەم، دەوڵەتانی پێوە بەند دەکا. هەرچی ئاستی دووەمە، ئەوا راڤەکردنێکە لە ناوەوە بۆ دەرەوە. دەرئەنجامی کۆتایی دیاردەخا، بەهۆی ئەو شتانەی کە لە ناوەوەی دەوڵەتاندا روودەدەن.

لەبەرئەوەی زۆربەی کات، پێویستیمان بە زانیاری دەبێت لەسەر هەردوو ئاستی شرۆڤەکردنەکە، کەواتە لە کوێوە دەست پێ بکەین؟

باشترین رێسا ئەوەیە کە لە سادەترین دەروازەوە دەست پێ بکەین، ئەگەر راڤەکردنە سادەکە مەبەستی هێنایەدی، ئەوا باشتر، بەم رێگایەش دەگوترێ، «رێسای دەست لێگرتنەوە – قاعدە الإقتصاد» یاخود «جفرەی ئوکام» کە بە ناوی فەیلەسوفی سەدەی چواردەهەم «**ویلیام ئوف ئوکام**»وە کراوە، کە گەیشتە ئەو بۆچوونەی دەڵێ: لێکدانەوەو راڤەکردنی باش، شتێکی درێژو نا پێویست دەسڕێتەوە. پرەنسیپی دەست لێگرتنەوە، واتە توانابوون لە روونکردنەوەی زۆر شت بە کەمترین وشە، ئەویش یەکێکە لەو پێودانگانەی «مەودای کیفایەتی تیۆرەکانی» پێ دەپێورێت.

هەروەها ئێمە بایەخ بە مەودای تیۆرەکە (کە چەند رەفتار دەگرێتەوە)و توانای لێکدانەوەی (چەند حاڵەتی هەڵپەسێردراو، یاخود لە دەرەوەی پێواندن – القیاس – راڤە دەکا) دەدەین. سەرباری ئەمەش پرەنسیپی دەست لێگرتنەوە خاڵی دەستپێکیش پێشنیار دەکا. چونکە لێکدانەوەی سیستەماتیک مەیلی سادەیی هەیە، خاڵی دەستپێکی باشمان دەداتێ. ئەگەر دڵنیابووین مەبەست بە تەواوی ناهێتەدی، ئەو کاتە دەتوانین لە یەکەکانی سیستەم رامێنین و ئاڵۆزی بخەینە سەر، تا دەگەینە کفایەتی داواکراو و ماقوڵ.

## سیستەمەکان: بونیادگەری و پرۆسەی پێکهێنان

تا چ رادەیەک، پێویستە لێکدانەوەی سیستماتیک، سادە، یاخود ئاڵۆزبێت؟ هەندێکی وەک (**کینیث ولتز** Waltz) بەتەنیا چاو دەبڕنە بونیاتەکەو داوای ئەوپەڕی دەست لێگرتنەوە دەکەن. وەلێ هەندێکی تری وەک (**ستانلی هوفمان** Stanley

Hoffmann) پێیان وایە پرەنسیپی ولتز، لێکدانەوەیەکی کەمی پێ دەکرێ. ئێمە لە ڕێگای هاوێرکردنی دوولایەنی سیستەم: بونیات و پرۆسەی بەیەکەوەنان، دەتوانین لەو ناکۆکییە بگەین. بونیاتی سیستەم ئاماژە بۆ دابەش بوونی دەسەلات دەکا. کەچی پرۆسەی بەیەکەوەنان ئاماژە بۆ جۆرو شێوەکانی کارلەیەکترکردنی نێوەخۆ دەکات، لە نێوان یەکەکانیدا، (واتە لە نێوان یەکەکانی سیستەمدا: و). ئاشکرایە کە بونیات و پرۆسەی بەیەکەوەنان، یەکیان کار لەوەی تر دەکات. دەکرێ لە رووی درێژی ماوەی تاقیکردنەوەیان لەیەکتر جیاواز بن. وەلێ بونیات زۆر بنەڕەتی ترەو لە پرۆسەی بەیەکەوەنان لەسەرەخۆ تر دەگۆڕێ.

ئابوریزانەکان، رووکارو ئادگارەکانی بونیاتی بازاڕ، لە رێگای رووگەی جێگیربوونی هێزی فرۆشتنەوە دەستنیشان دەکەن، مۆنۆپۆل کردن، هێزێکی فرۆتەنی گەورەی هەیە، مۆنۆپۆل کردنی دووان، دوو هێزی دەبێ. مۆنۆپۆلکردنی کەمینە واتە چەندین هێزی فرۆشتنی گەورە. لە بازاڕی نمونەییدا هێزی فرۆشتن بە پلەیەکی فراوان بڵاودەبێتەوە.

بابگەڕێینەوە سەر نموونەی پێشتری ئابوری: ئەو پیاوە کارسازانەی کە هەوڵدەدەن لە بازاڕێکی نموونەییدا، زۆرترین قازانج بکەن، دەبێ هەوڵەکانی خۆیان لە بەرژەوەندی بەکاربەر دەکاتەوە. وەلێ ئەنجامەکەی پشت بە بونیاتی سیستەمی بازاڕ دەبەستێ. جا ئەگەر بازاڕ بەدەست تاکێک، یاخود کەمینەیەک قۆرخ کرابێ، ئەوا ئەنجامەکەی جیاوازدێت. فرۆشیاری گەورە - مۆنۆپۆلیست - دەتوانێ زۆرتر قازانجی بکا، ئەگەر لە پێناو بەرزکردنەوەی نرخەکاندا. رادەی بەرهەمهێنانی دیاری کرد. بەم چەشنە، کاتێک بونیاتی سیستەم زانراو دەبێ، ئابوریزانەکان توانای پێشبینی کردنی بە بزاوتی بازاڕ و ئەوانەی قازانجیان پێ دەبرێ، زۆرتر دەبێ.

لێکۆڵەرەوە سیاسییەکانیش هەمان شت دەکەن. ئەوان سەیری بونیاتی سیستەمی دەولی دەکەن، بۆ ئەوەی پێشبینی رەفتاری دەوڵەتان و بەرەو جەنگ چوونیان بکەن، سیستەمە یەک جەمسەرییەکان بەرەو سوان و داخوران دەچن، لە کاتێکدا دەوڵەتان هەوڵی پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان دەدەن لە رێگەی دۆزینەوەی هاوسەنگیی هێز لەگەڵ دەوڵەتە دەستڕۆیشتوەکەدا، یاخود ئەستێرەی دەوڵەت بۆ رادەیەک بەرزبێتەوە، کە لە کۆتاییدا بتوانێ بەرەنگاری دەوڵەتە سەرکردەکە ببێتەوە.

هەرچی لە سیستەمی فرە جەمسەرییە، ئەوا دەوڵەتان بۆ هێنانەدی هاوسەنگی، پەنا بۆ هاوپەیمانێتی بەستن دەبەن، وەلێ هاوپەیمانێتییەکی نەرم و دەشێ جەنگیش

بەرپا ببێ! بەڵام بە شێوەیەکی ڕێژەیی چوارچێوەیەکی دیاریکراوی هەیە. کەچی لە سیستەمی دوو جەمسەریدا، ئەوا هاوپەیمانییەتییەکان موکمتر دەبن کە ئەمەش ئەگەری دایسانی ململانێیەکی فراوان زێتر دەکا، لەوانەیە بۆ جەنگی جیهانیش. هەندێک لە لێکۆڵەرەوەکان دەڵێن: «سیستەمگەلی دوو جەمسەرە» یا دەسوێ، یا دەتەقێتەوە. دەق ئەمە لە شەڕی پیلۆپونیزی ڕوویدا. کاتێک ئەثیناو سپارتا، چەپۆکی خۆیان لە هاوپەیمانێتییەکەیان توندکرد. ئەمە بۆ ماوەیەک بەر لە ساڵی «١٩١٤»شدا ڕاستە. کاتێک هاوسەنگیی هێزەکانی ئەوروپای فرەجەمسەر، بە شێوەیەکی پلە پلە، بووە سیستەمی هاوپەیمانێتیەکی دوو بلۆکی بەهێز، کە هیچ نەرمییەکیان نەبێت. وەلێ ئەو پێشبینیانەی کە لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان هەردوو سیستەمی دووجەمسەری و فرەجەمسەری بنیاتنراوە، دوای ساڵی ١٩٤٥، ڕووبەڕووی دەرچوونێکی گەورە لە پێوانەکردن دەبێتەوە. لە ماوەی جەنگی سارددا جیهان بوو بە دوو جەمسەر و بە دوو یاریزانی گەورەوە: وڵاتە یەکگرتووەکان و «هاوپەیمانەکانی»، یەکێتی سۆڤیەت و «هاوپەیمانەکانی». لەگەڵ ئەمەشدا جەنگێکی سەرتاپاگیری بەرفراوان نەکەوتەوە! هەندێک دەڵێن چەکی ئەتۆمی وایکرد، ڕوانگەی جەنگێکی جیهانی تۆقێنەر بێت.

بەم شێوەیە دەبینین بونیاتی سیستەمی دەولی ڕاڤەیەکمان پێ دەبەخشێ، وەلێ هەموو شتێکیش ڕاڤە ناکا. ئەگەر بونیاتی سیستەممان جێ هێلاو هاتینە سەر پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیستەم و شێوەی کارلەیەک کردنی نێوان دەوڵەتان، ئەوا زۆرتر فێردەبین. لەیەکتر هاوێرکردنی نێوان بونیات و پرۆسەی بەیەکەوەنان، لە هەموو کاتێکدا، دەتوانین بە خوازە (استعارة)، بە وێنەی یاری پۆکەری بێنینە بەرچاو، بونیاتی یاری پۆکەر لە دابەشکردنی هێزدایە، واتە ژمارەی ئەو فیشانە چەندە کە لای هەر یاریزانێکەو ژمارەی ئەو کارتە بەهێزانە چەندە، کە لە یارییەکەدا خراوەتە ڕوو. هەرچی میکانیزمی بەیەکەوەنانە، ئەوا چۆنیەتی بەڕێوەچوونی یارییەکەیە (واتە ئایا یاریزانەکە فریودەرێکی باشە؟ ئایا پابەندە بە ڕێساکانی یارییەکەوە؟ ئەگەر فێڵی کرد، ئاشکرا دەبێ؟»، و جۆرەها کارلەیەکترکردن لە نێوان یاریزانەکاندا.

**سێ شت بڕیار لەسەر پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیستەمی دەولی دەدا:**

- بونیاتی سیستەم (بونیاتی دووجەمسەرە، مەیلی بەرەو بەرهەمهێنانی پرۆسەی بەیەکەوەنانێکی کەم نەرمتر هەیە).
- تواناکان و ئەو هاندەرانەی دەوڵەت هەیەتی بۆ هاریکاریکردن، لە سۆنگەی پشت

بەستنی ئابوری و دام و دەزگاکانی دەولیەوە.
- ئەگەر دەوڵەت لە کەرەستەو ئامانجەکانیدا شۆڕشگێڕ یاخود میانڕەو بێت.

## ئامانجەکان و کەرەستەمیانڕەوو شۆڕشگێڕیەکان

ئامانجەکانی دەوڵەت چۆن کار لە پرۆسەی بەیەکەوەنانی دەولی دەکەن؟ سیستەمەکان زۆربەی کات هەندێک رێساو پراکتیکی بنەڕەتییان هەیە. دەوڵەتان دەشێن لە رووی ئەو پراکتیک و رێگایانە بوەستن، یاخود قبوڵیان بکەن.

سیستەمی دەولی، بە گوێرەی ئامانجەکانی دەوڵەتە گەورەکان، دەتوانێ بە پرۆسەیەکی سەقامگیری بەیەکەوەنان، یاخود شۆڕشگێڕانە تێ بپەڕێت. بۆ وێنە لە سەدەی هەژدەهەمدا، رێسای بنەڕەتی یارییەکە، شەرعیەتی دەوڵەتی پاشایەتی - (مافی خوداوەندی بۆ فەرمانڕەواکان) - و پاراستنی هاوسەنگیی هێزەکان بوو لە نێوان ئەو سیستەمە پاشایەتیانەدا. پەیماننامەی ئو تریخت، لە ساڵی ١٧١٣، بە راشکاوی ئاماژەی بۆ بایەخی هاوسەنگیی هێزەکان کردووە. زۆر شەڕی بچووک بەرپا بوون، وەلێ کەمێکیان سیستەمەکەیان شلەژاند.

لە مەسەلەی «**فریدریکی گەورە**»و ئەو رێگایەی مامەڵەی پێ لەگەڵ ئیمپراتۆری نەمسا (**ماریاتریزا** Moria Theresa) کرد، رامێنێ، ساڵی ١٧٤٠، **فریدریک** بڕیاری دا داوای «سیلیشیا» بکا، ئەو دۆمێنتە هی ئیمپراتۆریای نەمسا بوو، فردریک دۆزێکی شۆڕشگێڕانەی مەزنی نەبوو، بەڵکو تەنیا مەزنایەتی دەخواست. **فردریک** هەوڵی نەدا هانی رۆڵە ئەڵەمان زمانەکانی سیلیشیا بدا کە رێگا بۆ شۆڕشێکی گەلی دژی ماریا تریزا - فەرمانڕەوای رەهای نەمسا - خۆش بکا، بۆ ئەوەی ئەو فەرمانڕەوایە لەکارلابەرێ. بۆ زانیاری فریدریک خۆی بەرلین ئوتوکرات بوو لە و بە ئەڵەمانی دەئاخفت. ئەو «سیلیشیا»ی وەرگرت لەبەرئەوەی ئەو وای دەویست. کەچی سووربوو کە هیچ شتێکی وا نەکا، زیان بە نەمسا بگەیەنێ، یاخود پرەنسیپی شەرعیەتی سیستەمی پاشایەتی لەنگ بکا.

ئەمە لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسی بەراورد بکە کە دوای چل ساڵ لەمەوە هات وەختێکی لە فەڕەنسا رایەکی وا باو بوو کە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانەو پێویستە هەموو پاشاکان رەوانەی سەرپەتی قەنارە، یاخود ژێر تیغ (مقصلە) بکرێن و سەریان بپەڕێنرێ. **ناپلیۆن** پرەنسیپی «سەروەرێتی گەلی» لە هەموو لایەکی ئەوروپا بڵاوکردەوە. شەڕەکانی **ناپلیۆن** بەگژداچوونەوەیەکی گەورە بوون بۆ رێسای یارییەکەو

هاوسەنگیی هێزەکان لەیەک کاتدا. بەم چەشنە پرۆسەی میانڕەوی بەیەکەوەنان و تەرازووی سەقامگیری هێزەکان، کە هەر لە ناوەڕاستی سەدەوە سیمای سیستەم بوون، لەکۆتایی سەدەکەدا بۆ پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕی و هاوسەنگیەکی پەشۆکاوی هێز وەرچەرخان.

دەوڵەتان سەرباری گۆڕینی ئامانجەکانیان، دەتوانن ئامرازەکانیشیان بگۆڕن. هەروەها سروشتی ئەو ئامرازانەی کە دەوڵەتان بەکاریان دەهێنن، کار لە سروشتی پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیستەم دەکەن. ئامرازە جیاوازەکان، دەشێ کاریگەریان بەرەو سەقامگیربوون، یاخوود سەقامگیرنەبوون هەبێت. هەندێک لە ئامرازەکان بەهۆی تەکنۆلۆژیاوە دەگۆڕێن.

نموونەش بۆ ئەمە، پێشکەوتنی چەکی نوێ، وەکو مەترالیۆز، وایکرد جەنگی جیهانی یەکەم، رووبەڕووبوونەوەیەکی خوێناوی بێت. هەروەها دەشێ ئامرازەکان بەهۆی رێکخستنێکی نوێی کۆمەڵایەتییەوە بگۆڕێن. لە سەدەی هەژدەهەمدا، فریدریکی گەورە بە تەنیا ئامانجەکانی سنووردار نەبوون، بەڵکو ئامرازەکانیشی سنووردار بوون. سوپایەکی کرێگرتەی چەتەی هەبوو، کە (ولاء)یان بۆ ئەو سنووردار بوو، توانای وەرێخستن و - ئامادەگی-یان لاوازبوو. سوپاش لە سەدەی هەژدەهەم بە شێوەیەکی گشتی لە کەژی هاویندا دەجەنگان. واتە وەختێکی خۆراک بە ئاسانی دابین دەکرا، یاخود کاتێک خەزێنەی دەوڵەت پڕ زێڕ دەبوو، بۆ ئەوەی مووچەی سەربازەکانی پێ بدرێت، ئەو سەربازانەی کە بەزۆری لە چینە هەژارەکانی کۆمەڵگاوە دەهاتن، کاتێک خواردن و پارە تەواو دەبوو، ئەوانیش حکومەتیان بەجێ دەهێشت. شۆڕشی فەرەنسی، رێکخستنی کۆمەڵایەتی جەنگی بۆ ئەو شێوەیە گۆڕی کە فەرنسییەکان پێی دەڵێن Levee en Masse یاخود وەک ئێمە پێی دەڵێین - سەربازگرتن بە تیروپشک - هاونیشتمانانیان ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی بەرگری لە نیشتمانی دایک بکەن، لە رێگای ئەو هەستەوە، کە لەسەر هەمووان پێویستە **هاویەشی بکەن. جەنگ وەک رووبەڕووبوونەوەیەک لە نێوان چەند هەزار بەکرێگیراوێک نەمایەوە، کە دوور لە خەڵک بجەنگن. بەڵکو جەنگ وای لێهات هەمووان بگرێتەوە.** ئەو تێکەڵ بوونە بەرفراوانەو پاڵپشتە جەماوەرییە، پێکهاتەی پیادەی بەکرێگیراوی کۆنی بەتەواوی گۆڕی. هاوکات گۆڕانی ئەو ئامرازانەی دەوڵەتان هەیانبوو، یارمەتی گۆڕینی پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیستەمی دەولی دا لە سەدەی هەژدەهەمدا.

## بونیات و پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیستەمی دەولیی سەدەی نۆزدەهەم

ئەو لەیەکتر جوداکردنەوەیە، یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی لە بنەماگەلی ململانێیە گەورەکانی سەدەی بیستەم، کە بۆ سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێینەوە بگەین. ئەگەر پشتمان بە ڕێسای دەست لێگرتنەوە بەست پێویستە یەکەمجار بە دوای راڤەکردنێکی بونیادگەری سادە بگەڕێین، ئەگەر بمانەوێ ئەوانە راڤەبکەین کە بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم روویاندا.

لە سەرەتای ئەو سەدەیەدا ناپلیۆن هەولیدا، فەرەنسا دەست بەسەر ئەوروپادا بگرێ، وەلێ شکستی هێنا. خۆماندووکردن و تەقەلاکانی **ناپلیۆن** پالیان بە دەولەتەکانی ترەوە نا هاوپەیمانێتی یەکدی بکەن، کە لە کۆتاییدا بووە سۆنگەی بەزینی فەرەنسا. بەلام دوای بەزینی **ناپلیۆن**، کۆنگرەی ڤیەنا لە سالی ١٨١٥دا سیستەمی فرەجەمسەری کۆنی هێنایەکایەوە، بۆ ئەوەی پێنج دەولەتی گەورەی تر بەخۆوە بگرێ، کە هەریەکەیان لەنگەرو هاوسەنگیی ئەوانەی تر رابگرێ.

فەرەنسا بە درێژایی بیست سال، سیستەمی دەولی گۆڕی و هەڕەشەی گۆڕینی بونیاتەکەشی دەکرد. وەلێ لە کۆتاییدا شکستی هێنا و نەشیا بونیاتی سیستەمی کار لەیەکترکردنی دەولی ئەوروپی، بکاتە سیستەمێکی تاک جەمسەر.

بونیادگەرییەکان پێیان وایە گۆڕانی گەورە لەگەل یەکخستنی ئەلەمانیادا (سالی ١٨٧٠) هات. سیستەمی فرەجەمسەری سەدەی نۆزدەهەم وەکو خۆی مایەوە، وەلێ گۆڕانێکی گەورە بەسەر دابەشکردنی هێزەکان لە ناوەڕاستی ئەوروپا، روویدا. بەر لەو مێژووە ئەلەمانیا ٣٧ دەولەت بوو، گۆڕەپانێک بوو بۆ سیاسەتی دەولیی و ئەوانەی تر دەستیان تێوەردەدا. دوای سالی ١٨٧٠ ئەلەمانیا بووە دەولەتێکی یەکگرتوو.

جگە لەمەش ئەلەمانیا کە لە نێوەڕاستی ئەوروپایە، کاریگەرییەکی جیۆپۆلەتیکی گەورەی هەبوو. ئایا ئەلەمانیای یەکگرتوو، لە روانگەی بونیادگەرییەکانەوە، زۆر بەهێز بوو، یاخود زۆر لاواز بوو؟ ئەگەر هێندە بەهێز بوو، کە بتوانێ لەیەک کاتدا بەرگری لەخۆی بکا دژی روسیاو فەرەنسا، ئەوا لە هەمان کاتدا هێندەش بەهێز بوو، کە بتوانێ هەریەکە لە روسیا، یاخود فەرەنسا بەتەنیا بەزێنێ. ئەگەر ئەلەمانیا هێندە بەهێز نەبوایە کە بتوانێ فەرەنساو روسیا لەیەک کاتدا تێک بشکێنێ، ئەوا وا لاواز دیاردەبوو، کە لە روس و فەرەنسییەکان، هێزەکانیان بەیەکەوە کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی داگیری بکەن.

وەلێ ئەڵەمانیای یەکگرتووی نوێ لە دڵی ئەوروپا ، بەهۆی زۆرزانیی ئۆتو فون **پسمارک** راوێژکاری یەکەمەوە، بارێکی ناسەقامگیری نەگوراند ، هەر لە ساڵی ١٨٧٠ تاوەکو ١٨٩٠ ، **پسمارک** بە کارامەیی دیپلۆماتیکانەی خۆی توانی سەرکەوێ، لە هێورکردنەوەی، ئەو هەست بە هەڕەشەکردنەی لای هاوسێکانی پەیدا بووبوو. بەمەش سەرهەڵدانی کاریگەریی ئەو گۆڕانە بونیادگەرییە گەورانەی دواخست، کە بەسەر پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیستەم داهاتبوو. وەلێ جێگرەکانی **پسمارک** هەمان لێزانی دیپلۆماتیکانەی ئەویان نەبوو. هەر لە ساڵی ١٨٩٠ بەسەرەوە، سیستەمەکانی هاوپەیمانێتی ئەوروپایی پتەوتر بوون. ئەڵەمانیا بووە جەمسەری هاوپەیمانێتییەک و فەرەنساو روسیاش بوونە جەمسەری هاوپەیمانیەکی تر. هاوپەیمانێتی دووجەمسەرە تا دەهات پتەوتر دەبوو تا لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٩١٤ گەیشتە خاڵی تەقینەوە.

ئەو راڤەکردنە بونیادگەرییەی گۆڕانکارییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بڕێکی زۆر راستی تیایە. ئەگەرچی خۆی لە خۆیدا راڤەکردنێکی چڕوپڕیش نییە ، خۆی لە قەرەی رۆڵی کەسایەتی پسمارک نەداوەو، پێمان ناڵێ بۆچی دەوڵەتە ئەوروپییەکان هەر لە بنەڕەتەوە رێگای یەکخستنی ئەڵەمانیایان دا. بۆچی دەوڵەتەکانی هاوسێی ئەڵەمانیا هەوڵیان نەدا رێ لەم یەکخستنە بگرن؟ ئەگەر بەریتانی و فەرەنسییەکان سەرهەڵدانی ئەم جۆرە بەرەنگارییەیان دەبینی، بۆچی لە کاتێکی گونجاودا سەرهەڵدانەکەیان سەرکوت نەکرد؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە، پێویستە پەنا بەرینەبەر «لێ خوێندنەوە - استقراء» و سیاسەتە خۆجێییەکان. چونکە لێکدانەوەی بونیادگەرانە وەرامێکی چڕوپڕی پرسیارێکی بنەڕەتی ناداتەوە، کە بۆچی گەشەسەندنی هاوپەیمانێتی دووجەمسەرە، سی ساڵی خایاند؟ هەروەها توانای سەرهەڵدانی رۆڵی ترسناکی سەرکردایەتی لەبەرچاوناگرێ. ئەگەر تەزار (**قەیسەر**) لە ساڵی ١٨٩٠ پ**سمارکی** لانەدایە، یاخود ئەگەر جێگرەکانی پسمارک هاوپەیمانێتییە گران بەهاکەیان لەگەڵ روسیا بپاراستبوانە (کە لەگەڵ ئەڵەمانەکان هاوئایدولۆژیی پاشایەتی رەهابوو) لەوانەبوو گەشەسەندنی دووجەمسەرەیان وەلاوە نابوایە. ئەگەر جێگرەکانی **پسمارک** لە رووی خۆپڕچەک کردنی دەریاییەوە بەگژ بەریتانییەکان دانەچووبونایە، بەریتانییەکان لە ململانێیەکە دوور دەکەوتنەوە. راستە لێکدانەوەی بونیادگەرانە بۆ گۆڕانەکانی سەدەی نۆزدەهەم زۆر شت پێشکەش دەکا ، کەچی تا رادەیەکی زۆر

ڕێچکەیەکی قەدەر ئامێزە. ڕۆڵی خۆشەویستیی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە. وا لە جەنگی جیهانی یەکەم دەکا کەوا دیاربێ و هەر لە ساڵی ١٨٧٠ەوە دەبوایە بەرپابێ. ئەو خاڵی دەستپێک دیاری دەکا، وەلێ شرۆڤەکردنێکی تەواومان ناداتێ.

هەروەها پێویستیمان بەوە دەبێ حساب بۆ گۆڕانەکان لە پرۆسەی بەیەکەوەنان، یاخود شێوەی پەیوەندییەکان لە سیستەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بکەین. لێرەدا گۆڕانێک لە ئامانجەکان و ئامرازەکانی دەوڵەتاندا دەبینین، کە هانی دەستپێشخەرییان دا بۆ هاریکاریکردن. بە درێژایی سەدەی نۆدەهەم، ئایدیۆلۆژیای دیموکراسی و ناسیۆنالیزم بەهێزبوون، کاریگەرییەکی گەورەیان بەسەر ئامانجەکانی دەوڵەتانەوە هەبوو. دەوڵەت و فەرمانڕەوا وەک دوو ڕووی یەک ڕاستەقینە نەمانەوە. وتەی بەناوبانگەکەی **لویسی چواردە**، کە دەڵێ: «من دەوڵەتم» چیتر کاری پێ نەکرا. لە سەدەی هەژدەهەمدا، **فریدریک** چۆنی پێ خۆش بوایە، پروسیا ئاوا دەجولایەوە. وەزیرو پەرلەمانتاری هەڵبژێردراو نەبوون جڵەوی فریدریک بگرنەوە. بانگەشەکردن بۆ دیموکراسیەت، کاریگەری نێوخۆیی فراوانتری خستەسەر ئەو ئاڵۆزییەی لە سیاسەتی دەولیدا هەبوو. ناپلیۆن لە ڕکی ئەوروپا، ئاڵای بیروباوەڕی نوێی هەڵگرت و تۆوی نەتەوایەتی لە وڵاتانی تر چاند.

دەشێ شەڕەکانی **ناپلیۆن**، لە گۆڕینی بونیاتی سیاسیی ئەوروپا شکستیان هێنابێ، وەلێ بە دڵنیاییەوە گۆڕانێکی قوڵیان لە پرۆسەی بەیەکەوەنانەوە هێنایە ئاراوە. ڕاستە میری نەمساوی «**مەتەرنیخ**»و هاوکوفەکانی لە گێڕانەوەی سیستەمی کۆن، لە کۆنگرەی ڤیەنای ساڵی ١٨١٥، سەرکەوتنیان وەدەست هێنا، وەلێ لە پشت ئارامیەکەوە، هێزی نەتەوەیی و دیموکراتی گرکان ئامێز هەبوون، کە لە شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨دا تەقیەوە.

ساڵ هاتن و چوون، بەگژداچوونەوەی نەتەوەیی، بۆ شەرعیەتی فەرمانڕەوایی پاشایەتی، بووە سۆنگەی دامەزرانی هاوپەیمانێتییەکی ڕۆژئاوایی، کە دەرچوونێک بوو لە هاوسەنگیی هێزەکان. بۆ نموونە ساڵی ١٨٦٦، کاتێک پروسیەکان پەلاماری نەمسایان دا، فەرەنسا خۆی لە پشتگیریی نەمسا گرخاند. ئەمەش لە ڕوانگەی بونیادگەرەکانەوە، هەڵەیەکی درێژخایەن بوو، چونکە فەرەنساییەکان دژی ئەوەبوون نەمساوییەکان گیانی نەتەوەیی لەو پارچەیە بچەوسێننەوە کە لە ئیتالیایان داگیرکرد بوو. پسمارک بۆ یەکخستنی ئەڵەمانیا لەژێر سەرکردایەتی پروسیا، یاری لەسەر ژێی نەتەوایەتی لای دەوڵەتۆکە ئەڵەمانییەکان دەکرد. وەلێ گیانی نەتەوایەتی لە دواڕۆژدا

بووە کۆسپێک لە ڕێگای پێشووەچوون. کاتێک پسمارک لە شەڕی حەفتاکاندا دەستی بەسەر ئەلزاس و لۆرینی فەرەنسا داگرت، رقی نەتەوایەتیی فەرەنسایییەکانی هەستاند کە ئەمە وایکرد فەرەنساو ئەڵەمانیا لە دوارۆژدا نەبنە هاوپەیمانیی یەکتر. ئەو ئایدیۆلۆژیا نوێیانە ئامانجی دەوڵەتانیان گۆڕی و وایانکرد بەیەکەوەنانی سیاسەتی دەولی، لە جاران کەمتر راست بێ.

بە هەمان چەشن ئامرازەکانیش گۆڕان. بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای سەربازی نوێ، چەکی زەبەلاحی جەنگی هێنایە بەرهەم. بەگەڕکەوتنی شەمەندەفەرو، توانای تەییارکردن و سازدانی ژمارەیەکی زۆری سەرباز، بۆ یەکەم جار، لە نێوەڕاستی ئەم سەدەیەدا، رۆڵێکی سەرەکی لەجەنگدا بینی. بەر لە کۆتایی هاتنی ئەم سەدەیە، مەترالیۆزو سەنگەر هاتنە ئاراوە. ئەمە وایکرد بیرۆکەی جەنگی توندوتیژی کورت و سنووردار، کە **پسمارک** لە شەستەکاندا بەسەرکەوتوویی پشتی پێ دەبەست، ببێتە جێگەی پێکەنین. بونیات و پرۆسەی بەیەکەوەنان، یارمەتی لێکدانەوەی رەگەکانی جەنگی جیهانی یەکەم و ئەو گۆڕانانەی کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەسەر سیستەمی دەولی ئەوروپایی داهاتن، دەدەن. ئێمە لە بونیاتەوە دەستمان پێکرد، چونکە ئاسانتر بوو وەلێ ئاوڕدانەوە لە پرۆسەی بەیەکەوەنان، ئەوەمان بیردێنێتەوە، کە پێویستە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانیش پشت گوێ نەخەین.

## پاشماوەی نوێ

لە سەروبەندی دانوستان و کۆبوونەوەکانی ساڵی ١٩٩٠دا، بۆ یەکخستنی ئەڵەمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا، ئەو ئاریشەیە سەری هەڵدایەوە کە هەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، ئاریشەی ئەڵەمانی پێ دەگوترا. سەرەتا (ئەدوارد شیفرنادزە) وەزیری هەندەرانی ئەودەمەی سۆڤیەت گوتی:

سەرلەنوێ یەکخستنەوەی ئەڵەمانیا، تەرازووی هێزەکانی ئەوروپایی زۆر لەنگ دەکات. جارێکی تر کاربەدەستان کەوتنە پرسیارکردن: چەند دەوڵەت بە ئەڵەمانی داخیوێ و ئایا لەگەڵ سەقامگیربوونی ئەوروپایی هەماهەنگە؟ بە تێپەڕبوونی کات وەرامەکان لەیەکتر جیاوازبوون. لە کۆنگرەی ڤیەننای ساڵی ١٨١٥، بینیمان ٣٧ دەوڵەت، یاخود دەوڵەتۆکە بە ئەڵەمانی دەئاخافتن. **پسمارک** هەستی کرد کە پێویستە دوو دەوڵەت هەبێت نەک تاقە دەوڵەتێک. ئەو نەیدەویست نەمساوییەکان بخزێنێتە نێو ئیمپراتۆریا ئەڵەمانییە نوێیەکەیەوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا فشار بۆ سەر

دەسەڵاتی پروسیا بهێنن بۆ کۆنترۆلکردنی دەوڵەتە نوێیەکە. **هیتلەر** وەڵامێکی تری دایەوە: یەک دەوڵەت، کە دەبێتە دڵی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی. بەمەش مرۆڤایەتی راکێشایە نێو جەنگێکی دووەمی جیهانییەوە. لە ساڵی ١٩٤٥دا هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان بڕیاریان دا کە سێ دەوڵەت هەبێت: ئەڵەمانیای رۆژهەڵات و ئەڵەمانیای رۆژئاوا و نەمسا.

ئەمە هەمیشە نوکتەی ئەو پیاوە فەرەنسییەمان دێنێتەوە یاد، لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا: کاتێک لێیان پرسی حەزدەکەی چەند ئەڵەمانیا هەبێت، وەڵامی دایەوە: «من ئەڵەمانیام زۆر خۆش دەوێ، چەندە زۆرتربێ، باشترە».

دارمانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لە ئەورووپای رۆژهەڵاتدا کە، کۆتایی بە بونیاتی دووجەمسەرەی سیاسەتی دوای جەنگ هێنا توانای سەرلەنوێ یەکخستنەوەی ئەڵەمانیای رەخساند. وەلێ سەرلەنوێ یەکخستنەوە بووە هۆی دڵەڕاوکێیەکی نوێ. سەرچاوەکەشی، بوونی هەشتا ملیۆن کەسە، کە بەهێزترین بونیاتی ئابوورییان لە دڵی ئەورووپادا هەیە.

ئایا ئەڵەمانەکان بۆ رۆڵێکی نوێ تێدەکۆشن؟ ئایا هەمدیس پلان دادەنێنەوە، روو لە رۆژهەڵات دەکەن پاشان رووەو رۆژئاوا؟ ئایا رووەو ئەو وڵاتانە دەکشێن کە دەکەونە رۆژهەڵاتیانەوە کە هەمیشە نفوزی ئەڵەمانیایان تیادا بەهێزبووە؟ «**جۆن میرشمیر** John Mearsheimer» مامۆستای زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی شیکاگۆ، دەڵێ: وەڵامی ئەمە ئەوەیە «با بگەڕێینەوە بۆ دواڕۆژ». ئەو کابرایە پشتی بە شرۆڤەکردنی ریالیستانەی بونیادگەری بەستووە، تا گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامە رەشبینانەی کە دەڵێ دواڕۆژ وەکو رابردوو دەبێت، چونکە بونیاتی بارەکە، لە بونیاتی باری رابردوو دەچێ. وەلێ شتەکان بەسێ شێوە گۆڕاون. لەسەر ئاستی بونیادگەری، دەبینین وڵاتە یەکگرتووەکان تێکەڵ بە کاروباری ئەورووپایی بووە. پاشان قەبارەی وڵاتە یەکگرتووەکان نزیکەی چوار هێندەی قەبارەی ئەڵەمانیای یەکگرتووە.

بونیادگەرەکان لەوە دەترسن چیدیکە ئەمریکاییەکان تێکەڵی ئەورووپا نەبن و دەشێ دوای بەکۆتا هاتنی جەنگی سارد لاتەریک بنەوەو بچنەوە وڵاتی خۆیان. وەلێ لێرەدا گۆڕانکاری تریش هەیە. پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیاسەتی دەولی لە ئەورووپا بەشێوەیەکی زۆر گەورە گۆڕاوە. دامەزراندن و گەشەسەندنی دام ودەزگای نوێ: یەکێتی ئەورووپایی، ئەڵەمانیاو دەوڵەتانی تری ئەورووپا، بە رێگایەک یەکدەخا کە پێشتر وێنەی نەبووە.

گۆڕانکاری سێیەم لەسەر ئاستی سیستەمەکە نییە، بەڵکو لەسەر ئاستی دەوڵەتە. سیاسەتی نێوخۆی ئەڵەمانیا، نوێنەرەوەی زیاتر لە چل ساڵی دیموکراسییەتە. ئەو ئەڵەمانییەی بووە سۆنگەی سەر ئێشە لە نیوەڕاستی ئەوروپا، لە ساڵانی ١٨٧٠و ١٩١٤و ١٩٣٩، ئەڵەمانیایەکی دیموکراسی نەبوو.

دەبێ کام لەم راڤەکردنانە، بونیادگەری یاخود بەیەکەوەنان، یاخود نێوخۆیی، باشترین پێشبینیمان بۆ دوارۆژی ئەوروپا پێشکەش بکا؟

## سیاسەتی نێوخۆیی و سیاسەتی دەرەکی

ئەو ریالیزمە کە تا رادەیەکی زۆر پشت ئەستوورە بە ئاستی سیستەمێکی شرۆڤەکردن، دەڵێ: بەهۆی سیستەمی دەولییەوە، دەوڵەتان بەهەمان شێوە رەفتار دەکەن. شوێنی دەوڵەتێک لەو سیستەمەدا، وای لێدەکا بەهەمان شێوە هەڵسوکەوت بکات، کەوابێ شوێنە هاوچەشنەکان دەبنە سۆنگەی هەڵسوکەوتی هاوچەشن. دەوڵەتی گەورە بە جۆرێک هەڵسوکەوت دەکا، هی بچوکیش بەجۆرێکی تر. وەلێ ئەمە بەس نییە، مادامەکی زۆربەی کات ئاستی شرۆڤەکردنی سیستەمی دەست لێگرتنەوە، مەبەستەکان ناهێنێتەدی. ئەوکاتە پێویستە لەسەرمان ئەوە ببینین کە لە ناوەوەی سیستەمەکەدا چ روودەدا. دووکەس لەسەر بایەخی سیاسەتی نێوخۆیی ناتەبانین، شەڕی پیلوپونیزی لە ململانێیەکی نێوخۆیی نێوان ئۆلیگارکییەکان و دیموکراسییەکان لە شاری ئیپیدامنوس دەستی پێکرد.

دیموکراسیەتی خنکێنراو لە ئەڵەمانیاو سیاسەتی نێوخۆیی ئیمپراتۆریای نەمساوی - مەجەری، رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەمدا. هەروەها بۆ ئەوەی تێ بگەین کە چۆن جەنگی سارد بەکۆتا هات، پێویستە نیگامان بۆ شکستی ئابوریی یەکێتی سۆڤیەت بگوازینەوە، کە لەسەر پلاندانانی نێوەندی دامەزرابوو. ئاسانە نموونە لەسەر بایەخی سیاسەتی نێوخۆیی بدۆزینەوە، وەلێ ئایا دەتوانین بە زمانێکی گشتگیر لەسەری باخێوین؟ ئایا دوای ئەوەی گوتمان سیاسەتی نێوخۆیی گرنگە، شتێکی دیکە هەیە باسی لێوە بکەین؟

هەردوو تیوری مارکسیزم و لیبرالیزم تا رادەیەکی زۆر جەخت لەسەر ئاستی شرۆڤەی دووەم دەکەن، بەو پێیەی ئەگەر دەوڵەتان، کۆمەڵگای نێوخۆیی لەیەک چوویان هەبووایە، بەهەمان شێوە هەڵسوکەوت دەکەن. ئەگەر ویستت پێشبینی ئەوە بکەی کە سیاسەتی هەندەران چۆن چۆنی دەبێ، سەیری رێکخستنی نێوخۆیی بکە.

مارکسیستەکان، سەرمایەداری بەسەرچاوەی جەنگ دەزانن. **لینین** پێی وایە سەرمایەداری مۆنۆپۆلی پێویستی بە جەنگ هەیە، یاخود «هاوپەیمانیی نێوان ئیمپریالیستەکان، لە ئاگربەستێکی نێوان جەنگەکان زێتر نییە».

دواتر دەبینین مارکسیزم کارێکی کەس نەکردەی نەکرد سەبارەت راڤەکردنی هۆیەکانی دایسانی جەنگی جیهانی یەکەم و بە تەواوی لەگەڵ تاقیکردنەوەی نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە نەگونجا، ئەوەبوو دەوڵەتە کۆمونیستەکان، وەکو یەکێتی سۆڤیەت و چین و ڤێتنام، لەنێو خۆیاندا تێکبەربوون. کەچی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان لە ئەورووپاو ژاپۆن و ئەمریکای باکور پەیوەندی ئاشتیانەو هاوپەیمانیی ئابوورییان بەیەکەوە نا. کەواتە ئەگەر بڵێین سەرمایەداریی دەبێتە سۆنگەی جەنگەکان، هیچ بەڵگەیەکی بەهێزی لە تاقیکردنەوەیەکی مێژووییدا لەپشت نییە.

لیبرالیزمی کلاسیکی، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە سەر بیری بەریتانی و ئەمریکاییدا زاڵ بوو، گەیشتە دەرئەنجامێکی پێچەوانەوە، واتە دەوڵەتانی سەرمایەداری، مەیلی بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانەیان هەیە، چونکە شەڕ زیان بە بازرگانی دەگەیەنێ. خۆشگوزەرانی ئابوری و کۆمەڵایەتی لە بازرگانییەوە سەرچاوە دەگرێت، نەک جەنگ. ئەگەر دەمانەوێ بایەخ بە زێدەکردنی سەروەت و سامان و چاککردنی باری هاوولاتییان بدەین، ئەوا ئاشتی بۆ ئێمە باشترە. لیبرالیستی بەریتانی، **ریچارد کوبدن** Richard Cobden، بە شێوەیەکی باش روانگەی کلاسیزمی دەربڕی، کاتێک گوتی: دەتوانین جیهان لە شەڕێکی کرداری دووربخەینەوە. من دڵنیام کە جیهان ئەمە لە رێگای بازرگانییەوە ئەنجام دەدا.

دوای جەنگی جیهانی یەکەم، روانگەی لیبرالیزم زاڵ بوو. زۆر کتێب نووسرایەوە. لە نێوانیاندا تۆژینەوەیەکی نایاب هەیە، بە پێنووسی **نورمان ئانجل** Norman Angel کەتیایدا دەڵێ: شەڕ دوورخراوەتەوە، چونکە شەڕ خەرجییەکی گەلێک زۆری دەوێ جا ئەگەر ویستمان وێنەیەک لە شێوەی بیرکردنەوەی لیبرالیزمی کلاسیکی لەپاش جەنگی جیهانی دووەم چێ بکەین. تەنیا هێندەمان لەسەرە، سەیرێکی خێرخوازەکانی ئەو ماوەیە بکەین. **ئاندرۆ کارینجی** Carnegi، خودان پیشەسازیی ئاسن، لە ساڵی ١٩١٠دا سندوقی کارینجی بۆ ئاشتی دەولی دامەزراند. **کارینجی** لە چارەنووسی ئەو پارەوپوولانەی بۆ ئەم دەزگایەی تەرخان کردبوو، دڵنیا نەبوو، ئەگەر ئاشتی تێک بچێ. بۆیە بەندێکی خستە وەسیەتنامەکەیەوە کە چارەسەری ئەم مەسەلەیە دەکا. «**ئەدوارد جن**»ی بلاوکەرەوە لە شاری بوستن، نەیویست کارینجی لە

پەرای ئاشتیدا تەنیابێ. «**ئەدوارد جن**»یش دەزگای جیهانیی ئاشتی دامەزراند کە ئەمیش بۆ چارەنووسی قازانجی پارەوپوولەکانی دوای سەقامگیربوونی ئاشتی، دووچاری دڵەڕاوکێ بوو، کە بۆ دروستکردنی خانووبەرەی تەرخان کرد، کە تێچوونی کەم بێ، بۆ نیشتەجێ کردنی کرێکارە ئافرەتە گەنجەکان.

جەنگی جیهانی یەکەم هات بۆ ئەوەی ئەو روانگەی لیبرالییە بشێوێنێ. نە پەیوەندی بەیەکەوەکردنی نێوان بانکسازەکان و ئەرستۆکراتەکان لەودیو سنوورەکانەوە، نە گرێبەستەی کرێکاران لە نێوان دەوڵەتان سوودێکی هەبوو تا رێگا لە دەوڵەتانی ئەوروپایی بگرێ، شەڕی یەکتر نەکەن. شرۆڤەکردنە سەرژمێرییەکانیش هیچ پەیوەندییەکی بەهێزیان لە نێوان ئەو دەوڵەتانە نەدۆزییەوە کە تێکەڵ بە جەنگ بوون، کە داخۆ دەوڵەتێکی سەرمایەداربن یاخود دیموکراسی. هەردوو تیۆری مارکسیزم و لیبرالیزمی کلاسیکی، لە مەسەلەی پەیوەندی نێوان جەنگ و سەرمایەداری دژبەیەکن. وەلێ هەردووکیان رێککەوتوون، بۆ هۆیەکانی جەنگ لە سیاسەتی نێوخۆیی بگەڕێن بە تایبەتیش لە سروشتی سیستەمی ئابوری.

## لیبرالیزمی نوێ

بەرپابوونی هەردوو جەنگی جیهانی و شکست هێنانی ئاسایشی بە کۆمەڵ لە نێوان هەردوو جەنگدا، لە بەرژەوەندی تیۆرەکانی لیبرالیزم دانەبوو. زۆربەی ئەو شتانەی کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە لەمەڕ سیاسەتی دەولی نووسراو، مۆرکێکی ریالیستانەیان پێوەبووە، کەچی لە کۆتایی شەستەکان و حەفتاکاندا، لەگەڵ زێدەبوونی پشت بەیەکتر بەستنی ئابوری، تیورەکانی لیبرالیزم سەر لەنوێ بایەخیان پەیدا کردەوە. لێرەدا سێ کەناڵ بۆ بیرکردنەوەی لیبرالیزمی نوێ هەیە: ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی. کەناڵی سیاسی دووبەش بەخۆوە دەگرێ، یەکێکیان پەیوەستە بە داوودەزگاکان و ئەوی تریشیان بە دیموکراسیەت.

کەناڵی ئابوری زۆر جەخت لەسەر بازرگانی دەکا. لیبرالیستە نوێیەکان پێیان وایە بازرگانی گرنگە، نەک لەو رووەوەی کە رێگا لە دەوڵەتان دەگرێ پەنا بۆ جەنگ ببەن، بەڵکو لەبەرئەوەی وا لە دەوڵەتان دەکا کە بەشێوەک بەرژەوەندییەکانی خۆیان ببینن و دیاری بکەن، کە جەنگ کەم بایەخ بێت. بازرگانی رێگایەک دەخاتە بەردەم دەوڵەت، بۆ ئەوەی باری خۆی لە رێگای فراوانی کردنی ئابورییەوە بگۆڕێ، نەک لە رێگای غەزووی سەربازییەوە. «**ریچارد روزکرانس**» ئاماژە بۆ نموونەی ژاپۆنی دەکا. لە

سییەکاندا ژاپۆن وای هەست دەکرد کە تاکە ڕێگا بۆ گەیشتن بە بازاڕەکان، ئەوەیە کە چوارچێوەی خۆشگوزەرانییەکی هاوبەش لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بگورێنی «ئەمەش وای دەخواست کە لە ڕووی سەربازییەوە بەسەر هاوسێکانیدا زاڵ بێ و پابەندیان بکا بازرگانی لەگەڵ ژاپۆندا بکەن». لە ساڵی ۱۹۳۹دا (**یومین ستانلی**) پێی وابوو کە ڕووێکی ڕەفتارەکانی ژاپۆن لە سییەکاندا، خۆی لە سیاسەتی پاراستنی ئابوری دەدۆزییەوە. ستانلی پێی وابوو دامەزراندنی پەرژینی ئابوری بە درێژایی سنوورە سیاسییەکان، وا لە بەدەست هێنانی زەوی دەکات، کە هاوکات بێت لەگەڵ هەلی ئابوریدا. باشترین ڕێگا چارەش بۆ وەلاوەنانی جەنگ، هەوڵدانە بۆ فراژی بوونی ئابوری، لەچوارچێوەی بازرگانییەکی کراوەدا، کە دووربێ لە داگیرکردنی سەربازی. ئەمڕۆ ژاپۆن، بە پێچەوانەی ئەوەی لە سییەکاندا هەوڵی بۆ دەدا، لە ڕێگای بازرگانییەوە پایەی خۆی لە جیهاندا بەرزکردۆتەوە. پشکی ژاپۆن لە بەرهەمهێنانی جیهانی لە ٥ ٪ لە ساڵی ۱۹٦۰، بۆ لە ۱٥ ٪ لە ساڵی ۱۹۹۰ بەرزبۆتەوە. بەمەش بۆتە دووەمین دەوڵەت زلهێزی جیهانی لە ڕووی ئابورییەوە.

ڕیالیستەکان بەرپەرچی ئەمە دەدەنەوە کە ژاپۆن نەدەشیا ئەو فراژی بوونە ئابورییە سەرسوڕهێنە وەدەست بێنێ، ئەگەر یەکێک نەبوایە دەستی لەپشت بداو ئاسایشی بۆ دابین بکات. مەبەستیان لەمە پاراستنی ژاپۆنە دوای جەنگی جیهانی دووەم لەلایەن ئەمریکاوە. ڕاستی یەکەی، ژاپۆن بۆ دابینکردنی ئاسایشی خۆی لە بەرامبەر هاوسێکانیدا: یەکێتی سۆڤیەت و چین، کە دوو هێزی ئەتۆمی گەورەن، پشتی بە ولاتە یەکگرتووەکان بەست. ڕیالیستەکان پێشبینی ئەوە دەکەن کە دوای نەمانی یەکێتی سۆڤیەت، ولاتە یەکگرتووەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەکشێتەوەو بەربەست دەخاتە بەردەم بازرگانی ژاپۆنی، ژاپۆنیش ناچاردەبێ هێزی سەربازی خۆی دامەزرێنێتەوەو کارەکە بە بەیەکدادانی ژاپۆن و ولاتە یەکگرتووەکان بە کۆتا دێت، وەک تیۆری گوێزرانەوە بۆ دەسەلات دەڵێ. لیبرالیستەکانیش لەلایەنی خۆیانەوە بەرپەرچیان دەدەنەوە کە ژاپۆن سیاسەتێکی نێوخۆیی وا دەگرێتەبەر، کە زۆر جیاوازە لە سیاسەتی سییەکاندا. ئەو کۆمەڵگایە حەزی لەشەڕ نییە. ئەو پیشەی کە بە توندی خەڵک بۆ خۆی ڕادەکێشێ، بازرگانییە نەک میلیتاریزم. بیانگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە ڕیالیستەکان بایەخێکی تەواو نە بە سیاسەتی نێوخۆیی، نە بەو ڕێگایە دەدەن کە ژاپۆنی لە ئەنجامی هەلی ئابوریدا پێ گۆڕا. لیبرالیستە نوێیەکان دەڵێن دەشێ بازرگانی ڕێگا لەشەڕ نەگرێ، وەلێ دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە چۆنیەتی سەیرکردنی

دەوڵەتان بۆ دەرفەت و دەلیفە ئابورییەکانی خۆیان، ئەمەش بە رۆڵی خۆی، دەبێتە هۆی دامەزراندنی بونیاتێکی کۆمەڵایەتی، کە کەمتر مەیلی لە جەنگ بێت.

شێوەی دووەم لە لیبرالیزمی نوێ، کۆمەڵایەتییە پێی وایە، بەهەڤڕا بوونی کەسان لە رێگای زێتر لەیەکترگەیشتنەوە، ململانێ کەم دەکاتەوە. ئەم جۆرە پەیوەندییەی نێوان خەڵک، لەسەر زۆر ئاست بەڕێوەدەچێ. وەکو قوتابی و کارسازان و گەڕیدەو گوێزانەوەی پارەوپوول و کولتووری هاوبەش. دەشێ ئەو پەیوەندییانە وا لە خەڵک بکەن کەمتر هەست بە نامۆیی و رق لەیەکتر بوونەوە بکەن. ئەمەش بە رۆڵی خۆی خولیای شەڕانگێژی کەم دەکاتەوە.

لە ساڵی ١٩١٤دا لێپرسراوانی سەندیکاکانی کرێکاران، لە نێو خۆیاندا پەیوەندییەکی فراوانیان هەبوو، وەلێ ئەمە رێگەی لێ نەگرتن، هەرکە جلی سەربازییان لەبەرکرد، یەکتر بکوژن؛ ئاشکرایە ئەو رایە زۆر ساویلکەیە کە دەڵێ پەیوەندیی کۆمەڵایەتی رێگا لە شەڕ دەگرێ و زەمینەی لەیەکگەیشتن خۆش دەکا. لەگەڵ ئەمەشدا بە شێوەیەکی کەم بەشداری لە گۆڕانی لەیەکگەیشتن دەکا. ئەورووپای رۆژئاوای ئەمرۆ زۆر جیاوازە لەوەی ساڵی ١٩١٤. لە رێگای سنووری دەولییەوە پەیوەندی بەردەوام لە ئەورووپادا هەیە. نووسەرانی کتێبی قوتابخانەکان بایەخێکی بەرچاو بەنەتەوەکانی تر دەدەن. وای لێهاتووە وێنەی ئەورووپاییەکی تر (واتە وێنەی ئەورووپاییەک لەبەرچاوی ئەورووپاییەکی تر: و)، زۆر جیاوازە لەوەی کە لە ساڵی ١٩١٤دا هەبوو. دەرئەنجامی راپرسەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەست کردن بە ناسنامەی ئەورووپایی، کاردەکاتە سەر ئەوەی کە رۆڵەکانی ئەم دەوڵەتی دیموکراسیە، یان ئەو دەوڵەتی دیکە، چیان لە وەزارەتی هەندەرانی خۆیان بوێ. لێرەدا شایەنی ئاماژەپێکردنە کە گومان و دڵەراوکێ لای پسپۆرانی سیاسەتی هەندەرانی فەرەنسی هەبوو بەرامبەر سەرلەنوێ یەکخستنەوەی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٩٠دا، وەلێ راپرسی گشتی ئەوەی دەرخست کە زۆربەی فەرەنسییەکان پێشوازی لە یەکخستنەوەی ئەڵمانیا دەکەن. ئەم جۆرە هەڵوێستانە زۆر جیاوازن لە ئوگستوسی ١٩١٤. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەتەنیا بەس نین، وەلێ بەلای ئەوەدان کەوا کاتێک بە دام ودەزگاکان تێدەپەڕن، کاریگەریان زۆرتر دەبێت.

شێوەی سێیەم لە لیبرالیزمی نوێ، پێ لەسەر رۆڵی دام ودەزگاکان دادەگرێ. کەواتە لەم بارەیەوە، دام ودەزگا دەولییەکان بۆچی بایەخی خۆیان هەیە؟ لەبەرئەوەی ئەو چوارچێوەیە ئامادە دەکا کە شێوەیەک بداتە پێشهاتەکان و ئەو بڕوایە بۆ خەڵک

دەرەخسێنێ کە هیچ ململانێیەک نایەتە ئاراوە، ئەو سایەی دەگاتە دوارۆژو کەژی کێشەی ئاسایش خاو دەکاتەوە. هەروەها دام ودەزگاکان کاریگەری ئەو گێرەشێوێنییە کەم دەکەنەوە، کە ریالیستەکان گریمانەی هەبوونی دەکەن. Hobbs **هوبز** سیاسەتی دەولی وەکو دەولەتی جەنگ دەبینێ. راستە ئەو لە یادی نەدەکرد باسی ئەوەش بکات کە دەولەتی شەر، واتای کوشت و کوشتاری بەردەوام ناگەیەنێ وەلێ رێچکەی جەنگ وەکو ئاو و هەوایەکی بەدومانە، کە ئەگەری باران بارین هەیە. بەهەمان مانا، دەولەتی ئاشتی واتە ئارەزووی ئاشتی لە ئارادایە. خەلک دەتوانێ پێشهاتی ژیانێکی ئاشتییانە بکا کاتێک دام ودەزگای دەولی لە پێناو بەرژەوەندی حالەتێکی سەقامگیردا، بچووکردنەوەی قەبارەی گێرەشێوێنی دەگرێتە ئەستۆ.

دام ودەزگاکان بە چوار رێگا بۆ سەقامگیربوونی پێشهاتەکان کاردەکەن:

**یەکەم:** هەست بە درێژەپێدان و بەردەوام بوون دابین دەکا، وەکو ئەوەی زۆربەی ئەوروپاییە رۆژئاواییەکان پێشهاتی مانەوەی یەکێتی ئەوروپایی دەکەن چونکە بە زۆری سبەش دەمێنێتەوە، زۆر لە ئەوروپاییە رۆژهەلاتییەکانیش دەیانەوێ و هیوای ئەوە دەخوازن، کە رۆژێک لە رۆژان بچنەپال یەکێتی ئەوروپاییەوە، ئەمەش کار لە هەلسوکەوتی ئێستایان دەکات.

**دووەم:** دام ودەزگاکان دەرفەت بۆ زێدەبوونی ئالوگۆری بازرگانی و ئاسانکارییەکان، دەرەخسێنێ. ئەگەر فەرەنسییەکان ئەمرۆ رێژەیەکی بەرزتر لە زێدەبوون و ئاسانکاری وەدەست بێنن، دەشێ ئیتالییەکان بەیانی رێژەیەکی گەورەتر وەدەست بێنن. کەواتە هەموو دەست بەندییەک (صفقة) شایەنی دلەراوکێ نییە، چونکە کات خۆی کەفیلە بە هێنانەدی هاوسەنگییەکان.

**سێیەم:** دام ودەزگاکان، رەوتی زانیاری و یەکتر ناسینی دەولەتان دابین دەکات. بۆ وێنە، ئایا ئیتالییەکان بە راستی پابەند دەبن بەو رێسایانەی کە یەکێتی ئەوروپایی داینا‌ون؟ ئایا رەوتی بازرگانی تا رادەیەک هاوکوفییەکی تێدایە؟ دام ودەزگاکانی ئەوروپایی زانیاری دەربارەی بەرێوەچوونی کارەکان، دەخەنەروو دواجار دام ودەزگاکان رێگاچارەی ناکۆکییەکان دابین دەکەن. سەوداکردن و دەستبەندەکان و وەرگرتن و دانەوە لە یەکێتی ئەوروپایی لە نێو ئەنجومەنی وەزیران و لیژنەی ئەوروپاییەوە بەرێوەدەچێت. هەروەها دادگای عەدلی ئەوروپاییش هەیە. بەمەش دام ودەزگاکان ئاو و هەوایەک دروست دەکەن کە، ئەو پێشهاتانەی تیا فراژی دەبێ، کە سەقامگیربوونی لەسەر بەندە.

لیبرالیستە کلاسیکییەکان پێشهاتی «دارمانی ئاشتی بە تەواوەتی» دەکەن، لیبرالیستە نوێیەکانیش لە رەگەکانی ئاشتی دەگەڕێن کە دام ودەزگاکان و پێشهاتەکانی سەقامگیربوونی تێدا گەشەی کردووەو فراژی بووە. زانای سیاسەت «د. **کارل دویچ**»، ناوی «کۆمەڵگاکانی فرە ئاسایش»ی لەو ناوچانە ناوە کە جەنگ لە نێوان دەوڵەتان دوورخراوەتەوەو پێشهاتەکانی ئاشتی تیا گەشەی سەندووە. دام ودەزگاکانیش یارمەتی جێگیربوونی ئەم جۆرە پێشهاتانەیان داوە. بۆ وێنە دەوڵەتەکانی ئەسکەندەنافی رۆژێک لە رۆژان بە توندی شەڕیان لەگەڵ یەکتر کردووە، وڵاتە یەکگرتووەکان لەگەڵ بەریتانیاو کەنداو مەکسیک بەشەڕهات. کەچی ئەمڕۆ هیچ کەسێک بیر لەم جۆرە کارانە ناکاتەوە. دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکان بەرووکەش، ئارەزووی ئاشتی دەکەن. هەروەها دام ودەزگاکانی، وەک یەکێتی ئەوروپایی و رێکەوتنامەی ئازادی بازرگانی ئەمریکای باکوور NAFTA و رێکخراوی دەوڵەتانی ئەمریکایی، نەریتی وایان چەسپاندووە کە رێزی ئاشتی دەگرن و زەمینە بۆ دانوستان خۆش دەکەن، چونکە پێشهاتەکانی سەقامگیربوون، رێگا بۆ دەربازبوون لە حاڵەتەکانی «گیروگرفتی زیندانی» دابین دەکات، کە ریالیستەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

زۆر لە ریالیستەکان پێشهاتی ئەوە دەکەن کە رەنگە گیروگرفتی ئاسایش لە ئەوروپا، سەرەڕای هەبوونی دام ودەزگا لیبرالییەکانی یەکێتی ئەوروپا، سەرهەڵبداتەوە. پاش ئەوەی چوونە پاڵ یەکێتی ئەوروپایی لە ساڵی ١٩٩٢دا، بەجۆش کەوت. ماوەیەکی رەشبینی ئەوروپای گرتەوە، کە سیمای بەرهەڵستی کردنێکی توندی پێوە بوو، بۆ زیاتر یەکگرتن. بە تایبەتی ئەو ناکۆکییانەی کە دوای پەیماننامەی «ماسترخت» سەریان هەڵدا. لەبەرئەوەی هەندێک لە دەوڵەتان، وەکو بەریتانیای مەزن، لەوە ترسان کە دەست بەرداربوونی زێتر لە دەسەڵات بۆ حکومەتی یەکێتی ئەوروپایی، سەربەخۆیی و خۆشگوزەرانی دەوڵەتانی ئەندام دەخاتە مەترسییەوە. وەلێ هەستیش دەکا کە پێویستە دەسەڵاتی کۆمەڵەی ئەوروپایی بەهێز بکرێ. کەچی دووچاری دڵەڕاوکێش بووە، کە چوونەپاڵ ئەو کۆمەڵەیەو مانەوەی لە یەکێتییەکە ببێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتانی تری وەکو ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیتالیا زێتر لەو قازانج بکەن.

سەرهەڵدانی دەوڵەتی نوێی سەربەخۆ لە رۆژهەڵاتی ئەوروپاو یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ئارەزووی زۆربەیان بۆ چوونە پاڵ یەکێتی ئەوروپاییەوە، دوای ئەوەی

پەیوەندیی سیاسی و ئابورییان بە رۆژئاواوە پتەوتر بوو، مەترسی گیروگرفتەکانی ئاسایشی زیتر کرد. ئەگەر ئەو دەولەتانە لە توانایان دانەبێ شێوەی دیموکراسیەتێکی سەقامگیرو گەشەسەندوو پیادە بگەن، ئەوا ئەو شلەژانەی کە لەمەوە دەکەویتەوە دەبێتە هۆی گوراندنی حالەتێکی بۆشایی بەهێز، کە هەموو ولاتانی ئەوروپای رۆژئاوا دەگرێتەوە.

دەشێ سیاسەتی خۆجێی رۆلێک بگێرێ ئەگەر کۆمەلە خۆجێیەکان داوای یارمەتیان لەلایەنە دەرەکییەکان کرد. جا ئەگەر گێرەشێوێنی، ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلاتی گرتەوە، لەوانەیە کۆمەلێک پەنا بۆ روسیا، یاخود ئەلەمانیا ببەن و داوای یارمەتی لێ بکەن بۆ ئەو جەنگە نێو خۆییەی هاتۆتە ئاراوە.

«جون کیرسهایمر» رەچاوی ئەوە دەکا کە ئەو شلەژانە، ببێتە هۆی لە گرێژنە دەرچوونی چوارچێوەی داودەزگا لیبرالییەکان لە ئەوروپای رۆژئاواداو دوورخستنەوەی ئەلەمانیا لەو پایەی کە لە یەکێتی ئەوروپاییدا هەیەتی. روسیاو ئەلەمانیا لە ململانێیەکدا لەیەک دەدەن. نەک لەبەرئەوەی هیچ لایەکیان ئارەزوویان لە شەڕ هەیە، بەلکو لەبەرئەوەی ئەوان بەرەو بۆشایی هێز رادەکێشرێن. ئەو کاتە گیروگرفتی ئاسایش سەرهەلدەداتەوەو ئەلەمانیا دەگەڕێنەوە بۆ باری پێش سالی ١٩١٤ لە نێوەڕاستی ئەوروپادا. کە دووچاری دلەڕاوکێ بووەو لە چارەسەرییەک دەگەڕێ بۆ گیروگرفتەکانی ئاسایشی خۆی لەو بارە ئاستەنگەدا.

# تەرازووی هێزەکان و جەنگی جیهانی یەکەم

زۆربەی کات بەرپرسیاریی رووداونی جەنگی جیهانی یەکەم دەخرێتە ئەستۆی «تەرازووی هێزەکان»ەوە، کە یەکێ لە فراوانترین، هاوکات شلەژاوترین پرەنسیپە بەکارهاتووەکانی سیاسەتی دەولییە. زاراوەکە پان و بەرین و فشۆڵەو بۆ پاساو هێنانەوەی زۆر شت بەکاردەهێنرێ. فەیلەسوفی بەریتانی سەدەی هەژدەهەم «**دیڤید هیوم**» David Hume وەها وەسفی کردووە: رێسایەکی چەسپاوی سیاسەتێکی حەکیمانەیە. وەلێ «**ریچارد کوبدن**» Richard Cobdan هزرڤانی لیبرالیستی بەریتانی لە سەدەی نۆزدەهەم،پێی وایە کە: وێژینگ و شتێکە، لە وەسف کردن و تێگەیشتن نایەت.

«**ودرو ولسن**» Woodrow Wilson سەرۆکی ئەمریکایی لە رۆژانی جەنگی جیهانی یەکەمدا هەستی کرد کە تەرازووی هێزەکان پرەنسیپێکی بەدو و شەڕانگێزە، چونکە ئەو پرەنسیپە هانی سەرۆک دەوڵەتەکانی دا، چەشنی پارچە پەنیرێک مامەڵە لەگەڵ نەتەوەکاندا بکەن و چۆن لەگەڵ نیازو مەبەستەکانی ئەواندا دەگونجێ بەبێ هیچ حسێبکردنێک بۆ گەلان، ئاوای پارچە پارچە بکەن، هەروەها ولسون رقی لە تەرازووی هێزەکان دەبووەوە، چونکە بڕوای وابوو شەڕوشۆڕی لێ دەکەوێتەوە. کەچی بەرگریکەران لە سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان، وای دەبینن کە سەقامگیریی ئەوروپایی دێنێتەدی. وەلێ سەقامگیری و ئاشتی دوو شتی تەواو لێک جیاوازن، بە درێژایی پێنج سەدە، کە تەمەنی سیستەمی دەوڵەتیی ئەوروپاییە. دەوڵەتە گەورەکان ١١٩ شەڕیان لەگەڵ یەکتردا کردووە، ئاشتی لەو ماوەیەدا شتێکی دانسقە بووە. بە درێژایی سێ چواریەکی ئەو ماوەیە شەڕەکان بەردەوام بووینە، کە بەلایەنی کەم یەکێک لە دەوڵەتە گەورەکان تیایدا بەشدار بووە. نۆ شەڕ لەوانە گشتی و گەورە بوون (واتە دەست بەسەرداگرتن، یاخود جەنگی جیهانی بووە)، زێتر لە دەوڵەتێکی گەورە بەشداری تیادا کردووە. ئەگەر هاتوو پرسیمان: ئایا تەرازووی هێزەکان، بە درێژایی پێنج سەدە لە تەمەنی سیستەمی دەوڵەتی نوێدا، بەشێوەیەکی باش خزمەت و پەرای

ئاشتی کردووه؟ بە هەموو دڵنیاییەکەوە وەرامەکەی نەخێر دەبێت!

ئەمە شتێکی کت و پڕو نامۆ نییە، چونکە دەوڵەتان، هێزەکانی خۆیان بۆ پاراستنی ئاشتی، هاوسەنگ ناکەن، بەڵکو بۆ مسۆگەر کردنی سەربەخۆیی خۆیانە. تەرازووی هێزەکان یارمەتی پاراستنی دەوڵەتە گێرەشێوێن و جیاکان دەدا، وەلێ هەموو دەوڵەتێک ناگرێتەوە، نموونەی ئەمەش پۆڵەندا Polandیە، کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا، لە نێوان هاوسێکانیدا: نەمساو پروسیاو روسیا، **ودرو ولسن** گوتەنی: وەکو پارچە پەنیرێک پارچە پارچەکراو هەروەها لە رابردوویەکی نزیک، دەق ساڵی ١٩٣٩، **ستالین وهیتلەر**، دەستبەندێکیان گرێدا بۆ هەمدیس دابەشکردنەوەی پۆڵەندا. دەوڵەتانی بالتیک بەیەکێتی سۆڤیەت دران، بەم چەشنە لیتوانیا Lithua-nia و لاتڤیا Latvia و ئیستۆنیا Estonia، نیو سەدە لە تەمەنی خۆیان، تاکو ساڵی ١٩٩١، وەکو کۆمارگەلی یەکێتی سۆڤیەتی بەسەربرد.

تەرازووی هێزەکان، ئاشتی نەپاراست و هەمیشە سەربەخۆیی هەموو دەوڵەتێک ناپارێزێ، بەڵکو سیستەمی گێرەشێوێنی دەوڵەتی پاراست.

## هێز

بۆ ئەوەی لە واتای هاوسەنگی بگەین، پێویستە لە هێزەوە دەست پێ بکەین. هێز چییە؟ شێوەکانی چین؟ دەتوانین بڵێین هێز وەک ئەوینە، ئاسانترە تیایدا بژی، لەوەی بیپێوی، یاخود پێناسەی بکەی. هێز بریتییە لە توانای مرۆڤ بۆ هێنانەدی مەبەستەکانی، یاخود ئامانجەکانی، بەگوێرەی فەرهەنگ هێز بریتییە لە توانای ئەنجامدانی شتەکان و کۆنترۆل کردنی کەسانی تر. **روبەرت دال** Robert Dahl، مامۆستای زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی ییل Yale، هێز وەها پێناسە دەکا کە ئەو توانایەیە کە وا لە خەڵکانی تر بکەی، شتێک بکەن، کە بەشێوەیەکی ئاسایی نایکەن. وەلێ کاتێک هێز بە پێوانەی رەفتاری گۆڕاو لای خەڵکی تر دەپێوین، پێویستە شتە باشەکانیان بزانین، ئەگینا لە خەملاندنی هێزی خۆماندا بە هەڵەدا دەچین. ئاستەنگە کە بزانی خەڵک، یاخود دەوڵەتان چۆن هەڵسوکەوت دەکەن، بەبێ ئەوەی شنگ و هێزیان بزانی.

پێناسەی کلاسیکی بۆ هێز، دەشێ سوودی بۆ شرۆڤەوان و مێژوونووسان هەبێ کە کاتێکی زۆر بۆ سەرلەنوێ بەیەکەوەنانەوەی رابردوو بەسەر دەبەن. وەلێ زۆربەی کات لە روانگەی سیاسەتمەداران و سەرکردە پراکتیکییەکانەوە، پێدەچێ هێز خێرا لەناو

بچێ. هەروەها لەبەر ئەوەی توانای کۆنترۆڵ کردنی خەڵکانی تر بە هەبوونی ئامرازی دیاریکراو پەیوەستە، سەرکردە سیاسەتمەدارەکان هێز بەو شێوەیە پێناسە دەکەن. ئەو ئامرازانەش: دانیشتوان و زەوی و کەرەستەی سروشتی و قەبارەی ئابوری دەگرنەوە، کەوا لە هێز دەکەن توانای بۆ پێوان و پێشبینی لە پێناسەی رەفتارەکی زیاتر چەسپاو بێت. هێز لەو چوارچێوەیەدا واتای بەدەستەوە گرتنی کارتە بەهێزەکانە لە یاری پۆکەری دەولیدا کە یەکێ لە رێساکانی ئەوەیە دەستی خۆت بشاریەوە، یاخود هەر لە بنەڕەتەوە دەست بە یاریەکە نەکەی، ئەگەر زانیت بەرامبەرەکەت کارتی بردنەوەی لەلایە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە شەڕەکان ئەوانە دەستی پێدەکەن کە لە کۆتاییدا دۆڕاندوویانە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە سەرکردە سیاسەتمەدارەکان، هەندێک جار سەرەڕۆیی دەکەن، یاخود بەهەڵەدا دەچن. ژاپۆنی ساڵی ١٩٤١و عێراقی ساڵی ١٩٩٠، دوو نموونەن. زۆربەی کات، لە سیاسەتی دەولیدا، ناحەزوخەنیم هەندێک کارت لەیەک دەشارنەوە، وەک چۆن لە یاری پۆکەردا هەیە. دەشێ کارامەیی وەک حەشاردان و فریودان، ئەنجامی جیاوازی هەبێ، هەتاوەکو ئەگەر فریودانیش لە ئارادا نەبێ، دەشێ بکەوێتە خەملاندنی هەڵەوە، واتە ئەو ئامرازانەی کە پتر پەیوەندیان بەم بار یاخود ئەو بارەوە هەیە. نمونەش بۆ ئەمە لە ساڵی ١٩٤٠دا فەرەنساو بەریتانیا تانکیان لە **هیتلەر** زێتر هەبوو، وەلێ **هیتلەر** توانای مانۆرو ستراتیژیەتی سەربازی لەوان مەزنتر بوو.

وەرچەرخاندنی هێز، گرفتێکی بنەڕەتییە ئەمە، ئەو کاتە بەدیاردەکەوێ کاتێ لەسەر بنەڕەتی سەرچاوەکانی هێز، بیر لە هێز دەکەینەوە. هەندێک لەوڵاتان لە هەندێکی تر باشترن لە وەرچەرخاندنی هێزی خۆیان بۆ باندۆرێکی کاریگەرتر. بە تەواوی وەک ئەوەی یاریزانی پۆکەری لێهاتوو دەیکا، کاتێک بە کارتی بێ هێز بارمتەکردنەکە دەباتەوە، وەرگۆڕینی هێز، توانای وەرچەرخاندنی هێزی شاراوەیە، کە لە سەرچاوەکانیەوە حسێوی بۆ کراوە، بۆ هێزێکی بەرجەستە، بۆیە پێویستە کارامەیی وڵاتێک بزانین کە چۆن هێزی خۆی وەردەچەرخێنێ و چ ئامرازێکی هێزی بەدەستەوەیە تا بتوانین بە شێوەیەکی دروست پێشبینی بکەین.

کێشەیەکی تر، دیاریکردنی ئەو سەرچاوانەیە کە باشترین بنەماو بنەڕەت بۆ هێز دابین دەکەن، پێشان گەیشتن بە زانینی سەرچاوەکانی هێز کارێکی ئاسان بوو و وەکو ئەمڕۆ ئاڵۆزو پاڵۆز نەبوو. بۆ نمونە لە ئابوری ئەوروپای سەدەی هەژدەهەمدا، ژمارەی دانیشتوان سەرچاوەیەکی یەکلاییکەرەوەی هێز بوو، چونکە بنەڕەتێکی کۆکردنەوەی

باج و بەسەربازگرتنی جەنگاوەران بوو. بەهۆی ژمارەی دانیشتوانەوە فەرەنسا باڵی بەسەر ئەوروپای رۆژئاوادا کێشا، بۆیە دەبینین پروسیا لە کۆتایی شەڕەکانی ناپلیوندا، لە کۆنگرەی ڤیەننا، پلانێکی وردی پێشکەش بە هاوڕێیە سەرکەوتووەکانی خۆی کرد. بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ئەوروپا بنیات بکرێتەوە، تا هاوسەنگیی هێزەکان بپارێزێ. پلانەکە دانیشتوان و ئەو زەوییانەی دەگرتەوە کە هەر لە ساڵی «١٨٠٥»ەوە لەدەستی دابوون. هەروەها ئەو زەوی و زارو دانیشتوانانەی کە پێویستە پێی بدرێ بۆ گەڕاندنەوەی ژمارەی هاوسەنگیی پێویست. بەر لە سەرهەڵدانی رێچکەی نەتەوەیی، کەسێک بایەخی بە ژمارەی ئەو خەڵکە نەدەدا کە بە ئەڵەمانی نەداخاوتن، یاخود لەو هەرێمانەدا خۆیان بە ئەڵەمانی نەدەژمارد، وەلێ دوای نیو سەدە وای لێهات هەستی نەتەوایەتی زۆر بگەیەنێ.

گۆڕانێکی تر کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا روویدا، گەشەسەندنی بایەخی پیشەسازی و سیستەمەکانی هێڵی شەمەندەفەر بوو، کە وایکرد راگواستن و تەییارکردن و سازدانی سەرباز لە جاران زۆر خێراتر بێت.

لە شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەڵەمانیای **پسمارک** پێشڕەو بوو لە بەکارهێنانی هێڵی ئاسنی بۆ گواستنەوەی لەشکرو سوپا بۆ ئەو شوێنانەی کە سەرکەوتنی زۆر خێرای تیایدا هێنایەدی. ئەگەرچی روسیا لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە هەمیشە لە دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی تر گەورەتر بوو، بەڵام لە سەربازگرتن و خۆسازداندا لە هەمووان خاوتر بوو. گەشەسەندنی سیستەمی هێڵی ئاسنی لە روسیای رۆژئاوا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، یەکێک لەو هۆیانە بوو کە ئەڵەمانەکان لە بەرزبوونەوەی هێزی روسیا بترسن لە ساڵی ١٩١٤. لە سەر ئەم بنەمایە هێڵی ئاسنی لە ئەوروپادا بڵاوبۆوە، بۆئەوەی بەریتانیا لە خۆشحاڵی بەهێزی دەریایی خۆی بێ بەش بکا. هێندە کاتە نەما، ئەگەرچی لە بنەڕەتەوە پێداویستیش بێت، سوپا لەم لاو لەو لا دابنێ بۆ ئەوەی رێگا نەدا دەوڵەتێکی گەورەی تر لە کیشوەری ئەوروپا باڵادەست بێت.

شتێکی نوێ نییە، ئەگەر هاتوو جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە، کە بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای پیشەسازی چ کاریگەرییەکی گەورەی لە جەنگدا هەیە. هەر لە سەرەتای سەردەمی ئەتۆمییەوە لە ساڵی ١٩٤٥دا، زانست و تەکنولوژیا، بەتایبەتی هی پێشکەوتوو، بوونەتە سەرچاوەیەکی ترسناکی هێز. وەلێ ئەو هێزەی لە چەکی ئەتۆمی وەردەگیرێ، کاریگەرییەکی وێرانکارانەی هێندە گەورەی هەیە، کە بەکارهێنانی

کردۆته کارێکی ئاستەنگ و زۆر ترسناک. هەروەها جەنگی ئەتۆمی پارەو پولێکی یەکجار زۆری تێدەچێ، لێرەدا بە شێوەیەکی گشتگیرتر دەتوانین بڵێین، زۆر حاڵات هەیە کە بەکارهێنانی هێزی تێدا کارێکی گونجاو نییە، یاخود خەرجی زۆری دەوێ.

هێزی سەربازی، وێڕای قەدەغەکردنی بەکارهێنانی هێز لە نێوان کۆمەڵێک دەوڵەتدا، هەتاوەکو ئێستا لە پشت پەردەوە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ. بۆ نموونە ڕۆڵی هێزەکانی سەربازیی ئەمریکایی لە سەنگراندنەوەی هەر هەڕەشەیەک بۆ سەر هاوپەیمانەکانی. یاخود دابین کردنی گەیشتن بە سەرچاوەی ژیانەکی، وەکو نەوتی کەنداو. واتە دابین کردنی هێزی خۆپاراستن، دەشێ لە هەندێ حاڵەتدا وەک هۆکارێکی سەوداکاری بەکاربهێنرێ، دەشێ هەندێ جاریش پەیوەندییەکە ڕاستەوخۆ بێت.

سەرباری ئەمەش، لێرەدا حسێبێک هەیە، هەندێک جار پێی دەگوترێ «دیوی دووەمی هێز». واتە وا لە دەوڵەتانی تر بکرێ، کەوا بگۆڕێن، یاخود هەڵوێستەکانی خۆیان بگۆڕن. بەمەش دەگوترێ ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ، یاخود تێکشکێنەر لە بەکارهێنانی هێزدا. ئەو جۆرە «هێزە توندەش» لەسەر دوو پرەنسیپڕا دەوەستێ: تەماع لە بەرنان (کێک)، یاخود گەڤ لێکردن (قامچی)؛ ئەمریکاییەکان ئەم سیاسەتەیان لە ماوەی جیاجیادا بەکارهێناوە. ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر یارمەتی داون بۆ پاراستنی هاوسەنگیی هێزەکان لە جیهاندا. وەلێ لێرەدا ڕێگایەکی تریش هەیە، ڕێگایەکی نەرم، یا ناراستەوخۆ لە بەکارهێنانی هێزدا. لەوانەیە وڵاتێک دەرئەنجامێکی باش لە سیاسەتی جیهانیدا بێنێتەدی، لەبەر ئەوەی وڵاتانی تر دەیانەوێ لە دوای ئەوەوە بڕۆن، یاخود بە سیستەمە نەرمەکەی ئەو رازی بن.

بەو واتایە دانانی خشتەی کارەکان و بە هەیکەل کردنی دام ودەزگاکان لە سیاسەتی جیهانیدا، لەوە کەم بایەخ تر نییە کەوا لە خەڵکی تر بکەی لە هەندێک حاڵەتی دیاریکراودا بگۆڕێن. ئەو ڕووەی هێز - واتە وا لە ئەوانەی تر بکەی ئەو شتەیان بوێ کە تۆ دەتەوێ - دەشێ پێی بگوترێ گیانی هاوڕێیەتی، یاخود ڕەفتاری نەرمی هێز. سەرهەڵدانی هێزی نەرمیش پشت بە چەند سەرچاوەیەک دەبەستێ، وەک ڕاکێشانی ڕای خەڵکانی تر، یاخود توانای دانانی خشتەی کاری سیاسی، بەو شێوەیە ئەو شتانە دابرێژی کە خەڵکی تر بە شتی باشی بژمێرن.

باوکی هەرزەکاران دەزانن، ئەگەر ئەوان تۆوی هەڵبژاردنی بیروباوەڕو شتی باشیان لای ڕۆڵەکانیان چاند، ئەوا هەم مافەکانیان زۆرترو تەمەن درێژتر دەبێت، لەوەی پشت بە شێوازی کۆنترۆڵکردنێکی چالاکانە ببەستن. هەروەها سەرکردە سیاسەتمەدارە

فەیلەسوفەکان، لەمێژە دەرکیان بە سروشتی ئەو هێزە کردووە کە لە دانانی خشتەی کارو دیاریکردنی چواچێوەی هەر گفتوگۆیەکدا دێت. توانا بوون بۆ دامەزراندنی شتە باشەکان، بەرەو گرێدان بە سەرچاوەی هێزی نادیار دەچێ، وەک رۆشنبیری و ئایدیۆلۆژیاو دام ودەزگاکان.

گرنگترین سەرچاوەکانی هێز لە کاتی ئێستادا چین؟ چاوپیاخشاندنێک بە پێنج سەدەی رابردوو - تەمەنی سیستەمی دەولەتی نوێ - ئەوەمان بۆ دەردەخا کە سەرچاوەی جیاوازی هێز، لە ماوەی جیاوازدا رۆڵی ترسناکی بینیوە. سەرچاوەکانی هێز چەسپاو نین لە جیهانی ئەمڕۆماندا و بە بەردەوامی لە گۆڕاندان (بڕوانە ئەم خشتەیە).

## دەوڵەتە گەورەکان و گرنگترین سەرچاوەکانی هێز

| سەدە | دەوڵەتی گەورە | سەرچاوە سەرەکییەکانی هێز |
|---|---|---|
| ١٦ | ئیسپانیا | زێڕ، بازرگانی کۆلۆنیالی، سوپای بەکرێگیراو، پەیوەندی لەگەڵ خێزانە دەسەڵاتدارەکان. |
| ١٧ | هوڵەندا | بازرگانی، بازاڕەکانی سەرمایە، دەریاوانی |
| ١٨ | فەرەنسا | چڕی دانیشتوان، پیشەسازی لادێی، کارگێڕی گشتی، سوپا. |
| ١٩ | بەریتانیا | پیشەسازی، بازرگانی، پارەوپوول، قانونگەلی لیبرالیی، بەرگری کردنی ئاسان لە بەریتانیا. |
| ٢٠ | USA | قەبارەی گەشەسەندنی ئابووری، سەرکردایەتی کردنی زانست و تەکنۆلۆژیا، رۆشنبیری جیهانی، هێزی سەربازی و هاوپەیمانییەتییەکان، سیستەمگەلی لیبرالی نێودەوڵەتی، پێشکەوتنی گەورە لە گەیاندنی نێوان گەلان و تەکنۆلۆژیای راگەیاندن. |

له چاخی ئابوریدا، که لەسەر راگەیاندن و پشت بەیەکتربەستنی نێوان دەوڵەتان وەستاوە، هێز وای لێهاتووە کەمتر بەرەو پیلی گوێزانەوە بچێ و، کەمتر روون و کەمتر توندوتیژ بێت. لەگەڵ ئەوەشدا وەرچەرخانی هێز تەواو نەبووە. سەدەی ئێستا (بیست و یەک)، هێزی راگەیاندن و دام ودەزگایی بوون، بە دڵنیاییەوە رۆڵێکی گەورەتر بەخۆیەوە دەبینێ، وەلێ هێزی سەربازی، وەک ساڵی ١٩٩١ لە جەنگی کەنداودا لە ساڵی ١٩٩١ بینیمان، وەک هۆکارێکی گرنگ دەمێنێتەوە. هاوکات مەودای ئابوریش لەسەر ئاستی بازارەکان و سەرچاوەکانی سروشتی، بەگرنگ دەمێنێتەوە. لەگەڵ گەشەسەندنی کەرتە خزمەتگوزارییەکان لە چوارچێوەی ئابوری نوێدا، توانای لەیەکتر هاوێرکردنی خزمەتگوزارییەکان و پیشەسازیی شمەک بەردەوام دەبێت، هاوکات راگەیاندن لە رووی چەندایەتییەوە زێتر دەبێت، توانای رێکخستن بۆ بەرەوپیرەوە چوونێکی نەرم و خێرا، سەرچاوەیەکی یەکلایی کەرەوە دەبێت. یەک ریزی (یاخود ئاوێتەی یەک بوون) سیاسی هەر بە گرنگی دەمێنێتەوەو کولتوری میللی جیهانیش بەهەمان چەشن.

ئاستەنگی گۆڕانی سەرچاوەکانی هێز، کێشەیەکی گەورەیە لەبەردەم دەوڵەتداراندا - کاتێک هەوڵدەدەن تەرازووی هێزەکان هەڵسەنگێنن. شرۆڤەوانانی سیاسەتی دەولی وایدەبینن کە بەکارهێنانی هەمان وشە بۆ کاروباری جیاواز، کارەکە زێتر دەشلەژێنێ. پێویستە لەسەرمان ئەو ناوەڕۆکانەی لە ئەنجامی بەکارهێنانی بەرەڵلایی هەمان وشەدا لەدایک دەبن، دابڕین و رووناک بکەینەوە.

دەستەواژەی «تەرازووی هێزەکان»، بەلایەنی کەمەوە ئاماژە بۆ سێ شتی جیاواز دەکا:

## تەرازووی دابەشکردنی هێزەکان

دەشێ لە پێشەوە تەرازووی هێزەکان، ئەوە بگەیەنێ، کە هێز چۆن دابەش دەکرێ؟ سەرچاوەکانی هێز بەدەست کێن؟ هەندێک کەس زاراوەی «تەرازووی هێزەکان»، وەک کنایەتێک بۆ باری لە ئارادا بوو بەکاردەهێنن. واتە دابەشکردنی ئەو هێزەی لە ئارادایە. بۆیە هەندێک لە ئەمریکاییەکان لە هەشتاکاندا گەیشتنە ئەو رایەی کە بڵێن ئەگەر نیکاراگوا ببوایە دەوڵەتێکی کۆمۆنیست، ئەوا تەرازووی هێزەکان دەگۆڕا. ئەم جۆرە بەکارهێنانەی ئەم زاراوەیە، واتایەکی زۆر روون ناگەیەنێ. ئەگەر دەوڵەتێکی بچووک (ولاء)ی خۆی گۆڕی، دەشێ گۆڕانێکی کەم لە دابەشکردنی لە ئارادابووی

هێز بگۆڕێ. وەلێ ئەوە گۆڕانێکی زۆر کەم دەبێ و زانیاری پێویستمان دەربارەی گۆڕانکارییە قوڵەکان ناداتێ، کە لە سیاسەتی دەولیدا روودەدا.

رێگەیەکی تر بۆ بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە، ئاماژەکردنە بۆ رەوت و سیاقێکی زۆر تایبەت (زۆر دانسقە)، بۆ ئەو حاڵەتانەی کە هێز بەیەکسانی دابەش دەکرێ. ئەو بەکارهێنانە وێنەی ریزپەیژەی کێشەکان (مدرج اوزان)، یاخود هاوسەنگییەکان دێنێتەوە بیر. هەندێک لە ریالیستەکان دەڵێن: ئەگەر هاوسەنگییەکی هاوشان (متکافيء)ی هێز هەبوو، ئەوا سەقامگیری دێتە ئاراوە. لە کاتێکدا هەندێکی تر پێیان وایە سەقامگیری ئەوکاتە دێتەدی، ئەگەر هاتوو یەکێک لەلایەکان هێندە هێزەی هەبێ، وا لەوانی تر بکا نەوێرن پەلاماری بدەن، تیوری سەروەرێتی (نظرية السيادة) دەڵێ: هێزی ناهاوسەنگ، ئاشتی دێنێتەدی. کاتێک ئەو دەوڵەتە بێ هێز دەبێت و یەکێکی تر سەرهەڵدەداتەوە کە بەگژیدا بچێتەوە. ئەوکاتە ئەگەری دایسانی جەنگ زێتر دەبێت. با بگەڕێینەوە سەر لێکدانەوەکەی ثیوسایدیدس بۆ بەرپابوونی جەنگی پیلوپونیزی: گەشەسەندنی هێزی ئەثیناو ئەوترسەی لای سپارتییەکانی نایەوە، لەگەڵ تیوری گوێزرانەوەی سەروەرێتیدا دەگونجێ. ئەمە وەک دواتر دەیبینین بۆ جەنگی جیهانی یەکەمیش راستە. کەچی پێویستە بە ئاگادارییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە تیورانەدا بکەین. چونکێ بەلای زێدەڕۆیی لە پێشبینی کردنی ململانێییەکان دادەشکێنێتەوە. لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەریتانیای مەزنی رەتدا وەک گەورەترین هێزی ئابوری لە جیهاندا. لە ساڵی ١٨٩٥دا ناکۆکی لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە لەسەر سنوور لە ئەمریکای باشوور بەرپابوو. نیشانەکانی جەنگ لە ئاسۆ وەدەرکەوتن. هەر لەو کاتەدا دەوڵەتێکی تر سەری هەڵدا، دەوڵەتێکی دەستڕۆیشتوی کۆن، هۆیەکانی بەیەکدادان وەدیارکەوتن، وەلێ بەیەکدادان روونەدا. دەتوانین هەندێک نیشانەی گرنگ هەڵبهێنجین، بۆ چارەسەرکردن و رزگاربوون، **شارلوک هولمز** Sherloch Holmes گوتەنی، ئەو سەگانەی ناوەڕن، نەهاتنەئارای جەنگ لەم حاڵەتەدا بۆ ئەوەمان دەبا لە هۆی تر بگەڕێین. لێرەدا ریالیستەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەوا بەرزبوونەوەی ئەستێرەی ئەڵمانیا، هەڕەشەیەکی لە پێشترە بۆ بەریتانییەکان. کەچی لیبرالیستەکان هۆی دانەیسانی جەنگ دەگەڕێننەوە بۆ زێدەبوونی هەستی دیموکراسی لە هەردوو وڵاتدا، هەروەها دەیگەڕێننەوە بۆ پەیوەندی رۆشنبیری لە نێوان سەرکردەی پێشوو و بەگژداچۆرەوەی نوێ (بەریتانیاو وڵاتەیەکگرتووەکان-و)، باشترین شت کە بەر لە

هەموو شتێک بتوانین لە تەرازووی هێزەکانی پوخت بکەینەوە، ئەوەیە کەوا دابەش بوونی هێزی ناهاوشان لە نێوان دەوڵەتە گەورەکاندا، دەشێ هۆکارێک بێت، ئەگەر تاکە هۆکاریش نەبێت، بۆ راڤەکردنی ناسەقامگیری و بەرپابوونی جەنگ.

## سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان

بەکارهێنانی دووەمی ئەم زاراوەیە (زاراوەی تەرازووی هێزەکان-و) ئاماژە بۆ هاوسەنگیی هێزەکان دەکات وەک سیاسەتێکی هاوسەنگ لە نێوان دەوڵەتاندا. تەرازووی هێزەکان پێشبینی ئەوە دەکا کەوا بزاڤی دەوڵەتان بۆ ئەوەیە رێگەی هیچ دەوڵەتێک نەدەن، کە هێز بەلای ئەودابێ بەتەنیا. ئەو پێشبینی کردنە مێژوویێکی درێژی هەیە. **لورد پالمرستون**، Palmerston Lord، وەزیری هەندەرانی بەریتانیا لە ساڵی ١٨٤٨دا، گوتی: «بەریتانیا نە دوژمنی هەمیشەیی هەیە، نە دۆستی هەمیشەیی، بەڵکو بەرژەوەندییەکی هەمیشەیی هەیە». **ئەدوارد گرێی** Sir Edward Grey وەزیری هەندەرانی بەریتانی لە ساڵی ١٩١٤دا، نەیدەویست بچێتە ناو جەنگەوە، وەلێ لە کۆتاییدا ئەمەی کرد. چونکە لەوە دەترسا ئەڵەمانەکان بە باڵادەستیان لەو کیشوەرە، (کیشوەری ئەورووپا-و) زۆرینەی هێز لە ئەورووپا پەیدا بکەن. کاتێک هیتلەر لە ساڵی ١٩٤١دا، پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتی دا، **ونستون چەرچل** Winston Churchillی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا، گوتی: «لەسەر بەریتانیا پێویستە هاوپەیمانێتی **ستالین** بکا کە بەر لە چەند ساڵێک دوژمنداری دەکرد». هەروەها چەرچل گوتی: ئەگەر **هتلەر** پەلاماری دۆزەخ بدا، کەمترین شت کە بیکەم، ئەوەیە کە پشتگیری شەیتان (ئیبلیس) بکەم. لەبەردەم ئەنجومەنی گشتیدا[1]. ئەم نموونانە لەبارن بۆ ئەوەی هاوسەنگیی هێزەکان ببێ بە سیاسەتێکی روون.

**پێشبینی کردنی رەفتارێکی بەم چەشنە، بە دوو گریمانی بنەڕەتییەوە بەندە:**

١- بونیاتی سیاسەتی دەولی لە سیستەمی گێرەشێوێنی دەوڵەتاندا.

٢- دەوڵەتان سەربەخۆیی خۆیان لە سەرووی هەموو شتێکەوە دادەنێن.

سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان، وەک پێداویستیەک وای دادەنێ کە دەبێ

١- ئاخاوتنی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا Winston churchill، لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١ لەگەڵ سکرتێری تایبەتی خۆی کولڤین Colvine، کتێبی «چرچل یتکلم»، ئامادەکردنی روبرت جیمس Robert James، دار چیلس، نیویورک، ١٩٨٠.

دەوڵەتان تا ئەوپەڕی هێزەکانی خۆیان زێتر بکەن. دەشێ دەوڵەت لەگەڵ پیادە، یاخود پاسەکەدا بڕوا. بەو واتایەی کە خۆی دەداتە پاڵ لایەنی هەرە بەهێزو بەشداریی لایەنی سەرکەوتوو دەکا لە دەستکەوتەکانی. چوونەپاڵ لە سیاسەتی نێوخۆییشدا بڵاوە. کاتێک سیاسەتمەداران لە دەوری ئەوانە دەخولێنەوە کە هەلی سەرکەوتنیان بەهێزترە. کەچی چوونەپاڵ کاروان لە سیاسەتی دەولیدا مەترسی لەدەستدانی سەروەریێتی لە دوو توێی خۆی هەڵگرتووە. لە سالانی ١٩٣٩و ١٩٤٠دا، **موسولینی** چووەپاڵ **هیتلەر** بۆ پەلاماردانی فەرەنسا، چاوی لەوەبوو هەندێک تالان و بڕۆی دەست کەوێت. وەلێ تا دەهات زێتر دەکەوتە تەڵەی پاشکۆیەتی ئەڵەمانیاو تا لە کۆتاییدا سەربەخۆیی لەدەست دا. بۆیە سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان دەڵێ: «بڕۆپاڵ بێ هێزترین لایەن». هاوسەنگیی هێزەکان سیاسەتێکە مەبەست لێی یارمەتیدانی لایەنی بێ هێزە. چونکە ئەگەر تۆ یارمەتی گەورەی بەهێزت دا دەشێ لە کۆتاییدا لێت هەڵگەڕێتەوەو راوت بکاو قوتت بدا!

دەوڵەتان دەتوانن بەتەنیا هاوسەنگیی هێزەکان لە ڕێگەی پەرەدان بەچەکسازییەوە بێننەدی، یاخود لە ڕێگەی هاوپەیمانیێتی لەگەڵ دەوڵەتانی تردا، کە سەرچاوەکانی هێزیان یاریدەدەرن لە هێنانە ئارای هاوسەنگی لەگەڵ دەوڵەتی باڵادەستدا. ئەمەش یەکێکە لە گرنگترین و بەهێزترین پێشبینییەکان لە سیاسەتی دەولی و کاودانی ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا. باشترین نموونەش لە سەرەتای هەشتاکاندا (١٩٨٠-١٩٨٨) کاتێک **سەدام حوسێن** چووە نێو شەڕەوە، هەندێک چاودێر وای بۆدەچوون کە زۆربەی دەوڵەتە عەرەبەکان، بەبێ هەڵاوێردن، پاڵپشتی عێراق دەکەن دژی ئێرانی ئایەتوڵلا خومێنی، کە نوێنەری کولتوری فارسی و کەمینەی بیری شیعەی دەکرد لە ئیسلام. وەلێ سوریا بووە هاوپەیمانی ئێران، سەرباری ئەوەی کە سەرکردەکەی پیاوێکی علمانی بوو لە پارتی بەعس (هەمان پارت کە فەرمانڕەوایی عێراق دەکا). ئایا سوریا بۆ وای کرد؟ چونکە سوریا لە گەشەسەندنی هێزی عێراقی هاوسێی دەترسا لە جیهانی عەرەبیدا، بۆیە بە چاوپۆشین لە لایەنە ئایدیۆلۆژییەکانی، هاوسەنگیی کردنەوەی هێزەکانی عێراقی هەڵبژارد. زۆر جار بەکارهێنانی ئایدیۆلۆژیا وەک ڕێبەرێک بۆ پێشبینی کردنی ڕەفتاری دەوڵەتان دووچاری هەڵەمان دەکات. لە کاتێکدا بە پێچەوانەوە، پێشبینی کردنی بزاوتی هاوسەنگیی هێزەکان زۆربەی کات بە ڕاست دەردەچێ. بێگومان لێرەدا زۆر هەڵاوێردن (استثناء) لەو ڕێسایەدا هەیە. چونکە ناتوانرێ ڕەفتارەکانی مرۆڤ بە تەواوی دیاری بکرێن. لەبەر ئەوەی مرۆڤ

ڕێگاچارەو هەڵسوکەوتی وای هەیە لەوانەیە هەمیشە لەگەڵ پێشهاتی چاوەڕوانکراودا نەگونجێ. هەندێک حاڵەت هەن وا لە خەڵک دەکەن کە جۆرە هەڵسوکەوتێکی دیاریکراو بکەن. بۆ نموونە ئەگەر یەکێک لە هۆڵێکی پڕ خەڵک هاواری کرد: «ئاگرە.. ئاگرە!!!» دەشێ چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە خەڵک لە دەرگاکان قەرەپەستانە بکەن. وەلێ ناتوانین بزانین کە کێهە دەرگا قەرەپەستانێی لەسەر دەبێ. ئەگەر هەموو خەڵکەکە یەک دەرگایان هەڵبژارد، ئاژاوەیەکی وا پەیدا دەبێت کەس ناتوانێ بچێتە دەرەوە. بۆیە زۆربەی کات تیۆرەکانی سیاسەتی دەولی، هەڵاوێردنی گەورە دەخەنە روو. راستە هاوسەنگیی هێزەکان لە نەخشەکێشانی هەر سیاسەتێکدا، یەکێکە لە بەهێزترین ئامرازەکانی پێشبینی کردن لە سیاسەتی دەولیدا، کەچی دۆسییەکەی لە وردەکارییەوە دوورە.

بۆچی دەوڵەتان لە هەندێک کاتدا خۆیان لە هاوسەنگیی هێزەکان لادەدەن و دەچنەپاڵ لایەنی هەرە بەهێزە، نەک لایەنی هەرە بێ هێز، یان لەلایەک دەوەستن و سەربەخۆیی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە؟

دەشێ هەندێک لە دەوڵەتان پێیان وابێ کە هیچ رێگاچارەیەکی تریان لەبەردەمدا نییە. یاخود لەو بڕوایەدا بن کە ناتوانن کار لە تەرازووەکە بکات. کەواتە ئەگەر بارەکە بەم جۆرە بێت. دەشێ وڵاتێکی بچووک بڕیاربدا خۆی بخاتە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی زلهێزێکەوە، بەو هیوایەی کە بێلایەنییەکەی شتێکی لە ئازادی جووڵانەوە بۆ دابین بکات. نموونەی ئەمەش، لە جەنگی جیهانی دووەمدا، فنلەندییەکان جەنگیان لەسەر دەستی یەکێتی سۆفیەت دۆڕاند، سەرباری ئەمەش هەستیان کرد بێلایەنی بۆ ئەوان باشترە نەک بچنە ناو تەرازووی هێزەکانی ئەوروپاییەوە. فنلەندا دەکەوتە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی سۆڤیەتییەکانەوە، باشترین شت بۆ ئەو کە دەبوایە بیکردبوایە، وازهێنان بوو لە ئازادیی سیاسەتی دەرەوەی، بەرامبەر بڕێکی زۆر لە ئازادی هەڵسوکەوت کردن لە کاروباری ناوخۆییدا.

هۆیەکی تر بۆ ئەوەی کە پێشبینییەکانی تەرازووی هێزەکان لە هەندێک کاتدا بەهەڵە بکەوێتەوە، بەدی کردنی هەڕەشەیە. بۆ نموونە حیسابێکی میکانیزمانە بۆ سەرچاوەی هێزی وڵاتان لەساڵی ١٩١٧، پێشبینی ئەوە دەکرا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا وڵاتەیەکگرتووەکان بچێتەپاڵ ئەڵەمانیاوە. چونکە بەریتانیاو فەرەنساو روسیا ٣٠٪ی سەرچاوەکانی پیشەسازی جیهانیان لەبەردەست دابوو، لە کاتێکدا ئەڵەمانیاو نەمسا تەنیا ١٩٪یان هەبوو. کەچی ئەمە روونەدا، چونکە دووربینی

ئەمریکاییەکان پێی گوتن ئەڵمانەکان دەستدرێژکەر و لە رووی سەربازییەوە لەوانی دیکە بەهێزترن. هاوکات چونکە ئەڵمانەکان لە بایەخی توانای سەربازیی ئەمریکایان کەم کردەوە.

بینینی هەڕەشە، زۆربەی کات لەژێر کاریگەریی دوورو نزیکی سەرچاوەی هەڕەشەکە دایە. دەشێ یەکێک لە هاوسێکان، بە تەنیا بەپێوەری جیهانی بێ هێز بێ، وەلێ هەڕەشەیەک لە ناوچەکەی خۆیدا پێکدەهێنێ. با لە بابەتی ولاتەیەکگرتووەکان و بەریتانیا رامێنین لە سەدەی نۆدەهەمدا. بەریتانیا دەیتوانی بجەنگێ، وەلێ رازیکردنی ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکای هەڵبژارد. بۆ ئەمەش دەست بەرداری زۆر شت بوو، لەوانە دەستی لە کەناڵی پەنەما بەردا، ئەمە دەرفەت و هەلی بۆ ئەمریکاییەکان رەخساند کە باری دەریاوانی خۆیان باش بکەن. یەکێک لە هۆیەکانی ئەم هەڵوێستەی بەریتانیا ئەوەبوو، کە ئەوان زێتر لە ئەڵمانیای هاوسێیان دڕدۆنگ بوون نەک لە ئەمریکای دوورە دەست. راستە ولاتە یەکگرتووەکان بە قەبارە لە ئەڵمانیا گەورەتر بوو، وەلێ لە روانگەی بەریتانییەکانەوە مەسەلەی دووری، یاخود نزیکی، سەرچاوەی هەڕەشەکەی دیاردەکرد.

هەروەها ئەو مەسەلەی دووری، یاخود نزیکییە، هاوپەیمانێتییەکانی دوای ساڵی ١٩٤٥مان بۆ راڤە دەکا. ولاتە یەکگرتووەکان لە یەکێتی سۆڤیەت بەهێزتر بوو، کەواتە بۆچی ئەورووپاو ژاپۆن، هاوپەیمانییەتیان لەگەڵ سۆڤیەتدا نەبەست دژی ولاتەیەکگرتووەکان؟ وەرامی ئەم پرسیارە تا رادەیەک لە دووری، یاخود نزیکی سەرچاوەی هەڕەشەکەدایە. سۆڤیەت لە دیدی ئەورووپاو ژاپۆنەوە هەڕەشەیەکی راستەوخۆ بوو، لە کاتێکدا ولاتەیەکگرتووەکان هەڕەشەیەکی دوورە دەست بوو. بۆیە ژاپۆنی و ئەورووپاییەکان داوایان لە دەوڵەتە گەورە دوورەکە کرد، کەتای تەرازوویان بۆ راست بکاتەوە لەگەڵ هاوسێیە راستەوخۆکەیاندا.

هەقیقەتی ئەوەی کە مەسەلەی دووری، یاخود نزیکی زۆربەی کات کار لە چۆنیەتی دیتنی هەڕەشە کە دەکات، بەلای ئەو پێشبینی کردنانە دەشکێتەوە کە لەسەر سەرژمێرکردنێکی میکانیزمانەی سادە بۆ سەرچاوەکانی هێز وەستاوە.

یەکێک لە هەڵاوێردنەکانی تر لە پێشبینیی تەرازووی هێزەکان، پەیوەستە بە زێدەبوونی رۆڵی پشت بەیەکتر بەستنی ئابوری لە کاروباری جیهانیدا. سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان وا دەخوازێ کە فەرەنسییەکان حەز بەفراژی بوونی ئەڵمانیا نەکەن، وەلێ بەیەکەوە لکانی ئابوری وا دەکا کە فراژی بوونی ئەڵمانیا مەرجێک

بێت بۆ فراژی بوونی فەرەنسا. هاوکات هەلی دووبارە هەڵبژاردنەوەی سیاسەتمەدارە فەرەنسییەکان کە ئابوری لە سەردەمی ئەواندا فراژی کردووە، زۆرتر دەبێت، بۆیە گرتنەبەری سیاسەتی کۆسپ دانان لەبەردەم فراژی بوونی ئابوری ئەڵمانی، بە گەمژەییەک دەژمێردرێ، چونکە ئابوری هەردوو ولات بە پلەیەکی زۆر پشتیان بەیەکتر بەستووە. لە هەندێک حسێو بۆکردنی ئابوری، زۆربەی کات دەستکەوتی هاوبەش لە نێوان دەوڵەتاندا دەبێت، دەشێ ئەگەر سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان ساویلکانە پیادە بکرێ، لەدەست بچێت.

## بونیاتی سیاسی بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم

## تەرازووی هێزەکان

| | |
|---|---|
| ١٨١٥-١٨٧٠ | فرەجەمسەری ئاوالا |
| ١٨٧٠-١٩٠٧ | هەڵکشانی ئەستێرەی ئەڵمانیا |
| ١٩٠٧-١٩١٤ | هاوپەیمانێتیی دووجەمسەرە |

لە کۆتاییدا، هەندێک جار ئایدیۆلۆجیستەکان وا لە دەوڵەتان دەکەن، لە جیاتی بچنە پاڵ دەوڵەتە بێ هێزەکانەوە، بچنەپاڵ دەوڵەتە خاوەن دەسەلاتەکان. تەنانەت لە رۆژانی «**ثوسایدیدس**»یشدا، دەبینین، دەوڵەتە شارە دیموکراتییەکان، زێتر حەزیان بەلای ئەثیناو ئولیگارکییەکان دەکرد، لەوەی حەز لە سپارتا بکەن. لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمیشدا کە بەریتانییەکان، ولاتەیەکگرتووەکانیان رازی کرد، یاخود ئەوروپاییەکان دوای سالی ١٩٤٥ بوونە هاوپەیمانیی ئەمریکاییەکان، تا رادەیەک ئەمە بۆ ئایدیۆلۆژیا، هەروەها بۆ دووری، یان نزیکی هەڕەشەکە دەگەڕێتەوە. لەلایەکی ترەوە پێویستە زۆر پشت بەو پێشبینی کردنانە نەبەستین، کە بە ئایدیۆلۆژیاوە بەندن، لەبەر ئەوەی زۆرجار دەبێتە سۆنگەی هەڵەی گەورە گەورە. زۆر خەڵک لەو بڕوایەدابوون کە ناشێ **ستالین و هیتلەر** لەیەکتر نزیک ببنەوە، وەک لە سالی ١٩٣٩ روویدا. چونکە لە رووی ئایدیۆلۆژیاوە دوولای دژ بەیەکتر بوون. وەلێ حسێوبۆکردنی هاوسەنگیی هێزەکان بەرەو هاوپەیمانێتی دووقۆڵی بردن، دژی ئەو دەوڵەتانەی کە لە رووی ئایدیۆلۆژیاوە لە نێوەڕاست دابوون. بەهەمان چەشن، لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، ولاتەیەکگرتووەکان، لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ چین و یەکێتی سۆڤیەت و

ڤێتنام و کەمبۆدیادا کەوتە هەڵەوە، چونکە ئەمانە هەموو دەوڵەتی کۆمۆنیستی بوون. سیاسەتێک کە لەسەر هاوسەنگیی هێزەکان بیناکرابێ، دەبوایە دەرکی بەوە کردبوایە کە ئەو دەوڵەتە کۆمۆنیستانە، هەردەبێ لەنێوخۆیاندا هاوسەنگییەک پێکبێنن، (کە ئەمەش لە کۆتاییدا هاتەدی) ئەمە وایدەکرد ئەو هەموو زیانە نەکەوێتەوە، تا سەقامگیری لە رۆژهەڵاتی دووردا بێتەدی.

## هاوسەنگیی هێزەکان، وەک سیستەمگەلی فرەجەمسەر

سێیەمین رێگا کە زاراوەی «هاوسەنگیی هێزەکان»ی تیا بەکاردەهێنرێ، لە رووی مێژووییەوە، روونکردنەوەی حاڵەتەکانی فرەجەمسەرییە. هەندێ جار ئەوروپای سەدەی نۆزدەهەم، بە نموونەیەکی دەژمێرن، بۆ تەرازووی هێزەکانی فرەجەمسەری میانڕەو. مێژوونووسان، وەک **ئەدوارد گولیک** Edward Galick زاراوەی تەرازووی کلاسیکیی هێزەکان وەک کینایەتێک بۆ سیستەمی ئەوروپایی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەکاردەهێنن. بەو واتایە تەرازووی هێزەکان پێویستی بە هەبوونی کۆمەڵێک دەوڵەت هەیە، بەشێوەیەکی ئاسایی پێنج، یاخود شەش دەوڵەت کە لە رێسای یارییەکە دەکەن، کە بەشێوەیەکی گشتی بۆ هەمووان روون و ئاشکرایە. چونکە بەکارهێنانی زاراوەی «تەرازووی هێزەکان» ئاماژە بۆ سیستەمە مێژووییەکان دەکا، ئێمە سەیری هەردوو رەهەندی سیستەمەکان دەکەین، مەبەستمان لە «بونیات»و «پرۆسەی بەیەکەوەنانە» کە لە بەشی دووەمدا باسمان کردن.

راستە سیستەمی فرەجەمسەری تەرازووی هێزەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لە مێژووی سیستەمی دەوڵەتی نوێدا، درێژترین ماوەی بەبێ جەنگێکی جیهانی خایاند، لە (١٨١٥ تا ١٩١٤). کەچی پێویستە لە سەر ئێمە وێنەیەکی رۆمانتیکی بۆ ئەو مەسەلەیە چێ نەکەین، یاخود زێدەڕۆیی بکەین لە ئاسانکردنەوەی چیرۆکێکی ئاڵۆز.

بونیاتی تەرازووی هێزەکان لە ئەوروپای سەدەی نۆزدەهەمدا، لە کۆتاییەکانی ئەو سەدەیەدا گۆڕانی بەسەرداهات. لە ماوەی نێوان ١٨١٥-١٨٧٠دا، پێنج دەوڵەتی گەورە لە ئارادابوون بە بەردەوامی هاوپەیمانێتی لەگەڵ یەکدا دەگۆڕی، بۆ ئەوەی هیچ کامێکیان بەسەر، کیشوەری ئەوروپادا، باڵادەست نەبێت. لە نێوان ساڵانی ١٨٧٠و ١٩٠٧دا، دوای یەکخستنی ئەڵمانیاو ئیتاڵیا، بوون بە شەش دەوڵەتی گەورە. وەلێ مەزن بوونی هێزی ئەڵمانیا بەرەو ئەو گرفتەی راپێچ کردن کە لە دواییدا بووە سۆنگەی نەمانی سیستەمەکە، (واتە سیستەمی فرەجەمسەری-و) پێشتر بینیمان

ماوەی نێوان (١٩٠٧-١٩١٤)، دامەزراندنی دوو هاوپەیمانێتی گەورەی بەخۆیەوە بینی، کە دواتر بوونە دوو بلۆکی توندڕەو و هیچ نەرمییەکیان نیشان نەدەدا. ئەمەش بەشداری لە هەڵایسانی جەنگی جیهانی یەکەمدا کرد.

هەرچی بە گوێرەی «پرۆسەی بەیەکەوەنانەکەیە»، سیستەمی هاوسەنگیی هێزەکان لە ئەوروپای سەدەی نۆزدەهەمدا، بۆ پێنج دەوران دابەش دەکرێت. لە کۆنگرەی ڤیەننا، دەوڵەتە ئەوروپاییەکان، فەرەنسایان قبوولکردەوە و ڕەزامەندیان لەسەر ڕێساکانی یارییەکی دیارکراو نواند، کە یەکسانی لە نێوان یاریزانەکان دابین بکا. ئەو ڕێسایانە هەماهەنگیی ئەوروپاییان European Concer لە ١٨١٥ تا ١٨٢٢ پێکهێنا. ناوە ناوە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و دابین کردنی هاوسەنگی، کارەکانی خۆیان یەکدەخست . هەندێک دەستێوەردانی دیاریکراو کرا، بۆ هێشتنەوەی حکومەتەهایەک لە دەسەڵاتدا چونکە گۆڕانیان دەبووە سۆنگەی سەرلەنوێ نەخشەکێشانەوەی سیاسەت بە شێوەیەک کە سەقامگیری لە ئەوروپا لەنگ دەکرد. فراوان بوونی چوارچێوەی ڕێبازی نەتەوایەتی و شۆڕشە دیموکراتییەکان، کارەکەی زەحمەتتر کرد. وەلێ هەماهەنگییەکی ناتەواو لەساڵی ١٨٢٢ تا ١٨٥٤ بەردەوام بوو، ئەو نیمچە هەماهەنگییەش لە نێوەڕاستی ئەو سەدەیەدا نەما، کاتێک شۆڕشە نەتەوەخوازە لیبرالستەکان سەریان هەڵدا، کە بەگژ قەرەبووکردنەوەی هەرێمی، یاخود گێڕانەوەی حکومەتەکان بۆ دەسەڵات بەمەبەستی پاراستنی هاوسەنگی، دادەچوونەوە. بیری نەتەوایەتی بە ڕادەیەک بەهێز بوو کە چیتر باوی ئەوە نەما زەوی و زار دابەش و پارچە پارچە بکرێ، بەو ئاسانییەی کەوا پەنیری پێ پارچە دەکرێ.

ماوەی سێیەم لە پرۆسەکە (پرۆسەی بەیەکەوەنان-و) «١٨٥٤-١٨٧٠» تا ڕادەیەکی زۆر کەمتر میانرۆ بوو. ئەو ماوەیە پێنج جەنگی بەخۆیەوە بینی. یەکێک لەوانە جەنگی کریم بوو، کە جەنگێکی هاوسەنگیی کلاسیکیی هێزەکان بوو.

فەرەنساو بەریتانیا چیتر ڕێگەیان نەدا روسیا فشار بخاتە سەر دەوڵەتی داتەپیوی عوسانییەوە. هەرچی جەنگەکانی تر بوون، ئەوا پەیوەندییان بە بزاڤی یەکێتی ئەڵمانیا و ئیتالیاوە هەبوو. لەو ماوەیەدا سەرکردە سیاسەتمەدارەکان رقیان لە ڕێسا کۆنەکان بووەوەو دەستیان کرد بەبەکارهێنانی شەپۆلی نەتەوایەتی بۆ ڕاژەکردنی مەبەستەکانیان. بۆ نموونە، پسمارک نەتەوەخوازێکی ئایدیۆلۆژیستی ئەڵمانی نەبوو. بەڵکو زۆر خۆپارێزیش بوو، ویستی ئەڵمانیا لەژێر فەرمانڕەوایی بنەماڵەی پاشایەتی لە پروسیا یەکبخات. وەلێ لە پێناو بەدیهێنانی مەبەستەکانیدا، هەرکە ئەرکەکەی

بەجێ گەیاند، گەڕایەوە سەر شێوازی خۆپارێزی خۆی و سڵی لە بەکارهێنانی جۆشی نەتەوایەتی و جەنگ نەکردەوە، بۆ تێکشکاندنی دانیمارک و نەمساو فەرەنسا.

ماوەی چوارەم (١٨٧٠-١٨٩٠) سیمای پسمارکی بۆ هاوسەنگیی هێزەکان پێوەبوو. کاتێک ئەڵەمانیای یەکگرتوو لەژێر سەرکردایەتی پروسیا رۆڵی سەرکردایەتی کردنی خۆی دەگێڕا. **پسمارک** سیاسەتی خۆی زۆر بە نەرمی بەڕێوەدەبردو پەنای بۆ هاوپەیمانییەتی هەمەجۆر دەبرد، هەوڵی دەدا پاڵ بە فەرەنساوە بنێ بۆ ئەوەی سەرەڕۆیی و سەرکێشی ئیمپریالیستانەی خۆی لە پشت دەریاکانەوە ئەنجام بدات. بۆ ئەوەی چیتر سەرنجی لەسەر هەردوو هەرێمی «ئەلزاس و لۆرین» نەمێنێ، کە لە شەڕی حەفتاکاندا فەرەنسا لە دەستی دابوون. هاوکات هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی کاری هاوسەنگیی ئەوروپایی لەسەر بەرلین بوەستێ و چوارچێوەی ئیمپریالیستی ئەڵەمانی تەسک بکاتەوە، کەچی جێگرەکانی **پسمارک** لە ئاستی زیرەکی ئەودا نەبوون. هاوسەنگیی هێزەکان لە ماوەی (١٩٠٧-١٩١٤)دا وەک خۆی مایەوە، وەلێ وردە وردە نەرمیی خۆی لەدەستدا. جێگرەکانی **پسمارک** هاوپەیمانێتییەکانیان نوێ نەکردەوەو ئەڵەمانیا لە پشت دەریاکانەوە تێکەڵ بە سەرەڕۆییە ئیمپریالیستەکان بوو، بەمەش بەگژ بالادەستیی بەریتانییەکان داچووەوە. هەروەها وای نەکرد نەمسا، لە بالکان لەگەڵ روسەکاندا رووبەڕووبێتەوە. ئەو سیاسەتانە ترسی گەشەسەندنی هێزی ئەڵەمانیایان پتەوتر کردو پالیان بە سیستەمەکەوە نا بۆ حاڵەتی بەجەمسەربوون و بەرەو جەنگی جیهانی یەکەمی برد.

## پرۆسەی بەیەکەوەنانی تەرازووی هێزەکان
## بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم

| | |
|---|---|
| هەماهەنگی ئەوروپایی | ١٨٢٢-١٨١٥ |
| هەماهەنگی بەرهەڵدا | ١٨٥٤-١٨٢٢ |
| سەرهەڵدانی رێچکەی نەتەوایەتی و یەکخستنی ئەڵەمانیاو ئیتالیا | ١٨٧٠-١٨٥٤ |
| سیاسەتی پسمارک لە هاوسەنگیی هێزەکاندا | ١٨٩٠-١٨٧٠ |
| نەمانی نەرمی نێوان دەوڵەتان و جەمسەرەکان | ١٩١٤-١٨٩٠ |

## هاوپەیمانێتییەکان

هاوسەنگیی هێزەکان وەک سیستەمێکی فرەجەمسەر، قەرزاریاری پرەنسیپی هاوپەیمانێتییە. هاوپەیمانێتی (پاکت) بەو رێ و شوێنە رەسمی و نا رەسمییە دەگوترێ کە، دەوڵەتانی خاوەن سەروەری، پێکەوە لە پێناو دابین کردنی ئاسایشی یەکدی ئەنجامی دەدەن. لەوانەیە هۆی دامەزراندنی هاوپەیمانێتی دڵەڕاوکێی سەربازی بێ، وەک ئەوەی دوو دەوڵەتی قەبارە مام ناوەند پێیان وابێ، ئەگەر بوونە هاوپەیمان، لە هەڕەشەی دەوڵەتێکی گەورەتر لە خۆیان بەدوور دەبن. لە راستیدا هاوپەیمانێتی سەربازی، بەشێوەیەکی ئاسایی، یەکێکە لە خاڵە گەرمەکانی سیاسەتی دەولی. دەشێ دەوڵەتان لەبەر هۆی تر ببنە هاوپەیمانی یەکتر، کە سەربازی نین. پێشتر باسمان کرد کە ئایدیۆلۆژیا لە زۆر کاتدا دەوڵەتان لەگەڵ یەکتر کۆدەکاتەوە. هەروەها دەشێ ببێتە سۆنگەی بەیەکدادانی نێوان دەوڵەتانیش. دەشێ مەترسی ئابوری هۆیەکی تری دامەزراندنی هاوپەیمانێتیی بێ. بەتایبەتی لە ناوچەکانی جیهانی نوێدا کە سۆنگەی سەربازیی پوختی تیا نەماوە.

هاوپەیمانێتییەکان لەبەر چەند هۆیەک دادەڕمێن، کە لە هۆیەکانی پێکەوەنانیان کەمتر نین وەلێ بە شێوەیەکی گشتی دەشێ بگوترێ وەختێ دەوڵەتان واز لە هاوپەیمانێتی دەهێنن کە یەکێکیان هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی خۆی لە هاوپەیمانەکەیدا ببینێ. ئەمە لە کاتێکدا روودەدا کە سیستەمی یەکێک لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بگۆڕێ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو دوو دەوڵەتە چیتر هاوئایدیۆلۆژیا نین. بەم شێوەیە بەر لە ساڵی ١٩٤٩، کاتێک نەتەوەخوازەکان فەرمانڕەوایی چینیان دەکرد، چین و ولاتەیەکگرتووەکان هاوپەیمانی یەکتر بوون.

بێگومان لەوانەیە سۆنگەی تریش بۆ بەکۆتاهێنانی هاوپەیمانێتییەک هەبێت، کاتێک یەکێک لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەهێزتر دەبێت، و بە چاوی رکابەر لەلایەن دەوڵەتەکەی ترەوە سەیر دەکرێت و دەبێتە مایەی هەڕەشە بۆی. ئیدی بۆ هێنانەدی هاوسەنگی، لە شوێنی تر بە دوای هاوپەیمانی دیکە دەگەڕێ.

نەرمی و ئاڵۆزی، نیشانەیەکی جیاکەرەوەی سیستەمی هاوپەیمانییەتی پسمارک. سیفەتی یەکەم (نەرمی)، سەقامگیری بۆ سیستەمی هاوسەنگیی هێزەکان هێنایەدی، کەناو ناوە رێگە بە بەرپابوونی تەنگژەو ململانێ دەدا بەمەرجێ هەموو سیستەمەکە بنکۆڵ نەکا.

ئەڵمانیا لە نێودڵی ئەو سیستەمەدا بوو، دەتوانین **پسمارک** بە یاریزانێکی

لێهاتوو بچوێنین، کە دەتوانێ لەیەک کاتدا چەند تۆپێک لە هەوادا بهێڵێتەوە، ئەگەر یەکێکیشیان کەوت، ئەوا ئەوانەی تر لە هەوا بمێننەوە، بەڵکو بشتوانێ دابێتەوەو ئەو تۆپانەش هەڵگرێتەوە کە کەوتبوونە سەر زەوی، بەرلەوەی تۆپەکانی تر بکەون. لەگەڵ ئەمەشدا خاڵی بێ هێزی ئەو سیستەمە ئاڵۆزی بوو، کاتێک سەرکردەی ناکارامەتر جێگای پسمارکیان گرتەوە، نەیانتوانی درێژە بە سیستەمی هاوپەیمانێتی بدەن. لە جیاتی ئەوەی **پسمارک** ئاسا ململانێ لە ئەڵمانیا دووربخەنەوە، وەک چۆن فەرەنسای هان دەدا تواناکانی خۆی بۆ داگیرکردنی کۆلۆنیالی لە ئەفریقادا بەکاربهێنێ. سەرکردە ئەڵمانییەکانی دوای ئەو وایان کرد هاوپەیمانییەتییەکان پووچەڵ ببنەوەو گرژی بەرزبێتەوە تا گەیشتە ساڵی ١٩١٤. لەجیاتی نوێکردنەوەی هاوپەیمانێتی (ئەڵمانی - روسی)، تەزاری ئەڵمانی وازی لە روسیا هێنا بۆ ئەوەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەریتانیادا سازبدا. ئەو کاتە سیستەمی هاوپەیمانێتی فرەجەمسەری ناسک و نەرم، وردە وردە گۆڕا بۆ دوو بلۆکی هاوپەیمانێتی، کە هەردووکیان لە دووتوێی خۆیاندا دەرئەنجامی شوێنەوار مەترسیداریان لەسەر ئاشتی ئەوروپایی بەخۆیانەوە هەڵگرتبوو.

## رەهەکانی جەنگی جیهانی یەکەم

جەنگی جیهانی یەکەم نزیکەی ١٥ ملیۆن مرۆڤی بە فەتارەت دا. تەنیا لە تاقە شەڕێکدا - شەڕی سوم - ١,٣ ملیۆن سەرباز کوژران و برینداربوون. بەرامبەر ٣٦٠٠٠ سەرباز، کاتێک پسمارک لە ساڵی ١٨٦٦ نەمسای بەزاند، هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکان نزیکەی ٥٥٠٠٠ هەزار سەربازی لە کۆریاو ڤێتنام لەدەست دا. جەنگی جیهانی یەکەم، جەنگی مە تەرێز و سیمی دڕکاوی و مەترالیۆزو تۆپی قورس بوو. نەوەیەکی گەنجی ئەوروپایی بەتەواوی لەناوبرد.

ئەو جەنگە بەتەنیا مرۆڤی لەناونەبرد، بەڵکو سێ ئیمپراتۆریای ئەوروپایی: ئەڵمانیاو نەمسا - مەجەرو روسی تێکشکاند[٢]. ئەوروپا تا پێش جەنگی جیهانی یەکەم، مەکۆی هاوسەنگیی هێزە دەولییەکان بوو. دوای جەنگی یەکەمیش، ئەوروپا سەنگی خۆی هەرما. وەلێ وڵاتەیەکگرتووەکان و ژاپۆن بوونە دوو دەوڵەتی مەزن و هێزەکانیان لەسەر شانۆی رووداوەکانی جیهان وەدیارکەوتن. هەروەها جەنگی جیهانی

---

٢- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٨) لە دواوەی ئەم کتێبە، بۆ تەماشاکردنی ژمارەی کوژراوان لە ماوەی جەنگدا.

یەکەم، شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسی لەگەڵ خۆیدا هێناو بووە سەرەتایەک بۆ شەڕێکی ئایدیۆلۆژی، کە هەموو سەدەی بیستەمی ماندوو شەکەت کرد.

ئەو کارەساتە چۆن وا رووبدا؟ دوای جەنگی جیهانی یەکەم بە ماوەیەکی کورت، **میر بیرنهارد فون بیولو** Prince Bernhard Von Bulow (راوێژکاری ئەڵەمانیا لە ١٩٠٠ تا ١٩٠٩) لە کۆشکی راوێژکاری لە بەرلین، لەگەڵ جێگرەکەیدا **بیثمان هولفیج** Bethmann Hollweg کۆبووەوە. ئەمەی خوارەوە دەقی ئەو ئاخاوتنەیە کە بیولو لەو بۆنەیەدا دێتەوە یادی[٣]:

*بیثمان لە نێوەندی هۆدەکەدا راوەستابوو. چۆن روخسارو نیگای چاوەکانی لەیاد بکەم؟ نیگارکێشێکی بەناوبانگی ئینگلیزی وێنەیەکی هەیە، کە بەقۆچی قوربانی دەچێ، رق و نیگایەکی خەماوی وای لە چاواندایە کە وەسف ناکرێت. ئەم جۆرە خەمەم لە چاوانی بیثمان خوێندەوە.*

*لە دیاهیدا پێمگوت: «باشە، بەلایەنی کەمەوە پێم بڵێ ئەو هەموو شتە چۆن روویدا». دەستە باریکەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، بە دەنگێکی خەمۆکی و ماندووەوە گوتی: «ئاخ خۆزگە دەمزانی». چەند خۆزگەم دەخواست گەر بمتوانیایە لەقتەیەکی وەکو «بیثمان»م دەرهێنابوایە، لەو چرکەیەی ئەو پەیڤانەی دەردەبری، وێنەیەکی ئاوا، دەبووە باشترین بەڵگە کە ئەو پیاوە چارەڕەشە هەرگیز جەنگی نەویستوە.*

چەندین نەوە لە مێژوونووسان لە رەگ و ریشەی جەنگی جیهانی یەکەمیان کۆڵیوەتەوە، هەوڵیان داوە هۆیەکانی جەنگ راڤەبکەن. زۆر ئاستەنگە تەنیا تاکە هۆیەکی بۆ دیاری بکەین. وەلێ دەکرێ پرسیارەکە لەیەک جودا بکرێتەوە بۆ چەند ئاستێکی هاوێرکراو. لەهەر یەکێک لەو ئاستانە، تەرازووی هێزەکان، وەک سیستەمێکی فرەجەمسەر، هاوکات وەکو سیاسەتی هەر دەوڵەتێک بەتەنیاو سەرۆکی تاکە دەوڵەتێک، بەمەرجێکی بنەڕەتی دابنێین بۆ تێگەیشتن لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی جەنگ.

---

٣- مذكرات الامير بيرنارد فون بيلو ١٩٠٩-١٩١٩، بوسطن، دار ليتل و براون، ١٩٣٢، ص١٦٥-١٦٦.

له سۆنگەی ئەوەوە کە سیستەمی هاوپەیمانێتی، نەرمایی جارانی خۆی لەدەستدا، تەرازووی هێزەکان کەمتر فرەجەمسەر بووە، بەمەش ئەگەرەکانی جەنگ زێتر بووە.

## سێ ئاستی شرۆڤەکردن

هەریەکێک لەو سێ ئاستەی شرۆڤەکردن، بەشێک لە وەرامەکەی تێدایە، کورت دادڕین لە وشە، وا پێشنیار دەکا کە بە سادەترین شێواز دەست پێ بکەین و بزانین تا چ رادەیەک بۆمان روون دەکاتەوە، پاشان بە گوێرەی پێویستی کارەکە بەرەو شێوازی ئاڵۆزتر بچین. لەسەر ئەم بنەمایە یەکەمجار دەڕوانینە لێکدانەوەی روونکردنەوەکان، ئاستی سیستەم لە رووی بونیات و پرۆسەی بەیەکەوەنانەوە، بەیەکەوە. دواتر دەڕوانینە ئاستی ناوەوەی کۆمەڵگا، پاشان بادەدەینەوە سەر لای تاکەکان. ئینجا ئەزموونەکانی بیرۆکە دژ بەیەکەکان Counter factual Thoughts بەکاردەهێنین، تا چۆنیەتی رێکخستنی بەشەکان لەگەڵ یەکتردا ببینین لە راڤەکردنی جەنگی جیهانی یەکەمدا.

دوو هۆکاری سەرەکی لەسەر ئاستی بونیاتی، هەیە: سەرهەڵدانی هێزی ئەڵەمانی و رەقەکار بوونی سیستەمەکانی هاوپەیمانێتی. سەرهەڵدانی هێزی ئەڵەمانیا بە راستی سەرسوڕهێن بوو. پیشەسازی قورسی ئەڵەمانیا لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوو لە پیشەسازی بەریتانی رەتدا، کۆی بەرهەمی نەتەوەیی ئەڵەمانی GNP، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بووە، دوو هێندەی کۆی بەرهەمی بەریتانی. لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا، چواریەکی بەرهەمی پیشەسازیی جیهانی هی بەریتانیا بوو. وەلێ لە ساڵی ١٩١٣دا بوو بە ١٠ ٪. کەچی پشکی ئەڵەمانیا بەرزبوەوە بۆ ١٥ ٪.

ئەڵەمانیا بەشێکی لە توانا پیشەسازییەکان بۆ مەبەستی سەربازی تەرخانکرد. کە لەنێو ئەمەدا بەرنامەی خۆپڕچەک کردنێکی دەریایی گەورە هەبوو. لە ئەنجامی گەشەسەندنی هێزی ئەڵەمانیدا، بەریتانیا ترسی لێ نیشت لاتەریک ببێ و دووچاری دڵەڕاوکێ ببێت دەربارەی چۆنیەتی بەرگریکردن لە ئیمپراتۆریا بەرفراوانەکەی. بە هاوسۆزی ئەڵەمانەکان لەگەڵ بۆیرەکان (کە بەڕەگەز هۆڵەندی بوون و نیشتەجێی باشووری ئەفریقا بوون، و لە کۆتایی سەدەی رابردوودا بەریتانیا شەڕی لەگەڵ کردبوون) لە شەڕی بۆیردا، ئەو ترسانەی زێتر بوو.

لە ساڵی ١٩٠٧دا، **سیر ئایر کراون** Sir Eyre Crown، سکرتێری هەمیشەیی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا، بەڵگەنامەیەکی بەناوبانگی بەشێوەی یاداشتنامە لە

مێژووی سیاسەتی هەندەرانی بەریتانیادا نووسی.کە تیایدا هەوڵیداوە سیاسەتی هەندەرانی ئەڵەمانیا بەرچڤە بکا. لە کۆتاییدا گەیشتە ئەو رایەی کە بەریتانیا رێگا نادا تاکە وڵاتێک کۆنترۆڵی تەواوی کیشوەری ئەوروپا بکا. سەرباری ناروونی و شلەژاوی سیاسەتی ئەڵەمانیا، **کراون** Sir Crown گەیشتە ئەو رایەی کە بڵێ: بەرپەرچی بەریتانییەکان لە یاسای سروشتییەوە نزیکترە.

بەرپەرچدانەوەی بەریتانییەکان، ئەڵەمانیای بەهێزتر کردو هۆی دووەمی بونیاتی بۆ جەنگ دروست کرد: رەقەکاری سیستەمی هاوپەیمانێتییەکان بوو لە ئەوروپا. لە ساڵی ١٩٠٤دا، بەریتانیا وازی لە راستکردنەوەی تای تەرازووی هێزی خۆی هێنا، بەو پێیەی کە بەریتانیا شوێنێکی نیمچە لاتەریکی لە کیشوەرەکەدا هەبوو. هاوپەیمانێتییەکی لەگەڵ فەرەنسا بەست، دواتر لە ساڵی ١٩٠٧دا، هاوپەیمانێتی ئەنگلو - فەرەنسی فراوان بوو، روسیاشی گرتەوە. ئەو کاتە بە «هاوپەیمانییەتی سێ لایەنە» ناسرا. ئەڵەمانەکان کاتێک خۆیان بینی چواردەوریان گیراوە، پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ ئیمپراتوریای نەمسا - مەجەر پتەوتر کرد. لەگەڵ چەق گرتنی هاوپەیمانێتییەکان، کاری دیپلوماسیی نەرمی جارانی نەما. لەو ناوەدا گۆڕانکارییەک لە خۆ دانە پاڵ هاوپەیمانێتیەکان، کە تەرازووی هێزەکانی لەسەردەمی پسمارک پێ جوێ دەکرایەوە نەما. ئەوەی روویدا بە پێچەوانەوەبوو. ئەوەبوو دەوڵەتە گەورەکان لە دەوری دووجەمسەر کۆبوونەوە.

*یان ئەوەتا ئەڵەمانیا دەبێ بۆ کۆنترۆڵ کردنێکی سیاسی گشتی و باڵادەستییەکی دەریایی تێبکۆشێ، کە بەمەش هەڕەشە لە هاوسێکانی و هەبوونی ئینگلتەرا دەکا، یاخود ئەڵەمانیایەکی تر دەبێت کە ئەو جۆرە چاوتێبڕینە روون و دیاریکراوەی نابێ، لەکاتی ئێستادا ئەڵەمانیا بیر لەوە دەکاتەوە وەک یەکێک لە دەوڵەتە گەورەکان لە ئەنجوومەنی گەلاندا، شوێنی رەوای خۆی بەکاربێنێ و هەوڵبدا بازرگانی دەرەوەی خۆی چالاک بکاو، خێروبێری کولتووری ئەڵەمانی بڵاوبکاتەوەو چوارچێوەی توانا نیشتمانییەکانی فراوان بکا. بۆ گوراندنی بەرژەوەندیی نوێی ئەڵەمانیا لە هەموو لایەکی جیهاندا، لەهەر کات و جێگەیەکدا هەلێکی ئاشتیانەی بۆ هەڵکەوێ. لە تێڕامانی ئەم کارەدا دەبینین کە پێداویستییەکی راستەقینە لە بەردەم حکومەتی بەریتانیادا نییە کە بە شێوەیەکی یەکجارەکی بڕیاربدا، کەوا کام لەم دوو بۆچوونە دەربارەی سیاسەتی ئەڵەمانیا قبووڵ*

*بکا. لەبەر ئەوەی ئاشکرایە کـە پرۆژەی دووەمی ئەڵمـانی - پلان - (گەشەسەندنێکی نیمچە سەربەخۆ، کە بەتەواوی لە خیبرەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت دابڕاو نەبێ) لەوانەیە لەهەر قـۆناغـێکدا بێت لەگـەڵ پرۆژەی یەکـەمەوە، یاخـود پرۆژەیەکی نەخشـە بۆکـێشـراو و تۆێژراوە، بەیەکەوە بلکێ. سەرباری ئەمە ئەگەر پرۆژەی ئەو گەشەسەندنە هاتەدی، ئەو پایەی ئەڵمـانیـا پێی دەگـات، بێگومـان هەڕەشـەیەکی چەسپـاو بۆ جیـهـان پێکدەهێنێ. وەک هەر پەلامـاردانێکی بەمەبەست کـە لەلایەن شـوێنێکی هاوچەشنەوە، کە رق و کینەیەکی هەڵگیراوی هەبێ».*

**یاداشتنامەی** Sir Eyre Crown **١ی کانوونی دووەم ١٩٠٧**

ئەدی گـۆڕانـکارییـەکـانی پرۆسـەی بەیەکـەوەنان؟ جولەو گـوێزانەوەی بونیـاتی لە سیستەمی دووجەمسەریدا، کاری لەو پرۆسەیەکرد کە سیستەمی هاوسەنگیی هێزەکان لەسەدەی نۆزدەهەمدا کاری پێدەکرد. سەرباری ئەمەش سێ هۆی تر هەبوون بۆ ئەوەی تای تەرازووی هێزەکـان لە سەرەتاکـانی سەدەی بیسـتـەمدا لەنگ بێ. ئەو هۆیانە، جـۆش و خـرۆشی نەتەوایەتیـان پێکـهـێنا کـە لە چەند وڵاتێکدا تەشـەنەی دەکـرد. لە ئەورووپای رۆژهەڵاتدا بزاڤێک سەری هەڵدا کە داوای یەکێتی ئەو نەتەوانەی دەکرد کە بە زمانی سلاڤی داخاوتن. ئەم بانگەشە سلاڤیە هەڕەشەی لە هەردوو ئیمپراتۆریای عـوسمـانی و نەمساوی دەکرد، کە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی سلاڤیـان تێدا هەبوو. رق لێبـوونەوەی نەتەوەیی لە سـلاڤیـیـەکـان لەناو ئەڵمـانیـا سـەری هەڵدا. نووسـەرە ئەڵمانەکان دەیاننووسی کە هەردەبێ شەڕی تیـتونی - سلاڤی رووبدا. کـتێبەکـانی قـوتابخانـەش هەستی نەتەوایەتیان جۆش دەدا. رێچکەی نەتەوایەتی ئەوەی چەسپاند کە بۆ راکێشانی چینی کرێکاران، هەم لە سوسیالیزم بەهێزترە، هەم لە سەرمایەداریش کە بانکسازەکانی لە یەکتر کۆکردبۆوە. بەڵکو، بە راستی ناسیونالیزم ئەوەی سەلماند کەوا لە پەیوەندی خێزانی نێوان پاشاکانیش بەهێزترە.

پێش بەرپابوونی جـەنگ، تەزاری ئەڵمـانیـا بۆ تەزاری روسی نـوسی و داوای لێکرد کە لە جەنگ دوورکەوێتەوە. لەگەڵ ئامـۆزای خۆی بە دەستەواژەی (خۆشەویستم نیکی Dear Nicky)دواو نامـەکـەی بەناوی «دڵسـۆزت ویلی Willi Yours)(٤)

---

٤- بچـووک کـراوەی خـۆشـەویست کـردنی ناوی (William, Nicolas)ە کـە ئەو کـاتە تەزاری رووسیاو ئەڵمانیا بوون.

ئیمزا کرد.

تەزاری روسیا هیوای دەخواست هائێستا نائێستا جەنگ روو‌بدا، بەهۆی کوژرانی، ئەرشیدوقی نەمسا، **فرانس فردیناند** Franz Ferdinand کە یەکێکبوو لە ماڵباتی پاشایەتی نەمسا، ئەو لە هەمان دیدەوە سەیری کارەکانی دەکرد. وەلێ جۆشی نەتەوایەتی لەو کاتەدا بەسەر هەموو هەستێکی هاریکاری کردنی نێوان ئەرستوکراتەکان و پاشاکاندا زاڵ ببوو، ئەم بروسکە خێزانییە هیچ سوودێکی نەبوو.

هۆیەکی تری لەنگ بوونی تەرازووی هێزەکان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، سەرهەڵدانی رازی بوون بوو بە ئاشتی. بە درێژایی ٤٠ ساڵ دەوڵەتە گەورەکان لە ئەوروپادا لە جەنگێکەوە نەگلان. چەند تەنگژەیەک لە ئارادا هەبوون، بۆسنە (ساڵی ١٩٠٨)، مەغریب (١٩١١)، باڵکان (١٩١٢). وەلێ هەموو کۆنترۆڵ کران. کەچی سەوداو سەوداکاری دیپلوماتیکی بێ هیوایی لێکەوتەوە. پاشان چەند پرسیارێک سەری هەڵدا: بۆچی لەسەرمان پێویستە سازش لەگەڵ یەکتر بکەین؟ بۆچی وا لەلایەکەی تر نەکەین تەنازولی زۆرتربکات؟ تا وای لێهات «داروینی کۆمەڵایەتی Charles Darwin» پەسندو پەسندتر دەبوو. کە دەڵێ: وەک شیاوێکی سەرژمێری تیۆری، دەربارەی گەشەسەندنی رەگەزەکان لە جیهانی سروشتدا، مانەوەی باشترین، ماقوڵە، وەلێ پراکتیزەکردنی لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و رووداوە دانسقەکان، هەڵەیەکی گەورەیە.

لێرەدا بیروڕاکانی داروین بۆ پاکانە کردن بۆ بانگەشەی (پێویستە بەهێزترین باڵادەست بێت) خرانە کار. ئەگەر بەهێزترینیش باڵادەست بوو ئەوا بۆچی لەبارەی ئاشتی دووچاری دڵەڕاوکێ ببین! جەنگی درێژخایەن دوور بوو، هەرچی جەنگی کورت و یەکلایی کەرەوە بوو ئەوا لایەنە بەهێزەکە دەیباتەوە، زۆر لە سەرکردەکان بڕوایان وابوو کە جەنگ گۆڕانکاری دڵخۆشکەر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ.

سێیەمین هۆکار کە هاوبەشی لە لەدەستدانی هاوسەنگیی هێزەکان کرد لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، نەرمی و شل و خاوی سیاسەتی ئەڵەمانیابوو کە ئاڵۆزو لەرزۆک بوو. هەروەها سیاسەتی تەزار تا رادەیەک ترسناک بوو، ئەڵەمانەکانیش لە خەڵکی تر جیاواز نەبوون و تەماو مرخیان لە جیهانی دەرەوە خۆش کردبوو. وەلێ ئەوان بە رێگایەک هەوڵیان بۆ دەدا، کە هەموو لایەک دوژمنداریان بکەن، ئەمەش بەتەواوی لە سیاسەتی پسمارک جیاواز بوو لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئەوروپایی لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا. ئەڵەمانەکان کاتێک دەستیان بە پێشبڕکێی

چەکسازیی دەریایی کرد، بەریتانییەکانیان لەخۆوروژاند. هاوکات رق و کینەی روسەکانیان بزواند لەو مەسەلانەی کە پەیوەست بوون بە تورکیاو بەڵکانەوە. فەرەنسایان تووڕەکرد، لە بارەی کولونی فەرەنسییەکان لە مەغریب. تەزاری ئەڵەمانیا هەوڵیدا دۆستایەتی بەریتانییەکان بکا، بەو بڕوایەوە ئەگەر ترسی خستە دەروونیانەوە، ئەمە وایان لێدەکا رادەی گرنگی ئەڵەمانیاو رادەی پێویستیان بە دۆستایەتی کردنی ئەڵەمانیا تێ بگەن. وەلێ ئەوەی روویدا بە پێچەوانەوە بوو. بەریتانییەکان بە رادەیەکی وا ترسان کە یەکەمجار خۆیان بخەنە باوەشی فەرەنسییەکان و دواتریش روسەکانەوە. بەم چەشنە، ساڵی ١٩١٤ ئەڵەمانەکان هەستیان کرد کە پێویستە خۆیان لەو ئابڵوقەدانە دەرباز بکەن. بۆیە بە مەبەستەوە پرکێشی جەنگیان قبووڵ کرد. بەم شێوەیە دەبینین هەستی نەتەوایەتی و زێدەبوونی رازی بوون بە باری ئێستاو داروینی کۆمەڵایەتی و سیاسەتی ئەڵەمانی، هەموو ئەو هۆکارانە هاوبەشیان کرد لە نەرمی نەهێشتن لە پرۆسەی بەیەکەوەنانی سیاسەتی دەولی و دواتریش هاوبەشیان لە دایسانی جەنگی جیهانی یەکەمدا کرد.

ئاستی دووەم لە شرۆڤەکردنەکە، ئەوەمان نیشان دا کە چ لە ناوەوەی کۆمەڵگاو لە سیاسەتی نێوخۆیدا روودەدا[٥]. لەم ئاستەدا راڤەکردنێک هەیە، کە بە دڵنیاییەوە دەتوانین رەتی بکەینەوە: بانگەشەی **لینین** کە سەرمایەداران سۆنگەی جەنگ بوون. بە رای **لینین**، جەنگی جیهانی یەکەم دوا قۆناغی ئیمپریالیزمی سەرمایەداری بوو. وەلێ جەنگ لەسەر ململانێی ئیمپریالیستی لەسەر دابەشکردنی کولونەکان رووینەدا، وەک لینین رەچاوی کرد. ساڵی ١٨٩٨ لە ناوچەی فاشودە لە سودان رووبەڕووبوونەوەیەک لە نێوان فەرەنساو بەریتانیا هاتە ئارا. بەریتانییەکان گەرەکیان بوو هێڵی ئاسنیی باکوور - باشوور تەواو بکەن، کە لە باشووری ئەفریقاوە درێژ دەبووەوە تا میسر. لە کاتێکدا فەرەنسییەکان گەرەکیان بوو هێڵێکی تر لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا رابکێشن، تا کولونەکانیان لە ئەفریقاوە بەیەکتر ببەستنەوە. ئەگەر ئەوکاتە جەنگ بەرپا بوایە لێکدانەوەکەی لینین راست دەردەچوو.

لە راستیدا دوای شانزە ساڵ لەو مێژووە جەنگ لە ئەوروپا روویدا، بانکدارەکانیش بەر لە هەڵگیرسانی شەڕ، زۆر بەتوندی بەرەنگاری بەرپابوونی بوونەوە. **سیر ئەدوارد گرێ** (Edward Grey) وەزیری هەندەرانی بەریتانی، هەستی

---

٥- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٦)، بۆ شارەزابوون لە پلانی روونکردنەوەی تیۆرەکە دەربارەی هۆیەکانی دایسانی جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٤دا.

کرد کە پێویستە ئامۆژگارییەکانی **سیر ئایرکراون** پەیڕەوبکاو لەسەر بەریتانیا پێویستە ڕێگا نەدا ئەڵەمانەکان یاری بە تەرازووی هێزەکانی ئەوروپایی بکەن. کەچی نیگەرانی (**گرێی**) بۆ ئەوەبوو کە چۆن ڕێگایەک بدۆزێتەوە وا لە بانکارەکانی لەندەن بکا پشتگیری ڕاگەیاندنی جەنگ بکەن!

دەشێین ڕاڤەکردنەکەی **لینین** ڕەت بکەینەوە، وەلێ دوو هۆی نێوخۆیی تر هەیە، پێویستە بە بایەخێکی گەورەترەوە ڕەچاویان بکەین: یەکەمیان تەنگژە نێوخۆییەکانی هەردوو ئیمپراتۆریای بەساڵاچووی نەمسا - مەجەر و تورکیای عوسمانی و دووەمیان باری سیاسەتی نێوخۆیی ئەڵەمانیابوو.

هەردوو ئیمپراتۆریای نەمساو تورکیا فرە نەتەوەبوون، ڕووبەڕووی هەڕەشەی تێن و تاوی نەتەوایەتی ببوونەوە. سەرباری ئەمەش حکومەتی عوسمانی گەندەڵ و لەوپەڕی بێ هێزیدا بوو. ئیدی کڕی کۆمەڵە نەتەوەییەکانی باڵکان هاتبوو. کە هەوڵیان دەدا لەژێر فەرمانڕەوایی تورکیا ڕزگاربن، کە چەند سەدەیەکی خایاندبوو. لە ساڵی ١٩١٢دا ئەو کۆمەڵە نەتەوانە لە باڵکان سەرکەوتنیان وەدەست هێناو تورکەکانیان دەرکرد، ساڵی دواتر دەوڵەتە نوێیەکانی باڵکان، لەسەر دەستکەوت و تاڵان لەنێوخۆیاندا کەوتنە جەنگەوە.

ئەم شەڕانە هانی هەندێک لە دەوڵەتەکانی باڵکانی دا مل لە بەر ملی نەمساوییەکانیش بنێن. لەو ڕوانگەیەوە کە مادامەکێ توانیان تورکەکان دەربکەن، بۆچی نەمساوییەکانیش دەرنەکەن؟!

سربیا پێشقەرەولی دەوڵەتەکانی باڵکان بوو. نەمسا لەو فشارە نەتەوەییە ترسا، هاوکات ئەوەی لێی دەکەوتەوە لەدەست دانی پلەوپایەو حسێو بۆ کردن بوو، ئەمە نەمسای نیگەران کرد.لە کۆتاییدا بەهۆی کوژرانی ئەرشیدوق فرانس فردیناند بە دەستی تیرورستێکی سربەوە، نەمساو سربیا بوونە دوژمنی باوە کوشتەی یەکتر. نەمساوییەکان دەیانویست سربەکان بێ هێز بکەن تا نەبنە چەقێک و سلاڤەکانی باڵکان لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە. **ژەنەراڵ کونراد** (General Konrad) بە ئاشکرا هۆکارەکانی ڕوون کردۆتەوەو دەڵێ: لەبەر ئەو هۆیە، نەک لە تۆڵەی پرۆسەی کوشتنەکە، لەسەر نەمساو مەجەر پێویستە شیر بە ڕووی سربیادا هەڵبکێشن، کە خنخنۆکی پاشایەتی گرتووە. ڕەوشەکە وای لێهاتووە یان دەبێ ئەمە هەڵبژێرێ، یان گەردنی خۆی بخاتە بەردەست، یاخود هەوڵێکی تر بدا بۆ ئەوەی نەهێڵێ

تێکبشکێنرێ[٦].

ڕاڤەکردنێکی گرنگی تری ئاستی نێوخۆیی، سیاسەتی نێوخۆی ئەڵەمانیایە. «**فیشەر**»ی مێژوونووس و، لەو بڕوایەدان کە، کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ئەڵەمانیا هۆیەکی سەرەکی جەنگ بوون. **فیشەر** پێی وایە، کە هەوڵەکانی ئەڵەمانیا بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهان، هەوڵێک بوون لە چینە فەرمانڕەوایەکانەوە، بۆئەوەی سەرنجی خەڵک لە بێ فەرِی بەیەکەوەلکانی نێوخۆیی کۆمەڵگای ئەڵەمانی لابدەن. ئەو قوتابخانە فکرییە دەڵێ: هاوبەندییەکی خۆجێی لە زەویدارو و ئەرستوکراتەکان و سەرمایەدارە پیشەسازە گەورەکان، کە «هاوبەندیی مەلەغان و ئاسنی»ی پێ دەگوترا، فەرمانڕەوایی ئەڵەمانیای دەکرد. ئەو هاوبەندییە فەرمانڕەواییە، لەجیاتی چاکسازیی نێوەخۆیی، پشتی بە سیاسەتی فراوانخوازی بەستبوو. واتە یاری پاڵەوانانە لە جیاتی نان. فراوانخوازی ئەلتەرناتیڤی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی بوو، ئەمە بۆ ڕاڤەکردنی هەڵگیرسانی جەنگی، جیهانی یەکەم بەتەنیا بەس نییە، وەلێ یارمەتیمان دەدا کە سەرچاوەی ئەو فشارە بزانین کە ئەڵەمانەکان دوای ساڵی ١٨٩٠ خستیانە سەر سیستەمی دەولییەوە.

ئەی چی دەربارەی ئاستی یەکەمی شرۆڤەکردن، واتە ڕۆڵی تاکەکان؟ بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم، سیفەتی سەرکردایەتی سیمای لاوازی پێوەبوو، ئیمپراتۆری نەمسا «**فرانس یوزیف**» زۆر بەساڵاچوو و ماندوو بوو، سەرکردایەتی کردنی سوپاکەی دابووە دەست سەرۆکی ئەرکان، **ژەنەراڵ کۆنرادو «کونت بیرشتولد»** وەزیرە دوو ڕووەکەی هەندەران.

لە کۆمیدیاکانی چارەنووسیش «وەلی عەهدی نەمساویی «**فرانس فردیناند**» کە لە سەرایێڤۆ کوژرا، پیاوێکی میانڕەو و خاوەن بیروڕای سیاسی لیبرال بوو. لە روسیاشدا **تەزار، نیکۆلای دووەم**، فەرمانڕەوایەکی ڕەها بوو، تەمەنی خۆی بە دوورەپەرێزی لە جیهان بەسەربردبوو. بەپشت بەستن بەهەردوو وەزیری لێ نەوەشاوەی هەندەران و بەرگری، کە بە توندی ملکەچی ژنە نەخۆشەکەی بوون، بەرەنگاری هەموو گۆڕانکارییەک دەبووەوە لە ناوەوەی وڵاتەکەیدا. لەمەش گرنگتر، تەزاری ئەڵەمانیا کە هەستی بە لاوازی دەکرد. مرۆڤێکی ڕاراو خاوەن کەسایەتییەکی بێ هێز و سۆزەکی

---

٦- Boron Conrad Von Hotzendorff، احوال الحرب العالمية، ج٢، نيويورك، دار مكميلان، ١٩٢٨، ص١٨٥-١٨٦.

بوو. ئەڵەمانیای بەرەو سیاسەتێکی پڕ لە مەترسی برد، لە کاتێکدا کاڵفام و بێ توانا بوو. «**فون بیلوف**» لەم بارەیەوە دەڵێ:

«**فیلهیلمی دووەم**» جەنگی نەدەویست، ئەگەر لەبەرهیچ هۆیەک نەبووایە، ئەوا لەبەر ئەوەی بەرامبەر هەڵوێستی ناخۆش هورِ دەبوو. لەکاتی تەنگانەدا، خاوەن شکۆی پایەبەرز نەیدەتوانی لە شەڕدا سەرکردایەتی سوپا بکا. ئەو بەتەواوی دەیزانی کە دووچاری نوراستینا «الاجهاد العصبي» بووە. هەرچی وتاری پڕ جۆشی رەگەزپەرستانەو گەڤ کردن و بەڵێندان بوون، ئەوا دەیویست وا لە خەڵک بگەیەنێ کە ئەوان لە بەردەم فریدریکی گەورە، یاخود ناپلیۆنێکی ترن(٧).

## کاردانەوەی ئەڵەمانیا سەبارەت بەجاڕدانی جەنگی جیهانی یەکەم

*ئەدواردی حەوتەم (خاڵی تەزارو پاشای پێشووی ئینگلتەرا) کە ئێستا لە نێو گۆڕدایە، لە منی زیندوو بەهێزترە! چۆن گومان بەرم کە خەڵکێک لەو بڕوایەدان کە دەتوانرێ ئینگلتەرا بهێنرێتە ژێر بار، یاخود بەم یا بەو رێ و شوێنە سەرکوتکەرانەیە، وای لێ بکرێ ببێتە ئاشتیخواز! ئێستا پێویستە پەردە لە رووی ئەو هەموو فریودانە لا ببردرێ. دەمامکی ئاشتی مەسیحیانە لەسەر رووی -بەریتانیا- بە ئاشکرا و بە توندی پارچەپارچە بکرێ. بانگەشەی درۆزنانەی ئاشتی، شەرمەزار بکرێ!؟ لەسەر کونسول و پیاوەکانمان لە تورکیاو هیندستان پێویستە، کە دژی نەتەوەی بەقاڵان، کە دزێو و بێ رەوشت و درۆزنن، هانی جیهانی محەمەدی (ئیسلامی)! بۆ شۆڕشێکی توند بدرێت. ئەگەر لەسەرمان بێت تا مردن خوێنمان لێ بتکێ، لەوە کەمتر نییە کە ئینگلتەرا، هیندستان لەدەست بدا(٨).*

***تەزار فیلهیلمی دووەم***

---

٧- Richard Ned Lebow بين السلم والحرب، طبيعة الأزمة الدولية، بالتيمور، مطابع جامعة جونز هوبكنز، ١٩٨١، ص١٣٩.

٨- سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٤.

## ئایا جەنگ هەر دەبوایە بەرپابێ؟

کاتێک کۆمەڵێک هۆ لە ئارادابن و، هەریەکەیان بەتەنیا بەس بێ بۆ ئەوەی جەنگ بەرپا ببێ بەو حاڵەتە دەڵێین (دەستمان لێ شتووە). بۆیە جەنگی جیهانی یەکەم مەسەلەیەکی (دەست لێ شۆراو) بوو. ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر دەبوایە جەنگ بکەوێتەوە؟ وەڵام: نەخێر، تا هەڵگیرسانی شەڕ لە مانگی ئۆگستوسی ١٩١٤، مەسەلەکە وانەبوو کە چارنییە هەر دەبێ شەڕ بکەوێتەوە. تا ئەوکاتە کارێکی حەتمی نەبوو کە ئەو کوشتارە چوار ساڵ بەردەوام بێت.

با لەسەر بنەمای نزیکی کاتەکی لە رووداوەکانەوە، سێ شێوە لە هۆیەکان لەیەکتر هاوێربکەین، کە بەدرێژی باسیان دەکەین. لە هەمووان دوورتر هۆیە قوڵەکان و دوای ئەوانیش هۆیە ناوەڕاستەکانن. ئەوەی بە شێوەیەکی راستەوخۆش دەکەوێتە پێش رووداوەکانەوە، هۆیە خێراکەرەکانن. ئەگەر پشتمان بە گفتوگۆ بەست، دەپرسین: ئایا چۆن رووناکی لە ژوورەکەت داگیرسا. وەرامەکەی ئەوە دەبێ. کەوا تۆ پلاکی رووناکییەکەت پێکرد، هۆی راستەخۆ ئەوەیە کەوا یەکێک تەلی کارەبای بۆ ئەو ژوورە راکێشاوە. هۆی قوڵیش ئەوەیە کە «**توماس ئەدیسۆن** THOMAS» چۆنیەتی گەیاندنی کارەبای دۆزییەوە. دەمەتەقێیەکی تر، یاخود پێوەرێک کە مەبەست تیایدا نزیک کردنەوەی بیرۆکەکەیە، ئەویش هەڵکردنی ئاگرە. لێرەدا پارچە دارەکان هۆی قوڵن، دەنکی شەمچەو پارچەوکوتە کاغەز هۆی راستەوخۆن، پێکردنی دەنکی شەمچەکە هۆی خێراکەرە. هۆیە قوڵەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا ئەو گۆڕانکارییانە بوون کە بەسەر بونیاتی تەرازووی هێزەکان و هەندێک رووی سیستەمی سیاسەتی نێوخۆیی داهاتبوون. هەندێک لە هۆیە گرنگەکان بە شێوەیەکی تایبەتی سەرهەڵدانی گیانی نەتەوایەتی و ئەوانەی لێی کەوتەوە بوون، لە دارمانی هەردوو ئیمپراتۆریای بەساڵاچوو و حاڵەتی سیاسی ئەڵەمانی. هۆیە راستەوخۆکانیش، سیاسەتی ئەڵەمانی و دیاردەی رازی بوون بە ئاشتی و گەمژەیی شەخسی سەرکردەکان بوو، هەرچی هۆیە خێراکەرەکان بوون ئەوا کوژرانی فرانس فردیناند بوو لە سەرایێڤۆ بە دەستی تیرۆرستێکی سربی[٩].

کاتێک چاو بە رابردوو دادەخشێنینەوە، شتەکان هەمیشە وا دێنە بەرچاو، کە هەر دەبوایە رووبدەن. لەوانەیە بڵێین ئەگەر رووداوی کوژرانەکەش نەبوایە، رووداوێکی تر

---

٩- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٧) لە کۆتایی ئەم کتێبەدا.

هەر دەبوایە روویدا. هەندێک دەڵێن هۆیە خێراکەرەکان وەکو میترۆ وان، لە هەر دە خولەکێک بە دوای یەکترا دێن. بۆیە رووداوی سەراییڤۆ، بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، چ زوو، چ درەنگ، هەر دەبوایە رووداوی تری لەم چەشنە روویدا. ئەم جۆرە خستنەڕووە، رادەی راستییەکەی دەتوانین لە رێگای مێژووی دژ بەیەکەکانەوە تاقی بکەینەوە.

کاتێک بە وردی لە مێژووی ئەو دەورانە رادەمێنین، دەتوانین بپرسین «چی دەبوو ئەگەر» یاخود «چی روویدەدا»، کارەکە چۆن دەبوو ئەگەر ئەو رووداوی کوژرانە لە سەراییڤۆ نەبوایە؟ چی دەبوو ئەگەر سوسیال دیموکراتەکان لە ئەڵەمانیا دەسەڵاتیان بکەوتایە دەست؟ لێرەدا ئەگەر هەیە، لە رێگای هۆیە قوڵ و راستەوخۆییەکانەوە، ئەگەری دایسانی جەنگ زۆر بوو. وەلێ ئەگەری زۆر، واتای حەتمیەت نییە. با نموونەی «ئاگرەکە» سەرلەنوێ بخەینە روو.

پارچە دار و دەنکە شەمچەکە لەوانەیە ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی ئاگر هەڵ ببێ. خۆ ئەگەر بارانیش باری ئەوا دەنکە شەمچەکە ناتوانێ ئاگربکاتەوە. هەتاوەکو ئەگەر رووداوی سەراییڤۆش لەوکاتەدا روویدابوایە.

با وادانێین دۆزی سەراییڤۆ لە ساڵی ١٩١٤ نەبوایە. هیچ تەنگژەیەک تا ساڵی ١٩١٦ روونەدایە، ئەو کاتە چی روویدەدا؟ ساڵی ١٩١٤ **ژەنەڕاڵ ڤۆن مولتکەو** General Von Moltke و «**جاگو** Jagow»ی وەزیری هەندەران، لەسەرکردە هەرە خێراکەرەکانی ئەڵەمانیا بوون بۆ جەنگ. لەو بڕوایەدا بوون کە چار نییە دەبێ شەڕی روسیا بکرێ. دەیانزانی زەحمەتە ئەڵەمانیا لە دوو بەرەدا بجەنگێ، بۆیە دەبوایە ئەڵەمانیا لایەک تێکبشکێنێ، ئەوجا بۆ لایەکەی تر تەرخان بێ. راستە روسیا دەوڵەتێکی گەورەتر بوو، وەلێ لە رووی تەکنولۆژیاوە دواکەوتوو و تۆڕەکانی گەیاندنی پەڕپوت بوون. کەواتە دەشێ دەست وەشاندن لە روسیا دوابخا، دەبوایە ئەڵەمانیا یەکەمجار بە خێرایی بەرەو رۆژئاوا بجوولێتەوەو فەرەنسا تێکبشکێنێ. دوای سەرکەوتنی لە رۆژئاوا، دەتوانێ رووەو رۆژهەڵات وەرچەرخێتەوەو بەبێ ماندووبوون روسەکان ببەزێنێ. ئەمە (پلانی شیلفن Schlieffen plan) پلانی جەنگ بوو، کە ئەرکانی گشتی ئەڵەمانی دایانابوو، بۆ هێرشێکی خێراو راپێچکەر لە رێگای بەلجیکاوە (بەمەش ئەڵەمانیا بێلایەنی بەلجیکا پێشێل دەکا)، تا بەخێرایی فەرەنسا تێکبشکێنێ و دواتر بەرەو رۆژهەڵات وەرچەرخێتەوە. وەلێ بەهاتنی ساڵی ١٩١٦ ئەو ستراتیژییەتە بایەخی کەم دەبۆوە، چونکە روسیا، لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە قەرزەکانی فەرەنسای بۆ راکێشانی هێڵی شەمەندەفەر تەرخان کردبوو.

چونکە ئەو کاتە گواستنەوەی هێزەکانی روس بۆ بەرەکانی جەنگی ئەڵمانی دوو تا سێ مانگی دەخایاند، بەمەش کاتێکی زۆریان بۆ ئەڵمانەکان دەڕەخساند کە یەکەمجار شەڕی فەرەنسییەکان بکەن. لە ساڵی ١٩١٠دا، ماوەکە کەم بووەوە بۆ ١٨ رۆژ. کەچی بە هاتنی ساڵی ١٩١٦، ئەو پشتێنە ئاساییشە کاتییە بوونی نەدەما. ئەمەش وای لە ئەڵمانیا کرد دەست لە ستراتیژیەتی دوو بەرەیی بەربدا. بۆیە هەندێک لە سەرکردە ئەڵمانەکان، بیریان لەوەکردەوە کە جەنگێک لە ساڵی ١٩١٤، باشترە لە جەنگێک دوای ئەو مێژووە. بۆیە ویستیان دەرفەتی ئەو تەنگژەیە بقۆزنەوە، بۆ هەڵایساندن و بردنەوەی جەنگێکی راستەقینە.

ئەگەر تا ساڵی ١٩١٤، رووداوی کوژرانەکەو هیچ تەنگژەیەک نەبوایە، کارەکان وەکو خۆیان تا ساڵی ١٩١٦ بەبێ جەنگ تێپەڕیبوایەن. دەشیا ئەڵمانەکان ئەوکاتە هەستیان بکردایە کە شتێک هەیە بیانسەنگرێنێتەوەو توانای سەرەڕۆیی کردنیان لە باربات. کە لە دوو بەرەدا بجەنگن، بەڵکو لەوانەبوو (پلانی شیلڤن)یان رەتکردبوایەوەو بە تەنیا لە رۆژهەڵاتی ناڤین بجەنگابوونایە، یاخود لە وانەبوو دانیان بە واقیع بهێنابوایەو لەگەڵ بەریتانیای مەزن ئاشت ببونایەتەوە، یاخود رای خۆیان دەربارەی سوودی ئەو هێرشە بگۆڕیبایە. بەکورتی ئەگەر دوو ساڵی تر تێپەڕیبوایە، گۆڕانکاری زۆر، لە هێزی روسیا، روویدەداو لەوانە بوو رێ لە دایسانی جەنگ بگرێ.

ئەگەر جەنگ نەبوایە ئەوا هێزی پیشەسازیی ئەڵمانی بەردەوام لە زێدەبووندا دەبوو، لە کۆمیدیاکانی چارەنووس: وەک مێژوونووسی بەریتانی (**أ.ج تیلور** A.J.P) بۆی دەچێ، ئەوە بوو ئەڵمانیا بەبێ جەنگ دەستی بەسەر ئەورووپادا دادەگرت. کەواتە، لەوانەبوو تا ئەو رادەیە بەهێز بێت، کەوا لە فەرەنساو بەریتانیا بکا دوودڵ بن لەوەی شەڕی پێ بفرۆشن.

هەروەها دەربارەی ئەوەی کە دەشیا چ لە کاروباری نێوخۆی بەریتانیا روویدا، ئەگەر دوو ساڵی تر بەبێ جەنگ تێپەڕیبوایە. دەتوانین مەسەلەی دژبەیەکەکان بخەینە روو. لەکتێبی «مردنێکی نامۆ بۆ ئینگلتەرای لیبرالی The strange Death of Liberal England» (**جورج دینجرفیلد** George danger field)ی مێژوونووس، دەربارەی گێرمەوکێشەی نێوخۆی بەریتانیا دەدوێ:

پارتی لیبرالی Libral Party بەڵێنی دا بوو لە ئێرلەندا دەربچێ، لە کاتێکدا پارێزگاران، بە تایبەتی لە ئێرلەندای باکوور بەتوندی بەرەنگاری ئەمە بوونەوە.

سەرەتای یاخیبوونێکی سەربازی لە سوپای بەریتانیدا لە ئاسۆ وەدەرکەوت. ئەگەر ڕاپەڕینی ولستەر Vister Revolt ڕوویدابوایە، زۆر بەلای ئەوە دەشکایەوە کە بەریتانیا ئەوکاتە بە کێشە نێوخۆییەکانی خەریک دەبوو و نەیدەتوانی بەشداری لە هاوپەیمانییەتی ڕوسیاو فەرەنسادا بکا. بێ گومان زۆر گۆڕانکاری وا لە دوو ساڵی دواتر لە ئاشتی ڕوویدەدا، کە بایەخی مێژوویی خۆی دەبوو.

## چ جۆرە جەنگێک؟

کۆمەڵێکی تری دژ بەیەکەکان ئەو پرسیارە دەخەنەڕوو: چ جۆرە جەنگێک ڕوویدەدا، ئەگەر هاتوو، مەسەلەی ئایا هیچ جەنگێک ڕوودەدا خرایە لاوە. ڕاستە پایەی سیاسیی ئەڵەمانی، هاوسێکانی ترساند، بەرامبەر ئەمەش ئەڵەمانیا لەوە دەترسا لەلایەن هاوپەیمانییەتی سێ لایەنی (الحلف الثلاثي)یەوە ئابلووقە بدرێ.

کەواتە کارێکی ماقووڵە ئەگەری ڕوودانی جەنگێک نزیکتر بێ لە ئەگەری دوورخستنەوەی شەڕەکە. وەلێ چ جۆرێک جەنگ: شەرت نەبوو جەنگ، شێوەی جەنگی جیهانی یەکەم وەرگرێ. تەکنیکی دژبەیەکەکان دەڵێ: لەتواناادا هەبوو چوار جۆری تری جەنگ بێتە کایەوە.

بە سادەیی یەکێکیان جەنگی خۆجێیە. بەرایی تەزاری ئەڵەمانیا پێی وابوو تەنگژەی بۆسنە (١٩٠٨-١٩٠٩) دووبارە دەبێتەوە، کاتێک پاڵپشتی نەمساوییەکانی کرد. بەم هۆیەوە نەمساوییەکان توانیا ڕوسیا ناچار بکەن لە باڵکان بکشێتەوە[١٠].

لە (٥)ی تەمموزی ١٩١٤دا، کاتێ تەزاری ئەڵەمانی چووە گەشتێکی دەریایی، بەڵێنی بە نەمساوییەکان دا پشتگیریان بگرێ. کاتێ گەڕایەوە دیتی نەمساوییەکان ئەو چەکە (شیک)یان پڕکردبۆوە کە لەسەر کاغەزی سپی بۆی ئیمزا کردبوون. نەمساوییەکان بۆ دوا جار سربەکانیان ئاگادار کردبۆوە. وەختێ تەزار ئەو ڕاستییەی زانی، هەوڵێکی زۆری دا چواردەورەی ئەو جەنگە بگرێ و ڕێگا نەدا تەشەنە بسێنێ. وەک پێشتر لە بروسکەی (نیکی/ ویلی)دا ئاماژەی پێکرا، ئەگەر ئەو هەوڵانە سەرکەوتبان، ئەمڕۆ دەربارەی جەنگێکی گەورە نەدائاخاوتین، بەڵکو تەنیا لەبارەی جەنگێکی بچوکی نەمساوی - سربی لە ئۆگستوسی ١٩١٤ دەدواین.

١٠- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٤). بۆ زانیاری لەسەر ناوچەی بالکان و ئاواتەکانی ڕووس و مەجەرییەکان لە ساڵی ١٩١٤.

**دووەم،** ئەوەیە کە جەنگ یەک بەرەیی بێت. کاتێک روسەکان هێزەکانیان سازو تەیار کرد، ئەڵەمانەکانیش خۆیان کۆکردەوە. تەزار لە **ژەنەراڵ مولتکەی** پرسی، ئایا دەتوانێ تەنیا لە بەرەی رۆژهەلاتدا ئۆ پەراسیۆنی سەربازی بکرێ؟ **مولتکە** وەلامی دایەوە کە ئەمە لە تواناادا نییە. چونکە هەر گۆڕانکارییەک لە کات دانانەوە بۆ تەیارکردن و کۆکردنەوەی هێزەکان و کەل و پەل دابین کردن دەبێتە مێردەزمەی خۆسازدان و بە تەزاری راگەیاند کە ئەو کاتێ هەوڵی داوە پلانەکانی بگۆڕێ، خۆی لەبەردەم کۆمەڵێک ئاژاوەی وا دۆزیوەتەوە کە دەستی بەسەریاندا ناشکێ! لەگەڵ ئەمەشدا، ژەنەراڵ **فۆن ستاب** (Von staab). فەرماندەی تیپی هێڵی ئاسنی لە سوپای ئەڵەمانی، لە دوای جەنگدا دانی بەمە دانا، کە ئەو رۆژانە توانای گۆڕینی پلانەکان بە سەر کەوتوویی لە ئارادابوو. ئەگەر تەزاری ئەڵەمانیا ئەو راستییەی بزانیایەو پێی لەسەر جێبەجێکردنی داگرتایە، دەتوانرا خۆ لە شەڕی یەک بەرەیی ببوێردرێ.

حاڵەتە دژبەیەکەکان – واتە ئەلتەرناتیڤی لە توانابووی واقیعی – ئەوەیە کە شەڕ لەدوو بەرەدا بێنینە بەرچاو، بەبێ بەریتانیا: ئەڵەمانیاو نەمسا، دژی فەرەنساو روسیا. ئەگەر بەریتانیا نەبووایە، هاوسەنگییەکە دەگۆڕا، لەوانە بوو ئەڵەمانیا جەنگەکە بەرێتەوە. لەوانە بوو بەریتانیا نەچێتە ناو جەنگەوە ئەگەر ئەڵەمانیا بەلجیکای داگیر نەکردبووایە، رەنگە بەلجیکا هۆی سەرەکیش نەبووبێ بەلای بەریتانیاوە. هەندێک کەس، لەوانە **سیر ئەدوارد گرنی،** پێی وایە کە هۆی سەرەکی بەلای بەریتانیاوە بۆ هاتنە ناو شەڕەکە ئەوە بوو کە دەترسا ئەڵەمانیا دەست بەسەر کیشوەرەکە دابگرێ. وەلێ بەریتانیا دەوڵەتێکی دیموکراسییە، پارتی لیبراڵ لەنێو خۆیدا کەرت کەرت ببوو، چەپڕەوەکانی ئەو پارتە دژی جەنگ بوون. وەلێ کاتێک ئەڵەمانیا سنووری بەلجیکای بەزاندو بێلایەنی ئەو وڵاتەی پێشێل کرد، ئەو رووداوە هێزێکی بەوانە بەخشی کە لایەنگری شەڕبوون لەنێو (پارتی لیبراڵ)دا، بۆ ئەوەی بەسەر دوودڵی ئەو کەسانەدا زاڵ بێت، کە دژی شەڕ بوون و، هۆی ئەو کەلێنە بوون، کە لە حکومەتی بەریتانیادا پەیدابوو.

لە کۆتاییدا، چوارەم دژبەیەک. بەرپابوونی جەنگ بوو بەبێ وڵاتەیەکگرتووەکان. ئەڵەمانیا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨دا جەنگی دەبردەوە، ئەگەو وڵاتەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩١٧دا نەچووبووایە نێو جەنگ و تەرازووی هێزەکانی نەگۆڕیبوایە.

یەکێک لەو هۆیانەی کە وای لە وڵاتەیەکگرتووەکان کرد بەشداری جەنگ بکا،

هەڵمەتی غەواسەکانی ئەڵەمانیا بوو، دژی کەشتییەکانی هاوپەیمانان و ولاتەیەکگرتووەکان. گەمژەیی ئەڵەمانیاش لەوە بوو: ئەلەمانیا بروسکەیەکی بۆ باڵیۆزخانەی خۆی لە مەکسیک ناردبوو، کە بە بروسکەی **زیمرمان** دەناسرێ (Zimmerman Telegram) داوای کردبوو لە مەکسیک ئاژاوەو گۆبەند دژی ئەمریکاییەکان بنێنەوە، ولاتەیەکگرتووەکان ئەمەی بە کارێکی دوژمنکارانە ژمارد. ئەو هۆکارانە بوون وایان کرد ئەمریکا بچێتە نێو جەنگەوە.

## خەفەکردنی ڕێگاچارەکان

ڕێبازەکان وێنەی مێژوو دەکێشن. ڕووداوەکان یەک لەدوای یەکەوە دێن، پلەکانی ئازادی گرژدەبنەوە، یاخود ئازادی لەدەست دەچێت. ئەگەری بەرپابوونی جەنگ زێدە دەبێت. وەلێ خەفەکردنی ڕێگاچارەکان لەبەردەم سەرکردەکاندا، دەشێ بکرێتەوەو پلەکانی ئازادی بگەڕێننەوە. ئەگەر لە ساڵی ١٨٩٨ دەست پێ بکەین و بپرسین: کام جەنگ لە ئەورووپا لە هەمووان زێتر ئەگەری بەرپابوونی هەبوو؟ وەرامەکە جەنگ لە نێوان فەرەنساو بەریتانیادا. کە لە بەر پاشخانی ناکۆکی کۆلۆنیالی لە ئەفریقا ڕووبەڕووی یەکتر وەستابوون. وەلێ بەهۆی گرێدانی هاوپەیمانییەتی فەرەنسی – بەریتانی ساڵی (١٩٠٤)، کە دواتریش ساڵی ١٩٠٧ روسیا چووە ناویەوە، ئەگەری ئەم جۆرە جەنگە کەم بووەوە. ئەوەبوو یەکەم تەنگژەی ڕۆژئاوایی لە ساڵی ١٩٠٥و تەنگژەی بۆسنە لە ساڵی (١٩٠٨)دا ڕوویاندا، بۆ ئەوەی ئەگەری جەنگ دژی ئەڵەمانیا زێدەتر بکا. وەلێ لە ساڵی ١٩١٠دا هەندێک ڕووداوی گرنگ ڕوویاندا. «**پیتمان هولیفینگ**» راوێژکاری ئەڵەمانیا، هەوڵیدا لەگەڵ بەریتانییەکان پێک بێتەوە. بەریتانیا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە لە هەموو جەنگێکی ئەورووپاییدا بێلایەن دەوەستێت، ئەگەر ئەڵەمانیا قەبارەی هێزی دەریایی خۆی کەم بکاتەوە. هاوکات دەسپێکی بەریەک کەوتنێکی نوێی کۆلۆنیالی لە نێوان بەریتانیاو روسیا لە ئاسیا، لە نێوان فەرەنساو بەریتانیا لە ئاسۆ وەدەرکەوت، کە هەڕەشەی دارمان، یاخود کەلێن تێکەوتنی لە هاوپەیمانییەتی سێ لایەنە دەکرد. بە دەستەواژەیەکی تر، خەفەکردنی ڕێگاچارەکان، لە ساڵی ١٩١٠دا، سەرلەنوێ دەستی بە فراوان بوونەوە کرد. وەلێ بە هاتنەکایەی تەنگژەی دووەمی مەغریب لە ساڵی ١٩١١دا، خەفەکردنەکە داخرایەوە، بەشێوەیەک کە بەریتانیا کەشتیگەلی خۆی ئامادەکرد. بانکدارە ئەڵەمانی و فەرەنسییەکان بۆ بەرهەڵستی کردنی جەنگ، کەوتنە خۆ، تەزاری ئەڵەمانیا پەژیوان

بووەوە. وەلێ ئەو رووداوانە بە شێوەیەکی قوڵ کاریان لە رای گشتی کردو مەترسی لە نیازەکانی ئەڵەمانیا زێتر بوو.

راستە زێتر فشارخستنە سەر نەمساو شەڕی بالکان لە ساڵانی ١٩١٢-١٩١٣، رێگای بۆ ساڵی ١٩١٤ خۆشکرد. وەلێ لە ساڵی ١٩١٤دا هەوڵی هێورکردنەوەی بارەکە سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. بەریتانیا، **لورد هالدینی** Lord Haldane ناردە ئەڵەمانیاو هەردوولا لەسەر چەندین مەسەلە رێککەوتن. هەروەها ئەو رۆژانە ئەوە روون بووەوە کە بەریتانیا پێشبڕکێی چەکسازیی دەریایی بردەوە. بەو خۆزگەیەی کەوا خەفەکردنەکە جارێکی تر هێوربێتەوە.

لە حوزەیرانی ١٩١٤دا، هەستی بەریتانییەکان بۆ چاک بوونەوەی پەیوەندییەکانیان تا ئەو رادەیە بەهێز بوو، کە وای لێکردن چوار کەشتی هەڵگری زەبەللاح (Dreadnought) بە سەردانێکی رەسمی بنێرنە بەندەری کیل «Kiel»ی ئەڵەمانی. ئەگەر بەریتانیا وای حسێوکردبووایە کە جەنگ لەسەر لێواری هەڵگیرسانە، دواشت کە بیری لێکردبووایەوە ئەوە بوو گرنگترین چوار کەشتی هەڵگری خۆی بنێرێتە بەندەری دەوڵەتێکی ناحەز.

ئاشکرایە کە بیرۆکەی جەنگ، لەوکاتەدا لە مێشکی بەریتانییەکاندا نەبووە راستییەکەی، دەریاوانە بەریتانی و ئەڵەمانییەکان، بەیەکەوە لەسەر شۆستەی بەندەرەکە دەگەڕان و دەسوڕانەوەو کە رۆژی ٢٨ی حوزەیران، هەواڵی ئەوەیان پێگەیشت، کە لە شوێنێکی دوور، کە پێی دەگوترێ سەرایيڤۆ، تیرۆرستێکی سربی تەقەی لە دۆقی نەمساوی کردووە. مێژووش شتی لەناکاوی خۆی هەیە، وشەی لەوانەیە، وشەی حەتمی نییە.

## هەمدیس وانەی مێژوو

ئایا هیچ وانەیەک هەیە بتوانین لە مێژووی وەربگرین؟ پێویستە لە بابەتی وانەکان کەمێک لەسەرخۆبین. دەشێ حاڵەتەکانی پێکچوون مرۆڤ بەهەڵەدا ببەن، زۆر ئەفسانەو وێژینگ باڵیان بەسەر جەنگی جیهانی یەکەمدا کێشاوە، بۆ نموونە: هەندێک دەڵێن جەنگی جیهانی یەکەم بە تەنیا رێکەوتێک بوو، بە واتای وشە شتێکی کت و پڕ بوو. نەمسا هەوڵی بۆ جەنگ دا. ئەگەر جەنگ هەر بەرپا بووایە، ئەوا ئەڵەمانیا پێی باشتر بوو ساڵی ١٩١٤ بەرپابێ نەک دواتر. هەروەها خراو خەملاندنێک لە درێژی و قوڵی جەنگدا هەبوو. وێدەچێت ئەمە شتێک بێت و جەنگی

کتوپڕیش شتێکی تر.

هەروەها ئەمەش دەگوترا کە پێشبڕکێی خۆپڕچەک کردن لە ئەوروپادا سۆنگەی جەنگ بوو. وەلێ پێشبڕکێی چەکسازیی دەریایی لە ساڵی ۱۹۱۲ بەکۆتا هات و بەریتانیا بە سەرکەوتوویی تیایدا دەرچوو. دەربارەی نیگەرانیی ئەوروپاییەکان لە زێدەبوونی هێزی سوپاکان، پێدەچێ ئەو رایەی کە دەڵێ خودی پێشبڕکێی خۆپڕچەک کردنەکە لە پەنای داگیرسانی جەنگدا بوو، تا رادەیەکی زۆر ساویلکانە بێ.

لەلایەکی ترەوە هەندێک ئاگادارکردنەوەی راست هەن، یەکێک لە وانەکان ئەوەیە کە پێویستە بایەخ بە پرۆسەی بەیەکەوەنانی تەرازووی هێزەکان و بونیاتەکەی، واتە، دابەشکردنی هێزەکانیش، بدەین.

میانڕەوی لە پرۆسەکەدا دێت و دابەشکردنی هێزیش بەتەنیا سەقامگیری بەخۆوە ناگرێ. وانەیەکی تری سوودمەندیش ئەوەیە کەوا ئاگاداربین لە جاویدان کردنی ئاشتی، یاخود لەو بڕوایەدابین کە تەنگژەی داهاتوو، وەکو تەنگژەی پێشترە. گریمان ساڵی ۱۹۱٤ دووبارەبوونەوەی تەنگژەی بۆسنەی ساڵی ۱۹۰۸ە. ئەگەرچی روونیش بێت کە ئەمەیان وەکو ئەو نییە! لەپاڵ ئەمەشدا تاقیکردنەوەی جەنگی جیهانی یەکەم ئاماژە بۆ بایەخی سەقامگیربوونی هێزە سەربازییەکان دەکات لە کاتی تەنگژەکاندا، بەبێ ئەوەی هەست بکەین کە پێویستە بەکاری بهێنین یاخود لە دەستی بدەین. پاشان کاتی بزووتنەوەی شەمەندەفەرەکان یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکان نەبوو بۆ دارشتنی رەوگەکانی جەنگ و ئەنجامەکانی، وەلێ ئاستەنگی لە بەردەم سەرۆکە ئەوروپاییەکاندا زێترکرد کە کاتێک بۆ هەوڵە دیپلۆماتییەکانیان بدۆزنەوە.

جیهانی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، لە دوو مەسەلەی گرنگەوە لە جیهانی ۱۹۱٤ جیاوازە:

یەکەمیان چەکی ئەتۆمی وای کرد جەنگی خۆپاراستن ببێتە کارەسات. دووەمیان ئایدیۆلۆژیای جەنگ، قبوولکردنی بیرۆکەی جەنگ زۆر لە جاران لاوازترە. ساڵی ۱۹۱٤ بەو شێوەیە سەیری جەنگ دەکرا کە شتێکە هەردەبێ روویداو هیچ چارەمەفەرێک نییە. واتە روانگەیەکی قەدەری هەبوو، لۆژیکەکەی لە دارِوینی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەی هەڵدەگرت، کە دەڵێ: پێویستە جەنگ پێشوازی لێ بکرێ، چونکە وەکو زریانێکی نوێی خۆش، ئاو و هەوا دەپاڵێوێ و دنیا بێگەرد دەکا. بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم ئەو بڕوایە لەئارادا بوو، «**ونستۆن چەرچل**» لە کتێبەکەی «جیهان لە تەنگژەدایە» بە شێوەیەکی زۆر باش سێرە لەو هەستە دەگرێ:

«زاتیان کردو دۆڕان، ئەمە وانەی ساڵی ١٩١٤ بوو».

کـارێکی منالآنـەی نامـۆ لە کـاودانەکـەدا هەبوو، خـۆشگوزەرانی مـەتریالیـانەی نەتەوەکـان تەواوبووبوو، بـە توندی ببـووە ناکۆکیـیەکی نێوخـۆیی و دەرەکی، هەسـتی نەتەوایەتی بەبێ تامی بەرزبووەوەو ئایین بێ هێز ببوو. لە هەموو ولآتێک ئاگر کلّپەی دەسـەند، هەرچەندە بشـاردرابووایەوە بەدیـار دەکەوت. هەتاوەکـو وای لێـهات کـە بڕوا بکرێ جیـهـان، ئازادی گەرەکە. راسـتی، خەڵـک لە هەمـوو جێـیەک تامـەزرۆی ئەوەی بوون زات بە بەرخۆینێن و ئازاو بوێر بن[١١].

---

١١- Winston Chnrchill، العالم فى الأزمه، نیویورک، دار النشر سکرینز، ١٩٢٣، ص١٨٨.

# شکست هێنانی ئاسایشی بەکۆمەڵ و جەنگی جیهانی دووەم

## دامەزران و ژێر کەوتنی ئاسایشی بەکۆمەڵ

جەنگی جیهانی یەکەم بووە سۆنگەی پارچە پارچە بوونێکی توندی کۆمەڵایەتی و شەپۆلێکی بەرفرەی رق هەڵگرتن و شەرمەزارکردنی، ئەو کوشتارە سەر شێتانەیەی روویدا. بەرپرسیاریی بەرپابوونی جەنگیش خرایە ئەستۆی هاوسەنگیی هێزەکانەوە. **ودرو ولسن**، سەرۆکی ئەمریکا کە لیبرالیستێکی کلاسیکی سەدەی نۆزدەهەمە، لە گەرمەی شەڕدا، سیاسەتگەلی هاوسەنگیی هێزەکانی، بەبێ رەوشتی دانا. چونکە ئەو سیاسەتانە دیموکراسی و مافی چارەی خۆنووسینی نیشتمانیان پێشێل کرد. **ولسن** «هاوسەنگیی هێزەکانی بە یارییەکی گەورەی پرشەرم دانا چ لەئێستاو تاهەتایە سیستەمێکی کۆنی شەڕانگێزە، ئەو سیستەمە بەر لە جەنگ لەئارادابوو، دەبوایە جەنگی جیهانی یەکەم خۆی لەو سیستەمە کۆنینە ناسەقامگیرە دەرباز بکات، هاوسەنگیی هێزەکان شتێکە لە داهاتوودا دەتوانین دەست بەرداری بین[(١)].

ولسون لەسەر هەق بوو، چونکە سیاسەتگەلی هاوسەنگیی هێزەکان، دیموکراسی، یاخود ئاشتی ناخەنە پێشی پێشەوە. وەک بینیمان هاوسەنگیی هێزەکان هەمیشە لە خزمەت سیستەمی دەوڵەتی باڵادەست دابووە. دەوڵەتان هەوڵ دەدەن رێگای خۆسەپاندنی هیچ دەوڵەتێک نەدەن. ئەوەی لە هاوسەنگیی هێزەکان دەکەوێتەوە، لەگەڵ جەنگ و پێشێل کردنی مافی چارەی خۆنووسیندا رێک دێتەوە، هەتاوەکو ئەگەر تاکە رێگایەکیش بێت بۆ پاراستنی سەربەخۆیی. جەنگی جیهانی یەکەم بەپلەیەک ماڵوێرانی و ئاژاوەو دڕندەیی تێدابوو، کە وای لە زۆر کەس کرد بیر لەوە بکەنەوە، کەپشت بەستن بەجەنگ بۆ پاراستنی هاوسەنگیی هێزەکان، کارێکە چیتر بەرگەی ناگیرێ. وەلێ ئەگەر جیهان چیتر هاوسەنگیی هێزەکان دابین نەکا. چ شتێک

---

١- ی دوود: الاوراق العامة لجمهورية وودرو ولسون (نیویورك: هاربرة ١٩٢٥) ص ١٨٢-١٨٣.

جێگەی دەگرێتەوە؟

**ولسون** دانی بەوە داناوە کە ناتوانرێ دەوڵەتی خاوەن سەروەرێتی لەبەین ببردرێ. وەلێ دەتوانرێ هێز بەیاساو دام ودەزگاکان رام بکرێ. وەک ئەوەی لە ئاستی خۆجێەتی هەیە. چارەسەری لیبرالی داوای پەرەپێدانی ئەو دام ودەزگا دەولیانە دەکا، کە بەئەنجوومەنی یاسادانان و دادگای خۆجێیەتی دەچن، تا بتوانرێ رێ و شوێنی دیموکراسی لەسەر ئاستیی دەولی پراکتیزە بکرێ. لەو رۆژانەدا هەندێک لە لیبرالیستەکان دەڵێن: جەنگی جیهانی یەکەم، تەنیا بۆ ئەوە روویندا کە جیهان بکاتە شوێنێکی ئارام بۆ دیموکراسیی، بەڵکو تا دیموکراسیی وا بکات جیهان ببێتە شوێنێکی ئارام. لە کانوونی دووەمی ١٩١٨دا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، مانیفێستێکی چواردە خاڵی دەرکرد کە: تیایدا سۆنگەی چوونە ناوجەنگی روون کردبۆوەو بانگەشەی بۆ کۆمەڵەیەکی گشتیی گەلان دەکرد، کە بەگوێرەی پرۆگرامی تایبەت دابمەزرێ، بەئامانجی وەدیهێنانی گەرەنتی بۆ دابین کردنی سەربەخۆیی سیاسیی دەوڵەتان و یەکپارچەیی خاکەکانیان بەگەورەو بچووکیانەوە.

## کۆمەڵەی گەلان

**ولسون** کە رەخنەگران بەیوتوپیایی، تاوانباریان دەکرد، لەو بڕوایەدابوو کە رێکخستنی ئاسایشی دەولی، دەکرێ ببێتە دەروازەیەکی عەمەلی بۆ سیاسەتی جیهانی. ئەو دەیزانی ئەو رێکەوتننامانەی لەسەر کاغەز نووسراونەتەوە بەتەنیا بەس نین، بەڵکو هەر دەبێ رێکخراوو رێسایەک هەبێ ئەو رێکەوتننامانە جێبەجێ بکا.

بۆیە **ولسون** باوەڕێکی گەورەی بەبیرۆکەی «کۆمەڵەی گەلان» هەبوو. راستە هێزی ئەخلاقی گرنگە، وەلێ هەر دەبێ هێزی سەربازی پشتگیری رەوشت بکا. ئاسایش پێویستە ببێتە بەرپرسیارییەکی بەکۆمەڵ. ئەگەر ئەو دەوڵەتانەی دوژمنکاری یەکدی نین هەموو کۆبوونەوە، بۆئەوەی ببنە یەک دەست، سەروەرێتی هێز بەلای چاکەدا دەبێ. ئاسایشی دەولی هەردەبێ بەرپرسیاریی بەکۆمەڵ بێت. ئەو دەوڵەتانەی کەوا دوژمنکاری یەکدی نین هاوبەندیەک دژی دەوڵەتە دەستدرێژیکەرەکان پێک بهێنن. ئەوکاتە لە تواناادا دەبێت ئاشتی پچڕ پچڕ بکرێت.

دەوڵەتان چۆن دەتوانن ئەو سیستەمە نوێیەی ئاسایشی بەکۆمەڵ بۆ جیهان بێننە ئاراوە؟ یەکەمجار دەبێ دەستدرێژیکردن بکرێتە کارێکی ناڕەواو شەڕی هێرشکاران بە دەرچوونێک لەیاسا بژمێردرێ. دووەم: بەهۆی بەیەکەوەنانی هاوبەندییەکەوەکە، هەموو

ئەو دەوڵەتانە بگریتەوە پەیوەندییان بەبابەتەکەوە نییە، سێیەم: ئەگەر بەرپەرچدانەوەکە شکستی هێناو دەستدرێژیکردنەکە روویدا، پێویستە هەموو دەوڵەتان لەسەر سزادانی دەستدرێژیکەر رازی بن. شەریعەتی ئاسایشی بەکۆمەڵ لە هەندێک رووەوە بەسیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان دەچێت. لەو بارەوە دەوڵەتان هەوڵیاندا هاوبەندییەکی بەهێز دابمەزرێنن، تا دەستدرێژیکەر بسەنگرێتەوە، خۆ ئەگەر سەنگرانەوەکەش شکستی هێنا ئامادەبن هێز بەکاربهێنن. وەلێ سێ جیاوازی گرنگ لە نێوان ئاسایشی بەکۆمەڵ و هاوسەنگیی هێزەکاندا هەبوو. یەکەمیان: لە ئاسایشی بەکۆمەڵدا پێ لەسەر سیاسەتەکانی دەستدرێژیکردنی دەوڵەتێک دادەگیرا، نەک لەسەر توانای دەوڵەت. دووەم: لە سیستەمی ئاسایشی بەکۆمەڵدا پێشوەختە هاوپەیمانێتی نەدەبەسترا، مادامەکی دیارنەبوو کامە دەوڵەت دەبێتە دەستدرێژیکەر. هەموو دژی دەوڵەتی دەستدرێژیکەر دەوەستان، لەکاتێکدا لە ژێر سایەی هاوسەنگی هێزەکاندا پێشوەختە هاوپەیمانێتی گرێ دەدرا. سێیەم: سیستەمی ئاسایشی بەکۆمەڵ وا نەخشەی بۆ کێشرا کە جیهانی و بەرفراوان بێت. نە دەوڵەتی سەربەخۆی تیابێ و نەبێلایەن. ئەگەر ژمارەی دەوڵەتە بێلایەنەکان زۆر بوو، هاوبەندیەکە لاواز دەبێت، لەگەڵ ئەویشدا توانای هاوبەندییەکە لەسەنگراندنەوەی دەستدرێژیکەران یاخود سزادانیان کزو لاواز دەبێ.

میساقی کۆمەڵەی گەلان، پرەنسیپی ئاسایشی بەکۆمەڵی لەگەڵ خۆیدا هێنا، پرۆگرامەکە خۆشی بەشێک بوو لەو پەیماننامانەی کە جەنگی جیهانی یەکەمیان بە کۆتاهێنا. زۆر بەند لە میساقەکە، شایەنی ئەوەیە بەشێوەیەکی تایبەتی باس بکرێ. لەبەندی دەیەمدا دەوڵەتان بەڵێنیاندا پارێزگاری هەموو ئەندامانی کۆمەڵە لە دەستدرێژی بکەن. بەندی ژمارە (١١) هەموو جەنگێکی یاخود هەڕەشە نانەوە بە جەنگی وا لێکدایەوە کە ئاراستەی هەموو دەوڵەتان دەکرێ. لە بەندی (١٢و١٥)دا دەوڵەتان لەسەر ئەوە رازی بوون کە ناکۆکیەکانی نێوانیان بخەنە بەردەم تەحکیم و پەنا بۆ جەنگ نەبەن، تەنیا سێ مانگ دوای شکستهێنانی تەحکیم نەبێ. هەرچی بەندی ژمارە (١٦)یە، یەکلایکەرەوە بوو، دەڵێ هەرجەنگێک رێ و شوێنەکانی کۆمەڵەی گەلان پشت گوێ بخات، بەجەنگێک دژی هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵە دەژمێردرێ. ئەو دەوڵەتەش کە شەڕ دەست پێدەکا، یەکسەر سزای ئابوری دەدرێ. هەروەها ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان داوای دەکرد کەپشت بەرێ و شوێن و کارڕایی (اجراء) سەربازیش ببەسترێ.

ئەمە هەڵوێستێکی توندو ڕەقە. وەلێ هەندێک شتی نادیار لە ئارادا هەیە. مادامەکی دەوڵەتان هەموو دەبێ لەسەر پراکتیزە کردنی ئاسایشی بەکۆمەڵ رازی بن، واتا هەر یەکێک لەو دەوڵەتانە مافی ڤیتۆی هەیە.

کاتێک دەوڵەتان میساقەکەیان ئیمزا کرد، هەموویان رازی بوون کە ئیلتیزام بە بەندی (١٦)هەمەوە بکەن، وەلێ لە راستەقینەدا هەر دەوڵەتێ ئازاد بوو کە بۆخۆی جۆری سزاو چۆنیەتی جێبەجێکردنەکە هەڵبژێرێ. دەسەڵاتێکی باڵا نەبوو، کەبەم یان بەو مەرجە بیان بەستێتەوە، بۆیە کۆمەڵەی گەلان هەنگاوێک نەبوو بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی جیهانی کە دەسەلاتێکی باڵای هەبێ و بتوانێ دەوڵەتانی ئەندام پابەند بکات و کۆتایی بە سیستەمی گێرەشێوێنی دەوڵەتان بهێنێ، بەڵکو هەوڵێک بوو بۆ ئەوەی وا لەدەوڵەتان بکات ببنە ئەندامی دەستە جەمعی، وەلێ لەسیستەمێکدا رێک نەخرابن.

ئاسایشی بەکۆمەڵ دوو پرەنسیپی بەیەک گرێدراوی هەیە: سەروەرێتی و یاسای دەولی. پێناسەی سەروەرێتی زۆر ئاسانە: سەروەرێتی، واتە باڵادەستی شەرعیەت لە سنووری خاکێکی دیاریکراودا.

سەروەرێتی وەک ئەوەی ئاکاریستەکانی دەوڵەت بانگەشەی بۆ دەکەن و کۆمەڵەی گەلان بڕیاری لەسەرداوە، دەڵێ: سەروەرێتی دەوڵەت رەهایەو ناشێ پێشێل بکرێ. حکومەتی هەر دەوڵەتێک دەسەلاتێکی تەواوی بەسەر ناوەوەی سنوورەکەیەوە هەیە، ئەو خۆی بەتەنیاو بە رەزامەندی خۆی دەتوانێ دەسەلاتەکەی گورج وشل بکا. واتە ئەگەر حکومەت پەیماننامەیەکی لەگەڵ حکومەتێکی تردا ئیمزا کردو رێگای بەحکومەتی دووەم دا هەندێک دەسەلاتی لەسەر خاکی ئەودا هەبێ، ئەمە کەم کردنەوەیە لە دەسەلاتی خۆی، نەک داگیرکردنی سەروەرێتی حکومەتی یەکەم. لەو روانگەیەوە ئەو دەوڵەتانەی کەمیساقی کۆمەڵەی گەلانیان ئیمزاکردووە، دەستبەرداری برێک لەسەروەرێتی خۆیان بوون بۆکۆمەڵگای دەولی، بەرامبەر زەماناتی ئاسایشی بەکۆمەڵ و یاسای دەولی.

ئەوەی **ولسون** لە یاسای دەولی گەیشتووەو لە میساقی کۆمەڵەی گەلان داهاتووە ئەوەیە کە ئەو یاسایە لەسەرووی یاسا نیشتمانییەکانەوەیە.، ئا لێرەوە لەهەندێ حاڵەتدا لەسەرووی سەروەرێتییەوەیە. بیرورای مەرکەزی لە یاسای دەولی دەڵێ: دەوڵەتانی خاوەن سەروەرێتی ناکەونە بەر سزاوە مەگەر قانون پێشێل بکەن. رۆڵی ئاسایشی بەکۆمەڵ بەگوێرەی یاسای دەولی، رۆڵی پۆلیس لەیاسا نیشتمانییەکان

دەگێڕێ. زۆر لە دەوڵەتان مەسەلەی «بەزۆری»یان لەیاسای دەولی ڕەت کردەوەو پێیان وایە گوێڕایەڵ بوون، بەخۆشی خۆیانە نەک بەزۆری.

## وڵاتە یەکگرتووەکان و کۆمەڵەی گەلان

دەوڵەتان، حەز ناکەن دەست لەهەندێک سەروەرێتی خۆیان بەربدەن، بەرامبەر بەئاسایشی بەکۆمەڵ، ئەمە یەکێکە لە دیارترین خاڵە بێ هێزەکانی کۆمەڵە گەلان. لەسەر ئەم بنەڕەتە وڵاتە یەککگرتووەکان بەشداری لە دامەزراندنیدا نەکرد. ئەنجوومەنی پیران متمانەی بەو میساقە نەدا. ئیدی سیستەمی ئاسایشی بەکۆمەڵ، بەبێ گەورەترین نوێنەری سەرشانۆی دەولی کەوتەکار.

ئەو وێنەی لە مێشکی من دایە دەربارەی «کۆمەڵەی گەلان» ئەوەیە کەدەبێتە هێزێکی ئاکارئامێزی ڕێکخستنی خەڵک لە هەموولایەکی جیهاندا. تیشکی رۆشن کەرەوەی ویژدان دەخرێتە سەر هەموو کارێکی شەڕانگێزی، یاخود دەستدرێژیکردن، کەیەکێک نەخشەی بۆ کێشابێ، یاخود بیری لێ کردبێتەوە جا کەی و لەهەر شوێنێک بێت.

ودرو ولسن(٢)

بۆچی وڵاتە یەککگرتووەکان وازی لەمەسەلەی دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان هێنا، سەرباری ئەوەی کە کۆمەڵە، سەرەتا پرۆژەیەکی ئەمریکایی بوو بۆ سەر لەنوێ ڕێکخستنەوەی سیاسەتی جیهانی؟ زۆرینەی ئەمریکاییەکان دوای جەنگی جیهانی یەکەم ویستیان بگەڕێنەوە سەرباری «سروشتی» خۆیان. زۆربەی خەڵک واتای «سروشتی»یان وا لێکداوەتەوە، کە خۆیان لە دەست خستنە ناو کاروباری دەولی لابدەن. لایەنگرانی ئەو بۆچوونە رایانگەیاند بەپێی پرەنسیپی «مونرو»ی ساڵی ١٨٢٣، بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا تەنیا نیوەگۆی رۆژئاوا دەگرنەوە، لە کاتێکدا بەرهەڵستکاران گەڕانەوە سەر ڕێبازی **جورج واشنتۆن**. سەرۆکی ئۆپۆزیسیۆن، **سیناتور هنری کابوت لودج** لە ولایەتی ماساجوستر لەوە دەترسا کەبەندی (١٦)ی میساقی کۆمەڵەی گەلان، ببێتە سۆنگەی کزو لاوازی سەروەرێتی ئەمریکا ودەسەڵاتی

---

٢- انیس لکود: القوة والعلاقات الدولیة (نیویورك: دار رندوم للنشر: ١٩٦٢)ص١٠٤.

ئەنجوومەنی پیران لە راگەیاندنی جەنگدا. **کابوت لودج** گومانی لەوە هەبوو کەوا لەوانەیە ولاتە یەکگرتووەکان لەسەر بنەمای بڕیارگەلێکی سەخت و دژوار بۆ سەپاندنی ئاسایشی بەکۆمەڵ، نەک بە بڕیاری ئەنجوومەنی پیران، یاخود بەویستی گەلی ئەمریکا، پەلکێشی نێو جەنگێکی نوێ بکرێ.

هەندێ جار وا هزر لە شەڕە ئاخاوتنی نێوان سەرۆک **ولسون و سیناتور لودج**: دەکرێ کە ململانییە لە نێوان ئایدیالیستێک و ریالستێکدا[٣]. وەلێ دەشێین وەهاش سەیری بکەین کە گفتوگۆیەک بوو لە نێوان دوو شێوەی جیاواز لە ئاکاری ئەمریکایی. داوای **لودج** بۆ «لاتەریکی» هەڵوێستێکی ئەمریکایی کۆن و چەسپاو بوو سەبارەت هاوسەنگیی هێزەکان لەئەورووپادا:

دەوڵەتی ئەورووپایی بەناوی هاوسەنگیی هێزەکانەوە کاری دزێو دەکا لەگەڵ ئەوەشدا راستیەکەی ئەوەیە کە ولاتە یەکگرتووەکان لەسەدەی نۆزدەهەمدا توانی هاوسەنگیی هێزەکان پشت گوێ بخاو بەهۆی کەشتیگەلی بەریتانییەوە بە ئازادی بجووڵێتەوە. دەوڵەتە ئەورووپاییەکان نەیاندەتوانی بگەنە نیوە گۆی رۆژئاوا و هەڕەشە لە ئەمریکاییەکان بکەن. لە راستیدا ئەمریکاییەکان ئەو کاتە لەگەڵ لاتەریکی و خۆ تێنەگەیاندن بوون مەگەر کارەکە پەیوەست بێ بەدەست تێوەردان لە کاروباری هاوسێ لاوازەکانی خۆی لە ئەمریکایی ناوەڕاست و مەکسیک، ئەمریکاییەکان لە دوای جەنگی یەکەمەوە لە بەها ئەخلاقییەکان نزیک کەوتنەوە. زۆرینە بەلای هەستی لاتەریک بووندا کەوتنەوە لە بەرانبەر هاوسەنگیی هێزەکانی ئەورووپایی. لە ئاکامدا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا تایەکی تەرازوو لەتایەکی تری قورس تربوو. ئەمریکا نەیویست بەرپرسیاریەتی ئەو بارە دەولییە بگرێتە ئەستۆی خۆیەوە کەدوای جەنگ هاتەئاراوە.

## رۆژانی یەکەمی کۆمەڵەی گەلان

فەرەنسا لە دوای جەنگ لە هەموو شتێکی دیکە زیاتر لە خەمی، گەرەنتی سەربازیدا بوو تا جارێکی تر ئەڵمانیا وەک هێزێک هەڵنەسێتەوە. لەبەر ئەوەی ولاتە یەکگرتووەکان لەدامەزراندنی کۆمەڵەی گەلادا بەشدار نەبوو. فەرەنسا سەری خستبووە سەر بەریتانیا و داوای گەرەنتی تەنایی لێدەکرد و ئامادەکاریی سەربازی لێ

---

٣- المثالية والواقعية.

دەویست لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەڵەمانیا چاک بووەوەو گەڕایەوە سەر دۆخی جارانی. بەریتانیا نەچووە ژێرباری داواکانی فەرەنساوە، لەسەر ئەو ئەساسەی هەر هاو پەیمانییەتییەکی بەمجۆرە لەگەڵ گیانی ئاسایشی بەکۆمەڵدا ناگونجێ و پێشوەختە دەستدرێژیکەر دیاردەکرێ. هەروەها بەریتانیا، فەرەنسای پێ لە ئەڵەمانیا بەهێزتر بوو، کەواتە پێویست بەهاوپەیمانێتی ناکا، هەتاوەکو ئەگەر لەسەر بنەمای رێسا تەقلیدییەکانی هاوسەنگیی هێزەکانیش دامەزرابێ. بەریتانیەکان گوتیان گرنگ ئەوەیە ئەڵەمانیا ئامادەبکرێتەوە، وەک چۆن لە دوای شەڕەکانی ناپلیۆن، کۆنگرەی ڤیەننا فەرەنسای گەڕاندەوە باوەشی ئەوروپا. تین و تاوی جەنگ لە بەریتانیا زۆر کەم بووەوە تا فەرەنسا. ئینگلیزەکان هەستیان کرد کاتی ئەوە هاتووە ئەڵەمانەکان رازی بکەن و بیگەڕێننەوە سەر رێڕەوی ئەوروپایی.

وەلێ ئەوبۆچوونانە کاریان لە فەرەنسا نەکرد. هاوپەیمانییان لەگەڵ پۆڵەندا، کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم هاتبووەوە گۆڕێ بەست. هەروەها هاوپەیمانێتیان لەگەڵ سێ لایەنی بچووک گرێدا: یوگسلافیاو چیکوسلوفاکیا و رۆمانیا، کە بەشێکی ئیمپراتۆریای نەمساو مەجەری پێشووبوون. بەم سیاسەتە فەرەنسا خۆی خستە نێو دوو کێشەوە: هاوپەیمانێتییەکان بەتەنیا دژی ئاسایشی بەکۆمەڵ نەبوون، بەڵکو بۆ فەرەنسا دەرکەوت کە هاوپەیمانێتییەکان، بەزمانی هاوسەنگیی هێزەکان، سوودێکی زۆریان بۆ فەرەنسا نەبوو، پۆڵەندا پەیوەندی لەگەڵ هاوسێکانیدا خراب بوو، ئەڵتەرناتیڤی روسیا نەبوو کە دوای شۆڕشی بۆ لشەویک ترۆکرابوو. کێشەی ئەتنیکی و دابەش بوونی نێو خۆیی، دەوڵەتانی هاوپەیمانێتییەتەکان سێ لایەنیە بچووکەکەی دەهاڕی.

ئەڵەمانیا لە ئاکامی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، تاڕادەیەکی زۆر داهێزرابوو. (٢٥) هەزار میلی چوارگۆشەی لە خاکی خۆی و ٧ ملیۆن کەسی لە دانیشتوانەکەی لەدەست دابوو. پەیماننامەی ڤەرسای ناچاری کردبوو هێزەکانی خۆی بۆ ١٠٠ هەزار سەرباز کەم بکاتەوەو لە هێزی ئاسمانی بێ بەش کرابوو. ئەو پەیماننامەیە برگەیەکی بەناوبانگی بەخۆوە گرتبوو (تاوانەکانی جەنگ)، کە بەگوێرەی ئەو دەقە ئەڵەمانیا سەبەبکاری جەنگ بوو، بۆیە دەبوایە باجی شەڕ بداتەوە. لیستی قەرەبووەکان گەیشتە ٣٣ ملیار دۆلار! ئەو برە پارەیە لەو بارە داتەپیوەدا، هەرگیز لە وزەی ئەڵەمانەکاندا نەبوو. کاتێک ئەڵەمانیا ئەو قەرەبووەی نەدایەوە، فەرەنسا هێزێکی نارد، تا هەرێمی «رور» بگرێ، کە هەرێمێکی پیشەسازیی ئەڵەمانی بوو، تائەو کاتەی ئەڵەمانەکان

قەرزەکەیان دەدەنەوە. دوای بەرگریکردنێکی نێگەتیڤیانە ئەڵمانیا دووچاری هەڵئاوسانێکی گەورەی دراو هات کە هەموو پاشەکەوتی چینە ناوەندەکانی تێ برد. ئەو راستیە، یەکێک لەسەرچاوەکانی سەقامگیربوونی نێو خۆیی لەنێو برد. لە کاتێکدا کۆماری ڤایمار بۆ ئەوە تێدەکۆشا دەوڵەتێکی دیموکراسی پێکبهێنێ.

ئیتالییەکان هێندە پەرۆشی پەیماننامەی ئاشتی لە پاریس، یاخود کۆمەڵەی گەلان نەبوون. ئیتالیا چونکە لەبنەڕەتدا، هاوپەیمانی ئەڵمانیاو ئیمپراتۆریای نەمسا-مەجەر بوو، وەلێ لەسەرەتای جەنگدا پێیان وابوو ئەگەر بچنە پاڵ هاوپەیمانەکانەوە، زۆرتریان دەست دەکەوێت. هەر ئاواشیان کرد. «پەیماننامەی لەندەن»ی نهێنی کە لە ساڵی ۱۹۱۵دا بەسترا، بەڵێنی بەئیتالییەکان دا، کە پارچەیەک خاکی ئیمپراتۆریای نەمسا- مەجەر، کە دواتر بە یوگسلاڤیا ناسرا بدرێ بەئیتالیا. ئیتالیا پێی وابوو ئەو بەڵێنانە دەگەنەجێ، وەلێ **ودرو ولسن**، لەگەڵ ئەو جۆرە دابەشکردنە کۆنەی دەسکەوتەکانی شەڕ نەبوو، سەرباری ئەمەش یەکێک لە هێزە بزوێنەرەکانی سیاسەتی دەرەوە، دوای هاتنی **موسولینی** و فاشیستەکان بۆ دەسەڵات ساڵی ۱۹۲۲ هەوڵیدەدا ئیمپراتۆریایەکی رۆمانی نوێ دابمەزرێنێ.

بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێن بوو، کۆمەڵەی گەلان بەم جۆرە سەرەتایە دەست پێ بکات و بتوانێ شتێک بەشتێک بکا. لەگەڵ ئەمەشدا، لەماوەی نێوان ۱۹۲٤-۱۹۳۰دا سەرکەوتنێکی رێژەیی بەدیارکەوت. کۆمەڵە پلانی بۆ ئەوە دانا کە بڕی ئەو قەرەبووە کەم بکرێتەوە کە دەبوایە ئەڵمانیا بیداتەوە. لەساڵی ۱۹۲٤دا حکومەتەکان پڕوتوکۆلێکیان ئیمزا کرد بۆ چارەسەرکردنی بەئاشتیانەی ناکۆکییەکان، کە دەبێ بۆ چارەسەرکردنی تەنگژەکان پشت بەتەحکیم ببەسترێ. لەوانەیە گرنگترین دەستکەوت، پەیماننامەی «لوکارنو» بێت، کەلە ساڵی ۱۹۲۵دا مۆرکرا، رێگای بەئەڵمانیا دا بچێتە ناو کۆمەڵەی گەلان و کورسییەکی لە ئەنجوومەنی کۆمەڵەدا پێدرا.

پەیماننامەی «لوکارنو» دوو رووی هەبوو: لە رۆژئاواوە، ئەڵمانیا گفتی دابوو تخوبی فەرەنساو بەلجیکا نەبەزێنێ. هەردوو هەرێمی «ئەلزاس و لورین»یش کە پسمارک لە شەڕی حەفتاکاندا دەستی بەسەرداگرتبوون، بەگوێرەی پەیماننامەی «ڤرسای» بداتەوە فەرەنسا. هەروەها ئەڵمانیا پەیمانی دابوو کە پارچەیەک لە خاکی خۆی، بە درێژایی رووباری «راین» لەچەک دامالێ. پەیماننامەی «لوکارنو» پێی لەسەر ئەو ئەنجامانە داگرت. لە رۆژهەڵاتیشەوە ئەڵمانیا پەیمانی دابوو کەپشت بە تەحکیم ببەستێ، بەرلەوەی لە رۆژهەڵاتدا پەنا بەرێتەبەر گۆڕینی سنوورەکان لەگەڵ پۆڵەنداو

چیکوسلوڤاکیا. دەبوایە بڕگەی دووەم زەنگی ئاگادارکردنەوەی لێ دابا. چونکە دوو جۆرە سنوور لەگەڵ ئەڵەمانیادا هەبوو، جۆرێک لە ڕۆژئاواوە کە توانای پێشێلکردنی نەبوو. جۆرێکی تر لە ڕۆژهەلات، توانای دانوستان لەسەرکردن و وەرگرتنەوەو دانەوەی هەبوو. ئەو ڕێکەوتنامانە، جۆرە پێشکەوتنێک بوون لەو ڕۆژانەدا.

کۆمەڵەی گەلان توانی هەندێک ناکۆکی بچووک بچووک چارەسەر بکات. وەک ناکۆکی نێوان یۆنان و بولگاریا. دوابەدوای «کۆنگرەی واشنتۆن»ی ساڵی ١٩٢١ پرۆسەی دانوستان لەسەر چەک دانان دەستی پێکرد. ولاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و ژاپۆن لەسەر داماڵینی بڕێک لە چەکی دەریایی ڕێککەوتن. کۆمەڵەی گەلان لێژنەیەکی ئامادەکاری دانا بۆ فراوان کردنی گفتۆگۆ لەسەر داماڵینی چەک و خۆی بۆ کۆنگرەیەکی دەولی کە نەبەسترا ئامادەکرد، تەنیا (دوای ئەوەی کاتی بەسەرچوو) لە ساڵی ١٩٣٢دا. سەرباری ئەمەش، لەساڵی ١٩٢٨دا، لە میساقی کیلوگ- بریان Kellogg- BRiand Pact کە بەناوی وەزیری هەندەرانی ئەمریکاو فەرەنساوەیە، دەوڵەتان لەسەر بە تاوان دانانی جەنگ ڕێککەوتن. وەلێ گرنگترین شت ئەوەبوو، کە کۆمەڵەی گەلان ببووە مەکۆیەکی چالاکی دیپلۆماتیکی. ئەمریکایی و روسەکان، ئەندامی کۆمەڵە نەبوون، دەستیان بەناردنی چاودێر کرد بۆ کۆبوونەوەکانی کۆمەڵە لە جنێڤ. پاشان دارایی جیهانی لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٩دا هەرەسی هێنا، هەروەها پارتی سوسیالیستی نەتەوەیی (نازی) لە ئەڵەمانیا لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٣٠دا سەرکەوت، ئەمانە ئاماژەیەک بوون بۆ تەنگ و چەڵەمەکانی داهاتوو، سەرباری ئەمەش، لە کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵەی گەلاندا، کە لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠دا بەسترا هەست بەپێشکەوتنێک دەکرا. ئەو گەشبینیەی بەرامبەر سیستەمە ئاسایشی بەکۆمەڵ، لە سییەکاندا هەبوو، لەبەردەم ئاریشەکانی مەنشوریاو حەبەشە (ئەثیوپیا) بارگەی خۆی پێچایەوە.

## شکست هێنانی مەنشوریا

مەسەلەی مەنشوریا ئەزموونێک بوو بۆ کۆمەڵەی گەلان، بەلام لەم ئەزموونەدا شکستی هێنا. تاکو لە مەسەلەی مەنشوریا بگەین پێویستە لەڕەوشی ژاپۆن تێ بگەین. ژاپۆن لە قوربانییەکی دەستی دەستدرێژکاریی ئیمپریالی لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە کۆتایی سەدەیەکەدا، بووە دەوڵەتێکی ئیمپریالیی سەرکەوتوو. لە شەڕی ساڵی ١٩٠٤-١٩٠٥دا روسیای بەزاند و لەساڵی ١٩١٠دا کۆریای کردە

کۆلۆنی خۆی. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا چووە پاڵ هاوپەیمانەکانەوە. دوای جەنگیش هەوڵیدا وەک زلهێزێک دانی پیابنرێ. ئەوروپایی و ئەمریکاییەکان بەرەنگاری ئەو هەوڵە بوونەوە. لە پاریس حکومەتە رۆژئاواییەکان ئەو پێشنیارەی ژاپۆنیان رەتکردەوە، کەداوای دەکرد میساقی کۆمەڵەی گەلان، جەخت لەسەر پرەنسیپی یەکسانی رەگەزەکان بکاتەوە. لە بیستەکاندا، ئەمریکاییەکان یاساگەلێکی رەگەز پەرستانەیان دارشت، کە ژاپۆنییە کۆچ کردووەکانیشی دەگرتەوە، بەریتانیا پەیماننامەی دووقۆڵی خۆی لەگەڵ ژاپۆندا بەکۆتا هێنا. زۆر لە ژاپۆنییەکان هەستیان کرد کە رێساو مەرجەکانی چوونە نێو یانەی دەوڵەتە گەورەکان گۆراون، کاتێک ئەوان هێندەی نەمابوو بچنە نێو یانەکەوە.

(چین) نموونەیەکی تربوو لە تەنگژەی مەنشوریا، لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا گۆبەندو ئاژاوە چینی گرتبووەوە. شەرێکی نێوخۆیی لە نێوان ئەو هەرێمانەی سەرکردە سەربازییە پێک ناکۆکەکان دەستیان بەسەر داگرتبوون، بەرپابوو. مەنشوریا بەشێک بوو لە چین، ئەگەرچی لە ژێر فەرمانرەوایی فەرماندەیەکی سەربازی تارادەیەک سەربەخۆدا بوو. بزاڤی نەتەوەیی چینی هەوڵی دەدا وڵاتەکە یەکخاتەوە، بەتوندی رەخنەیان لەو پەیماننامە زالمانانە دەگرت کە لەسەردەمی ئیمپریالیزمدا بەسەر چین سەپێندرابوون. لەگەڵ زیدەبوونی هێزی نەتەوەخوازە چینییەکان لە بیستەکاندا، پێک هەڵخشانیان لەگەڵ ژاپۆنییەکان زیدە دەبوو، باڵە سەربازییەکان کەوتنە ململانێ لەسەر دەسەڵات گرتنەدەست، لەگەڵ زیدەبوونی تەنگژەی ئابوری جیهانی و گرژی لەگەڵ چیندا، باڵی سەربازی لە ژاپۆن وردە وردە بەهێز دەبوو.

لە ئەیلوولی ۱۹۳۱دا سوپای ژاپۆن گۆبەندێکی لەسەر هێڵی ئاسنی مەنشوریا دروست کرد. ژاپۆنییەکان هەر لەسەردەمی شەری روسی- ژاپۆنی ساڵی ۱۹۰٤- ۱۹۰٥ـەوە، مافی دامەزران و بڵاوکردنەوەی هێزی سەربازیان لەوێ هەبوو. تێکدانی هێڵی ئاسنی، بیانگەی دایە هێزەکانی ژاپۆن هەموو مەنشوریا داگیربکەن. هەرچەندە ژاپۆن بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە مەبەستی لەم کارەدا پاراستنی هێڵی ئاسنی بووە. وەلێ ئەم بانگەشەیە گەیشتە ئەو رادەیەی کە حکومەتێکی مەنشوری دەستکردی خۆیان دامەزرێنن و ناویان نا (مانچۆکو)؛ چین پەنای بردە بەر کۆمەڵەی گەلان، بەڵام ژاپۆن لێ نەگەرا بریارێکی وا دەرچێت کە داوای کشانەوەی ژاپۆن بکات. لە کانوونی یەکەمدا کۆمەڵەی گەلان رازی بوو لیژنەیەک بەسەرۆکایەتی **لورد لایتون- اولتن** Loyd Lytton بنێرێ بۆ ئەوەی لەرووداوەکانی مەنشوریا بکۆڵێتەوە.

دواجار **لورد لايتون** له ئەلوولى ١٩٣٢دا، راپۆرتى خۆى پێشكەش بە كۆمەڵەى گەلان كرد، راپۆرتەكە بڕوبيانوى ژاپۆنى لەو دەست تێوەردانە ناياساييە رەتكردەوە. راستە ئەو لەراپۆرتەكەيدا داواى لە ئەندامانى كۆمەڵەى گەلان كرد، كە دان بە حكومەتى مانچۆكو نەنێن. كەچى داواى نەكرد سزاكانى بەندى (١٦) بەسەر ژاپۆن بسەپێندرێ. لە شوباتى ١٩٣٣دا لە ئەنجوومەنى گشتى كۆمەڵەى گەلاندا، (٤٢) دەنگ بەرامبەر تاقە دەنگێك، لەگەڵ راپۆرتەكەى لايتون بوون سەبارەت پەلامارى ژاپۆن بۆ سەر مەنشوريا. ژاپۆن تاقە دەنگى بەرهەڵستكاربوو. ئەوە بوو ژاپۆن لە كۆمەڵەى گەلان كشايەوە. بەشێوەيەكى گشتى دەتوانين بڵێين- دۆزى مەنشوريا، خاوەخاوى كارڕاييەكان و دڵ لەدڵدان و بێ كەڵكى كۆمەڵەى گەلانى بەتەواوى ئاشكرا كرد.

## دارِمانى ئەثيوپيا (حەبەشە)

دوا تاقيكردنەوەى سيستەمى ئاسايشى دەستەجەمعى، كۆمەڵەى گەلان لە ئەثيوپيا بوو لە ساڵى ١٩٣٥دا. ئەمجارەيان كۆمەڵەى گەلان سزاى سەپاند، وەلێ دەرئەنجامى كۆتايى، ديسان شكست و تێكەوتن بوو. ئيتاليا ماوەيەكى زۆر بوو پلانى بۆ ئەوە دادەنا، ئەثوپيا بە ئيمپراتۆرياكەى خۆيەوە بلكێنێ. نەك تەنيا لەبەر ئەوەى كەلە كۆلۆنەكانى خۆى لە ئەريتريا نزيك بوو، لەسەر دەرياى سوور، بەڵكو لەبەرئەوەى ئيتالييەكان هەستيان بە سووكايەتى پێكردن دەكرد، كاتێك ئەثيوپيەكان لەسەدەى نۆزدەهەمداو لە رۆژانى داگيركردنى وڵاتەكەياندا لەسەردەمى ئيمپرياليزمدا، ئيتالياييان بەزاند، ئايديۆلۆژياى فاشيستى پێى وابوو پێويستە ئەو «هەڵە» مێژووييە راست بكرێتەوە. لە نێوان ساڵانى ١٩٣٤-١٩٣٥دا، ئيتالييەكان رووداوێكيان لەسەر سنوورەكانى نێوان ئەثيوپيا و ئەريتريا خولقاند. ئەوان ئەو كارەيان ئەنجامدا، سەربارى ئەوەى كە پەيماننامەى ئاشتى لە نێوان ئەثيوپيا وئەريترياىدا هەبوو: هەروەها سەربارى ئەوەى ئيتاليا كە يەكێك بوو لەو دەوڵەتانەى ميساقى «كيلوگ- بريان»يان ئيمزا كردبوو، ميساقەكە جەنگى قەدەغە كردبوو، هاوكات ئيتاليا ئەندامى كۆمەڵەى گەلان بوو. كەدەبوايە پابەندبێ بەوەى، پەنا بۆ تەحكيم بەرێ، بۆ ماوەى سێ مانگ، بەرلەوەى هيچ كارێكى تر بكا.

لە تشرينى يەكەمى ١٩٣٥دا، ئيتاليا، ئەثيوپياى داگير كرد. داگير كردنەكە كارێكى دەستدرێژكارانە بوو، ئەمە گفتوگۆ هەڵناگرێ، ئەنجوومەنى كۆمەڵە، ڤيتۆى

ئیتالیای خستە لاوەو داوای کۆنگرەیەکی تایبەتی کرد، بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر ئەو سزایانە بدا کە پێویستە بەسەر ئیتالیادا بسەپێندرێ. پەنجا دەوڵەت لە کۆنگرەکە ئامادەبوون. دوای هەشت رۆژ لە داگیرکردنەکە، کۆنگرە داوای لە ئەندامەکان کرد چوار جۆرە سزای ئیتالیا بدەن: وەستاندنی هەناردنی شت و مەک بۆ ئیتالیا، هەندێک جۆرە کەل و پەلی دیاریکراوی پێ نەفرۆشن، ئەوانەی کە ناتوانن لەسەرچاوەی تر بەئاسانی وەدەستیان بێنن، وەک مەتات و پلێت. هەروەها قەدەغەکردنی فرۆشتنی هەموو کەل و پەلێکی سەربازی بە ئیتالیا و قەرزی نەدرێتێ. وەلێ لێرەدا سێ شتی تێدا نەبوو، ئیتالیا دەیتوانی ئاسن و خەڵووزو نەوت لە دەرەوە بکڕێ، هەروەها پەیوەندی دیپلوماتێکی لەگەڵدا نەپچڕێنرا. هەروەها بەریتانیا کەنالی سوێسی بەڕووی کەشتییەکانی ئیتالیا دانەخست کە کەل و پەلیان بەرەو ئەریتریا هەڵگرتبوو.

بۆچی ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان لەمە زێتریان پێ نەکرا؟ گەشبینییەکی تەواو هەبوو کە ئەو سزایانە ئیتالیا ناچار دەکەن لە ئەثیوپیا بکشێتەوە. گومانی تیانییە کەوا سزاکان کاریان لەئابوری ئیتالیا کرد. لەماوەی ساڵێکدا ناردنە دەرەوەی ئیتالیا بەرێژەی سێ یەک کەم بووەوەو نرخی لیرەی ئیتالی دابەزی. وارێکەوت کە یەدەگی زێڕی ئیتالی لە ماوەی (٩) مانگدا تەواو ببێ. وەلێ هەرچەندە سزاکان زەبریان لە ئیتالیا دا، بەڵام نەیانتوانی وا لە **موسولینی** بکەن سیاسەتی خۆی بەرانبەر ئەثیوپیا بگۆڕێ.

لە بەرامبەر نیگەرانی سەبارەت بە تەرازووی هێزەکان لە ئەوروپا، تووڕەیی بەریتانی و فەرەنسییەکان بەرامبەر کێشەی ئەثیوپیا کەم بووەوە. چونکە ئەڵمانیا تا دەهات بەهێزتر دەبوو، بۆیە بیریان لەوە کردەوە ئیتالیا راکێشنە نێو هاوبەندییەکەوە، تا راستی ئەلەمانیا بکەنەوە، کاتێک لە ساڵی ١٩٣٤دا، بەدیارکەوت **هیتلەر** دەیەوێ نەمسا داگیر بکا، **موسولینی** هێزەکانی بەرەو سنوورەکانی نەمسا بزواند، **هیتلەر** پەژیوان بووەوە. بەریتانیاو فەرەنسییەکان بەو هیوایە بوون کە **موسولینی** راکێشنە نێو هاوبەندییەک دژی ئەڵمانیا.

دیپلوماتیکە تەقلیدییەکان لەگەڵ سیستەمی ئاسایشی دەستە جەمعی، کۆمەڵەی گەلان نەجەنگان، بەڵکو سەر لە نوێ راڤەیان کردەوە. چونکە لەدیدی تەرازووی هێزەکانەوە، دواشت کە بیانویستایە، ئەوە بوو لە ململانێیەکی دوورە دەستەو لاپەڕە بئاڵێن لەئەفەریقا، لە کاتێکدا کە کێشەیەکی بلەز لەدڵی ئەوروپادا روو بەڕوویان دەبووەوە. ریالیستە تەقلیدییەکان گوتیان دوژمنایەتییەکی دوور لە ئەفریقا، هەڕەشە

لە ئاسایشی ئەورووپا ناکات. دانوستـان و پێکهـاتنەوە پێـویست بـوو بۆ گـێڕانەوەی ئیـتالیا بۆ نێو هاوبەندییەکە. بۆیە شتێکی نامۆ نەبوو کە بەریتانی و فەرەنسییەکان خۆ لە سزاکان بدزنەوە. وەزیری هەندەرانی بەریتانیا، **سیرساموئیل هور**، لە کانوونی یەکەمی ۱.۹۳۵دا، لەگەڵ هاوکوفە فەرەنسییەکەی «**پیرلافان**» کۆبۆوە، نەخشەیەکیان بۆ دابەشکردنی ئەثیوپیا بۆ دوو بەش دانا: بەشێکیان ئیتالی و بەشەکەی تر سەر بە کۆمەڵەی گەلان بێت. کاتێک هەواڵی ئەو پرۆژەیە بۆ رۆژنامەکان دزەی کرد خەڵک لە بەریتانیا هەڵسانەوە. (**هور**) ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە، دوای ئەوەی خەڵک بەوە تاوانباریان کرد کە ناپاکی لەگەڵ کۆمەڵەی گەلان و ئاسایشی بەکۆمەڵدا کردووە.

وەلێ ئینگلیزەکان دوای سێ مانگ رای خۆیان گۆڕی. لە مارسی ۱۹۳٦دا **هیتلەر** پەیماننامەی لۆکارنۆی تێهەڵداو هێزەکانی نارده ناوچەی بێ چەکی (راین). یەکسەر بەریتانیا و فەرەنسا وازیان لەبیرکردنەوە لە ئەثیوپیا هێنا، لەگەڵ ئیتالییەکان کۆبوونەوەو دەربارەی چۆنیەتی پارێزگاری کردنی هاوسەنگیی هێزەکان لەئەورووپا بیروڕایان لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ کردن، بەمەش بابەتی هاوسەنگیی هێزەکان لە ئەورووپا، بەسەر پراکتیزەکردنی پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵی لەئەفەریقادا زاڵ بوو، لە مایسی ۱۹۳٦دا ئیتالییەکان وایان لێهات توانای تەواوکردنی سەرکەوتنە سەربازییەکەیان هەبێت. بەهاتنی مانگی تەمووز، سزاکان هەڵگیران.

باشترین شت کە دەربارەی ئەو تراژیدیایە گوترابێ، ئەوەبوو کە لەسەر زمانی نێردراوی هایتی لە کۆمەڵەی گەلان گوتراوە: «دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین باگەورەبێ یان بچووک، بەهێزبێ یان بێ هێز، دووربین یاخود نزیک، سپی بین، یاخود رەش، کە رۆژێ لە رۆژان ئێمەش دەبینە ئەثیوپیای یەکێکیان»(٤).

پاشان چەند ساڵێکی پێ نەچوو، زۆربەی گەلانی ئەورووپا بوونە گوری (سەدەقەی) دەستدرێژکاریی هیتلەری. لەجەنگی جیهانی دووەمدا، یەکەمین هەوڵی جیهان بۆ هێنانەدی ئاسایشی بە کۆمەڵ، شکستی هێنا.

## بنەماکانی جەنگی جیهانی دووەم

جەنگی جیهانی دووەم لە رووی زیانی مرۆییەوە، لە هەموو جەنگەکانی تری رەت

---

٤- ولترز، تاريخ عصبة الامم (لندن: مطبعة جامعة اكسفورد، ١٩٥٢) ص٦٥٣.

کرد کە بە ٣٥ تا ٥٠ ملیۆن مرۆڤ دەخەملێنرێت. دەبینن تانک و فڕۆکە، کە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا رۆڵێکی گەورەیان نەبووە، باڵ بەسەر جەنگی جیهانی دووەمدا دەکێشن. بۆ وێنە لە «جەنگی بەریتانیا»[٥]، کەیەکێک لەخاڵەکانی وەرچەرخان بوو لە ڕێڕەوی جەنگی جیهانی دووەمدا، رادار رۆڵێکی گرنگی بینی. پاشان لە کۆتایی جەنگدا بۆمبی ئەتۆمی هاتەکایەوە، بەمەش چاخی ئەتۆمی گزنگیدا.

جەنگی جیهانی دووەم، بە خۆبەدەستەوەدانی بێ قەیدوشەرت کۆتایی هات بەپێچەوانەی ئەوەی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا روویدا. هاوپەیمانەکان، ئەڵەمانیا و ژاپۆنیان داگیر کرد، لە ماوەی داگیرکردنەکەدا کاریان بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا کرد. کێشەی ئەڵەمانیا بۆ درێژایی نیوەسەدە، بەدابەشکردنی ئەڵەمانیا چارەسەرکرا، هەروەها جەنگی جیهانی دووەم، جیهانێکی دوو جەمسەری دروست کرد، وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت لە هەموو ئەوانەی لەم جەنگەدا بەشداریان کرد، بەهێزتر دەرچوون.

جەنگ ئەلتەرناتیڤێک بوو بۆ ئەوروپا، وەک کۆنترۆلکەرێکی هاوسەنگیی هێزەکان. ئەوروپا بووە تەختەیەکی زۆرانبازیی رکابەرە دەرەکییەکان، بەچەشنێک کەبەحاڵەتی ئەڵەمانیا دەچوو بەر لە ساڵی ١٨٧٠. جەنگی جیهانی دووەم، هەیکەلی سیستەمێکی جیهانی داڕشت کە تا ساڵی ١٩٨٩ بەردەوام بوو.

*لێرەدا وەک من بۆی دەچم، کلیلی کێشەکە ئەوەیە ئەگەر هیتلەر بەئەنقەستیش نیازی جەنگی هەبوایە، ئەوا ئەو جەنگە نەبوو کە بەو شێوەیە روویدا، تەنیا ئەگەر بیەوێ بە فێڵێکی کارامە خۆی لێ بدزێتەوە. وەک ئەوەی خۆی لە جەنگی نێو خۆیی دزیەوە. چەند ئاسانە وا لە خەڵکی تر بکرێ کەکار لەسەر ئەوانەبکەن، کە پاڵپێوەنەری (دوافع) شەڕانگێزانەیان هەیە. هیتلەر چاوەڕوانی ئەوەی لەوانی تر کرد کە ئەو شتە بکەن، ئەگەر ئەو لە جێگەی ئەوان بوایە، دەیکرد.*

*أ.ج.ب. تیلر*[٦]

---

٥- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١١) بۆ زانیاری دەربارەی نەخشەی هێرشی ئەڵەمانیا بۆسەر بەریتانیا لە ئۆکستۆسی ١٩٤٠.

٦- تايلر، جذور الحرب العالمية الثانية (كرينيج: فاوسيث، ١٩٦١) ص٢٨١.

## جەنگی هیتلەر

جەنگی جیهانی دووەم، زۆربەی کات بە «جەنگی هیتلەر»[7] ناودەبرێ. ئەمە راستە، بەڵام وادیارە وەسفێکی ساویلکانەیە. جەنگی جیهانی دووەم مەسەلەیەکی کۆنە. «بەشی دووەمە» لە جەنگێکی گەورە، کە لەساڵی ۱۹۱۸دا کۆتایی بەسەرکردایەتی کردنی ئەوروپایی هێنا. ماوەی نێوان هەردوو جەنگ تەنیا پشوودانێک بوو . هیتلەر جەنگی دەویست، وەلێ ئەو جەنگە نا کە ئێستا بە «جەنگی جیهانی دووەم» دەناسرێ. جەنگێکی زیانبەخش و ماوە کورت، جەنگێکی لە ناکاوی دەویست.

شەڕی ئۆوقیانووسی هێمن، شەڕی **هیتلەر** نەبوو، **هیتلەر** بەردەوام دنەی ژاپۆنییەکانی دەدا کە پەلاماری سەنگافورەی کۆلونی بەریتانی، یان پەلاماری سیبریا بدەن، بۆ ئەوەی هێزەکانی روسیا رابکێشن و لە ئەوروپای دووربخەنەوە، وەلێ هیچ سوودی نەبوو، ژاپۆن هیچی لەم دووانە نەکرد. پاشان ژاپۆن، هیتلەری سەرسام کرد، کاتێ پەلاماری بنکەی «بیرل هاربەر»ی دەریایی ئەمریکای دا[8].

سەرباری ئەوەی شەڕی ئۆقیانووس، بەشێک بوو لەجەنگی جیهانی دووەم، بەڵام رەگی خۆشی هەبوو. هەوڵێکی ئیمپریالیستیانەی تەقلیدی بوو بۆ کۆنترۆل کردنی ناوچەکە. لەلایەکی ترەوە لەوانەیە زێدەڕۆیی بکەین، ئەگەر زۆر پێ لەسەر هۆیەکانی تر دابگرین. بەڵکو هەندێک لە مێژوونووسان خەریکە پەرێزی **هیتلەر** پاک دەکەنەوە! «**تیلەر**» دەڵێ: **هیتلەر** کەسێکی ترسناک و سەرەڕۆو، دڵ خۆشکەر نەبوو. بەڵکو تەنیا هەڵپەرستێک بوو لە بۆشایی هێز کەوتەوە، سیاسەتی رازی کردنی هێنایە کایەوە، کەدیموکراسیگەلی رۆژئاوایی گرتیانەبەر. وەلێ **تیلەر** زۆر لەمەش دوورتر دەڕوا. بۆ وێنە لەکتێبی «خەباتی من» ، کە هیتلەر لە ساڵی ۱۹۲٤دا بڵاوی کردەوە، هەندێک پلانی نادیاری خستبوەڕوو، کە **تیلەر** بە «بەخۆ نازینەکانی هیتلەر»ی دەژمێرێ و نارەزایی ئەڵەمانەکان دەردەبڕێ لە داگیردکردنی هەرێمی «رور» لەلایەن فەرەنسییەکانەوە.

وەلێ **هیتلەر** لە ساڵی ۱۹۲۸دا کتێبێکی تری نهێنی نووسی، کە تیایدا زۆر لە داواکانی کتێبی «خەباتی من»ی دووپات کردۆتەوە. ئەو کتێبە هەتاوەکو ئەگەر

---

٧- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٩) بۆ زانیاری دەربارەی پێشکەوتنەکانی جەنگ ۱۹۳۹-۱۹٤۰.
٨- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٩).

پلانێکی دوورودرێژیش نەبێ، ئاماژەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەو مەرامەی **هیتلەر** نیازی بووە.

**تیلەر** بەسووکی سەیری «یاداشتنامەکانی هوسباخ»یش دەکا، ئەو **هوسباخە** یەکێک بوو لە یاریدەرەکانی هیتلەر، کە لەکۆبوونەوەی «پیرشتسگادن» لەساڵی ١٩٣٧دا، چەند تێبینیەکی تۆمار کردووەو، تیایدا دەڵێ: **هیتلەر** پلانی بۆ ئەوە دادەنا تاساڵی ١٩٤٣ دەست بەسەر تەواوی خاکەکاندا دابگرێ. واتە بەرلەوەی باڵادەستیی ئەڵەمانیا ببێتە شتێکی بەسەرچوو. **هیتلەر** کاتێک لە رۆژهەڵات: لە نەمساو چیکوسلوڤاکیاوە دەستی پێکرد، هەستی بەگرنگی قۆستنەوەی دەرفەتەکان دەکرد، کاتێک هەڵدەکەون. **تیلەر** بایەخی ئەم یاداشتنامەیە رەتدەکاتەوە، لەبەر ئەوەی یاداشتنامەیەکی رەسمی نەبوو. **تیلەر** لەسەر ئەو بابەتەی نووسی و بەڵگەی نوێی بەدەست کەوت. ئێمە ئێستا نازانین کە **هیتلەر** زۆرجار دەربارەی ئەو خشتەی کات دانانەوەو ئەو نیازانە ئاخاوتووە. یاداشتنامەی «**هوسباخ**» بەشێوەیەکی گشتی پێشبینی هەموو کردەوەکانی هیتلەری کردووە.

## ستراتیژیەتی هیتلەر

**هیتلەر** کاتێک لە ساڵی ١٩٣٣دا جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست، چوار رێگا چارەی لەبەردەمدا بوو، سێیانی دوورخستەوە. دەیتوانی نیگەتیڤیزم (السلبیة) هەڵبژێرێ و بەپایەی ئەڵەمانیای دەولی رازی ببێ. یاخود لە رێگای گەشەسەندنی ئابوورییەوە، فراوانخوازی هەڵبژێرێ. «وەک ئەوەی ژاپۆن لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە کردی» یان لە رێگای فراوانخوازی پیشەسازییەوە ئەڵەمانیا بەرەو قەڵەمڕەوی دەولی بەرێ. یان ئامانجەکانی تەنیا دەستکاریکردنی پەیماننامەی ڤرسای بوایەو هەندێک لەو زیانەی ساڵی ١٩١٨ بە ئەڵەمانیا کەوت، کەم بکردایەوە. لە سییەکاندا، دیموکراسیگەلی رۆژئاوایی لەو زوڵمەی لە ئەڵەمانیا کرا نیگەران بوون کە. بەرپرسیاریەتی جەنگی جیهانی یەکەم هەمووی خرابووە ئەستۆی ئەڵەمانیا.

وەلێ **هیتلەر** ئەو سێ ستراتیژیەتەی رەتکردەوە، بۆ شکاندنی ئابلووقەکە هێرش و پەلاماری پێ چاکتر بوو. وای حسێب کرد ئەڵەمانیا کە لە نێوەڕاستی ئەورووپایە ناتوانێ تا هەتایە بە ئابلووقەدراوی بژی، پێویستە لە رۆژهەڵاتەوە زەوی وەدەست هەتا هەتایێ، بۆ ئەوەی بواری دەستبکەوێ و بنکەی خۆی فراوان بکا، پاشان کار بۆ ئەوەبکا رۆڵێکی گەورەتر لە جیهاندا بگێڕێ.

**هیتلەر** بەچوار قۆناغ ڕێگاچارەی چوارەمی گرتەبەر. یەکەمجار زنجیرەیەک مانۆڕی سیاسی کارامە: دەستی کرد بە تێکدانی چوارچێوەی کاری پەیماننامەی ڤەرسای. لە تشرینی یەکەمی ۱۹۳۳دا خۆی لە کۆمەڵەی گەلان کێشایەوە و بەستنی ئەو کۆنگرەیەی کە کۆمەڵە بۆ داماڵینی چەک سازی دابوو، خستە ملی فەرەنسا، واتە فەرەنسا لە کۆنگرەی داماڵینی چەک نایەوێ هێزەکانی خۆی کەم بکاتەوە. ئەمەش وا لە ئەڵەمانیا دەکا هەرگیز نەتوانێ بەردەوام بێ لە مانەوەی لە کۆمەڵەو کۆنگرەکەدا، لە کانوونی دووەمی ۱۹۳٤دا پەیماننامەیەکی لەگەڵ پۆڵەنداو دەوڵەتە بچووکەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا گرێ دا. لە ئاداری ۱۹۳۵دا بڕگە سەربازییەکانی پەیماننامەی «ڤەرسای» ڕەتکردەوەو گوتی: ئەڵەمانیا چیتر بەرگەی ئەوە ناگرێ سوپاکەی تەنیا ۱۰۰ هەزار سەرباز بێ و ڕایگەیاند لەجیاتی ئەمە سوپاکەی سێ قات زێدە دەکاو هێزێکی ئاسمانیش دادەمەزرێنێ.

بەریتانیاو فەرەنسا و ئیتالیا، لە «ستریسا»ی ئیتاڵی کۆبوونەوە بۆ ئەوەی لە بزاڤەکانی هیتلەر بتوێژنەوە. وەلێ بەر لەوەی بگەنە هیچ ڕێکەوتنامەیەک، **هیتلەر** دەستی خۆی پێش خست و داوای دانوستانی لەبەریتانیا کرد، تا پەیماننامەیەکی دەریاوانی لەگەڵ گرێ بدا. بەریتانیاش قۆستنەوەی ئەم دەرفەتەی لە دەست خۆی نەدا، بەم چەشنە **هیتلەر** نوشوستی بەهەموو کاردانەوەیەکی هەماهەنگی هێنا، کە لە کۆنگرەی «ستریسا» بکەوێتەوە. لە ئاداری ۱۹۳٦دا، کاتێک ڕووداوەکانی ئەثیوپیا، دوور لە نێوەڕاستی ئەورووپا بایەخیان پەیدا کرد، **هیتلەر** هێزەکانی خۆی ناردە ناوچەی «ڕاین»، کە بەپێی پەیماننامەی «لوکارنو» کرابووە ناوچەیەکی بێ چەک. بەرپرسیاریەتییەکەشی خستە ئەستۆی فەرەنساوە، کەوای لە **هیتلەر** کردووە ئەم کارە بکاو، گوتی: فەرەنسا بەئەنجامدانی هەندێک ڕێککاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا، ڕێکەوتننامەی «لوکارنو»ی خستە ژێر پێی خۆیەوە. ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد ئەگەر دەوڵەتە ئەورووپاییەکان، بۆچوونەکانی ئەو لەمەڕ دەستکاریکردنی پەیماننامەی «ڤەرسای» قبووڵ بکەن، ئەوا دەگەڕێتەوە نێو کۆمەڵەی گەلان. ئەمە مانۆڕێکی زیرەکانەبوو، یاری لەسەر ژێی هەست بەتاوان کردن و ناڕوونی نیازەو مەرامی دیموکراسیگەلی ڕۆژئاوایی دەکرد.

قۆناغی دووەم ۱۹۳٦-۱۹٤۰ قۆناغی فراوانخوازی هیتلەرە لەسەر حسێبی هاوسێیە بچووکەکانی. لە ساڵی ۱۹۳٦دا **هیتلەر** پلانێکی ئابوری، بۆ بنیاتنانەوەی ئامێری سەربازیی ئەڵەمانی بۆ چوارساڵ دانا، تا لە ساڵی ۱۹٤۰ بۆ جەنگ

سازو ئامادە بێ. هەروەها میساقی میحوەری لەگەڵ ئیتالیاو پەیماننامەی دژی کۆمنترن «کومونیستی دەولی» لەگەڵ ژاپۆن گرێدا، چووە هانای فاشیستەکان و خۆی لەجەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا هەڵقورتاند. **هیتلەر** ناردنی سوپا بۆ هاریکاری ژەنەراڵی فاشیست، **فرانکۆ** بەوە پاساودایەوە کە ئەمە بەشێکە لە هەڵمەتەکانی رۆژئاوا بۆ سەر بۆڵشەویک، لە ساڵی ١٩٣٨دا، راوێژکاری نەمسا (**سەوسنینغ** Schuschnig) داوای لەگەلی نەمساوی کرد کە بۆ یەکیەتی لەگەڵ ئەڵەمانیا رێفراندۆمێک سازبدەن. بەو هیوایەی بەرلەوەی **هیتلەر** یەکیەتییەکەیان بەسەردا بسەپێنێ، نەمساوییەکان بەرەتکردنەوە وەرامی بدەنەوە. وەلێ **هیتلەر** خۆی لەمەش هەڵقورتاند، هێزەکانی ئەڵەمانیا بەرەو «ڤیەننا»ی پایتەخت هەڵکشان، تا سەربەخۆیی نەمسا لە ناوبەرن. دوای ئەمە نۆرەی چیکۆسلوڤاکیا هات. **هیتلەر** مەسەلەی چارەی خۆنووسینی سێ ملیۆن ئەڵەمانی کە لە هەرێمی «سوودیت»ی ئەو وڵاتە دادەنیشتن خستەروو، فشاری خستنە سەر چیکوسلوڤاکیا. ئەو ناوچەیە هاوسنوور بوو لەگەڵ ئەڵەمانیاو لەرووی سەربازییەوە ناوچەیەکی گرنگ بوو، چونکە بەرزاییەکانی «بوهێمیا» کەوتبوونە ئەوێ. هێڵێکی بەرگری سروشتی و، ئەو شوێنە بوو کە چیکییەکان بەرگریان لێ دەکرد لەهەر هێرشێکی چاوەڕوانکراوی **هیتلەردا**. **هیتلەر** رایگەیاند کە ئەو چارەسەریانەی دوای جەنگ ئەنجام دران، ئەو خەڵکانەی کەبەزمانی ئەڵەمانی داخیوۆن، خرابوونە سەر خاکی چیک. پێشێلکردنێکی مافی چارەی خۆنووسین و نموونەیەکی تری زۆرداریی دەوڵەتە رۆژئاواییەکانەو داوای کرد ئەو زەویانەی خەڵکەکانیان بەئەڵەمانی داخیوۆن، لە چیکۆسلوڤاکیا دابڕێن و بخرێنەوە سەر ئەڵەمانیای جێگەی باب و باپیرانیان.

ئەمە چیکییەکانی دووچاری نیگەرانی کردو بەشێکی هێزی یەدەگیان بانگی خزمەتی سەربازی کرد، ئەمە هیتلەری توورە کردو بڕیاریدا چیکوسلوڤاکیا وردوخاش بکا.

ئەو رووداوانە بەریتانیایان ترساند، کە نەیدەویست جەنگ لە ئەوروپادا بەرپابێ. سەرۆک وەزیرانی بەریتانی «**نیڤیل چەمبرلن**» سێ جار سەردانی ئەڵەمانیای کرد، بۆ ئەوەی هەوڵبدا تارمایی جەنگ لە ناوچەکە دووربخاتەوە. **چەمبرلن** لەو بڕوایەدابوو لەبەر دووری ماوەی نێوان هەردوو وڵات و نەبوونی هێزی بەریتانی لەو کیشوەرەدا، هیچ رێگایەکیان لەبەردەمدا نییە تا بەرگری پێ لەچیکۆسلوڤاکیا بکەن. لەمەش گرنگتر، نە چیکوسلوڤاکیایان بەو شێوەیە دەبینی کە شایەنی ئەوە بێت لە پێناویدا

بچنە نێو جەنگەوە، نە بەریتانیاش ئەو دەمە ئامادەی جەنگ بوو.

هێزی ئاسمانی بایەخی زێتر پەیداکرد. هاوکات مەترسی هەڵمەتی ئاسمانیش زێتر بوو. سەرۆک وەزیرانی بەریتانی دەیزانی کەوا هێزە بەرگریکارەکانی وڵاتەکەی و سیستەمەکانی رادار ئامادەی شەڕێکی ئاسمانی نین، لەبەر ئەو هۆیە ئالۆزانە لە ئەیلوولی ١٩٣٨دا **چەمبرلن**، لەشاری میونیخ لەگەڵ **هیتلەر** کۆبووەوەو. بەوە رازی بوو کە چیکوسلوڤاکیا دابەش بکرێ و خاکی (سودیت)یش بدرێتەوە ئەڵەمانیا، ئەگەر **هیتلەر** بەڵێنی ئەوەبدا کە بەگژ بەشەکەی تری چیکوسلوڤاکیا دانەیەتەوە. **هیتلەر** ئەم بەڵێنەی پێداو **چەمبرلن** چووەوە بەریتانیاو رای راگەیاند کە «ئاشتی سەردەم»ی هێناوەتەدی.

تەنیا شەش مانگ بەسەر ئەمەدا تێپەڕی، لە ئازاری ١٩٣٩دا، هێزەکانی ئەڵەمانیا چوونە ناو پارچەکەی تری چیکوسلوڤاکیاوە و «پراگ»ی پایتەختیان داگیرکرد. ئیدی بەریتانیای هێدمگرتوو دەرکی بەوەکرد، کە هیتلەر هەوڵی داگیرکردنی وڵاتانی دیکەش دەدات. ئامانجی دواتریش دەشێ پۆڵەندا بێت، کە لە سەدەی هەژدەهەمدا دابەشکرابوو و لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە وەکو دەوڵەتێک هاتبووەوە گۆڕێ و رێڕەوێکی لە بەندەری دانزک لەسەر دەریای بالتیک درابوویێ. ناوچەکە خەڵکێکی تێدا بوو، بەزمانی ئەڵەمانی دەئاخاوتن. **هیتلەر** هەمان تەکتیکی بۆ جارێکی تر بە کارهێنایەوە، رایگەیاند کە بوونی گەلێکی ئەڵەمان زمان لە چوارچێوەی خاکی پۆڵەندەدا، پێشێل کردنی مافی چارەی خۆنووسینەو نموونەیەکی تری زۆرداریییەکانی سیستەمی «ڤەرسای»ە.

ئەمجارەیان بەریتانیاو فەرەنسا هەوڵیاندا هیتلەر بسەنگرێننەوەو رابگرن، بەوەی هەرێ نامەیەکیان مۆرکرد کە بەرگری لە پۆڵەندا بکەن. ئەو کاتە **هیتلەر** بەکودەتایەکی کارامەی دیپلۆماتێکی هەڵسا، لەنکاوڕا لە ئابی ١٩٣٩دا پەیماننامەیەکی لەگەڵ **ستالین** مۆرکرد. سەرباری ئەوەی کە جاران دەیگوت ئەو دەیەوێ بەرگری لە رۆژئاوا بکا دژی بۆلشەویک. ئەو پەیماننامەیە بوارێکی وای بۆ **هیتلەر** رەخساند کەچی گەرەکە لە رۆژئاوا بیکا. هەروەها ئەو پەیماننامەیە پرۆتۆکولێکی تری نهێنی تێدابوو بۆ دابەشکردنی پۆڵەندا. **ستالین** و **هیتلەر** لەسەر ئەوە رێکەوتن هەریەکەیان بەشی خۆی بەرێ. **هیتلەر** دەستی بەسەر بەشەکەی خۆی داگرت و لەئەیلوولی ١٩٣٩دا شەڕی دژی پۆڵەندا دەست پێکرد. ئەو رۆژگارە **هیتلەر** بەتەمای رێکەوتنامەیەکی میونخی تر نەبوو کە بەریتانیا خۆی تێ هەڵقورتێنێ بۆ ئەوەی بەشێکی لە پۆڵەندا

بدەنێ، بەرامبەر هەرێی ئەوەی کە پەیڕەوی میانڕەوی بکات.

هەرچی قۆناغی سێیەم بوو، قۆناغێکی کورت بوو. **هیتلەر** لە ساڵی ١٩٤٠دا باڵادەستیی سەربازی لە کیشوەرەکە بەدی هێنا. دوای ئەوەی پۆڵەندای داگیر کرد بارەکە بۆ ماوەیەکی کاتی هێور بووەوە. ئەو ماوەیە پێی گوترا (الحرب الزائغة).

**هیتلەر** پێی وابوو لەوانەیە بەریتانیا هەوڵێک بۆ ئاشتی بدا، وەلێ لەوە دەترسا بەریتانیا لەبەهاری ساڵی ١٩٤٠دا هێزەکانی خۆی بنێرێتە نەرویج، بۆیە لە ترسی دابەزینی هێزەکانی بەریتانی، شەڕێکی کت وپڕی بەرپا کرد، کە هۆڵەنداو بەلجیکاو فەرەنسای گرتەوە. تانکەکانی خۆی بەنێو دارستان و لێڕەواری «ئاردین» تاودا، کەوا گریمان دەکرا کەس ناتوانێ خۆی لێ بداو بەکەس نابڕدرێ. فەرەنسی و بەریتانییەکان هۆپێکیان لە خۆزانی هەکە سوپای ئەڵەمانیا لە دەوری هێڵی ماجینۆ سوڕایەوە، کە بە درێژایی سنوورەکانی ئەڵەمانیا لەگەڵ فەرەنسا درێژ دەبووەوەو فەرەنسییەکان موکم و پتەویان کردبوون. هێزەکانی بەریتانیاشی دەرپەڕاندە «دەنکرک»، کە ناچار بوون کەل وپەلی خۆیان جێ بهێڵن و ئەو هێزەی کە مایەوە لە رێگای کەناڵەوە بیبباتەوە دەرەوە. بەم چەشنە بەهۆی زنجیرەیەک جووڵانەوەی زیرەکانە لە ساڵی ١٩٤٠دا **هیتلەر** لە رۆژئاوای یەکێتی سۆڤیەتەوە بووە سەرداری کیشوەری ئەورووپا.

*ئێستا پۆڵەندا کەوتۆتە ئەو رەوشەی کە من گەرەکم بوو. دەترسم لە دوا چرکەدا بەرازێک، یان یەکێکی تر، پرۆژەیەکی «نێوبژیوانی»یەم پێشکەش بکا.*

***ئەدولف هیتلەر ٢٧ی ئاب (ئۆگستوس) ١٩٣٩*** [٩]

قۆناغی چوارەم، قۆناغی رەت بوون و بڵاوبوونەوە بوو، شەڕێکی بەرفراوان هەڵگیرسا. **هیتلەر** ماوەیەکی زۆربوو دەیویست بەرەو رۆژهەڵات دژبە یەکێتی سۆڤیەت بجوڵێتەوە. وەلێ ویستی یەکەمجار لە بەریتانیا رزگاری ببێ، بۆ ئەوەی ئەگەری شەڕ لەدوو بەرەدا دووربخاتەوە. ئەگەر توانی باڵادەستیی ئاسمانی بێنێتەدی، ئەوکاتە دەتوانێ لەکەناڵ بپەڕێتەوەو بەریتانیا داگیر بکا. وەلێ هێزی ئاسمانیی **هیتلەر**، لەشەڕی لەندەن تێکشکێنرا[١٠]. کاتێ **هیتلەر** لە هێنانەدی باڵادەستیی

---

٩- ادولف هتلر فی ٢٧ اب اغسطس) ١٩٣٩ المانیا، ١٨٦٦-١٩٤٥ (نیویورک: مطابع جامع اکسفورد، ١٩٧٨) ص٧١٢.

١٠- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١٠).

ئاسمانی شکستی هێنا، خۆی لەبەردەم پرسیارێکی سەرسوڕهێنەر دۆزییەوە، ئایا پێویستە پلانەکانی خۆی بۆ پەلاماردانی یەکێتی سۆڤیەت دوابخا؟

هیتلەر وێڕای کە نەیتوانی بەریتانیا ببەزێنێ، بڕیاری دا پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتیش بدا، پێی وابوو دەتوانێ بەخێرایی ستالین ببەزێنێ و دواتر بابداتەوە سەر بەریتانیا. لەسەرەوەی ئەمەش، بەم کارەش بەریتانیای لە هەموو هاوپەیمانێتییەکی سەنگین لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بێ بەش دەکرد.

لە حوزەیرانی ١٩٤١دا **هیتلەر** پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتی دا، ئەمەش هەڵەیەکی زۆر گەورەبوو، لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵداو دوای ئەوەی ژاپۆنییەکان پەلاماری بیرل هاربریاندا، **هیتلەر** هەڵەیەکی گەورە تری کرد، کە جەنگی دژی وڵاتەیەکگرتووەکان ڕاگەیاند. **هیتلەر** ئەمەی بۆ ئەوە کرد تا ژاپۆن لە جەنگەکە بەتێوەگلاوی بمێنێتەوە. چونکە ئەو هەمیشە دنەی ژاپۆنییەکانی دەدا بێنە پاڵ ئەوەوە. بۆیە ئەو دەرفەتەی قۆستەوەو تۆربیدەکانی خۆی لە کەشتی ئەمریکایی بەردا بەم کارەش بەنزینی زێتر بەسەر ئاگری جەنگی جیهانی دووەمدا کرد، کە ڕایخی سێیەمی پێوە سوتاو لە ناوبرد.

## ڕۆڵی تاک

لەوانەیە کەسایەتی **هیتلەر**، هۆکارێکی یەکلایی کەرەوەی جەنگ نەبووبێ، دیموکراسیگەلی ڕۆژئاوایی بەپلەیەکی وەها لاوازبوو، لە نێوە خۆیاندا پارڤەببوون، هەستیان بە تاوانباری دەکرد، هەر نەتەوەخوازێکی زیرەکی ئەڵەمانی وا لێ کرد کە بتوانێ دەستکاری سیستەمی ڤەرسای بکا. وەلێ قۆناغی یەکەم و دووەم کە کۆنترۆڵی ئەوروپایان پێ کرا، بۆ کارامەیی و بوێریی سەرشێتانەی **هیتلەر** و خولیای شەڕانگێری ئایدولۆژیاکەی دەگەڕێتەوە، زۆرجاران هیتلەر بڕیارەکانی ژەنەرال و لێپرسراوە خۆپارێزەکانی ڕەتدەکردەوە. **هیتلەر** جەنگی گەرەک بوو، حەزی لەسەرەڕۆیی سەرکێشی بوو.

قۆناغی چوارەم کەجەنگی جیهانی و شکستی لەگەڵ خۆیدا هێنا، ئاماژە بۆ دوولایەن دەکا لە کەسایەتی **هیتلەر**، لەگەڵ بەردەوامبوونی لە خواردن، مگێزو ئارەزووی خواردنی دەکرایەوە، هەروەها بڕوای بەبلیمەتی خۆی هەبوو، وەلێ ئەو بڕوابەخۆبوونە بەرەو دوو هەڵەی گەورەی برد، پەلاماردانی یەکێتی سۆڤیەت بەرلەوەی بەریتانیا تێکبشکێنێ، هەروا ڕاگەیاندنی جەنگ دژی وڵاتەیەکگرتووەکان، ئەو

کارەی **هیتلەر** بیانوی بە سەرۆکی ئەمریکایی «**فرانکلین روزفلت**» دا تا بەشداری لەجەنگدا بکا، هەم لە ئەوروپاو هەم لە ئۆقیانووسی هێمن.

خەوش و کەموکوڕی گەورەی **هیتلەر**، ئایدۆلۆژییە ڕەگەز پەرستانەکەی بوو، کە لە هەندێک یەدەکی پڕ بایەخی بێبەش کرد. کاتێک ئەڵەمانیا، پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتیی دا، زۆر لە ئۆکرانییەکان و خەڵکی تر دژی دڕندایەتی **ستالین** ڕاپەڕین. وەلێ **هیتلەر** بەچاوێکی سووکەوە سەیری دەکردن، نەتەوەی سلاڤی پێ پایەنزم و شایەنی ئەوە نەبوون ببنە هاوپەیمانی ئەو دژی **ستالین**. هەروەها گومانی وابوو وڵاتە یەککگرتووەکان بەهۆی دانیشتووە ڕەش و جوولەکەکانیەوە، بێ هێزە. گاڵتەی بە**روزفلت** دەکرد کە باووباپیرانی جوولەکە بوون. **هیتلەر** نەیتوانی لەو ڕاستییە بگا، کە فرەڕەگەزی دەشێ ببێتە سەرچاوەی هێز. لەسەر هەموو ئەمانەوە دوژمنداریی کردنی ڕەگەزی «سامی» وای لێکرد هەندێک زانای وا لە ئەڵەمانیا دەربکا کە ڕۆڵێکی یەکلاییکەرەوەیان بینی لە دروست کردنی بۆمبی ئەتۆمی. بەکورتی دەڵێین کە هیتلەر تاکە کەسێکی یەکلاییکەرەوە بوو لە بەرپابوونی جەنگی جیهانی دووەمدا. بەڵێ هیتلەر لە پەشت هەڵگیرسانی ئەم جۆرە جەنگەو دەرەنجامەکانیەوە بوو.

## ئەو هۆیانەی کە پەیوەستن بە سیستەم و کاروباری نێوەخۆوە

بێگومان لێرەدا هۆی تریش هەبوون، چونکە جەنگی جیهانی دووەم بەتەنیا جەنگێکی هیتلەری نەبوو. نرخی ڕاڤەکردنەکەی «**تیلەر**»ی مێژوونووس لێرەدایە. پاشان هۆی تر هەبوون بەسیستەمەوە پەیوەست بوون بە هەردوو لایەنی بونیادگەری و کارراییەوە. جەنگ لەسەر ئاستی بونیادی کێشەی ئەڵەمانی چارەسەر نەکرد. پەیماننامەی «فەرسای» هێندە دڵڕەقانە بوو، هەستی نەتەوایەتی ئەڵەمانەکانی وروژاند. توانای بزاوت و ڕاپەڕینی لا دروستکردن. لەسەرەوەی ئەمەشدا نەبوونی وڵاتەیەککگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت لە تەرازووی هێزەکان تا کاتێکی زۆر درەنگ، وایکرد ئەڵەمانیا نەسەنگرێتەوەو بەرزەفت نەبێ. ئەمە سەرباری ئەوەی کە پرۆسەی بنیاتنانی سیستەمی دەولی لە دەستکاریکردن دوور بوو، ئەڵەمانیا داوای دەستکاریکردنی دەکرد و هەوڵی تێکشکاندنی سیستەمی «ڤەرسای» دەدا، لەپاڵ ئەمەشدا نەشونماکردنی ئایدیۆلۆژیا گەورەکان: وەک فاشیزم و کۆمونیزم، ڕق و کینەیەکیان هێنایە ئاراو، لە سییەکاندا کۆسپیان خستە بەردەم پەیوەندیکردن لەنێوان لایەک و لایەکی تردا. لەسەر ئاستی نێوخۆیشدا سێ گۆڕانکاری گرنگ لە ئارادا بوو

یەکەمیان: دیموکراسیی رۆژئاوایی کەدابەشکردنی چینایەتی و ناکۆکییە ئایدیۆلۆژییەکان پارچەپارچەی کردبوون، هەماهەنگی لەنەخشەکێشانی سیاسەتی هەندەراندا، خەریک بوو دەبوو بەشتێکی هەرگیز نەبووە. نموونەی ئەمەش. کاتێک لە فەرەنسا، «لیون پلوم» هاتە سەرحوکم، خۆپارێزەکان دروشمی «هیتلەر باشترە لە پلیوم» یان بەرزکردەوە. هەروەها لەساڵی ۱۹۳۹دا حکومەتی خۆپارێزەکان لە بەریتانیا شاندێکی ناردە مۆسکۆ بۆ ئەوەی بزانێ ئایا لە تواناد هەیە هاوپەیمانییەتییەک لەگەڵ ستالیندا مۆربکرێ. وەلێ ئەو شاندەی حکومەتی بەریتانیا لەنێو خۆیاندا دابەش ببوون، بەر لەوەی لەم بارەیەوە بگەنە بڕیارێک، هیتلەر بەر لە بەریتانییەکان گەیشتە ئەو بڕیارە، یەکێک لە هۆیەکانی ئەم دواکەوتنەی بەریتانیا، دوو دڵی چینی ئەرستۆکرات بوو، لە مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمۆنیزمدا. هۆی دووەم لەسەر ئاستی نێوخۆیی، هەرەسهێنان و دارمانی ئابوری بوو، بێ بازاڕی و مەنگ بوونی ئابوری (۱۹۲۹-۱۹۳۱..و) پەیوەندییەکی بەسیستەمەکەوە هەبوو. لەو رووەی کاری لە هەموو وڵاتان کردو کاریگەریی دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی پەکخست، لەدۆزینەوەو چەسپاندنی هەماهەنگییەکی ئابوری دەولی، لە پێناو چارەسەرکردنی ناهاوسەنگی لەبازرگانی و هاتووچۆی سەرمایە لەنێوان دەوڵەتاندا، وەلێ ئەو تەنگژەیە جێ پەنجەیەکی بەهێزی لەسەر سیاسەتەکانی نێو خۆیی و ململانێی چینایەتی بەجێهێشت.

ئەو بێکارییە گەورەیەی هاتە ئاراوە، باندۆری وای لەگەڵ خۆی هێنا، وەک ئەوە وابوو نەوتت بەئاگر داکردبێ. لە ئەنجامدا نازییەکان لەئەڵەمانیا گەیشتنە حوکم و حکومەتە دیموکراسییەکان بێ هێزبوون.

هۆی سێیەم، سیاسەتی دوورەپەرێزو لاتەریکی ئەمریکابوو، وڵاتە یەکگرتووەکان لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە بووە بەهێزترین وڵاتی ئابوری، وەلێ ئەمریکا ئەوەی رەتکردەوە کە بەرپرسیاریەتی ئەو پایەیە هەڵگرێ. لە سییەکاندا تەنگژەی ئابوری بەسەردا هات. وای لێکرد زێتر بەباری نێوخۆیی خەریک بێ و فەلسەفەی لاتەریکی قوڵتر بکاتەوە. سەرۆک **فرانکلین روزفیلت**، لەدەورەی یەکەمی سەرۆکایەتی کردنەکەیدا و ئەمریکاییەکانی تر، تەنیا بایەخێکی کەمیان بەئەوروپا دەدا، کەچی دوای سەرلەنوێ هەڵبژاردنەوەی لە ساڵی ۱۹۳۶دا، دەرکی بەو راستییە کرد کە هیتلەر زۆر بەهێزبووە، لەوانەیە دەست بەسەر تەواوی ئەوروپادا بگرێ و پاشان هەڕەشە لەوڵاتە یەکگرتووەکانیش بکا. ساڵی دواتر، ۱۹۳۷، **روزفیلت** دەربارەی

ئەوشتانەی لە ئەوروپا روویاندەدا هاتە قسە وەلێ ئەمریکاییەکان حەزیان نەدەکرد خۆ لە رەوشی ئەوروپا بگەیەنن. لە سالّی ١٩٤٠دا، **رۆزفیلت** ئالوگۆڕێکی لەگەڵ بەریتانییەکان کرد، چەند تێکشکێنەرێکی (مدمرات) پێدان لە بەرامبەردا ئەمریکا مافی ئەوەی هەبێ چەند بنکەیەک لە کۆلۆنەکانی بەریتانیا، لە نیوە گۆی رۆژئاوادا دابمەزرێنێ. لە سالّی ١٩٤١دا **رۆزفلت** وای لە کۆنگریس کرد بەرێککەوتنامەی بەقەرزدانی کەل و پەلی جەنگی بە بەریتانیا رازی بێ، تا بەریتانیا بەدەستی هیتلەر نەدۆڕێنێ. وەلێ رای گشتی نێوخۆیی «**روزفیلت**»ی پابەند کردبوو، کەتا چ رادەیەک ئازادە بەرەنگاری هیتلەر ببێتەوە.

ئەو هۆیە نێوخۆیی و کەسایەتی و سیستەمیانەی کە پەیوەستن بە سیستەم[11]، چۆن بەیەک دەگەن و کامڵ دەبن تا وێنەکە پێکبهێنن؟ دەمانتوانی بڵێین، هۆیە قوڵەکانی جەنگی جیهانی دووەم پەیوەستن بەسیستەم - مەسەلەی جەنگی جیهانی یەکەم تەواونەبووە. هەرچی هۆیە نێوەڕاستەکانە، تارادەیەکی زۆر نێوخۆیی بوون. پارچەپارچەبوونی کۆمەلآیەتی و ئایدیۆلۆژی، کەهیتلەر لە ئەلّەمانیا سەرکردایەتی دەکردو بێ هێزی دەوڵەتە دیموکراسییەکان لە هۆیە خێراکەرەکانی هەڵگیرسانی جەنگ بوون.

## ئایا جەنگ هەر دەبوایە روویدا؟

ئایا جەنگی جیهانی دووەم هەر دەبوایە روویدا؟ نەخێر. وەلێ بەتێپەڕبوونی کات وای لێهات ئەو شێوەیە وەربگرێ. لە سالّی ١٩١٨دا شتێک لەئەگەری دایسانی جەنگی جیهانی دووەم لە ئارادابوو، وەلێ دوای مۆرکردنی پەیماننامەی «لوکارنو» لە سالّی ١٩٢٦، ئەو ئەگەرەش نەما. پاشان خەفەکردنی رێگاچارەکان، دوای مەنگییە گەورە ئابوورییەکەی لەسالّی ١٩٢٩، سەر لەنوێ داخرایەوە. لەسالّی ١٩٣٣دا هیتلەر دەسەلآتی گرتەدەست تا بەرپابوونی جەنگ لەسەر ئاستی جیهانی لە سالّی ١٩٤١دا. شکستهێنانی جەنگی جیهانی یەکەم لە چارەسەرکردنی کێشەی ئەلّەمانی، واتای ئەوەیە ئەگەری جەنگی جیهانی دووەم، هەر لە سالّی (١٩١٨)ەوە لە ئارادا بووە.

ئەگەر دەوڵەتە دیموکراسییەکان، لەسییەکاندا رێگای رازیکردنی ئەلّەمانیایان هەڵبژاردبوایە، ئەوا دەتوانرا حکومەتی «ڤایمار»ی دیموکراسی بهێلڕێتەوە. یاخود ئەگەر

١١- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١٣).

ولاّته یەکگرتووەکان پەیماننامەی «فەرسای» مۆربکردبوایەو لە ئەوروپادا بمابوایەوە بۆ پارێزگاری کردنی هاوسەنگیی هێزەکان (وەک دوای ساڵی ١٩٤٥ کردی) لە وانە بوو هیتلەر بگاتە دەسەڵات، یان لەوانە بوو هەندێک وردە شەڕ لە ئەوروپا بقەومابان، وەلێ نەوەکو جەنگی جیهانی دووەم. لە سییەکاندا مەنگی و بێ بازاڕی ئابوری، پێ سۆتەک بوو، گڕی ئایدیۆلۆژیاکانی خۆشکرد، دەستدرێژکاری جاویدان کردو وای کرد ئەگەری دایسانی جەنگ لە پێشتر زێتر ببێ.

باپشت بە پرەنسیپی دژبەیەکەکان ببەستین، وامان دانا لە سەرەتای سییەکاندا فەرەنساو بەریتانیا، هاوپەیمانییەتیان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت گرێ بدابوایەو بەرەو رووی ئەڵەمانیا ببونایەتەوە، یاخود ئەوە بێنینە بەرچاو کە ولاّتە یەکگرتووەکان لەپاڵ کۆمەڵەی گەلاندا بوایە، ئایا **هیتلەر** نەدەسەنگرایەوە، یان جەنگەکەی دوادەخست، لە وانەبوو ئەو سەرکەوتنە سەرنجڕاکێش و زووانە بەدەست نەهێنێ، یان بەدەستی ژەنەڕاڵەکانی خۆی لە دەسەڵات هێنرابایە خوارەوە، کە زۆرجاران بیریان لەم جۆرە کودەتایە دەکردەوە. وەلێ لەبەر ئەوەی ئەم شتانە روویاندا، کەسایەتیی **هیتلەر**و ستراتیژییەکەی، لە هۆیە خێراکەرە سەرەکییەکانی جەنگ بوون. هەرکە **هیتلەر**؛ لە سەرەتای سییەکاندا دەستی بەپلان دانان کرد بۆ جەنگ، تاوای لێهات هیچ چارەیەک بێ لە جەنگ نەمایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە مێژوونووسان لەو بڕوایەدان، ئەگەر بەریتانیاو فەرەنسا لە ئەیلوولی ١٩٣٩دا هێرشیان بکردبوایە، لەوانەبوو ئەڵەمانیا ببەزێن.

### جەنگی ئۆقیانووسی هێمن

جەنگ لە ئۆقیانووسی هێمن، سەرچاوەی جیای خۆی هەیە. ژاپۆن کۆمەڵگایەک بوو زۆر بەتوندی خوی بەنەریتەکانی خۆیەوە گرتبوو، هیچ پەیوەندییەکی قوڵی بەو شتانەوە نەبوو کە لە ئەوروپا روویاندەدا. لە بیستەکاندا، ژاپۆن ئەگەرچی سیستەمی پەرلەمانی تیابوو، لە دیموکراسیی زۆر دوور بوو. لە سییەکاندا میلتیارست و نەتەوەخوازە توندڕەوەکان، جڵەوی دەسەڵاتیان گرتەدەست، سیاسەتی فراوانخوازی ئیمپریالیستانەیان دەنگێکی باشی لای گەلی ژاپۆن دایەوە. ژاپۆن هەمیشە گازاندەی لەوەدەکرد کە بێ بەش بووە لەکەرەستەی خاوو ناچار بووە لەدەرەوەی رابهێنێ.

کاتێک تەنگژەی ئابوری لە سییەکاندا بازرگانی ژاپۆنی گرتەوە، ژاپۆنییەکان لەوەترسان ئەگەر باری خۆیان نەگۆڕن، رووبەڕووی ئایندەیەکی تاریک ببنەوە، بۆیە

هەوڵیاندا سەروەریتیەکی هەرێمی بۆ خۆیان دروست بکەن، کەناوی نرا، کەرتی هەرەگەورە بۆ خۆشگوزەرانی هاوبەشی رۆژهەڵاتی ئاسیا Greater East Asia Co-prosperity Sphere ناوێکی کارامەی بریقەدار بوو بۆ داگیرکردنی وڵاتانی هاوسێ، ژاپۆنییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو رێگایە بواری ئەوەیان بۆ دەرەخسێنێ بەرەنگاری هەڕەشەکانی بەریتانیاو وڵاتە یەکگرتووەکان ببنەوە. کە تائەو دەمە دووهێزی دەریایی مەزن بوون لە ئۆقیانووسی هێمندا.

لەسەرەتادا ژاپۆن لەسەر حسێوی چین پەلی هاویشت، جەنگی دڕندانە لە چین، ژاپۆنی خستە ململانێیەکی دیپلۆماتیانەوە لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان، کە پاڵپشتی چینی دەکرد. دوای ئەوەی هیتلەر فەرەنسای داگیرکرد، ژاپۆن ئەو هەڵەی قۆستەوە بۆ ئەوەی دەست بەسەر کولونە فەرەنساییەکان دابگرێ لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا، واتە ڤێتنام و کەمبۆدیا.

لەو خاڵەدا، سێ رێگا چارە لەبەردەم ژاپۆنییە فراوانخوازەکاندا هەبوو: یەکێکیان لەرۆژئاواوە دەست لە یەکێتی سۆڤیەت بوەشێنن. لەبەر ئەوەی لەسەر سنووری مەنشوریاش بەیەکدادان لە نێوان هەردوولادا هەبوو. هەندێک لەو بڕوایەدا بوون کە تارادەیەکی زۆر ئەگەری بەرپابوونی شەڕێکی ژاپۆنی- سۆڤیەتی هەیە، بەدرێژایی سنووری مەنشوریا. رێگاچارەی دووەم ئەوەبوو ژاپۆن لە باشوورەوە دەستی خۆی بوەشێنێت. راستە لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا دەستیان بەسەر کۆلۆنەکانی فەرەنسا داگرتبوو، وەلێ خەڵاتی هەرەگەورە، هیندی رۆژهەڵاتی بوو کەهی هۆڵەندا بوو (ئەندەنوسیای ئێستا) کە بەنەوت دەوڵەمەندبوو، ژاپۆنیش پێویستی بەنەوت هەبوو. هەرچی رێگاچارەی سێیەم بوو، ئەوا لە رۆژهەڵاتەوە دەست ئەمریکا بوەشێنن، کە ئەمە لە هەموو رێگاچارەکان ترسناکتر بوو.

لە کۆتاییدا ژاپۆنییەکان رێگاچارەی دووەم و سێیەمیان هەڵبژارد. لە(٧)ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا لە رۆژهەڵاتەوە دەستیان لە وڵاتە یەکگرتووەکان وەشاند، لەباشوریشەوە لە فیلیپین و ئەندەنوسیا، وەلێ ئەگەر جووڵانەوەکەیان بۆ باشوور بەمەبەستی داواکردنی کەرەستەی خاوبوو، ئەوا راڤەکردنی پەلامارەکەیان بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان ئاستەنگە. ژاپۆنییەکان مەودای جیاوازی سەرچاوەکانی هێزی ئەو دوو وڵاتەیان دەزانی. هەروا دەیانزانی لە کۆتاییدا ناتوانن شەڕ لە وڵاتە یەکگرتووەکان بەرنەوە. وەلێ لە پەنای ئەو پەلامارە کت و پڕەیان بۆ سەر «بیرل هاربر» بەو ئومێدە بوون ورەی وڵاتە یەکگرتووەکان لاوازبکەن. بەشێوەیەک سۆنگەی تەقینەوەی

جەنگێکی بەرفراوان دوور بخرێتەوە. ئەمەش خراو خەملاندنێکی ژاپۆنییەکان بوو. ئەگەرچی لە روانگەی ئەوانەوە لە هەموو رێگاچارەکانی تر حەکیمانەتربوو.

هەکە پایزی ١٩٤١ داهات، ژاپۆنییەکان چیتر یەکێتی سۆڤیەتیان بە ئامانجێک دانەدەنا، پەلاماری **هیتلەر** بۆ یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەوە بوو ئەو هەڕەشەیە لەسەر ژاپۆن هەڵگرێ. ئەم دوو وڵاتە تاهەفتەکانی کۆتایی جەنگ «بێ لایەنی بەرژەوەندیدار»ی خۆیان پاراست. هاوکات ئەمریکاییەکان هەوڵیان دا ژاپۆنییەکان لە لێدانی باشوور بسەنگرێننەوە، چوونی نەوتیان بۆ ژاپۆن قەدەغەکرد. لەم بارەیەوە سەرۆک روزفیلت دەڵێ: «وڵاتە یەکگرتووەکان پەتی خستۆتە ملی ژاپۆنییەکان و ناوە ناوە رایاندەکێشێ» هەروەها ئەم قسەیەشی لەدەمی یاریدەدەری وەزیری هەندەران، (**ردین چمسون**) هەڵگرتەوە، کە ئەو رۆژانە گوتبووی:

«پەلاماردان نەدەبووە سۆنگەی جەنگ، چونکە هیچ ژاپۆنییەکی ژێر ناتوانێ بڕوا بەوەبهێنێ، کەوا پەلاماردانی ئێمە، ناحانگەیەنێتە هیچ شتێک، تەنیا کارەسات و ماڵوێرانی بۆ وڵاتەکە نەبێت»[١٢] وەلێ ژاپۆنییەکان هەستیان کرد ئەگەر شەڕێ دەکەن، ئەوا لەکۆتاییدا هەرچۆنێک بێت، چارەنووسیان دۆڕان و بەزینە. لەبەر ئەوەی ٩٠٪ نەوتەکەیان لەدەرەوە دەهات، بینیان کەوا هێزی دەریاییان لە باشترین حاڵەتدا، ناتوانێ ساڵێک خۆی راگرێ، ئەگەر باری تری نەوتیان نەگاتێ، بۆیە ئەگەر نەجەنگن، ئەوا هێدی هێدی دەخنکێن.

لە پاڵ ئەمەشدا وڵاتە یەکگرتووەکان داوای لە ژاپۆن دەکرد لەچین بکشێتەوە. ژاپۆنییەکان بڕوایان وابوو، کە ئەمە لەناوچەیەکیان بێ بەش دەکا، کەبە قووڵایی ئابوری خۆیان دادەنا. یەکێک لە ئەفسەرەکان ئەوبارەی بۆ ئیمپراتۆر «**هیروهیتو**» وەسف کردووە کە «وەکو نەخۆشێکە لە حاڵەتێکی ترسناکدا بێت نەشتەرگەری لەپاڵ ئەو مەترسییە زۆرانەی کەتیایەتی، هەندێک هیوای بۆ رزگارکردنی ژیان پێ دەبەخشێ»[١٣]. چوونە نێو جەنگ لە روانگەی ژاپۆنییەکانەوە کارێکی بەتەواوی نائاقڵانە نەبوو، بەڵکو خراپی هاتنە ناو جەنگ لەئەڵتەرناتیڤە دیارەکانی تر کەمتر بوو. ئەگەر ئەڵمانییەکان، بەریتانییەکان شکاندو ئەو هەڵکوتانەسەرەیان ورەی رای گشتی بەریتانیای هێنایەخوارەوە. دەشێ دانوستان لەسەر ئاشتی بکرێ. پەیڤەکانی

---

١٢- سکوت ساکان. جذور الحرب في المحيط الهادي (نيويورك، مطابع جامع مكبرج، ١٩٨٩) ص٣٣٥-٣٣٦.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل ٣٢٥.

جێگری سەرۆک ئەرکانی سوپا «**تسوکودا**» دەستەواژەیەکی تیایە، دەربارەی مگێزی بێ چارەو ئاوەڵای فەرماندە ژاپۆنییەکان، کە دەڵێ: «ئەگەر چووینە نێو جەنگەوە، بەشێوەیەکی گشتی هەلی سەرکەوتن لەئارادا نییە. ئێمە دەپرسین. ئایا هیچ رێگایەک هەیە بۆ ئەوەی کارەکان بەئاشتیانە چارەسەربکرێن. هیچ کەسێک ناڵێ، دووچاری دڵە راوکێ مەبن هەتاوەکونێ ئەگەر شەڕیش درێژەی پێدا، من بەرپرسیاریەتییەکە هەڵدەگرم. لەلایەکی ترەوە ناتوانین ئەو مل کەچییە قبوڵ بکەین کە لە ئارادایە. بۆیە مرۆڤ هیچی تری لەدەست نایێ تەنیا بگاتە ئەو ئەنجامەی، کە ئێمە هەردەبێ بجەنگین(١٤).

ژاپۆنییەکان دەیانتوانی لەدەستدرێژیکردنیان بۆسەر چین و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا پەژیوان ببنەوە. وەلێ ئەمە لەدیدی سەرکردە سەربازییەکانەوە کارێکی دوور بوو. بۆیە لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا بۆردوومانی بەندەری «پیرل هاربر»یان کرد.

ئەی چی دەربارەی سێ ئاستەکە، ئەگەر لەسەر ئۆقیانووسی هێمن پراکتیزەبکرێن؟ بەدڵنیاییەوە رۆڵی تاک بێ هێزترە، لەوەی کە رۆڵی هیتلەر هەیبوو لە ئەوروپادا. لەگەڵ ئەوەشدا تاکەکان، وەک دروستکەری سیاسەت، کاریگەری خۆیان لەسەر رێرەوی رووداوەکاندا هەبوو، ژەنەڕاڵ وسەرکردە دەریاییە فراوانخوازەکان، دەیانویست بالادەستیی ژاپۆن لە هەرێمەکان فراوان بکەن. بەگەرمی هەوڵیان دەدا، جەنگ لە رۆژئاواوە بەرەو چین و لەباشوورەوە بەرەو فیلیپین و ئەندەنوسیاو لە رۆژئاواوە بۆ دۆستەکانی ئەمریکا لە ئۆقیانووسی هێمن فراوان بکەن. سەرکردە سەربازییەکان، وەک «**هایدیکی توگو**» رۆڵێکی گەورەیان لە نەخشەکێشانی سیاسەتی حکومەت دەبینی. **توگو** وەکو زۆربەی سەرکردە سەربازی و سیاسییەکان، لایەنگیری ئەو شتانەی دەکرد کە بڕیاریان لەسەر دابوو. لە کاتێکدا **هیتلەر** لە زۆربەی کاتدا هەر خۆی بڕیاری دەدا، ئەگەرچی لەلایەن زۆر لە گەورە ژەنراڵەکان و کارسازە پیشەسازییەکانی ئەڵمانەوە پشتگیری دەکرا. لە ژاپۆن، دەسەڵات لە چوارچێوەیەکی فراوانتر دابەش کرابوو. بڕیارەکان لە ئەنجامی بێنەو بەردەیەکی بەرفرەتر لە نێوان سیاسەتمەداران و سەرکردە سەربازییەکان لە دایک دەبوو.

بەهەمان چەشن رۆڵی تاک لەنەخشەکێشانی سیاسەتی ئەمریکاییش گرنگ بوو.

---

١٤- سكوت ساكا، الردع واتوار: دراسة نقدية في نظريات الردع المدنة «اطروحة دكتوراه في جامعة هارفردي، ١٩٨٣. ص.٢٨٠.

**روزفیلت** حەزی دەکرد سزایەکی ئاقڵکەرانەی ئابوری بە سەر ژاپۆنییەکاندا بسەلمێنێ، لەسۆنگەی دەستدرێژیکردنیان بۆسەر باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. وەلێ زۆر لە ئەندامەکانی کۆنگرێس و خەڵکان لەم سەرو ئەوسەری وڵاتدا، سیاسەتی روزفلتیان بەدڵ نەبوو، کە داوای «کارایی و رووبەڕووبونەوەی دەکرد. چونکە لە ساڵانی ١٩٤٠-١٩٤١دا، هێشتا مەیلی سیاسەتی خۆپارێزی و لاتەریکی لە وڵاتە یەککگرتووەکان بەهێزبوو. خەڵکێکی زۆر بەشداریکردنی وڵاتە یەککگرتووەکانیان لە کاروباری دەولی رەتدەکردەوە. ئەگەر ئەو کاتە یەکێکی وەکو سیناتور «**پیرثن ویلر**» لە ویلایەتی مونتانا، یاخود «**حیرام جونسف**» لە کالیفورینا سەرۆک بوایە، ئەوا لە جیاتی ئەوەی لە رووی ژاپۆندا بوەستێ، پاساوی بۆ دەستدرێژکارییەکانی ژاپۆن دەهێنایەوە. ئەمەش وایدەکرد هەر لەبنەڕەتەوە ژاپۆن پێویستی بەوەنەبێ پەلاماری وڵاتە یەککگرتووەکان بدا. بێگومان لەم حاڵەتەدا دەستدرێژکاری ژاپۆنی بەبێ هیچ سەنگرانەوەیەک بەرێوە دەچوو، ئەو کاتە خۆی وەک زلهێزێک بۆ رۆژئاوای ئۆقیانووسی هێمن، تەرخان دەکرد. هەرچی دەربارەی ئەو هۆیانەیە کەبەسیستەمی نێوخۆوە بەندن، ئەوا زێدەبوونی گیانی سەربازییە لە حکومەتی ژاپۆندا، کە ئەمە وایکرد ئەگەری بەرپابوونی جەنگ لە پێشان زۆرتر بێت. هەروەها هەرەسهێنان و دارمانی ئابوری لە ژاپۆن و وڵاتەیەککگرتووەکان کاری لە سیاسەتی هەندەرانی هەردوو وڵات دەکرد، هەروەک چۆن لە سییەکانیشدا کاری لە ئەوروپا کرد. ئەمە وایکرد ژاپۆن مەیلی سیاسەتی فراوانخوازی زۆرتر بێت، لە کاتێکدا وڵاتە یەککگرتووەکان تاوەکو ساڵی ١٩٤٠، زێتر بۆ مەیلی بەلای سیاسەتی لاتەریکیەوە دەبوو. لەپاڵ ئەمەشدا ئەو ئاژاوە نێوخۆییەی کە لەسییەکاندا چینی گرتەوە، وایکرد وڵات زێتر دووچاری فراوانخوازی ژاپۆنی بێت، کە ئەمەش بە رۆڵی خۆی نفوزی سەربازییەکانی لە سیاسەتی نێوخۆیی و حکومەتی ژاپۆن زۆرتر کرد.

پەیمانی ڤەرسای، لەسەر ئاستی سیستەم، پەرای چاوتێبڕینەکانی ژاپۆنی بۆ چین نەدەکرد. دوای ئەمەش لە سییەکاندا کێشەی ئابوری هاتە ئاراوە، ئەمە ئاستەنگی زێتری خستە بەردەم ژاپۆن بۆ وەدەست هێنانی کەرەستەی خاو، کە تەنیا لە رێگای بازرگانییەوە وەدەستی دەکەوت. لە نێوان ساڵانی ١٩٣١و ١٩٣٣دا دارمانی سیستەمە ئاسایشی کۆمەڵەی گەلان لە ئاسیادا هاتەئارا، کەئەمە کۆسپە داوو دەزگاییەکانی لە رێگای چاوتێبڕینەکانی ژاپۆن رادا.

هۆیە قوڵ و راستەوخۆکان لە جەنگی ئۆقیانووسی هێمندا، لەوەی ئەوروپا جیان،

کە تاڕادەیەکی زۆر شەڕێکی نێوخۆیی بوو- وەرچەرخایەوە بەرەو فراوانخوازی لە ژاپۆن و زێتر سیاسەتی لاتەریکی لەئەمریکا، ئاژاوەکانی چین لە سییەکاندا.
هەرچی هۆیە خێراکەرەکانە، ئەوا بڕیاری قەدەغە کردنەکەبوو کە سەرۆک **روزفیلت** لە تەمموزی ١٩٤١دای، کە میلتارە ژاپۆنییەکانی، بۆ پەلامارادانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رشتر کرد کە لە (٧) کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا روویدا[١٥].

## رازیکردن و دوو جۆرە جەنگ

ئەو وانەو پەندانە چین کە لەمەی هەڵدەهێنجین؟ هەندێک دەڵێن وانەی بنەڕەتی لە ماوەی سییەکاندا، خەراوییەکانی «رازیکردنە». وەلێ رازی کردن خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپ نییە، ئەوە ئامرازێکی دیپلوماتیکی کۆنینەی کلاسیکییە، رێگاچارەیەکی سیاسیانەیە، گۆڕانکاری لە تەرازووی هێزەکان دەڕەخسێنێ و سوودی بۆ دەوڵەتی رکابەر، یاخود ناحەز دەبێت، لەجیاتی سەنگراندنەوە، یاخود بنکۆڵکردنی دەوڵەتی دوژمن، دەوڵەت بڕیاری ئەوە دەدا کە باشتر وایە رێگا بداتە دەوڵەتی دوژمن هەندێک دەستکەوتی کەمی پێ ببڕێ.
بەر لە جەنگی پیلۆپونیزی، «کورنث»، «ئەثینا»ی هاندا کە رێگای بدا «کورسایرا» قوت بدا. وەلێ خەڵکی ئەثینا، «کورنث»یان رازی نەکردو کوشتاریان هەڵبژارد. دەبینین بۆ ئەثینا واباشتر بوو، تەما بەبەر «کورنث»ەوە بنێ، لە جیاتی ئەوەی لەسەر کورسایرا ملیان لە بەر ملی بنێ.
سیاسەتی رازیکردن لە ساڵی ١٨١٥دا بەسەر کەوتوویی دانرا، لە رازیکردنی فەرەنسا لەلایەن هاوپەیمانە سەرکەوتووەکانەوە. لەنەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، بەریتانییەکان، ئەمریکاییەکانیان رازی کرد. بەڵکو دەتوانین بڵێین، سیاسەتی رازی کردن، راستر دەبوو، ئەگەر هاوپەیمانەکان لەبیستەکاندا بەرامبەر ئەڵەمانیا پەیڕەویان کردبوایە، لە کاتێکدا ئەوان لە سییەکاندا پەنایان بۆ ئەو سیاسەتە برد، لە کاتێکدا دەبوایە بەرامبەر ئەڵەمانیا بوەستنەوە.
رازیکردن، نزیک بوونەوەیەکی هەڵەبوو لە **هیتلەر**. لەبەر ئەوەی سەرۆک وەزیرانی بەریتانی (**نیڤیل چەمپرلن**) کەسێکی ترسنۆک نەبوو، وەک ئەزموونی میونیخ هزری

---

١٥- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١١).

لێدەکرد. ئەو ویستی جەنگێکی تری جیهانی لە کیشوەرەکە دووربخاتەوە. لە تەمموزی ١٩٣٨دا گوتی: «کاتێک بیر لەو چوار ساڵە تۆقێنەرەو، بیر لەو حەوت ملیۆن لاوە دەکەمەوە کە گیانیان لەدەستدا، کە هێشتا لە هەرەتی گەنجیدابوون. ئەو سیانزە ملیۆن مرۆڤەی دەست و پێ یان بڕاوەتەوەو کەم ئەندام بوون، چارەڕەشی دایکان و باوکان و کوڕو کچان، پێویستە لەسەرم بڵێم هیچ قازانجکەرێکی راستەقینە لە جەنگدا نییە. لە کۆتاییدا ئێمە هەموومان دۆڕاوین. ئەمە وای لێکردم لەو بڕوایەدابم ئەرکی سەرەکی ئێمە لەو ژیانەدا، دووپات نەبوونەوەی جەنگێکی جیهانی ترە لە ئەوروپا، تەنانەت رێگا نەدانی هەڵگیرسانی شەڕێکی نێوخۆیی و هەرێمیشە»[١٦].

١٦- نیڤیل چەچرلن، بحث عن السلام: الکلمات ١٩٣٧-١٩٣٨ ( لندن: صاتجینسون) ص٥٩.

# شەڕی سارد

ئەگەر نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم سیمای توندو تیژی پێوە دیار بووبێ، ئەوا دیارترین شت کە نیوەی دووهەمی لە یەکەم هاوێر دەکردەوە، روونەدانی جەنگی جیهانی سێیەم بووە. لە جێی ئەوە، شەڕی سارد لە ئارادا بوو، واتە ماوەیەکی دژبەری توندبوو، بەبێ ئەوەی بەکردەوە شەڕ روویدا. دژبەریەکە هێندە گرژو توندبوو، زۆرکەس چاوەڕوان بوون ململانێیەکی چەکدارانە لە نێوان دەوڵەتە گەورەکاندا روویدا. شەڕو کوشتار لە پەرگەو ناوچە لاپەڕەکان روویدا، وەلێ بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەتدا شەڕ نەقەوما. شەڕی سارد چوار دەیەکی خایاند، لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە تاوەکو ساڵی ١٩٨٩. لەم ماوەیەدا دانوستانی جدی لە نێوان وڵاتەیەککگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەتدا کەم بوو. تەنانەت لەماوەی نێوان ١٩٤٥-١٩٥٥دا تاکە یەک کۆنگرەی لوتکەش نەبەسترا. لە ساڵی ١٩٥٢دا باڵیۆزی ئەمریکایی لە مۆسکۆ (**جورج کینان**)، وەها وەسفی دووره پەرێزی و لاتەریکیی خۆی لە باڵیۆزخانەکەیدا کردووە کە بەو ماوەیەی لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا! لە بەرلین گیرابوو، چواندووە.

قۆناغەکاتی ئەو دواییەی شەڕی سارد لە حەفتاو هەشتاکاندا، ئەوا زۆر جیاوازبوون، پەیوەندییەکی زۆر لە نێوان ئەمریکایی و سۆڤیەتیەکاندا هەبوو. بەردەوام دانوستانیان لەمەڕ پەیماننامەکانی چاودێریکردنی چەک دەکرد.

کۆتایی شەڕی سارد زۆر خێرابوو، دوای ئەو گۆڕانکاریە سیاسییانە بوو: هاتنی میکائیل گۆرباچۆف لە ساڵی ١٩٨٥ بۆ دەسەلات و کۆتایی پێ هێنانی کۆنترۆلی سۆڤیەتی لە ئەوروپای رۆژهەلات لە ساڵی ١٩٨٩و دوای ئەمەش لەبەر یەکهەڵوەشانەوەی خودی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١.

## سەنگراندنەوەو بنکۆلکردن

شەڕی سارد شتێکی ناوازەو هەڵاوێردراو بوو، چونکە هەرچەند ماوەیەکی درێژ لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ڕکابەردا گرژی هەبوو، بەڵام بەجەنگ کۆتایی نەهات. لێرەدا لێکدانەوەی جۆراوجۆر بۆ هۆیەکانی ئەم حاڵەتە هەیە. لەمەودوا گفتوگۆی لەسەر دەکەین:

شەڕی سارد لەسۆنگەی ڕێڕەوە نائاساییەکەییەوە، دیدێکی دانسقە لەپەیوەندییە دەولییەکان پێشکەش دەکات. هێزی دینامیکیەتی ژمارەیەک لە ڕێگاچارەکانی سیاسەتی هەندەران ڕۆشن دەکاتەوە، کە دەشێ دەوڵەتان بیگرنە بەر، ڕێگاچارەی سەنگراندنەوە (خيار الردع)و ڕێگاچارەی بنکۆڵکردن (خيار الاحتواء).

سەنگراندنەوە (الردع) واتا یەکێک چاوترسێن بکەی، نەبادا کارێک ئەنجام بدا. ئەمەش شتێکی نوێ نییە لە شەڕی سارددا. بەدرێژایی مێژوو، وڵاتان سوپا بەیەکەوە دەنێن و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەم و ئەودا دەبەستن و هەڕەشە لەم لاو لەولا دەکەن، وڵاتانی تر چاوترسێن دەکەن کە نەکەن پەلاماریان بدەن. لە ماوەی شەڕی ساردو هاتنەئارای چەکی ئەتۆمیدا، دەوڵەتە گەورەکان بە پشت بەستن بەهەڕەشە کە نەکەن دەوڵەتانی دیکە کاری دەستدرێژکاری بکەن، لەجیاتی پەنابردنە بەر سەنگراندنەوە دوای ڕوودانی دەستدرێژیکردنەکە.

سەنگراندنەوەی شەڕی سارد بەتەواوی بە «سەنگراندنەوەی ئەتۆمی» بەستراوەتەوە، وەلێ هاوکات درێژ بوونەوەی کێشەکە بۆ لۆژیکی هاوسەنگیی هێزەکان دەگەڕێتەوە. سەنگراندنەوە بە هۆی هەڕەشەی ئەتۆمییەوە، یەکێک لەو ڕێگایانە بووە کە دەوڵەتە گەورەکان پەنایان بۆ دەبرد، نەبادا هیچ لایەک پێشکەوتنێکی وا بەدەست بێنێ لەنگی بخاتە هاوسەنگیی هێزەکان، لە نێوان هەردوولاوە، ئەو سەنگراندنەوە زۆرجاران گرژیی لە نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەتدا توندتر دەکرد، وەک دواتر دەبینین ئاسان نییە چۆنیەتی ئەنجامدانی «سەنگراندنەوە» ڕوون بکەینەوە. لێرەدا هەمیشە هۆ بۆ هێنانەوەی هەڵە، یاخود درۆ لە ئارادا هەیە. ئەگەر مامۆستایەکی ژن گوتی: وانە وتنەوەکانی من، «فیل» لە هۆڵی وانەگوتنەوە دووردەخاتەوە، زەحمەتە بەدرۆی بخەینەوە، ئەگەر لە بنەڕەتدا فیل نەچووبێتە هۆڵەکەوە! دەتوانین ڕادەی ڕاستی ئەو گوتنانە تاقی بکەینەوە بەبەکارهێنانی تەکینیکی دژ بەیەکەکان: ئایا ئەگەری ئەوە هەیە فیل بچێتە هۆڵی وانەگوتنەوە؟

پرەنسیپی سەنگراندنەوە بەسیاسەتی بەخۆوەگرتنەوە (الاحتواء) لکاوە.

«بنكۆڵكردن» له ماوەی شەڕی ساردا ئاماژە بۆ سیاسەتێکی دیاریکراوی ئەمریکی دەکا ، کە ئامانجی بنکۆڵکردنی کۆمۆنیستی سوڤیەتی بووە ، لەپێناو سیستەمی بڵاوکردنەوەی ئابوری و سیاسیی لیبرالی جیهانیدا. بنکۆڵکردن، وەکو سەنگراندنەوە، لەگەڵ شەڕی ساردا نەهاتۆتە کایەوە. وەلێ زاراوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوەیە. لەبەر ئەوەی بنکۆڵکردن «بەخۆوەگرتن» چەندین سەدەیە ئامرازێکی سەرەکی بووە لە سیاسەتی هەندەراندا. لەسەدەی هەژدەهەمدا، دەوڵەتانی خۆپارێزی پاشایەتی لە ئەوروپا ، هەوڵیاندا فەلسەفەی ئازادی و یەکسانی «بنکۆڵ بکەن» کە شۆڕشی فەرەنسی جاڕی بۆ دەدان. بەر لەوەش کەنیسەی کاثۆلیکی لەبەرەنگاربوونەوەی بزاڤی چاکسازی ئایینیدا، هەوڵیدا بزاڤەکەو بیروڕاکانی «مارتن لوثر» بنکۆڵ بکات.

لێرەدا زۆر شێوەی جیاجیای «بنکۆڵکردن» هەیە. دەشێ بەشێوەیەکی هێرشکارانە، یاخود بەرگریکارانە بێت. دەشێ ئابوری بێت لە شێوەی بەربەست، یاخود سزای بارزگانی. وڵاتە یەککگرتووەکان لە کاتی شەڕی سارد دا ڕارابوو لە نێوان سیاسەتی بە خۆوەگرتنی بەرفراوانی کۆمۆنیزم، یان هەر تەنیا بنکۆڵکردنی سۆڤیەت؟

## سێ «تەما لەبەرنان» لە شەڕی سارد دا

کێ بوو ، یان، هۆی شەڕ چی بوو ؟ لەو کاتەوەی شەڕی سارد دەستی پێکرد ، ئەم دوو پرسیارە بابەتی گفتوگۆیەکی گەرم و توندن لە نێوان زانایان و دانەرانی سیاسەتدا. سێ قوتابخانەی هزری لەم بابەتەوە هەیە: تەقلیدی، دەسکاریخوازی، پۆست دەسکاریخوازی.

تەقلیدییەکان کەبە خۆپارێز، یاخود توندڕەو دەناسرێن، پێیان وایە کە وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە، کێ شەڕی ساردی دەست پێکرد؟ زۆر ئاسانە. **ستالین** و یەکێتی سۆڤیەت بوون. لە کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەمدا دیپلوماسیەتی ئەمریکی بەرگریکارانە بوو.. لە کاتێکدا سۆڤیەتییەکان شەڕانگێزو فراوانخواز بوون. ئەمریکاییەکان زۆر درەنگ لە سروشتی هەڕو گیڤی سۆڤیەتییەکان واگاهاتن.

تەقلیدییەکان چ بەڵگەیەکیان بەدەستەوەیە؟

دوای جەنگی جیهانی دووەم، وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا پێشنیاری سیستەمێکی جیهانی بەرفراوانی کرد کە لە ڕێگای نەتەوە یەککگرتووەکانەوە کۆمەڵگە بخاتە باری ئاسایشەوە. یەکێتی سۆڤیەت، نەتەوە یەککگرتووەکانی بەهەند هەڵنەگرت، چونکە ئەو لە خاڵی نفوزی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا ، فراوانخوازی و باڵادەستی

گەرەک و بەلاوە گرنگ بوو. دوای جەنگ ولاتە یەکگرتووەکان هێزەکانی خۆی بەرهەڵدا کرد. لە کاتێکدا یەکێتی سۆڤیەت سوپایەکی گەورەی لە ئەوروپای رۆژهەڵات هێشتەوە. ساڵی ١٩٤٥ کاتێک **روزفیلت**، **ستالین** و **چەرچل** لە یالتا کۆبوونەوە، ئەمریکاییەکان لەبەر بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەتی وازیان لەبەرژەوەندییەکانی خۆیان هێنا واتە دانیان بە بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت نا. وەلێ **ستالین** خۆی لە رێککەوتنامەکان دزییەوە، بەتایبەتی کە رێگای نەدا هەڵبژاردنێکی ئازاد لە پۆڵەندا ئەنجام بدرێ.

رێبازی فراوانخوازیی سۆڤیەتی، ئەودەمە مسۆگەر بوو، کاتێک سۆڤیەتییەکان دوای جەنگ خۆیان لە کێشانەوەی هێزەکانیان لە باکووری ئێران گنخاند، تادواتر لەژێر فشار ناچارکران هێزەکان بکێشنەوە. لە ساڵی ١٩٤٨دا کۆمۆنیستەکان لە چیکوسلوڤاکیا دەسەڵاتیان گرتە دەست. لە ساڵی ١٩٤٨و ١٩٤٩دا سۆڤیەتییەکان ئابلووقەی «بەرلین»یان دا، لە هەوڵێکدا بۆ وەدەرنانی حکومەتە رۆژئاواییەکان. هەروەها لە ساڵی ١٩٥٠دا سوپای کۆریای باکوری کۆمونیست، سنوورەکانی کۆریای باشووری بەزاند.

تەقلیدییەکان پێیان وایە ئەو رووداوانە وردە وردە ولاتە یەکگرتووەکانیان لەهەمبەر هەڕەشەی سۆڤیەتییەکان لاواز کردو شەڕی سارد دەستی پێکرد.

دەسکاریخوازەکان، ئەوانەی کە لە شەست و حەفتاکاندا بۆ یەکەمجار شتیان نووسی، لەو بڕوایەدان ئەمریکاییەکان سەبەبکاری شەڕی سارد بوون نەک فراوانخوازیی سۆڤیەتی. بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەبوو کە جیهان دوای جەنگی جیهانی دووەم، دوو جەمسەرە نەبوو. یەکێتی سۆڤیەت زۆر لە ولاتە یەکگرتووەکان بێ هێزتر بوو. جەنگ، ئەمریکای بەهێزتر کردبوو، چەکی ئەتۆمی هەبوو، کەچی هێشتا سۆڤیەتییەکان ئەو چەکەیان نەبوو. هاوکات یەکێتی سۆڤیەت دەوروبەری (٣٠) ملیۆن کەسی لێ کوژرابوو، بەرهەمی پیشەسازیی سۆڤیەتی ببووە نیوەی ساڵی ١٩٢٩. لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥دا **ستالین** بە (**ئافریل هاریمان**)ی بالوێزی ئەمریکی گوت، کە سۆڤییەتییەکان نیازیان وایە ئەو خەسارەتەی لەنێوەخۆ لێیان کەوتووە پڕیکەنەوەو، لەمەش زێتر، وەک دەسکاریخوازەکان دەڵێن: رەفتارەکانی ستالین لە پەیوەندییەکانی هەندەراندا دوای جەنگ، سیمایەکی میانڕەویان پێوەبوو. هەوڵی دەدا جڵەوی **ماوتسی تونگی** کۆمۆنیست بگرێتەوە، کە دەیویست دەسەڵاتی چین بگرێتە دەست. لە شەڕی نیوخۆیی یۆنانیشدا هەوڵی دەدا جڵەوی کۆمونیستە

یۆنانیەکان بگرێتەوە. لە مەجەرو چیکوسلوڤاکیاو فنلەندا ڕێگای بە حکومەتە ناکۆمونیستەکاندا.

دەسکاریخوازەکان دەکرێن بەدوو بەشەوە: (نەرم) و (توندو ڕەقەکار)، دەسکاریخوازە نەرمەکان زێتر پێ لەسەر بایەخی تاکەکان دادەگرن، وا هەست دەکەن مردنی **روزفیلت** لە نیسانی ١٩٤٥دا ڕووداوێکی یەکلاییکەرەوە بوو، چونکە دوای هاتنی «**هاری ترومان**» بۆ پۆستی سەرۆکایەتی، سیاسەتی ئەمریکایی سیمای زبری و توندی پێوەلکا. لە مایسی ١٩٤٥دا ولاتە یەکگرتووەکان سەرشێتانە پرۆگرامی قەرزدان و بەکرێدانی یارمەتییەکانی سالانی جەنگی لە سۆڤیەت بری و فەرمانی گەڕانەوەی ئەو کەشتیانەی دا کەبەرەو لەنگەرگرەکانی سۆڤیەتی دەچوون، لە کاتێکدا لە نیوەی ڕێگادا بوون. هەروەها لە کۆنگرەی پۆتسدام، کە شارێکە لە نزیک بەرلین، لە مانگی تەمووزی ١٩٤٥دا **ترومان** هەولیدا بەبۆمبی ئەتۆمی هەڕەشە لە ستالین بکات. هاوکات لە ولاتە یەکگرتووەکاندا پارتی دیموکراتی لە هەلوێستی چەپڕەوو میانڕەوانەی بای دایەوە سەر ڕاستڕەوی؛ لە سالی ١٩٤٨دا **ترومان**، وەزیری کشتوکال «**هینری لاوس**»ی دەرکرد، چونکە داوای بەگوڕخستنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەل سۆڤیەتدا دەکرد، لە کاتێکدا «**جێمس فروستال**» وەزیری نوێی بەرگری لە ئیدارەی ترومان، لە هەرە دوژمنەکانی کۆمۆنیزم بوو. دەسکاریخوازە نەرمەکان یاخود- میانڕەوەکان- دەلێن، گۆڕینی بەرپرسەکان یارمەتیمان دەدا کە لەو هۆیانە بگەین کە وای لە ولاتە یەکگرتووەکان کرد دوژمنداریی زێتری سۆڤیەت بکات.

دەستکاریخوازە توندڕەوەکان وەلامێکی تری جیاوازیان هەیە، ئەوان کێشەکە بەمل (کەس) دانابرن، بەلکە دەیبەنەوە سەر سروشتی سەرمایەدارێتی ئەمریکایی بۆ نموونە «**گابریل وجویس کولکو**» و «**ولیام أ. ولیامز**» وای بۆ دەچن: ئابوری ئەمریکا، پێویستی بە فراوانخوازی هەبوو، ولاتە یەکگرتووەکان نەخشەی بۆ ئەوە دارشت کە جیهان بکاتە شوێنێکی ئارام نەک بۆ دیموکراسیەت، بەلکو بۆ سەرمایەداری. بە هەرمێن خستنی بالادەستیی ئابوری ئەمریکایی، بەرگەی بوونی ولاتێک، جاهەر ولاتێک بێ نەدەگرت، کەهەولبدا ناوچەیەکی ئابوری وا ڕێک بخا کە خۆی تێیدا سەربەخۆبێت. سەرکردە ئەمریکاییەکان لە دووبارە بوونەوەی تەنگژەی سییەکان دەترسان. نەبوونی بازرگانی دەرەوە، وەستانێکی ئابوری گەورەی تری دەهێنایەکایەوە. پرۆژەی «**مارشال**» بۆ یارمەتیدانی ئەوروپا، تەنیا ڕێگایەک بوو بۆ فراوانکردنی ئابوری ئەمریکایی. سۆڤیەتییەکان ڕاست بوون کە ئەو پرۆژەیان ڕەتکردەوەو بە

هەڕەشەکیان دادەنا بۆ ناوچە نفوزی خۆیان لە ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا. ئەمریکاییەکان بەگوێرەی دەستەواژەی «**ولیامز**» هەمیشە سیاسەتی دەروازەی والآیان، لاباشتر بوو لە ئابوری دەولی، چونکە ڕێگای هاتنە ناوەوەی ئەمریکاییەکان بوو

هەرچی پۆست دەسکاریخوازەکانن کە بۆ ماوەی حەفتاکان و هەشتاکان دەگەڕێنەوەو «**لویس کاوس**» نوێنەرایەتیان دەکا، ڕاڤەکردنێکی تریان هەیە، تەقلیدییەکان و دەسکاریخوازەکان بەهەڵە دەخەنەوە. دەڵێن کەس بەرپرسیاریەتی جەنگی سارد هەڵناگرێ، بەڵکو دەڵێن، حەتمیەتێک، یاخود شتێکی لەو بابەتە هەبوو کە هەرگیز ڕێگەی دەربازبوون نەبوو، بەهۆی بونیاتی هاوسەنگیی هێزەکانی دوو جەمسەری دوای جەنگی جیهانی دووەم. لە ساڵی ١٩٢٩ جیهان فرەجەمسەرییەکی حەوت دەوڵەتە بوو، وەلێ دوای ئەوماڵوێرانییەی جەنگ لە دوای خۆیەوەی جێ هێشت، تەنیا دوو دەوڵەتی گەورە مانەوە: وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت.

دوو جەمسەری و بێ هێزیی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان دوای جەنگ، بۆشاییەکی هێزی گوراند، کە هەردوو دەوڵەتی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. بۆیە هەردەبوایە لە یەک بدەن. کەواتە بەگوێرەی ڕای پۆست دەسکاریخوازەکان، گەڕان بەدوای ئەوەی کە کێ بەرپرساریەتی جەنگ هەڵدەگرێ، سوودی نییە.

دوای جەنگ، هەم سۆفیەتییەکان و هەم ئەمریکاییەکان ئامانجی جیاوازیان هەبوو، سۆڤیەتییەکان مولک و ماڵی بەرجەستەیان هەبوو،... زەوی و زار، هەرچی ئامانجەکانی ئەمریکابوون، بەرجەستەنەبوون، بەزەوی و زارەوە پەیوەست نەبوون. بەڵکو بەنێوەندەکانەوە، ئەوان بایەخیان بەڕێڕەوی گشتی سیاسەتی جیهانی دەدا، ئامانجی مولکەکان بەر ئامانجی نێوەندەکان کەوت، واتە ڕووبەڕووی یەک بوونەوە، کاتێک وڵاتە یەکگرتووەکان بانگەشەی دامەزراندنی سیستەمی «نەتەوە یەکگرتووەکانی جیهان»ی دەکرد، یەکێتی سۆڤیەت هەوڵی دەدا چوارچێوەی نفوزی خۆی لە ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا پتەوتربکات. کەچی ئەو جیاوازییانە لە شێواز (بەگوێرەی پۆست دەسکاریخوازەکان» هۆیەک نەبوون بۆ ئەوەی وا لە ئەمریکاییەکان بکەن هەست بە تاوانی فریودان بکەن، چونکە وڵاتەیەکگرتووەکان، سوودی لەنەتەوە یەکگرتووەکان بینی.

دەشێ سۆڤیەتییەکان چوارچێوەی نفوزێکیان بۆ خۆیان لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا دۆزیبێتەوە. وەلێ وڵاتە یەکگرتووەکانیش چوارچێوەی قەڵەمڕەوی خۆی هەبوو لە نیوەگۆی ڕۆژئاوادا. ئەوانەی بانگەشە بۆ پۆست دەسکاریخوازەکان دەکەن دەڵێن:

ولاّته یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت، هەردووکیان پابەندبوون بە فراوانخوازیەوە نەک بەهۆی (الجبریە)ی ئابوریەوە، کەدەسکاریخوازەکان پێی لەسەر دادەگرن، بەڵکو لە سۆنگەی کێشەی ئاسایشی دەوڵەتان لە سیستەمێکی گێرەشێوێنی زۆر کۆندا. نە ئەمریکاییەکان و نەسۆڤیەتییەکانیش ئامادەنەبوون رێگا بەیەکتربدەن، بەتەنێ ئەوروپا کۆنترۆڵ بکەن. هەروەک چۆن ئەڤینا رێگای نەدا بە«کورنث»یەکان دەست بەسەر کەشتیگەلی کورسایرا دابگرن. کۆمەڵی پۆست دەسکاریخوازەکان بۆ ئەم مەبەستە ئەوە بەڵگەیە دەهێننەوە کەستالین لە ساڵی ١٩٤٥دا بەسەرۆکی یوگسلافی «**میلوڤان جیلاس**»ی گوت: ئەم جەنگە وەکو جەنگەکانی پێشتر نییە، کێ ناوچەیەک بگرێ سیستەمی کۆمەلاّیەتی خۆی بەسەر سەپێنێ. بەڵکە هەریەکە، سیستەمی خۆی بەو رادەیە دەسەپێنێ، کە سوپاکەی دەتوانێ بیگاتێ[١].

بەواژەیەکی تر، دەوڵەتێک هێزی سەربازی خۆی بەکاردەهێنێ بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکان وەکو کۆمەڵگاکەی خۆی لێ بکا، تا سەلامەتی خۆی لە جیهانێکی دووجەمسەری ئایدیۆلوژی دابین بکا. **روزفیلت** لە پایزی ١٩٤٤دا، شتێکی هاوچەشنی بە**ستالین** گوت: لەم شەڕەدا، بە مەودای گۆی زەوی، بەکردەوە مەسەلەیەکی سیاسی، یاخود سەربازی نییە، کە بە لای ولاّتە یەکگرتووەکانەوە گرنگ نەبێ[٢].

کۆمەڵەی پۆست دەسکاریخوازەکان دەڵێن بونیاتی ئەو سیستەمی دوو جەمسەرییە، بەرزبوونەوەی حاڵەتی دژبەری لێ کەوتەوە: هەڵوێستی توندڕەو لە ولاّتێکدا، رووبەڕووی هەڵوێستێکی توندڕەوتری دەکردەوە لە ولاّتەکەی تردا. تاوای لێهات هەردووکیان سەیری دژەبەرەکەیان بکەن، کە بەهیتلەری سییەکان دەچێ. لەگەڵ زێتر چەقبەستنی ئەو روانگەیە، «شەڕی سارد» قوڵتر دەبووەوە.

## سیاسەتی روزفیلت

**فرانکلین روزفیلت** ویستی خۆی لە هەڵەکانی جەنگی جیهانی یەکەم لابدا بۆیە لە جیاتی ئەوەی ئاشتی لەسەر شێوەی پەیماننامەی ڤەرسای بێنێتە ئاراوە، داوای خۆبەدەستەوەدانی بێ قەیدوشەرتی ئەڵەمانیای کرد، ئەو بۆ وەلاوەنانی سیاسەتی خۆپاراستن، کە لە سییەکاندا زیانی بە ئابوری جیهانی گەیاند و هاوبەشی لە

---

١- میلوفا دبیلاسی، احادیث. مع ستالین، ترجمە (مایکل پتروڤیچ)، کالیفورنیا، دار هارکورت، ١٩٦٢.

٢- رالف لیفرنک، الحرب البارده، دار هالاف دیفیدسن، ١٩٨٢، ص ١٥.

داگیرساندنی پتیلی جەنگدا کرد، سیستەمی بازرگانی دەویست. هەروەها دەیویست ولاّتە یەککگرتووەکان خولیای لاتەریکی بەلاوەنێ کە لە سییەکاندا زیانێکی زۆری پێگەیاند و هاوکات بچێتە پاڵ کۆمەڵەیەکی نوێی گەلان کە لەسەر شێوەی «دەستەی نەتەوەکان» بێت و لەوەی پێشتر بە هێزتر بێت و ئەنجوومەنێکی ئاسایشی زۆر بەهێزی هەبێ، «**کوردل هل**» وەزیری هەندەرانی ئەمریکا لە زۆربەی ساڵەکانی جەنگدا مرۆڤێک بوو بەتەنگ پرەنسیپەکانی ولسونەوە بوو، رای گشتی ئەمریکاش، بۆ پرۆژەی نەتەوە یەککگرتووەکان زۆر بەپەرۆش بوو.

روزفیلت لەلایەن هەردوو حزبەوە، کۆماری و دیموکراتی، پێویستی بەپاڵپشتی دەرەکی هەبوو، بۆ هەڵوێستە دەولییەکەی. لەسەر ئاستی دەرەوە: پێویستی بەوە هەبوو بڕوا بە**ستالین** بێنێ کە چوونە نێو نەتەوە یەککگرتووەکان پێداویستییە ئاسایشییەکانی ئەو جێ بەجێ دەکا.

روزفیلت بەوە تاوانبار دەکرا کە لە مامەڵەکردن لەگەڵ نەخشەکانی دوای جەنگدا ساویلکە بووە. پلانەکانی ساویلکە نەبوون، بەڵکو هەندێک لە تەکتیکاتەکانی ساویلکە بوون. زیاد لە پێویستیش باوەڕی بەپرۆژەی نەتەوە یەککگرتووەکان هەبوو. لەئەگەری کەوتنە «لاتەریکی» زێدەڕۆیی دەکرد، لەمەو لەویش گرنگتر ئەوەبوو لە شوێن و پایەی ستالینی کەم کردەوە. بەو گومانەی کەدەتوانێ مامەڵە لەگەڵ ستالین بکا. هەروەک چۆن مامەڵە لەگەڵ هاوکارێکی خۆی دەکا لە سیاسەتمەدارە ئەمریکاییەکان و بەگیانی هاوکاری قوڵی دەخاتە سەرشانی.

روزفیلت لەوە نەگەیشتبوو کەستالین دیکتاتۆرە - ملیۆنەها خەڵکی بە نێوی گەلەوە لەگەڵ کوشتووە، بۆ ئەوەی خۆی لە هیتلەر بپارێزێ، میساقێکی لەگەڵدا ئیمزا کرد، تا دەسکەوتەکانی شەڕی لەگەڵ دابەش بکا. وەکو هیتلەر گەلانی هاوسێی دەربەدەرو پاکسازی دەکرد و لە نێوی دەبردن. خۆشی لەلاچەپێک دەوەستاو هانای بۆ بەدیموکراسیگەلی رۆژئاوایی دەهێنا، کاتێک ئەڵمانیا بەرەو رۆژئاوا بۆوە، گازاندەیەکی زۆریشی دەکرد کە رۆژئاوا یارمەتی بەپێی پێویست نادەن لە هیتلەر بەرەو رۆژهەلات دەخشی(٣).

**روزفیلت، ستالینی** خراو بەرچڤەکرد. وەلێ لەکۆنگرەی «یالتا» لە ساڵی ١٩٤٥، زۆر دەست بەرداری بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا نەبوو. روزفیلت لە هەموو لایەنەکانی

---

٣- سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.

سیاسەتەکەیدا ساویلکە نەبوو. هەوڵیدا کۆمەک و یارمەتی ئابوری، بەوازهێنانی سۆڤیەت لە هەندێک شت بەستێتەوە. دابەشکردنی نهێنییەکانی ئەتۆمیشی لەگەڵیاندا رەتکردەوە. بەشێوەیەکی سادە، کەسێکی ریالیستانە بوو سەبارەت ئەوەی کە، کێ دەبێ هێزی هەم لە رۆژهەڵاتی ئەوروپاو هەم لە ناوچەکەدا نفوزی هەبێ. هەڵەکانی لەو چوارچێوەیەدا بوون، کە بڕوای وابوو ستالین وەکو ئەو، دنیا دەبینێ و لە سیاسەتی دیموکراتی وڵاتە یەکگرتووەکان تێدەگا. رۆزفلت پێی وابوو هەمان کارامەیی سیاسی ئەمریکایی، کە فەرماندەیەکی سیاسەتوان بۆ رەواندنەوەی ناکۆکییەکان پەنای بۆ دەباو راوێژکاریی دۆستانە، لە مامەڵەکردن لەگەڵ ستالیندا سەرکەوتن وەدەست دەهێنێ.

### سیاسەتەکانی ستالین

دوای جەنگ پلانی بەپەلەی، ستالین ئەوەبوو چۆن چەنگی خۆی لەناو وڵاتەکەیدا توند بکا، جەنگی جیهانی دووەم زیانی زۆر گەورەی بەیەکێتی سۆڤیەت گەیاند، بە تەنیا هەر زیانەی مرۆیی و زیانە ترسناکەکانی پیشەسازی نەبوون، کەپێشتر باسمان کردن، بەڵکو لەمەش رەتی کرد بۆ ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم، خەڵکانێکی زۆر هاوکاری ئەڵەمانەکانیان کردبوو. چونکە لەدڵەوە رقیان لە توندوتیژیی حوکمی کۆمۆنیستی دەبووەوە. داگیرکاریی ئەڵەمانی، کۆنترۆلی ستالینی تاڕادەیەکی ترسناک لاوازکرد بوو. راستە **ستالین**، لەماوەی جەنگدا دوای ئەوەی ئایدیۆلۆژیای لاوازی کۆمۆنیزم، نەیتوانی گەلەکەی، جۆش بداتەوە، ناچاربوو زێتر لەگەڵ گیانی نەتەوایەتی روسەکان بدوێ. بۆیە لەدوای جەنگەوە سیاسەتی دوورەپەرێزیی ستالینی نەخشەی بۆکێشرا! بۆ ئەوەی رێگا لە کاریگەرییەکانی دەرەوە بگرێت، کە لە ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکانەوە دەهات. **ستالین**، وڵاتە یەکگرتووەکانی وەک دوژمنێکی دیاریکراو بەکارهێنا، داوای لە گەلی سۆڤیەتی کرد کەویستی خۆی بەهێزبکاو ئاگادارو دڕدۆنگ بێت لە بێگانان. وەلێ ئەمە بەو مانایە نییە کە **ستالین** بە راستی شەڕی ساردی دەویست، کە لە دوای ئەمەوە هات. بەتایبەتیش ئەگەر ئەوەی تیا بەدی کردبوایە کە یارمەتی دەدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی لە رۆژهەڵاتی ئەوروپاو هەندێک یارمەتی ئابوری لە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ دەهێنا. ئەو وەک کۆمۆنیستێکی دڵسۆز لەو بڕوایەدابوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان هیچ رێگایەکی تری نییە تەنیا ئەوە نەبێ کەیارمەتی ئابوری سۆڤیەت بدات، چونکە سیستەمی سەرمایەداری پێویستی بە

هەناردنە دەرەوەی پارەو پوول هەیە، بەهۆی نەبوونی خـواسـتی پێـویست لە ناوەوە. **ستالین** پێی وابوو کە تەنگژەیەکی تری سیستەمی سەرمایەداری، لە ماوەی ١٠ یان ١٥ سـالّی داهاتوودا سـەرهەڵدەدا. ئەو دەمـیش یەکـێـتی سـۆڤـیـەت چاک بۆتەوەو ئامادەی بردنەوەی زۆرانبازی حەتمیە لەگەڵ سەرمایەدارەکاندا.

هەرچی بەزمانی سیاسەتی هەندەرانە، ئەوا **ستالین** ویستی لە ناوەوە خۆی بپارێزێ و ئەو دەسکەوتانە بپارێزێ کەیەکێتی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا وەدەستی هێنا بوون، لە پەیماننامەکانی لەگەڵ هیتلەر، لەساڵی ١٩٢٩دا. هاوکات ویستی ئەو بابەتە پەرش و بڵاوانە تاقی بکاتەوە، کـــەکـــاتێک هیـچ تەنگژەیەک لە ئارادا نابێ، بەشێـوەیەکی روونتـر دێنە بەرچاو. لە سـالّی ١٩٤١دا، بە «**ئەنتۆنی ئایدن**» وەزیری هەندەرانی بەریتانی گوت: ئەو- واتە **ستالین**- حسێو کردنی لەسەر جەبر پێ باشترە، بەو واتایەی چارەسەری کرداری لاباشتـرە لە چارەسـەری تیـۆری. کـاتێک **ونستون چەرچل**، دوای جەنگ، پلانی دابەشکردنی نفوزی لەبالکان پێشکەش بەستالین کرد. واتە هەندێک وڵاتی خسـتە ژێر کـۆنتـرۆلی بەریتـانیـاو هەندێکی تری خسـتـە ژێر کـۆنرۆلی سـۆڤـیـەت و ئەوانەی تریشی وەکـو یەک لە نێـوان هەردووڵایاندا بەشکرد، سەرەتا ستالین پێشوازی لەوە کرد کە حکووماتی کۆمۆنیستی بەشێوەیەکی راستەوخۆ بە سەر چین و چیکوسلوڤاکیاو مەجەردا بسەپێندرێن، کە ئەمە بەتەواوی لەگەڵ ئەو دەروازە حسـابیـیـە، نەک جەبرییەیە بۆ بەدیهێنانی ئامـانجەکـانی دەگونجـا، **ستـالین** کـۆمـۆنیـسـتـێکی پابەندبوو، نەک زۆربەی کـات پەنای دەبردە بەر تەکـتـیکاتی پراگماتیکی، ئەگەرچی جیهانی لە چوارچێوەی کۆمۆنیزمەوە دەبینی.

### قۆناغەکانی ململانێ

دەشێ قۆناغی یەکەمی شەڕی سارد بکرێتە سێ خول: سەرەتا ١٩٤٥-١٩٤٧، راگەیاندنی شەڕی سارد ١٩٤٧-١٩٤٩، پەرە گرتنی شەڕی سارد ١٩٥٠-١٩٦٢.

چ **ستالین**، چ **ترومان** بە دوای شەڕی سارددا نەدەگەڕان. لەکۆتایی جەنگی جیهانی دووەمـدا ترومـان، جـێگری جـارانی **روزفـیلت**، «**هاری هویکنز**»ی نارده مۆسکۆ، تا بزانێ تا چەند توانای هەندێ رێ و شـــوێن هەیە. **ترومـــان**، تـا دوای کـــۆنگرەی پۆتسدامیش، **ستالینی** بەکابرایەکی میانڕەو دادەنا، لە راستـیدا ئەو تا ئاخیروئۆخری ساڵی ١٩٤٩، **ستالین** و (بوس بیندرگاس)ی کۆنە هاوڕێی لەشاری کینساس بەیەک دەچواند. لە سـالّی ١٩٤٦دا **جـورج کـینان** هەوڵی دەدا وڵاتە یەکگرتووەکـان لە

سروشتی **ستالین** ونیازە راستەقینەکانی ئاگادار بکاتەوە. **چەرچل** لەشاری فلنتن لە ویلایەتی میزوری وتارێکی گرنگی خوێندەوەو تیایدا ئاگاداری کردەوە کە «ناوبڕەیەکی ئاسنین» لە ئەوروپا دانراوە. کاتێک وەزیری هەندەرانی ئەمریکا (**جیمس برنز**) هەوڵی دەدا پاش جەنگ لەگەڵ سۆڤیەتییەکاندا بگاتە پەیماننامەیەک، **ترومان** داوای لە «**کلارک کلیفورد**» کرد کە راپۆرتێکی بۆ ئامادەبکات کە ئایا سۆڤیەتییەکان چەند پلانێکیان بۆ ئایندە بەدەستەوەیە. **کلیفورد** لەگەڵ خەڵکی جیاجیا ئاخاوت، گەیشتە ئەو ئەنجامە کە کینان راست دەکا: سۆڤیەتییەکان هەر هەلێکیان بۆ بڕەخسێ، نیازی فراوانخوازیان هەیە. کاتێک **ترومان** لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٦دا راپۆرتەکەی پێ گەیشت، داوای لە **کلیفورد** کرد کە دەرئەنجامەکانی ئەو راپۆرتە لە چوارچێوەیەکی فراواندا بڵاونەکاتەوە. چونکە ئەو لەسەر پەیڕەوکردنی پرۆژە گەورەکەی **روزفیلت** بەردەوام بوو و هێشتا ستراتیژیەتێکی نوێی دانەنابوو. شەش مەسەلە بوونە هۆی گۆڕینی ستراتیژیەتی ئەمریکایی و دەست پێکردنی شەڕی سارد. یەکێکیان مەسەلەی پۆڵەنداو ئەوروپای رۆژهەڵات بوو. هەڵبەت پۆڵەندا یەکێک بوو لە هۆیە خێراکەرەکانی بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی. ئەمریکاییەکان لەو بڕوایە بوون کە **ستالین** خۆی لە ئەرکێکی راشکاو دزیەوە کە دەبوایە دوای جەنگ هەڵبژاردنێکی ئازاد لە پۆڵەندا بکرێ. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو خاڵەی ستالین رەزامەندی لەسەر دابوو، روون نەبوو. لە ساڵی ١٩٤٣دا، **ستالین** و **روزفیلت** لە تاران یەکتریان دیت، **روزفیلت** مەسەلەی پۆڵەندای لەگەڵ کردەوە، وەلێ لە چوارچێوەی پرۆسەی هەڵبژاردنی ئەمریکایی لەساڵی ١٩٤٤دا، **ترومان** پشتی ستالینی گرت، چونکە لە کاتی هەڵبژاردندا لەبەردەم ژمارەیەکی زۆر دەنگدەری پۆڵەندیدا رایگەیاند کە دوای جەنگ هەڵبژاردن لە پۆڵەندا ئەنجام دەدرێ، هەرچی **ستالین** بوو، رۆژێک لە رۆژان بیری خۆی سازدانی هەڵبژاردن لە یەکێتی سۆڤیەت مژوول نەدەکرد، **ستالین** ئەوەی بەهەند هەڵنەدەگرت کە داخۆ **روزفیلت** بایەخ بە چ دەدا. هەروەها رێکەوتننامەی «یالطا»ی ساڵی ١٩٤٥ تەمومژێکی پێوە بوو. **ستالین** تا لە توانایدا بوو خۆی لە ناوەڕۆک و واتاکەی دووردەخستەوە. حکومەتێکی دەستکردی لە وارشۆ دامەزراند، دوای ئەوەی سۆڤیەتییەکان سەربازە ئەڵمانیەکانیان لە وڵات دەرکرد، ئەمریکاییەکان هەستیان کرد کە دەست خەڵەت دراون، وەلێ **ستالین** هەستی کرد کە ئەمریکاییەکان لەبەردەم ئەو راستەقینەیەدا چۆک دادەن، کە سەربازە سۆڤیەتیەکان بوون، پۆڵەندایان رزگار کرد.

له مایسی ١٩٤٥دا کتوپڕ کار بەپرۆگرامی یارمەتییەکانی خواستن و بەکرێدان وەستێنراو پەیوەندی ئابوری لە نێوان ولاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت بەرەو تێکچوون دەچوو. ئەو کۆتایی پێهێنانە سەرگەرمانەیە بە پرۆگرامی خواستن و بەکرێدان، تاڕادەیەک هەڵەیەکی بیروکراتی- کارگێڕی بوو. وەلێ بەگشتی بارەکە بەرەو باشی نەڕۆیشت لە شوباتی ١٩٤٦دا، ولاتە یەکگرتووەکان ئەو داوایە یەکێتی سۆڤیەت رەتکردەوە کە سەبارەت بەقەرز وەرگرتن پێشکەشی ئەمریکای کردبوون. سۆڤیەتییەکان ئەو رەفتارانەیان وا لێک دایەوە کە فشاری ئابورییە لە پێناو مەبەستێکی دوژمنکارانەدا.

ئەڵەمانیا کێشەی سێیەم بوو، لە کۆبوونەوەی «یالطا» ئەمریکییەکان و سۆڤیەتییەکان لەسەر ئەوە رێککەوتن، کە پێویستە ئەڵەمانیا ٢٠ ملیار دۆلار قەرەبووی شەڕ بداتەوە، کە نیوەی ئەو پارەیە بۆ یەکێتی سۆڤیەت بێت، بەڵام وردەکاری و شێوەو کاتی پارە دانەکە، ئەوا لە «یالطا» دیاری نەکرا. هەردوولا لەسەر ئەوە رێککەوتن کە دواتر لێی بکۆڵنەوە. لە مانگی تەمووزی ١٩٤٥دا، لە کۆنگرەی پۆتسدام دا سۆڤیەتییەکان داوای ١٠ ملیار دۆلاریان کرد. بێ لەوەش داوایان کرد ئەو قەرەبووە لە خەزێنەی کەرتەکانی ئەڵەمانیای رۆژئاوا بدرێتەوە، کەئەمریکایی و بەریتانیایی و فەرەنسییەکان داگیریان کردبوون، **هاری ترومان** لە مەسەلەی ئاوەدانکردنەوەی ئەڵەمانیا نیگەران بوو، گوتی ئەگەر سۆڤیەتییەکان دەیانەوێ ١٠ ملیارەکە لە ئەڵەمانیا وەربگرنەوە، با لە کەرتی رۆژهەلاتی وەربگرنەوە، کە خۆیان داگیریان کردووە. ئەگەر دوای ئاوەدانکردنەوەی کەرتی رۆژئاوا شتێک لە پارەو پوولی مایەوە ئەوا پێیان دەڵێین.

بەم چەشنە وردە وردە، لەسەر چۆنیەتی ئاوەدان کردنەوەی ئەڵەمانیا، ئەمریکییەکان و سۆڤیێتییەکان لە یەکدی دابڕان. ئەمریکایی و بەریتانی و فەرەنسییەکان پرۆسەیەکی سەربەخۆیان لە کەرتەکانی رۆژئاوا دامەزراندو دەستیان بەپرۆسەی بەیەکەوە لکاندنی کەرتەکانی رۆژئاوا کرد، ئەو کارە وای لە سۆڤیەتییەکان کرد کە چەپۆکی خۆیان لە کەرتەکانی رۆژهەلاتی ئەڵەمانیا توند گیر بکەن.

رۆژهەلاتی دووریش مەسەلەیەکی تر بوو. سۆڤیەتییەکان تا دوا هەفتەی جەنگ، لە ئۆقیانووسی هێمن بەبێلایەنی مابوونەوە، پاشان شەڕیان لەدژی ژاپۆن راگەیاند و دەستیان بەسەر مەنشوریاو چوار دورگەی تر لە باکووری ژاپۆندا گرت. لە کۆنگرەی پۆتسدامدا، سۆڤیەتییەکان داوای کەرتێکیان، لە ژاپۆن کرد، وەکو کەرتی ئەمریکی

لەئەڵەمانیا. **ترومان** وەڵامی ئەوەبوو کە سۆڤیەتییەکان درەنگ گەیشتنە ئاهەنگەکە، بۆیە هیچ کەرتێکیان پێ نادرێ. ئەم هەڵوێستە لە روانگەی ئەمریکاییەکانەوە ماقوڵ بوو، وەلێ ئەو حاڵەتە ئەوروپای رۆژهەڵاتی وەبیر سۆڤیەتییەکان هێنایەوە، کە ئەمریکاییەکان نفوزو هەڵبژاردنی ئازادیان گەرەک بوو. وەلێ یەکەمجار سوپای سۆڤیەت بوو گەیشتە ئەو ناوچەیە. لەسەر ئەو بنەمایە سۆڤیەتییەکان باری رۆژهەڵاتی ئەوروپایان بە باری رۆژهەڵاتی دوور بەراورد کرد. لە کاتێکدا ئەمریکاییەکان ئەمەیان بە نموونەیەکی تر لە هەوڵی فراوانخوازیی سۆڤیەت لێکدایەوە.

مەسەلەی پێنجەم، مەسەلەی بۆمبی ئەتۆمی بوو، **روزفیلت** بڕیاریدا کە یەکێتی سۆڤیەت لە نهێنییەکانی بۆمبی ئەتۆمی پێک نەکا. زۆربەی مێژوونووسان لەسەر ئەوە رێکن کە **ترومان** بۆمبی ئەتۆمی لە هیرۆشیما و ناکازاکی دا، بەپلەی یەکەم بۆ ئەوەی بەپەلە کۆتایی بە جەنگ بهێنێ، نەک بۆ ئەوەی یەکێتی سۆڤیەتی پێ بترسێنێ وەک هەندێک لە دەسکاریخوازان دەیلێن. وەلێ **ترومان** ئەوەی لە پێش چاوی خۆی دانابوو کە بۆمبەکە هەندێک کاریگەریی سیاسیشی دەبێت. ئەو رۆژەی ترومان لەکۆنگرەی پۆتسدامدا **بەستالینی** راگەیاند کە ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمی هەیە، رووی **ستالین** وەکو رووی یاریزانێکی پۆکەری بێ باک مایەوە، وەک ئەوەی ئەو هەواڵە بەلای ئەوەوە هیچ نەبێ وا خۆی نواند. **ستالین** بەهۆی سیخورەکانیەوە ئاگای لەمە هەبوو، وەلێ دان بەخۆداگرتنەکەی، ئەمریکاییەکانی تەزاند.

کاتێک وڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٦دا پرۆژەی «باروخ»ی پێشکەش بە UN کرد، تا نەتەوە یەکگرتووەکان چاودێریی چەکی ئەتۆمی بکا، **ستالین** ئەو پرۆژەیەی رەتکردەوە، چونکە دەیویست بۆمبە تایبەتییەکەی خۆی دروست بکا.

هزرو دیدی **ستالین** وابوو کە هەر بۆمبێک لە ژێر چاودێریی دەولی دابێ، واتا ئەو بۆمبە لە ژێر چاودێریی ئەمریکا دایە، لەبەر ئەوەی تەنیا ئەمریکاییەکان دەیانزانی ئەو بۆمبە چۆن دروست دەکرێ، بۆیە بۆ سۆڤیەتییەکان زۆر باشتر بوو کە بۆمبی خۆیان هەبێت (ئاخیرەکەی لە ساڵی ١٩٤٦دا تەقاندیانەوە).

مەسەلەی شەشەم تایبەت بوو بە ئاسیای ناڤین و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. کەبەر لە جەنگی جیهانی دووەم بەریتانییەکانی تێدا خاوەن نفوزبووە. لەدوای جەنگدا زۆرشت روویدا، یەکەمیان سۆڤیەتییەکان رازی نەبوون لە ئاداری ١٩٤٦دا هێزەکانیان لە باکووری ئێران بکێشنەوە. کاتێک ئەو مەسەلەیە لەنەتەوە یەکگرتووەکان گفتوگۆی لەسەر کرا، وڵاتە یەکگرتووەکان پشتی ئێرانییەکانی گرت. لە کۆتاییدا

سۆڤییەتییەکان بەناچاری هێزەکانیان کێشایەوە، وەلێ بەهەست کردن بە تاڵییەکی قوڵەوە. پاشان سۆڤیەتییەکان کەوتنە فشارخستنە سەر تورکیای هاوسێی باشووریان. وەک بڵێی شیوعیە یۆنانییەکان لەشەڕی نێو خۆییدا سەرکەوتنیان وەدەست هێنابێت، ڕۆژئاواییەکان جارێکی تر باوەڕیان بەوە هێنا کە سۆڤیەتییەکان بەرەو فراوانخوازی دەچن.

ئەم شەش خاڵە راستەقینە بوون، تێکەڵ بەیەکتر کردنیان شتێکە لە خراو راڤەکردن، ئایا دەتوانرا بە رازیکردن و دانوستان چارەسەر بکرێ؟ ئایا رازیکردن سوودی دەبوو؟

لەوانەیە نەخێر. لەبەر ئەوەی **ستالین** بەگوێرەی رای **کینان** هەموو خاڵێکی دەخستە بەرپشکنین کەچروک بوایە، سیاسەتی رازیکردنیش، بەبابەتێکی چروک و پەرش و بڵاو دەژمێردراو پێویستی بەپشکنینی زیاتر دەکرد. لە حوزەیرانی ١٩٤٦دا، وەزیری هەندەرانی پێشووی سۆڤیەت «**مەکسیم لیتشکینوف**». هاوکوفە ئەمریکاییەکەی خۆی لە هەر سازش و دەست بەردار بوونێک ئاگادار کردەوە، چونکە سۆنگەی بنەڕەتی بارگرژیەکە، لەو «چەمکە ئایدیۆلۆژیە» سەرچاوەی دەگرت کە لە ئارادابوو، ئەویش ململانێی نێوان هەردوو جیهانی کۆمۆنیستی و سەرمایەدارییە، کە شتێکی حەتمییەو دەربازبوونی لێ نییە. بەسادەیی هەر دەست بەردار بوونێک دەبێتە سۆنگەی ئەوە کە «ڕۆژئاوا دوای ماوەیەک، کورت یا درێژ، رووبەڕووی زنجیرەیەک داواکاری تر ببێتەوە»(٤). ئەو کاتە لەوانەیە رازیکردن شکست بێنێ. وەلێ سەوداکاریش ئاستەنگترە، دەشێ هەندێک رووداو لابەرێ، کەبوونەتە هۆی بەرپابوونی شەڕی سارد. ئەگەر ئەمریکاییەکان بەپیر پراگماتیزمی ستالینەوە بچونایە، وەک بانگەشەیەکی تاکتیکی پەنایان بۆ هەڵوێستێکی توندتر بردبوایە و دانوستانیان بکردایە، لەوانەبوو بەدەرئەنجامی باشتر دەرچووبوونایە لە قۆناغی یەکەمی شەڕی سارد: ١٩٤٥-١٩٤٧.

قۆناغی دووەم، راگەیاندنی شەڕی ساردە لە ١٩٤٧-١٩٤٩دا. لە کێشەی نێوان یۆنان و تورکیا سەری هەڵدا. بەریتانیا کە جەنگی جیهانی دووەم پەکی خستبوو، هەستی کرد چیتر ناتوانێ پاسەوانیی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بکا. ئەمریکا دەبوایە بڕیاربدا، یان واز لە بۆشاییەکە بهێنێ، کە گەشە بکاو فراژی ببێ، یان شوێنی بەریتانیا

---

٤- سەرچاوەی پێشوو. ل١٣١.

بگرێتـەوەو یارمـەتی بۆ یۆنان و تـورکـیـا دابین بکا. ئەمـەش تاڕادەیەکی زۆر واتای دەرچوون بوو لە سـیـاسەتی تەقلیدی ئەمریکی (سیـاسەتـی لاتەریکی. و). **ترومان** لەئەگەری ئەوە دەترسـا کـە ئەم جـۆرە هەنگاوە لەلایەن رای گـشـتی ئەمـریکییـەوە رەتبکرێتەوە. **ترومان** لە سەرۆکی کۆمارییەکان «**ئارثر فاندنبرگ**» پرسی، ئایا ئەگەری ئەوە هەیە ئەنجوومەنی پیران پاڵپشتیی یارمەتیدانی تورکیاو یۆنان بکا! **فاندنبرگ** ئامۆژگاری ترومانی کرد، کە ئەگەر ویستی بەستەڵەکی سیاسەتی تەقلیدی ئەمریکی بتـوێنێتـەوە، پێـویسـتـە (تاڕادەی لەعنەت بیـانتـرسێنێ). بۆیە کـاتێک **ترومان** ئەو گۆڕانە پێویستییانەی دەبێ لە سیاسەتی ئەمریکی رووبدەن، روون کردەوە، قسەی لە پێداویستی پارێزگاری کردن لە هاوسەنگیی هێزەکان لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا کرد لە رێگەی یارمەتی پێشکەش کردن بە تورکیا و یۆنانەوە. هەروا لەسەر ئەوە ئاخاوت کە گەلانی ئازاد لەهەر کوێیـەک بن پێـویسـتـە بپـارێزرێن، ئەو روونکردنەوە ئاکارئامێزە ئایدیۆلۆژییـە سـەبارەت بە یارمـەتییـەکـانی ئەمـریکی بەناوی «پرەنسـیـپی ترومـان» ناسرا.

ئەو رۆژە **جـورج کـینان** گـەڕایەوە وەزارەتـخـانەی هەندەران، دژی ئەو رێبـازە ئایدیۆلۆژییە وەستا کە سیـاسـەتی هەندەرانی پێ دادەڕێژرا و گوتی زۆر بەرهەڵدایەو دەشێ وڵات بەرەو سـەرئێـشـە بەرێ، راسـتـیش سـیـاسـەتی بنکۆڵکردن کـە زادەی پرەنسیپی **ترومان** بوو، بێ سنوورو فشۆڵ و زۆر خاڵی نا روونی تیابوو.

ئایا وڵاتە یەکگرتووەکـان بایەخی بە بنکۆڵکردنی هێـزی سـۆڤـیـەتی دەدا، یان ئایدیۆلۆژی کۆمۆنیزم؟ بەرایی وادیاربوو بنکۆڵکردنی هەردووکیـان یەک شـتـە، وەلێ کاتێک لە ماوەی شەڕی ساردا بزاڤی کۆمۆنیستی کەرت بوو، ئەو تێکەڵ پێکەڵـییە، گرنگ بوو.

ئایا ترومان دوچاری هەڵەبوو کاتێک زیاد هەستی بەهەڕەشە دەکردو لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژی گۆڕانی سیاسەتی دەخستـەڕوو؟ هەندێک لەچاودێران هەست دەکەن کەوا گۆڕانی رای گشـتی لە وڵاتە دیموکراتییـەکـان زۆر ئاسـتـەنگترە لە گـۆڕانی سیـاسـەت. ئەگـەر بتـەوێ وڵاخێـکی چەمـوش بەرزەفت بکەی، پێـویستـە جڵـەوەکەی توند بگری و راکێشی. جا ئەگەر زێدەڕۆییەکە پێویست بووبێ یان نا، یارمەتی گۆڕانێکی سروشتی شەڕی ساردی دا.

لە حـوزەیرانی ١٩٤٧دا، وەزیری هەنـدەران «جورج مـارشـاڵ» پڕۆژەیەکی دەربارەی باری ئابوری ئەوروپا راگەیاند، لە دەستپێکی پڕۆژەکەدا داوای لە یەکێتی سۆڤیەت و

وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتی کردبوو، کە ئەگەر ئارەزوو دەکەن، بابێنە پاڵ پرۆژەکەوە. سۆڤیەتییەکان پرۆژەی مارشاڵیان وەک پیاوەتییەکی ئەمریکایی دانەنا، بەڵکو بەئامێرێکی کوتینەوەی قەڵاکانی خۆیان دانا، بۆ تێک و پێکدانی ناوبرەی ئاسایش لە ئەورووپای رۆژهەڵاتدا. کاتێکیش چیکوسلوڤاکیا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە چاوی لە یارمەتییەکانی ئەمریکاییە، **ستالین** دەستی لە خنخنۆکەی رۆژهەڵاتی ئەورووپا توندکردو کۆمۆنیستەکان لە شوباتی ١٩٤٨دا دەستیان بەسەر هەموو دەسەڵاتێک داگرت لە چیکۆسلۆڤاکیا. **ترومان** دەنگدانەوەیەکی سالانی سییەکانی لەم رووداوانە هاتەوە بەرگوێ. دوچاری دڵەڕاوکێ هاتبوو کە **ستالین** پێوەیە ببێتە هیتلەرێکی تر. بۆیە وڵاتە یەکگرتووەکان هەنگاوەکانی خۆی گورج کرد بۆ چاککردنەوەی کارەکانی لەئەڵەمانیای رۆژئاوادا.

**ستالین** بەرپەرچی ئەمەی بەئابلووقەدانی بەرلین دایەوە. وڵاتە یەکگرتووەکانیش وەک بەرپەرچدانەوەیەکی ئابڵووقەکە پردێکی ئاسمانی دامەزراند و دەستی کرد بەپلان دانان بۆ دامەزراندنی هاوپەیمانییەتی باکووری ئەتڵەنتیک (حلف الشمال الاطلسي- الناتو). دژە بەرەیەکان لە وێنەی کارڕایی و کارڕایی چوون یەک دەستیان بەتوندبوونەوە کرد.

قۆناغی سێیەم لە شەڕەکە، لە هەموو قۆناغەکان توندتربوو، کە لەئەنجامی دوو بەریەکەوتنندا هاتە پێش لە سالی ١٩٤٩: یەکێتی سۆڤیەت بە مەزندەی ئەمریکاییەکان خێراتر بۆمبی ئەتۆمی تەقاندەوە، هەروەها پارتی کۆمۆنیستی چین جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست (تەنیا دورگەی تایوان نەبێ). ئەو ترسە زۆرەی کە واشنتن دوچاری بوو، لە بەڵگەنامەیەکی نهێنی رەسمیدا دەربڕاوە. ئەویش بەڵگەنامەی (٦٨)ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییە NSC 68-، کە پێشبینی هێرشێکی سۆڤیەتی دەکا لەماوەی چوار یاخود پێنج ساڵدا، وەک بەشێک لەپلانی دەست بەسەرداگرتنی جیهان. بەڵگەنامەکە داوا دەکات خەرجی بەرگریی ئەمریکی زۆر زێتر بکرێ. کێشەکانی بودجەیی، سەرۆک **ترومانیان** بێزار کرد، بۆیە بەردەوام بەرەنگاری بەڵگەنامەی NSC 68 دەبووەوە. تاوەکو لە حوزەیرانی ١٩٥٠دا، هێزەکانی کۆریای باکوور، سنووری کۆریای باشووریان بەزاند.

شوێنەوارەکانی شەڕی کۆریا، وەک ئەوە وابوون یەکێک نەوت بەئاگرێکی بچکۆلەدا بکات، گومانی رۆژئاوایان دەربارەی چاوتێبڕینە فراوانخوازییەکانی ستالین دووپات کردەوە، ئەمە بووە سۆنگەی ئەوەی کە بودجەی بەرگریی ئەمریکی بەشێوەیەکی

زۆر مەزن زێدە بکرێ، کە **ترومان** ئاوەها لە مێژووە بەرەنگاری دەبووەوە.

بۆچی **ستالین** ڕێگای دا کۆریای باکوور پەلاماری کۆریای باشوور بدا؟[٥]

خروچۆف لەیاداشتنامەکانیدا وای لێکدەداتەوە: سەرۆکی کۆریای باکوور (**کیم ئیل سونگ**) فشاری بۆ **ستالین** هێنا کە هەلێکی بۆ بڕەخسێنێ تا نیمچە دورگەی کۆریا یەکبخاتەوە. ولاتە یەکگرتووەکانیش دەیگوت کۆریا لەدەرەوەی سنوورەکانی بەرگری کردنی ئەوە. وەزیری هەندەران «**دین ئاشیسۆن**» بەڕوونی لەم بارەیەوە ئاخاوت و سەرۆکایەتی ئەرکانی هاوبەش لەسەر ئەم بنەمایە پلانی دارشتبوو. لە دیدی ستالین، کۆریا خالێکی چروک و پەرش و بلاو بوو. وەلێ کاتێک کۆریای باکوور، سنوورەکانی کۆریای باشووری بەزاند، بەرپەرچدانەوەی **ترومان** شتێکی بەدیهی بوو نەک حسێو بۆ کراو. **ترومان** بیریکەوتەوە کە چۆن **هیتلەر** ناوچەی راینی داگیرکردو ئەو بەدیهییەتەی هێنایەوە بیری خۆی کە دەلێ: بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژکاری بکرێت لە هەرکوێیەک بێت. ئەو بەراوردکردنە مێژووییەی کەپەلامارەکەی کۆریای باکوور وروژاندی، هێندە بەهێزبوو کەوایکرد هەموو پلانەکانی پەیوەست بەسنوورەکانی بەرگری کردن داپۆشی. ولاتە یەکگرتووەکان توانی ئەنجوومەنی ئاسایش سازبدا کە متمانە بە ئاسایشی بەکۆمەڵ بدا. چونکە ئەوکاتە یەکێتی سۆڤیەت پەیوەندی لەگەڵ ئەنجوومەنی ئاسایش پچڕاندبوو، توانرا کارەکە ئەنجام بدرێ، پاشان لە ژێر ئالای نەتەوە یەکگرتووەکاندا، ئەمریکا هێزی ناردە کۆریا.

لە سەرەتادا سوپاکانی کۆریای باکوور نیمچە دورگەکەیان خستە ژێر کۆنترۆلی خۆیانەوە تا گەیشتنە دوورترین خاڵ لەباشوور. وەلێ لەمانگی ئەیلوولدا، ئەمریکا هێزەکانی خۆی لە ڕێگای دەریاوە، لە ناوچەی «ئانچۆن» دابەزاند و کۆریە باکوورییەکانی بەشێوەیەکی زۆر خراو شکاند. ئەگەر ولاتە یەکگرتووەکان لەو خاڵەدا بوەستابوایە، دەرئەنجامی هەڵمەتەکە ئازاری کەمتر دەبوو، وەلێ ترومان دوچاری ئەو فشارەبوو کە راوەدووی هێزە تێکشکاوەکە بنێ تا دەگاتەوە باکووری هێلی ٣٨. کاتێک ئەمریکاییەکان لە رووباری «یالو» نزیک کەوتنەوە، کە چین و کۆریای لێک جوێ دەکردەوە. چینەکان خۆیان تێ هەڵقورتاندو وایان لە هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد تا نیوەڕاستی نیمچە دورگەی کۆریا خۆ نەگرنەوە. لەوێ شەڕ بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو، تاوەکو لە ساڵی ١٩٥٢دا ئاگر بەست ئیمزا کرا.

---

٥- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١٢).

ولاته یەکگرتووەکان لەگەڵ چین ئامبازی یەکتر بوونەوە، کۆمۆنیستەکان یەک ڕیزو بەهێز هاتنە مەیدان. بێ هیوایی بووە سۆنگەی لەیەکترازانی نێوخۆیی لە ئەمریکاو سەرهەڵدانی مەکارسیەت (المکارثیە). بلۆکەکانی شەڕی سارد پتەوتربوون، نزیکەی هەموو پەیوەندییەک لە نێوان هەردوولادا پچڕا.

## حەتمییەت

ئایا بەرپابوونی شەڕی سارد، کارێک بوو هەردەبوایە رووبدا؟ تاقمی پۆست دەسکاریخواز راست دەکەن، ئەگەر حەتمییەتمان بەواتای «تارادەیەکی زۆر لە وانەیە» دانا. چونکە بونیاتی دوو جەمسەرە (دووسەرە) وای کردووە شیانی ئەوە هەبێ، هەردوو لایەن پەلکێشی حاڵەتێکی بۆشایی بەهێز بکرێن لە ئەوروپا، بەشێوەیەک کە لەیەک کردنەوەی پێکدادانی هێزەکان، زەحمەت بێت، بارە ئایدیۆلۆژییەکەش، کۆسپی خستە بەردەم کاری نەتەوە یەکگرتووەکان و بەشداری لە توندڕەویی کاروانی سیستەمی دەولیدا کرد.

لە بارێکی ئاڵۆزی ئاوهادا، هەردەبوایە ململانێ دەربارەی ئەو شەش مەسەلەی کە پێشتر باسمان کردن و چەند مەسەلەیەکی تر رووبدا، کە چارەسەری هەمووشیان ئاستەنگ بێت.

کەچی تاقمی پۆست دەسکاریخواز بەشێوەیەکی لە رادەبەدەر پشت بەو راڤەکردنەیە دەبەستن کە پەیوەندی بەسیستەمەوە هەیە. دەشێ ئەوە راست بێ کە شەڕی سارد چار نەبوو هەر دەبوایە رووبدا. وەلێ سەبارەت قوڵیی ئەو شەڕە نەخێر، پاشان لێرەدا زۆر قۆناغی جیاجیا لە دژەبەریەکەدا هەبوو. هەروەها لەبەر ئەوەی سیستەمی دووجەمسەرەی دەولی تاوەکو ساڵی ١٩٨٩ نەگۆڕا، بۆیە لێکدانەوەی بونیادگەری، ناتوانێ راڤەی قۆناغە جیاجیاکان، یاخود قووڵایی دژە بەریەکە بکا. لێرەدا ئەوەی گرنگە تاکەکان و سیاسەتی نێوخۆییە: **روزفیلت و ترومان، ستالین و خروچوف.** پێویستە بەبایەخەوە لە سیاسەتی نێوخۆیی بتوێژینەوە، تا بەتەواوی مەودای شەڕی سارد تێ بگەین. دەسکاریخوازان راستن کە بایەخێکی زۆر بەمەسەلە نێو خۆییەکان دەدەن، وەلێ لەوەدا بەهەڵەچوون کە زۆر زێدەڕۆیی لەمەڕ جەبرییەتی ئابوری دەکەن. لەمەش گرنگتر رۆڵی زێدەڕۆیی و ئایدیۆلۆژیایە لەسیاسەتی نێو خۆیدا. **ستالین** لە سۆنگەی کێشە نێو خۆییەکانی دوای جەنگەوە ئایدیۆلۆژیای بەکارهێنا، **ترومانیش** بۆ ئەوەی سیاسەتی هەندەرانی ئەمریکایی بگۆڕێ زێدەڕۆیی دەکرد. بەراوردکردنیش

لەگەڵ ماوەی سییەکاندا یارمەتی هەردوولای دا بۆ ئەوەی هەڵوێستی ڕەقەکارانەی خۆیان بەهێزتر بکەن.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو، کە ستراتیژیەتە ئەلتەرناتیڤەکان، لە هەموو کاتەکاندا، هۆکارێک بوون لەم هۆکارانەی دژە بەریەکەیان قوڵتر دەکردەوە. نموونەی ئەمەش، وڵاتە یەکگرتووەکان پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی «**کینان**»ی کردو لە ماوەی ١٩٤٥ تا ١٩٤٧ بە شێوەیەکی زۆر توندتر وەڵامی دەدایەوەو لە ساڵی ١٩٤٧تا ١٩٥٠ پەیڕەوی سیاسەتی دانوستان و پەیوەندیکردنی پراگماتیانەتری کرد. لە وانەبوو لە سەرەتای پەنجاکاندا هەرەتی شەڕی سارد کۆتایی بهاتبوایە.

### ئاستی شرۆڤەکردن

دەشێ بەزمانی وێنە، یاخود بەئاستی شرۆڤەکردنی جیاجیای ئاماژە پێکراو وەسفی بنەماکانی شەڕی سارد بکەین. لە سەدەی نۆزدەهەمدا «**ئەلکسی دوتوکفیی**» پێشبینی ئەوەی کرد کە روسیا و وڵاتە یەکگرتووەکان دەبنە دوو گەورە زەبەلاحی کیشوەری، لە جیهاندا. دەشێ لەم بۆچوونەوە، ریالیستەکان پێشبینی ئەوەیان کرد بێ کە ئەم دوو زلهێزە دەکەونە ململانەوە. هەڵبەت لە ساڵی ١٩١٧دا شۆڕشی بەلشەویک ڕەهەندێکی ئایدیۆلۆژی بۆ ئەو ململانێیە زێدەکرد.

کاتێک **ودرو ولسون** هەواڵی شۆڕشی روسی پێ ڕاگەیانرا، لەبەر ئەو گیانە دیموکراسییەی هەیبوو، پیرۆزبایی لەگەلی روس کرد. هێندەی نەبرد ئەمریکاییەکان روسە بەلشەویکەکانیان بەوە تاوانبارکرد، کە کاری جینۆسایدیان ئەنجام داوەو خەڵکیان لەموڵک و ماڵی خۆیان دەرکردووەو لە شەڕی جیهانی یەکەمدا هاریکاری ئەڵەمانەکانیان کردووە، وڵاتە یەکگرتووەکان بەو هێزەوە، هاتە مەیدان تا هەوڵبدا روسەکان دژی ئەڵەمانیا لە جەنگدا بهێڵێتەوە. وەلێ سۆڤیەتییەکان ئەوەیان واڵێک دایەوە کە ئەمە هەوڵێکە بۆ ئەوەی کۆمۆنیزم لەبێشکەوە بخنکێنن. سەرباری ئەو جیاوازییانە، یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکان لە ماوەی جەنگدا خۆیان لەوەبوارد بچنە نێو ململانێیەکی ترسناکەوەو لەسەرەتای چلەکانەوە بوونە دوو هاوپەیمانی یەکتر. پاشان سیستەمی دوو جەمسەرە هاتە ئارا، کە دوای هەرەفتنی هەموو دەوڵەتە گەورەکان لە جەنگی جیهانی دووەم هاتە ئارا و ئەو بۆشایی هێزەی لەو دارمانە کەوتەوە. ئەو سیستەمی پەیوەندییەکانی گۆڕی. هەر لە سەرەتاوە دڕدۆنگی بەرانبەر بەیەکتر پەیدابوو، وەلێ دڕدۆنگییەکە دووراو دوور بوو، بەر لە

جەنگی جیهانی دووەم دەیانتوانی خۆیان لە یەکتر لابدەن. وەلێ دوای ساڵی ١٩٤٥ روو بەڕووی یەکتر بوونەوە، دوای ساڵی ١٩٤٧ ململانێیەکی قوڵ دەستی پێکرد. هەندێک خەڵک دەپرسن ئەگەر بونیاتی دووجەمسەرە ئەو کاریگەرییەی هەبووبێ: یەکێتی سۆڤیەت دەوڵەتێکی گەورەی وشکانی بوو. لە کاتێکدا ولاتەیەکگرتووەکان دەوڵەتێکی گەورەی دەریایی بوو، لەبەرچی لێرەدا کار لە نێوان فیل و نەهەنگ دابەش نەکرێ و هەریەکەی لە دەوروبەرو ژینگەی خۆی بمێنێتەوە؟

وەرام ئەوەیە کە فیشە سەرەکییەکانی گرەوەکە، واتە ئەو ولاتانەی دەتوانن تا تەرازووی ئەم یان ئەولایە لەنگ بکەن، دەکەونە دەوروبەری یەکێتی سۆفیەتەوە: بەتایبەتی ئەوروپاو ژاپۆن.. **جورج کینان** باسی رەوشی دوای هەردوو جەنگەکەی کردووەو دەڵێ: چوار رووبەری گەورە بۆ ئەفراندنی تەکنۆلۆژی و پیشەسازی لە ئارادا هەیە، ئەگەر بەم شێوەیە یان شێوەیەکی تر هاوبەندی یەکتر بوون، ئەوا تەرازووی هێزەکانی دەولییان پێ دەگۆڕێ، ئەوانیش ولاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت و ژاپۆن و ئەوروپان. هاوپەیمانییەتی ئەوروپاو ژاپۆن و ولاتە یەکگرتووەکان بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە.

لێکدانەوەی بونیادگەرانە، پێشهاتی ململانەی دەکرد، بۆیە پێویستە لەسەر ئێمە لە راقە بونیادگەرییە رەتبین و بۆ ئاستەکانی شرۆڤەکردنی کۆمەڵگایی و تاک- تایبەت بە تاکەکان- بپەڕینەوە. لەسەر ئاستی کۆمەڵگە، هەردوو ولات (مەبەست ئەمریکاو سۆڤیەتە) زۆر لەیەکتر جیاواز بوون. زۆر بەکورتی دەڵێین، نەریتە سیاسییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و دەربڕینی لەسیاسەتی هەندەراندا، دەمانخەنە بەردەم دوو بنەڕەتەوە: روسی و کۆمۆنیستی، نەریتی سیاسی روسی پێ لەسەر رێچکەی فەرمانڕەوایی رەها دادەگرێ، نەک دیموکراسی. ئارەزوو لە هەبوونی فەرماندەیەکی بەهێز و، ترسان لە گێرەشێوێنی (روسیا ئیمپراتۆریایەکی بەرفراوان بوو و یەک رێز نەبوو، ترسان لە گێرەشێوێنی و داماڵران، کەدەشیا ببێتە سۆنگەی لەبەریەک هەڵوەشاندنەوە، ترسێکی تەواو راستەقینە بوو)، ترسان لە پەلاماردان، (روسیا دەوڵەتێکی وشکانی گەورەبوو، لە رووی جوگرافییەوە پارێزراو نەبوو، بەدرێژایی سەدەکان لەلایەن هاوسێکانییەوە پەلاماردەدرا)و دڵەراوکێی شەرم لە حاڵەتی دواکەوتن (لە سەردەمی پەترۆسی گەورەوە روسەکان هەوڵدەدەن جێ پێی خۆیان لەرکابەری دەولی حوکم بکەن) و نهێنی و شت شاردنەوە (ئارەزوو لە شاردنەوەی لایەنی زۆر خراو لە ژیانی روسیا). سەرباری ئەمانەش سیستەمی کۆمۆنیستی باسی

مافەکانی چینایەتی دەکرد، نەک مافەکانی تاک، بەو پێیەی بنەمای عەدالەتە. ڕۆڵی گونجاوی تاکەکەس، یاخود کۆمەڵگا، ئەوەیە کە سەرکردایەتی پرۆلیتاریا، یاخود چینی کرێکار بەرەو ئەوە ببا کە کۆنترۆلی لەدەست بێ، وەک دەبێ وابێ، چونکە ئەمە ڕێڕەوی مێژووە.

بۆیە ئایدیۆلۆژی پاڵێکی تری بە ئمپریالیزمی روسی تەقلیدییەوە نا پێشەوە. بووە سۆنگەی سیاسەتێکی هەندەرانی زۆر شاراوەو نهێنی. ئەوەی گرنگە، رووە بەهێزو لاوازەکانی ئەم پرۆسەی سیاسەتە تێبینی بکەین. رووە بەهێزەکانی لەساڵی ١٩٢٩ڕوون بوون. کاتێک **ستالین** بەخێرایی ئامادەبوو هاوپەیمانییەتییەک لەگەڵ هیتلەردا ئیمزا بکا. رای گشتی پابەندی نەکردو هیچ شتێک نەبوو کارگێڕی پێ بگوترێ و سنوورێکی بۆ دابنێ. بەتەواوی دەستی **ستالین** بەرهەڵدابوو لەوەی بە خێرایی هاوپەیمانییەتی لەگەڵ هیتلەردا بکا، لە کاتێکدا بەریتانی و فەرەنسییەکان لە مامەڵەکردن لەگەڵ هیتلەردا هێشتا لەبگرەو بەردەدابوون، لە ساڵی ١٩٤١دا رووەکەی تری پرۆسەکە هاتەئاراوە، کاتێک **هیتلەر** پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتی دا، **ستالین** نەشیا باوەڕ بەوە بکا کە هیتلەر کارێکی لەم جۆرەدا دەکا، بەدرێژایی هەفتەیەک یاخود زێتر دوچاری بێ ئومێدییەکی زۆربووبوو. ئەنجامەکەشی کارەساتێک بوو بۆ سەنگەرەکانی بەرگریی سۆڤیەتی لە قۆناغەکانی یەکەمی جەنگدا.

بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، نەریتەکانی سیاسەتی ئەمریکی پێیان لەسەر دیموکراسییەت و لیبرالیزم و فرە حزبی و دابەشکردنی دەسەڵات دادەگرت. لە جیاتی هەست کردن بەشەرم و شوورەیی دواکەوتن، وڵاتە یەکگرتووەکان شانازی بە تەکنۆلۆژیاو بەو فراوان بوونە ئابورییە دەکرد کە هێنابوویەدی. لە جیاتی ترسان لە پەلاماردان، وڵاتە یەکگرتووەکان لە زۆربەی دیرۆکی خۆیدا، توانیویەتی لەنێوان دوو دەوروبەردا خۆی لاتەریک بکا. هەرچی لە بارەی شت شاردنەوەو نهێنی و نهێنیکارییەوەیە، ئەوا وڵاتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی وا کراوە بووە، کە بەڵگەنامەکانی حکومەت لە ماوەی چەند رۆژێکدا، یاخود چەند هەفتەیەکدا دەگەیشتنە دەست رۆژنامەگەری. لەجیاتی ئەوەی لە روانینە عەدالەت پشت بە پرەنسیپی چینایەتی ببەستێ، بەتوندی پێی لەسەر عەدالەتی تاکدا دادەگرت. سیاسەتی هەندەرانی ئەمریکا لەم نەریتە سیاسیانەوە هاتۆتە ئاراوە، کە سیاسەتێکی گشتی و ئاکار ئامێز بووە، بەگوێرەی کاریگەرییە نێو خۆیی و دەرەکییەکان، دەبزواو دەرئەنجامەکەشی ئەوەبوو کەوا سیاسەتی هەندەرانی ئەمریکی زۆربەی کات سیمای

ناهەماهەنگی و یەکنەگرتوویی، لە زۆر رووە رووکەشەکانی پێوەبێت. وەلێ پرۆسەکە رووییێکی تریشی هەبووە، ئەویش ئەوەبوو کە هێزی بەرهەمهێنان و فرەحزبی، زۆربەی کات وڵاتە یەکگرتووەکانی لە هەڵەی گەورە گەورە پاراستووە.

بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە، شتێکی نامۆ نییە کە ئەم دوو کۆمەڵگایە زۆر جیاوازە لە رووی هەیکەلی و پرۆسەی نەخشەکێشانی سیاسەتی هەندەرانەوە، یەکیان ئەوەی تر بشڵەژێنێ، نموونەی ئەمە، چۆنیەتی مامەڵەکردنی **روزفیلت و ترومان** بوو لەگەڵ **ستالین** لەچلەکاندا. بۆ ئەمریکاییەکان زەحمەت بوو لە ماوەی شەڕی سارد دا لە یەکێتی سۆڤیەت بگەن، چونکە یەکێتی سۆڤیەت. زێتر لە سنووقێکی رەش دەچوو.

سەرکردە ئەمریکاییەکان دەیانتوانی بزانن چی دێتە ناو سنووقەکەو چی دەچێتە دەرەوە، وەلێ نەیاندەتوانی ئەوە برانن کە چ لە ناو سندوقەکە روودەدا. بەهەمان چەشن ئەمریکاییەکانیش، سۆڤیەتییەکانیان شڵەژاند، ئەوانیش وەکو ماشێنێکی بەدەنگە دەنگ بوون. بەشێوەیەک بۆ مرۆڤ ئاستەنگ بێت کە بە روونی گوێی لە ریتمی جووڵانەوەکەی بێت. پاشان خەڵکێکی زۆرن و زۆر شت دەڵێن. ئەوشتە سۆڤیەتییەکانی زۆری پێ تێکچوون و وای لێکردن کە بەراستی نەزانن ئەمریکاییەکان چیان گەرەکە.

## ئامانجگەلی ئەمریکی و سۆڤیەتی لە شەڕی ساردا

زۆربەی کات سۆڤیەتییەکان بەفراوانخواز تاوانبار دەکران. لەبەر ئەوەی دەوڵەتێکی شۆڕشگێڕ بوون، نەک دەوڵەتێک کەبەباری ئێستا رازی بێ. هەروەها سۆڤیەتییەکان حەزیان دەکرد شتی بەرجەستەیان لەدەستدا بێت، وەک زەوی و زار، لە کاتێکدا ئەمریکاییەکان حەزیان لە ئامانجی نابەرجەستە دەکرد، یاخود حەزیان لە کەشوهەوا، رێگای دڵگیربوون بە دیمەنی گشتی سیاسەتی دەولی دەکرد.

دەتوانین پەنا بۆ جۆری ئەو داواکاریانە بەرین کە **ستالین و چەرچل و روزفیلت** خستیانە سەرمێزی دانوستان لە یالتا، ئامانجەکان لە یالتا زۆر روون بوون: ئەڵمانیا و پۆڵەندا. **چەرچل** گەرەکی بوو فەرەنسا وەک جاری جارانی، لێ بێتەوە، تا یارمەتی بدا لە هێنانەدی هاوسەنگیی هێز لەگەڵ سۆڤیەتدا، لە حاڵەتێک ئەگەر ئەمریکاییەکان چوونەوە وڵاتی خۆیان. **روزفیلتیش** نەتەوە یەکگرتووەکان و سیستەمێکی ئابوری کراوەی دەولی دەویست، ئامانجەکان زۆر لەیەکتر جیاوازبوون. ئامانجەکانی **ستالین** دوای جەنگ، ئامانجێکی ئیمپریالیستی کلاسیکی روسی بوون،

**ستالین** ویستی ئەو دەسکەوتانە بپارێزێ کە لە پەیماننامەی گەڵ هیتلەردا وەدەستی هێنابوون، لیستی ئارەزووەکانیشی لە لیستی ئارەزووەکانی **پەترۆسی گەورە** جیاواز نەبوو!

هەندێک لە ئەمریکاییەکان هەستیان دەکرد کە سۆڤیەتییەکان لە **هیتلەر** کەمتر فراوانخوازنین، کە مگێڕی لەوە بوو دەست بەسەر تەواوی جیهاندا بگرێ، هەندێکی تر وای بۆچوون کە فراوانخوازیی سۆڤیەتی، پێویستی بەدڵنیابوونی لەدواوەیە. فراوانخوازییەکی بەرگریکەرانەیە، بەلایەنی کەم دووڕووی جیاواز لەرێچکەی فراوانخوازی سۆڤیەتییەکان و هیتلەرییەکاندا هەیە. یەکەمیان ئەو (سۆڤیەت) مەیلی شەڕی نییە. سۆڤیەتییەکان شەڕیان نەدەویست. کاتێک هیتلەر پەلاماری پۆڵەندای دا، لەوەترسا سۆڤیەتییەکان رازی کردنێکی تری، وەک رازی کردنەکەی میونیخی بخەنە بەردەم و بێ بەشی بکەن لە چێژی شەڕ، بۆ بنیاتنانی جاویدانییەکانی فاشیزم. جیاوازییەکی تر ئەوەبوو یەکێتی سۆڤیەت ورياو هەڵپەرست بوو، نەک سەرۆیەکی هەڵەپاس. لە روانگەی سۆڤیەتەوە گیانی سەرەرۆیی گوناهێک بوو دەرهەق کۆمۆنیزم، چونکە رێڕەوی مێژووی بینراوی دەشلەژاند. لە ماوەی شەڕی ساردا، هەرگیز یەکێتی سۆڤیەت ئارەزووی لە شەڕ نەبوو، یاخود هەڵەپاس نەبوو وەکو **هیتلەر**. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک کێشە هەیە لە وێناکردنی رەفتارەکانی سۆڤیەتی، کەبەرگریکردنێکی رووت بوو، لەشەڕی پیلوپونیزی فێری ئەوەبووین، کە لەجیهانێکی دووجەمسەریدا، ئاستەنگە جیاوازی لە نێوان پەلاماردەرو بەرگریکەردا بکەین. هەندێک کردار کە لەوانەیە پاڵپێوەنەری بەرگری کردنی لەدواوە بێت، وەلێ لە روانگەی لایەکەی ترەوە وەکو هەڕەشە کردنێکی گەورە دیار دەبێ، ئێمە دەزانین کە فراوانخوازیی بەرگریکاری، یاخود ئیمپریالیزم، مێژوویەکی درێژی هەیە. بۆ نموونە لەسەدەی نۆزدەهەمدا، بەریتانیا لە پێناو پاراستنی رێگا دەریاییەکانیدا بۆ هندستان، میسری داگیرکرد. دوای ئەوەی میسری داگیر کرد، هەستی کرد پێویستە سوودانیش بۆ پاراستنی میسر داگیربکا. پاشان ئۆگەندای داگیر کرد بۆ پاراستنی سوودان. دوای داگیر کردنی ئۆگەندا، بەریتانییەکان هەستیان کرد پێویستە کینیاش داگیر بکەن. هەروا بۆ پاراستنی ئۆگەندا، هێڵی ئاسنی رابکێشن، لەپاش هەر خواردنێک (داگیرکردنێک) بەریتانیا مگێزی دەبووەوە، کێشەی ئاسایشی بە کاردەهێنا بۆ فراوانخوازی. زێتر سەرباری ئەمە کۆمۆنیستەکان پاڵپێوەنەرێکی ئایدیۆلۆژیشیان هەبوو، ئەویش رزگار کردنی چینی کرێکار بوو لە هەموو لایەکی جیهاندا. بۆئەوەی شەرعییەتی زێتر بدەنە مەیلی

فراوانخوازانەیان، بەکورتی ئامانجەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە کاتی شەڕی سارد دا فراوانخوازانە بوون، وەلێ بەهەڵپەرستی و وریاییەوە.

## بنکۆڵ کردن

ئەدی ئامانجەکانی ئەمریکا چی بوون؟ وڵاتە یەکگرتووەکان لە ماوەی شەڕی ساردا ویستی یەکێتی سۆڤیەت بنکۆڵ بکا. وەلێ سیاسەتی بنکۆڵکردن دوو مەسەلەی تەم و مژاوی گەورەی تیادابوو: یەکێکیان پەیوەندی بە نیازەکانەوە هەبوو. ئایا هێزی سۆڤیەت بنکۆڵ بکا یان کۆمۆنیزم؟ دووهەمیشیان پەیوەندی بە ئامرازەکانەوە هەبوو. پارەو پوول خەرج کردن بۆ ڕێگاگرتن لە فراوانخوازیی هێزی سۆڤیەت، یاخود تەنیا لەچەند ناوچەیەکی سەرەکی دیاریکراودا بوەستێ، کەبەڕادەیەکی ترسناک بۆ هێنانەدی هاوسەنگی گرنگن! ئەم دووخاڵە نا ڕوونەی کە پەیوەندیان بە ئامانجەکان و ئامرازەکانەوە هەیە، بەر لەشەڕی کۆریا جێگەی گفتوگۆیەکی گەرم بوون. **جورج کینان** لەو شێوازە بە خۆوەگرتنە فشۆڵە جیابووەوە کە **ترومان** بانگەشەی بۆ دەکرد. بیرۆکەی **کینان** سەبارەت بەخۆوەگرتن لە دیپلوماسییەتی کلاسیکی کۆنەوە نزیکتربوو، کە داوای دەکرد کەمتر پشت بە ئامرازی سەربازی ببەستریٚ و زۆرتر بە هەڵبژاردن (الانتقائیة). باشترین نموونەش بۆ ئەمە یوگسلافیایە، بەحکومەتە کۆمۆنیستە دیکتاتۆرییەکەیەوە، کە **جوزیف تیتۆ** سەرۆکایەتی دەکرد. لە ساڵی ١٩٤٨دا **تیتۆ** لە **ستالین** جیابوەوە. چونکە سۆڤیەت هەوڵی دەدا سیاسەتی هەندەرانی یوگسلافیا کۆنترۆڵ بکات بە پاڵپشتی کردنی کۆمۆنیستە یۆنانییەکانیشەوە. ئەگەر لەلایەنی ئایدیۆلۆژییەوە سەیری بنکۆڵ کردنمان کرد، ئەوا دەبوایە وڵاتە یەکگرتووەکان، یارمەتی یوگسلافیا نەدا، چونکە ئەوژی دەوڵەتێکی کۆمونیستی بوو، هەرچی لەلایەنی هاوسەنگیی هێزەکانەوەیە، ئەوا لەسەر وڵاتە یەکگرتووەکان پێویست بوو یارمەتی یوگسلافیا بدا بۆ لاوازکردنی هێزی سۆڤیەت. لە ڕاستیدا ئەمریکا هەر ئەمەشی کرد، یارمەتی سەربازی پێشکەش بە حکومەتێکی کۆمۆنیستی دیکتاتۆری کرد، سەرباری ئەو ڕاستەقینەیەی کە «پرەنسیپی ترومان» ڕایگەیاند، کە ئامانج بەرگری کردن بوو لە ئازادی گەلان لە هەموو شوێنێک، وڵاتە یەکگرتووەکان ئەم کارەی لەبەر چەند هۆیەک ئەنجام دا، کە پەیوەستە بەتەرازووی هێزەکانەوە. ئەم سیاسەتەش کەلێنێکی گەورەی خستە هێزی سۆڤیەت لە ئەوروپادا.

کەچی دوای شەڕی کۆریا، تێزەکەی (**کینان**) پاساوەکانی خۆی لەدەست دا. پاشان

بەدەرکەوت کە پێشبینییەکانی بەڵگەنامەی ژمارە (٦٨) NSC 68 ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی، دەربارەی فراوانخوازیی سۆڤیەتی، پاساوی خۆیان هەبووە. کۆمۆنیستەکان بەهەماهەنگی و یەکرێزی دەجووڵانەوە. لە کاتێکدا ئەدەبیاتی بەخۆوەگرتن پێی لەسەر ئامانجێکی ئایدیۆلۆژی دادەگرت، ئەویش رێگەگرتن بوو لە بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم، لەم چوارچێوەیەدا ولاتە یەکگرتووەکان هەڵەیەکی گەورەی کرد، کاتێ خۆی لە شەڕی ڤێتنام هەڵقورتاند. بۆ ماوەی دوو دەیەک ولاتە یەکگرتووەکان خەریک بوو رێگا نەدا کۆمۆنیستەکان دەست بەسەر ڤێتنام دابگرن، کە نرخەکەی ٥٨ هەزار کوژراوی ئەمریکی و لەوانەیە ملیۆنێ کوژراوی ڤێتنامی و ٦٠٠ ملیار دۆلارو ئاژاوەی نێوخۆبوو. ئەمە خودی سیاسەتی بەخۆوەگرتنی زۆر بێ هێز کرد. پاشان ولاتە یەکگرتووەکان لە کاتێکدا هەوڵی دەدا لە ڤێتنامی باشوور، کۆمۆنیزم بنکۆڵ بکا. ئەمریکا لەوە دەترسا لە ڤێتنام بدۆڕێ، یان باوەڕ کردن بە لێهاتوویی ئەو لە جێبەجێکردنی ئەرکەکان و باوەڕکردن بەسیاسەتی بنکۆڵ کردن لە ناوچەکانی تری جیهان لاواز بکا. سەیرەکە، لەوەدایە ناکۆکییە نەتەوایەتییەکان لە نێوان ولاتانی ئاسیای کۆمۆنیستدا دوای شکانی ئەمریکاییەکان لە ساڵی ١٩٧٥و کشانەوەیان، ساغیان کردەوە کەوا هێزێکی کاریگەرن لە پاراستنی هاوسەنگیی هێزەکان لە ناوچەکەدا.

*زیدەڕۆییە، کە بڵێین رەفتارەکانی ئەمریکی بە تەنیا و بەبێ یارمەتی، دەیانتوانی بزاڤی کۆمۆنیستی، یاخود بژێنێتەوەو پەلە لە دارمانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی بکەی لە روسیا. وەلێ ولاتە یەکگرتووەکان تاڕادەیەکی گەورە دەیتوانی فشاری خۆی بۆ سەر سیاسەتی هەندەرانی سۆڤیەتی زیدە بکا. رادەیەک لە میانڕەوی بە سەر کرەملیندا بسەپێنێ بۆ پاسەوانی کردنێکی زۆر گەورەتر لەوەی کەلە ساڵانی دواییدا بینی، دواتر ئەو مەیلانە بەهێز بکا، کە لە کۆتاییدا دەستەواژەیەکی بۆخۆی دەدۆزیەوە، لە دارمانی دەسەڵات- هێز-ی سۆڤیەتی، یاخود بەشێوەیەکی پلەپلە نەرمایی وەدەست بێنێت*(٦).

***جورج کینان (مصادر السلوک السوڤیتی).***

---

٦- جورج کینان، مصادر السلوك السوڤيتي، مجلة الشؤون الخارجية، المجلد ٢٥، العدد (٤) (تموز)، ١٩٤٧، ص٥٨١.

## پاشماوەی شەڕی سارد

لە ساڵی ١٩٥٢دا «**دوایت ئایزنهاور**» بە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژێردرا. بەپشت بەستن بەو بەڵێنەی کە شەڕی کۆریا بەکۆتا بێنێ و پاشەکشە کۆمۆنیستەکان. کۆماریخوازەکان دەیانگوت سیاسەتی بنکۆڵکردن موجامەلەیەکی ترسنۆکانەی کۆمۆنیزمە. ڕێگاچارەی راستەقینە ئەوەیە وا لە کۆمۆنیستەکان بکرێ بگەڕێنەوە دواوە.

لە ماوەی شەش مانگدا ئەوە بەدیارکەوت کە پاڵنان بەکۆمۆنیزم بۆ دواوە کارێکی زۆر ترسناکە، چونکە پەلە لەبەرپابوونی شەڕێکی ئەتۆمی دەکا. لەدوای مردنی ستالین لە ساڵی ١٩٥٢دا بەستەڵەکی پەیوەندییەکانی شەڕی سارد کەمێک توایەوە، لە ساڵی ١٩٥٦دا کۆنگرەیەکی لوتکە لە شاری جنیف بەسترا، کە پەیماننامەیەکی تیا ئیمزاکراو بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە نەمسا بووە دەوڵەتێکی بێ لایەن. لە ساڵی ١٩٥٦دا خرۆچۆف وتارێکی نهێنی لەبەردەم کۆنگرەی بیستەمی حزبدا لە یەکێتی سۆڤیەت خوێندەوەو تاوانەکانی ستالینی ئاشکراکرد. وتارەکە دزەی بۆ دەرەوە کرد، لە کەرتی سۆڤیەتی ئەوروپای رۆژهەڵاتدا، ئەم دزە کردنە هاوبەشی لەبڵاوبوونەوەی ناسەقامگیری و ئاژاوە دەکرد. مەجەرییەکان هەوڵی شۆڕشیان دا، وەلێ سۆڤیەتییەکان بەشێوەیەکی سەربازی خۆیان دەخاڵەتیان تێدا کرد تا مەجەر لە نێو سەربازگەی کۆمۆنیستی بهێڵنەوە.

**خرۆچۆف** بڕیاری دا دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەرلین بخەنە دەرەوەو لە مەسەلەی جەنگی جیهانی دووەمدا بگەنە چارەسەرێکی کۆتایی. بۆ ئەوەی بتوانێ لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا کۆنترۆڵی سۆڤیەتی پتەوتر بکاو سوود لە پاکتاو کردنی ئیمپریالیزم لە جیهانی سێیەم وەرگرێ. وەلێ شێوازی **خرۆچۆف** و هەوڵەکانی بۆ دانوستان لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکاندا، شێوازی تەزاری ئەڵەمانیامان دێنێتەوەیاد. کەدەیویست بەر لە ساڵی ١٩١٤ بەریتانیا ناچار بکا سەوداکاری لەگەڵدا بکا. شێوازێک کەپڕبوو لە هەڕەشەو دەستخەرۆکردن. سەر لەنوێ کەوتەوە هەوڵدان بۆ ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان پەلکێشی سەردانەواندن بکا، بەپێچەوانەی ئەوەی کە گەرەکی بوو. ئەوەبوو **خرۆچوف** هەم لە تەنگژەی بەرلین ١٩٥٨-١٩٦١ و جاری دووهەمیش لەتەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا نوشوستی هێنا.

یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کاتی تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا گەیشتنە لێواری شەڕێکی ئەتۆمییەوە. ئەو کارەی هەردوو لای ترساندو و پاڵی

پێـوەنان کـە لاپەڕەیەکی نـوێی پەیوەندییــەکــان بکەنەوە. وەک دەبینین وردە وردە کـرانەوەیەک لە سـاڵی ١٩٦٢-١٩٧٨ هاتە ئاراوە. یاخـود بارگرژیەکە خاوبۆوە. ئەو دانوستـانـانەی کە لە پێناو دانانـی رادەیەک بۆ چەکسازی، لە دوای تەنگژەی کـوباوە، ئەنجـام دران. (پەیماننـامـەی قـەدەغـەکـردنی تاقـیـکردنەوەکـان Limited Test Ban Treaty)یان لێ کەوتەوە کە سالی ١٩٦٢، رادەیەکی دانا بۆ تاقـیـکردنەوەی ئەتۆمی لە ئاسـمـان، هەروەها پەیماننامـەی دانانـی رادەیەک بۆ بلاوبوونەوەی چەک لە سـاڵی ١٩٦٨. ئیـدی بازرگانی لە نێـوان هەردوو ولاتدا وردە وردە بەگەڕ کەوتەوەو حالەتی کـرانەوەکە دەستـی بەفـراوان بوون کـرد. شەڕی ڤـێـتنـامی هاتە سەر، کە سەرنجی ولاتە یەکگرتووەکانی زێتر بۆ هەڕەشەی چینی کۆمۆنیستی راکێشا.

لە ساڵی ١٩٦٩ تا سالی ١٩٧٤، ئیدارەی **نیکسۆن** کرانەوەکەی وەک ئامرازێک بۆ هێنانەدی بنکۆلکردنەکە بەکـارهێنا. دوای تەنگژەی کـوبا، سـۆڤـیـەت هەلـمـەتی دامـەزراندنی مـاشـێنەکـانـی سـەربازی زۆر گـەورەی دەست پێکرد، ئەوەبوو بوونە هاوشانی ئەمریکا لەچەکی ئەتۆمی. شەڕی ڤێتنامیش بێ هیـواییەکی بۆ رای گشـتی ئەمریکایی، سەبارەت بەدەخالەتکردن لەشەڕی سارد هێنایە ئاراوە.

سـتـراتیـژیـیـەتی نیکسـون لەسـەر چەند بنەمـایەک دامـەزرابوو: ١- دانوسـتـانـدن سەبارەت بە پەیماننامەی کۆنترۆلکردنی بەرهەمهێنانی چەکی ستراتیژی، بە ئامـانجی ئەوەی پەیوەندییە ئەتۆمییەکان بە هاوسەنگی بمێنێنەوە. ٢- دامەزراندنی پەیوەندیی دیپلۆماتیکی لەگەڵ چیندا بۆ هێنانە ئارای تەرازوویەکـی سێ لایەنەی هێز لە ئاسیا لە جیاتی ئەوەی چین و یەکێتی سۆڤیەت بکا لە یەک تادا لەیەکتر نزیک ببنەوە. ٣- بەگوڕترکـردنی بازرگانی بۆ ئەوەی سیاسەتی «کێک و قـامچی» لە پەیوەندییـەکانی ئەمـریکی - سـۆڤـیـەتی لە ئارادابێ. ٤- بە کـارهێنانی «گـەوی پەیوەنـدی» بۆ ئەوەی پارچە جیاجیاکانی سیـاسەت بەیەکتر ببەسترێتەوە. بەرزترین خالی کرانەوەکە لە سالانی ١٩٧٢و ١٩٧٣ بوو، وەلێ پێدەچوو کە زۆر بەردەوام نەبێ.

شەڕی رۆژهەلاتی ناڤین لەسالی ١٩٧٣ و کۆمەکی سۆڤیەتییەکان بۆ بزاڤەکانی دژ بەرۆژئاوا لە ئەفـریقیا، بوونە سۆنگەی هەست کردن بەنارەزایی لە فـریودانی یەکتردا. سیاسەتی نێوخۆیی ئەمریکا، لەدارمانی سیاسەتی کرانەوەدا هاوبەش بوو. هەندێک لەیاسـا دانەرە ئەمـریکاییـەکان، وەکـو **سیناتور هنری جاکسن**، هەولیـاندا بازرگـانی لەگـەل سۆڤـیـەتدا بە مـافی مرۆڤ ببەستنەوە، لەجیـاتی ئەوەی بەگـوێرەی تەرازووی هێـزەکان رەفـتـار بکەن. کـاتێک لە سـالی ١٩٧٥دا، پورتوگـال لە بە کـۆلۆنی کـردنی

ئەنگۆلا و موزەمبیق دەستی هەڵگرت، سۆڤیەتییەکان هێزی کوبییان نارده ئەو دوو وڵاتە بۆ ئەوەی یارمەتی مانەوەی حکومەتە کۆمۆنیستەکان لە دەسەڵات بدەن. سەرۆک «**جیرالد فورد**» وشەی (کرانەوە)ی بەکارنەهێنا. **جیمی کارتەر** کە دوای ئەو هات، هەوڵیدا درێژە بەسیاسەتی «کرانەوە» لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بدا لە دوو ساڵی یەکەمی ماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا وەلێ سۆڤیەت و (کوبا) لە شەڕی نێوخۆیی ئەثیوپیا هالآبوون و سۆڤیەت بەردەوام بوو لە بەهێزکردنی توانای بەرگریی ئەثیوبیدا. لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٩دا، سۆڤیەت گوللەی بەزەیی پیاهاتنەوەی بە «کرانەوەکە» ناو پەلاماری باخچەی دواوەی خۆی واتە ئەفغانستانی دا.

بۆچی دژەبەریەکە سەری هەڵدایەوە؟ یەکێک لە راڤەکردنەکان دەڵێت کە «کرانەوەکە» زیاد لە پێویست وەهەرمێن خراو چاوەڕوانی زۆرتری لێ دەکرا لەوەی کە رەچاو دەکرا. ئەگەر وردبین، دەڵێین لە حەفتاکاندا سێ رێباز بوونە کۆسپ لەرێگای سیاسەتی دەرگای ئاوالەدا، یەکێکیان ئەوەبوو سۆڤیەتییەکان بەردەوام بوون لەدامەزراندنی ماشێنی جەنگیاندا بودجەی خۆ پڕچەک کردنی ساڵانە بەرێژەی لە ٤ ٪ . زیدەبوو لە هەر جارێکیشدا ژمارەیەک لە رۆکێتی قورسی دەخستە سەر جبەخانەکەی کە ئەمە بەشێوەیەکی تایبەت پلاندانەرانی بەرگریی ئەمریکی دوچاری دڵەڕاوکێ کرد. دووهەمیان خۆتێ هەڵقورتاندنی سۆڤیەت بوو لە ئەثیوپیا و ئەنگۆلاو ئەفغانستان. سۆڤیەتییەکان ئەم خۆتێهەڵقورتاندنەیان بەو دەستەواژەیە پاساودەدایەوە کە پێیان دەگوت «درەوشانەوەی هێزەکان» لە مێژوو، بڕوایان وابوو کە مێژوو بەم سەمتە دەچێتە پێش کە مارکسیزم- لینیزم، پێشبینی کردووە.

سێیەمیان ئەو گۆڕانکارییانەبوون کەبەسەر سیاسەتی نێوخۆیی ئەمریکی داهاتبوون، کە لایەنێکی راستڕەو ئەو هاوبەندییەی لە بەریەک هەڵوەشاندەوە کە پاڵپشتی پارتی دیموکراتی دەکرد ئەو گۆڕانکاریانە ئەنجامی کارلەیەک کردنێ لە نێوان کردارەکان، یاخود جووڵانەوەکانی سۆڤیەت و رووگە سیاسییەکانی ئەمریکی هاتنە ئارا. ئەو رایەیان دووپات کردەوە کە شەڕی سارد بەردەوام بوو، کەچی «کرانەوەکە» نەشیا بمێنێتەوە.

وەلێ سەرباری ئەوە، نوێ بوونەوەی دژەبەریەکە لە هەشتاکاندا، بە شەڕی ساردی پەنجاکان ناچێ. سەرباری هەبوونی گوتە و ئەدەبیاتی پەنجاکان، کردارەکان بەتەواوی جیاوازبوون. دەبینین سەرۆک **رونالد ریگان**، لە ئاخاوتنیی خۆیدا، یەکێتی سۆڤیەتی بە «ئیمپراتۆرە شەڕانگێزەکە» وەسف دەکرد. وەلێ لە رووی کردارەوە پلانی بۆئەوە

دادەنا ڕێکەوتنامەی چاودێریکردنی چەکی لەگەڵ گرێ بدا. لەسەردەمی ئەودا بازرگانی لەگەڵ سۆڤیەت زێتر بوو، بەتایبەتی لە هەناردنە دەرەوەی گەنمدا. پەیوەندی بەردەوام لە نێوان ئەمریکی و سۆڤیەتییەکان لە ئارادابوو. تەنانەت هەردوو هێزە مەزنەکە ڕێسای پەندو ئاگاداری دیاریکراوی دیاریشیان لە ڕەفتاری یەکتر هەڵێنجا. نەشەڕی راستەوخۆ، نەبەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی، هەروەها گفتوگۆ کردن سەبارەت بە مەسەلەی خۆ پڕ چەک کردن و چاودێری کردنی چەکی ئەتۆمی، جۆرێکی تر شەڕێکی سارد بوو، کە جیاواز بوو لەشەڕی پەنجاکان.

## کۆتایی شەڕی سارد

شەڕی سارد کەی بەکۆتاهات؟ لەبەر ئەوەی رەگ و ریشەی شەڕی سارد بەشێوەیەکی پتەو بەدابەشکردنی ئەوروپا لە نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت بەسترابۆوە، دەتوانرێ مێژووی کۆتایی هاتنی شەڕی سارد بەکۆتایی ئەو دابەشکردنە ببەسترێتەوە، واتە ساڵی ۱۹۸۹. واتە ئەو دەمەی چیتر یەکێتی سۆڤیەت، هێزی بۆ پشتگیری حکومەتی کۆمۆنیستی لە ئەڵەمانیای رۆژهەڵات بەکارنەهێنا. جەماوەری راپەریو لەتشرینی دووەمی ۱۹۸۹دا دیواری بەرلینی بڕی، ئەو رۆژە شەڕی تێدا بەکۆتا هات.

وەلێ بۆچی کۆتایی هات؟ یەکێک لە بۆچوونەکان سایەو چاکەی ئەمە دەگەڕێنێتەوە بۆ سیاسەتی بنکۆڵ کردن. **جورج کینان**، دوای جەنگی جیهانی دووەم رای وابوو کەوا کۆمۆنیستی سۆڤیەت هەردەبێ نەرم بێ، ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان توانی رێگای فراوان بوون لەیەکێتی سۆڤیەت بگرێ و دەروازەیەک بۆ ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم بدۆزێتەوە، ئەو کاتە بیروڕای نوێ سەر هەڵدەداو خەڵک لەوەدەگا کە کۆمۆنیزم وەک پێداویستیەک شەپۆلی دوا رۆژ نییە، مێژووش لایەنگری سۆڤیەت نییە. **کینان** لە چوارچێوەی پان و پۆڕی وێنەی دوا رۆژدا راستی دەکرد. ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو کات دانانەوەکە بوو، بۆچی ساڵی ۱۹۸۹؟ بۆچی شەڕی سارد چوار دەیەکی خایاند؟ بۆچی کۆمۆنیزمی سۆڤیەتی ئەو هەموو ساڵەی گەرەک بوو تا نەرم بێ؟ بۆچی دە ساڵی تر درێژنەبووەوە؟ راستە سیاسەتی بنکۆڵ کردن کاری خۆی کرد، وەلێ ئەمە وەڵامێکی تەواو نادا بەدەستەوە.

لێکدانەوەیەکی دیکە «پیربوون و پەککەوتەیی ئیمپریالیزم»ە. «**پول کینیدی**» مێژوونووس دەڵێ: ئیمپراتۆریاکان بەردەوام فراوان دەبن. تا ئەو زێدە فراوان

بوونەیان، هێزی نێو خۆی ئیمپراتۆریاکە هەڵدەمژێ. حاڵی یەکێتی سۆڤیەتیش بەم چەشنەیە. هەردەبوایە بگاتە حاڵەتی پەککەوتن. ئەو کە چواریەکی بودجەکەی لەبەرگری و کاروباری هەندەراندا خەرج دەکرد «لە بەرامبەردا وڵاتە یەکگرتووەکان لە هەشتاکاندا ٦٪ی بۆ ئەو مەبەستانە خەرج دەکرد». **کینیدی** بەردەوام دەبێ و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کەوا هیچ ئیمپراتۆریایەکی فرەنەتەوەیی پەککەوتوو لە مێژوودا، نەکشاوەتەوە نێو سنووری نیشتمان خۆی، تەنیا ئەگەر لەشەڕێکی گەورە لەسەر پێشەوایەتی کردنی جیهان نەیدۆڕاندبێ، یاخود بەشپرزەیی لێی دەرنەچووبێ. کەچی یەکێتی سۆڤیەت هەم لەشەڕدا نەبەزیبووەو هەم بەشپرزەیی لێی دەرنەچووە.

ڕاڤەکردنی سێیەم ئەو خۆپڕچەک کردنە گەورەیەی ئەمریکا بوو لە هەشتاکاندا، کە سۆڤیەتی ناچارکرد لەشەڕی سارددا خۆی بەدەستەوە بدا. ئەو ڕاڤەکردنە لایەنێکی ڕاستی تیادایە، ئەگەر ئەوەمان لەبەر چاوگرت کە سیاسەتەکانی سەرۆک ڕونالد ریگان ئاشکرایان کرد، کە سۆڤیەت تووشی پەککەوتنێکی ئیمپریالیی ترسناک بووە، وەلێ ئەو ڕاڤەکردنە وەڵامی پرسیارە بنەڕەتییەکە ناداتەوە. هەرچۆنێک بێت، ماوەکانی بەرایی لە خۆ پڕ چەک کردنی ئەمریکی ئەو کاریگەرییەیان نەبوو.

بۆچی ساڵی ١٩٨٩؟ پێویستە لە سەرمان لەهۆی قوڵتر بگەڕێین. کاتێک واگومان دەبەین کەسیاسەتی وتارە بریقەدارەکانی ئەمریکی لە هەشتاکاندا هۆی یەکەمە بۆ داڕمانی یەکێتی سۆڤیەتی، ئەوا وەکو ئەو کەڵەشێرەمان لێ دێت کەوا دەزانێ خۆر لەبەر بانگدانی ئەو هەڵدێ.

دەتوانین کۆتایی هاتنی شەڕی سارد بەشێوەیەکی باشتر ڕاڤە بکەین، کاتێ لە هەرسێ شێوەی هۆیەکان رامێنین: خێراکەرو ڕاستەوخۆ (یاخود نێوەند)و قوڵ. یەکێک لە گرنگترین هۆیە خێراکەرەکان لە بەکۆتا هێنانی شەڕی سارد کەسێک بوو بەناوی **«میکائیل گورباچۆف»**. ئەو پیاوە گەرەکی بوو کۆمۆنیزم چاک بکاتەوە نەک بیگۆڕێ، کەچی چاکسازییەکە وەکو تۆپەڵە بەفرێکی گەشەسەندوو وابوو (SNOW BALL) کە لە شۆڕشێکی هەڵچوودا بێ لەبنکەوە، سەرباری ئەوەی کەلە تروپکەوە بەڕێوەدەبا، **گۆرباچۆف** لە سیاسەتی نێوە خۆیی و هەندەراندا، کۆمەڵێک کاری کرد، کەپەلەی لە داڕمانی سۆڤیەتی کردو کۆتایی شەڕی ساردی خێراترکرد.

کاتێک بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٨٥ هاتە سەر حوکم، هەوڵیدا وەک ئامرازێک ڕەوشی گەلی سۆڤیەتی ڕێکبخاتەوە، تا بەسەر باری وەستاوی ئابوری زاڵ ببێ، کاتێک ئەو هەوڵە نەیتوانی چارەسەری کێشەکە بکا. بیرۆکەی پیرۆسترۆیکای خستە

روو. کەچی نەیتوانی لەسەرەوە پیروسترویکایەکە جێ بەجێ بکا، چونکە بیروکراتییەکانی دەزگای دەوڵەت، کۆسپیان دەخستە بەردەم جێ بەجێکردنی فەرمانەکانییەوە. بۆ ئەوەی ئاگر لە ژێر پێی بیرۆکراتییەکان بکاتەوە ستراتیژیەتی گلاسنۆستی (GLASNOST)، یاخود گفتوگۆی کراوەو پشت بەستن بە دیموکراسیەتی گرتەبەر. گۆرباچوف وای دابووە بەر زەین، جۆشدانی بێزاری گەل- خەڵک - لە رێگای دامەزراندنی سیستەمێکەوە فشار دەخاتە سەر بیروکراتییەکان و رێگا بەپیروسترویکا دەدا کاری خۆی بکا. وەلێ هەرکە رێگای بەگفتوگۆی کراوە داو پشتی بەدیموکراسیەت بەست و رێگای بە خەڵک دا چیان لە دڵ و دەروون دایە دەربڕن و ئەوە هەڵبژێرن کە دەیانەوێ، زۆر کەس گوتیان «دەمانەوێ دەربچین، هیچ شتێک نییە ناوی شێوەیەکی نوێی مرۆڤی روسی بێ. ئەمە بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری ئیمپریالیستە، ئێمە سەر بەو ئیمپراتۆریایە نین».

**گۆرباچۆف** جڵەوی لەباریەک هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەتی بەرهەڵدا کرد. ئەو لەباریەک هەڵوەشانەوەیە دوای شکستی «کودەتای بازەکان» لە ئۆگستوسی ١٩٩١ زێتر روون بووەوە. لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا ئەو شتەی ناوی یەکێتی سۆڤیەت بوو، لەئارادا نەما!

سیاسەتی هەندەرانی گۆرباچۆف کەنێوی نا «بیرکردنەوەی نوێ» هاوبەشی لەبەکۆتا هێنانی شەڕی ساردا کرد. ئەوسیاسەتە دوو رەگەزی زۆر گرنگی هەبوو: یەکێکیان پرەنسیپی ئاسایشی هاوبەش بوو، کە بەپێی ئەو پرەنسیپە توانرا لە قەفەزی کێشەی ئاسایشی کلاسیکی- کۆن- دەربازی ببێ، ئەویش بەبەشداری کردنی لایەنەکان لەدابین کردنی ئاسایشدا. گۆرباچۆف و ئەوانەی لەدەوروبەری ئەو بوون. پێیان وابوو، کە جیهانێک بەوراِدەیە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەی تێدابێ، ئاسایش تیایدا دەبێتە یاری هاوکاری کردن و لە رێگای هاریکاری کردنەوە هەموو لایەک سوود وەردەگرن، هەبوونی هەڕەشەی ئەتۆمی، واتا بەفەتارەت چوونی هەمووان. ئەگەر پێشبڕکێیەکە لە سنووری کۆنترۆل کردن دەرچوو، لە جیاتی ئەوەی هەوڵ بدرێ گەورەترین بڕی چەکی ئەتۆمی دروست بکرێ، گۆرباچۆف پرەنسیپی (کیفایەتی) راگەیاند، بەمەش کەمترین ژمارەی چەکی ئەتۆمی هێشتەوە کە بەس بێ بۆ بەرگری کردن. پاشان سیاسەتی هەندەرانی گۆرباچۆف رەهەندێکی تری هەبوو، ئەویش رای گۆرباچۆفە کەوا فراوانخوازی لەڕووی ئاکامەوە خەرجی زۆرتری تێدەچێ لەوەی سوودمەندبێ. واتەو سەربازی لە بن باری گرانترە کۆنترۆل کردنی سۆڤیەتی بۆ

ئیمپراتۆریای رۆژهەڵاتی ئەوروپا تێچوونی یەکجار گەورەیەو بەرهەمەکەی کەمە. پەلاماردانی ئەفغانستان کارەساتێکی گران بەهابوو. پێویست بەوە نەما کە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کۆمۆنیستی وەک ئامرازێک بسەپێنرێ بۆ پاراستنی ئاسایشی سنوورەکانی سۆڤیەتی.

بەم چەشنە بەهاتنی هاوینی ١٩٩١، خەڵکی ئەوروپای رۆژهەڵات برێکی گەورەتریان لە ئازادی پێ بەخشرا. هەنگاریا (مەجەر)، رێگای بە ئەڵمانەکانی رۆژهەڵات دا کە بەناو خاکی ئەودا بچنە نەمسا. ئەم کۆڕەوە فشارێکی توندی لەسەر حکومەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات هەبوو. حکومەتەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات، چیتر توانای ئەوەیان نەما «هەکە پاڵپشتیی سۆڤیەتی نەما» خۆنیشاندانەکان بپلیشێننەوە. لە تشرینی دووەمدا «دیواری بەرلین» رووخا، ئەمە ترۆپکی بەرز بوونەوەی ئەو رووداوانە بوو کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بە دوای یەکداهاتن.

دەشێ وای لێک بدەینەوە کەئەم رووداوانە لە ئەنجامی خراو حسێو کردنەکانی گۆرباچۆف هاتەئاراوە. **گۆرباچۆف** گومانی وابوو کە کۆمۆنیزم دەتوانرێ چاک بکرێتەوە. وەلێ لە کاتی هەوڵی چاککردنەوەیدا کونێکی بچووکی تیاکرد. وەکو کونی دیواری یەکێک لە بەنداوەکان. هەرکە ئاوە پەنگ خواردووەکە هورژمی زێتر بوو، ئەوا کونەکە بەخێراییەکی زۆر گەورە دەست بەفراوان بوون دەکا تاپاشان هەموو بەنداوەکە دادەدرِێ.

ئەمانە هەمووی وەڵامی ئەو پرسیارە نادەنەوە، بۆچی ساڵی ١٩٨٩؟ بۆچی لە رۆژگاری ئەو سەرۆکەدا؟ ئایا **گۆرباچۆف** تارِادەیەک رێکەوت بوو لە مێژوودا. لەسەرەتای هەشتاکاندا سێ پێشەوای دێرینی سۆڤیەت، بەخێرایی و یەک لە دوای یەک مردن. پێش ساڵی ١٩٨٥ دەرفەتی هاتنە پێشەوە بۆ نەوەی تەمەن بچووکتر نەرِەخسا، واتە بۆ ئەوانەی کە لە ژێر سەرکردایەتی خرۆچۆف کاریان دەکرد و بەناوی «نەوەی ١٩٥٦» دەناسران. وەلێ ئەگەر ئەندامێکی تری بیروی سیاسی حزبی کۆمۆنیست بوایە، جگە لە گۆرباچۆف، واتە لە رکابەرە توندرِەوەکانی لەوانە بوو یەکێتی سۆڤیەتی داتەپیو دە ساڵی تر تەمەنی درێژ ببوایەوەو بەم چەشنە خێراییە دانەرِمابوایە. راڤەکردنێکی زۆر بۆ مەسەلەی کات دانانەوە لە کەسایەتی **گۆرباچۆفدا** هەیە، هۆیە راستەوخۆکان، کەوا **کینان و کینیدی** بەیەکەوە لەسەری رێکدەکەون.

دوو هۆیە راستەوخۆبە گرنگەکە ئەمانەن: بیری لیبرالیزم و داتەپیوی ئیمپریالیی. بیروباوەرِی لیبرالیزم کە داوای کرانەوەو دیموکراسییەت و بیرکردنەوەی نوێی دەکرد،

ئەوەی کە **گۆرباچۆف** بانگەشەی بۆ دەکرد، بیروباوەڕێکی ڕۆژئاوایی بوو و ئەوەی ۱۹۵٦ پەسندی کردبوو. گەشەسەندنی گەیاندن لە نێوان دەوڵەتەکاندا یارمەتی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی لیبرالیزمی دا. خەڵک بەچاوی خۆیان ئەو سەرکەوتنە ئابورییەی ڕۆژئاوایان بینی. ئەمە هێزی کاریگەرییەکەی زێتر کرد، پاشان پیربوون و پەککەوتنی ئیمپریالیی لە ئارادابوو. بودجەی بارگرانی دیفاع، وای لێهات کار لە ڕووەکانی تری کۆمەڵگای سۆڤیەتی بکا. لە ساڵی ۱۹۸٤دا **مارشاڵ ئۆگاروف**، سەرۆکی ئەرکانی سۆڤیەتی دەرکی بەوەکرد کەوا وڵاتەکەی پێویستی بەبنکەیەکی ئابوری مەدەنی باشتر هەیەو پێویستە زێتر بگاتە بازرگانی و تەکنۆلۆژیای ڕۆژئاوایی. وەلێ سەرکردە کۆنەپارتیزەکان گوێیان بۆ **ئۆگاروف** ڕانەدێراو لایاندا.

لەمەوە ڕادەی گرنگی هەردوو هۆیە ڕاستەوخۆکەمان بۆ بەدیاردەکەوێ: بیروباوەڕی لیبرالیزم و پیری و پەککەوتەیی ئیمپریالیی. وەلێ لە کۆتاییدا ئێمە تەنیا ئەوەمان لەدەستە کەمامەڵە لەگەڵ دوو هۆیە قوڵەکەدا بکەین: داڕمانی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم و شکست هێنانی ئابوری سۆڤیەتی: کاتێ کۆمۆنیزم لە ماوەی دوای جەنگدا، شەرعییەتی خۆی لەدەست دا شتێکی سەرسوڕهێن بوو، لە قۆناغی یەکەمی ئەو ماوەیەدا، واتە ڕاستەوخۆ دوای ساڵی ۱۹٤٥، کۆمۆنیزم بەشێوەیەکی فراوان پێشوازی لێکرا. زۆر لە کۆمۆنیستەکان لەئەوروپا لەریزی پێشەوەی بەرەنگاریی فاشیزمدا بوون. زۆرکەس بڕوای وابوو کە کۆمۆنیزم دواڕۆژ دیاری دەکا. یەکێتی سۆڤیەتی بەهۆی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزمەوە بەئاسانی بڕێکی گەورەی لە هێز وەدەست هێنا، وەلێ ئەو هێزە تاڕادەیەک لە هەڵمەت بردنە سەر **ستالین** لە ساڵی ۱۹۵٦دا توایەوە. کە پەچە لە ڕووی تاوان و و کردارە سەرکوتکەرەکانی هەڵدرایەوە لەهەنگاریا (ساڵی ۱۹۵٦)و لە چیکوسلوڤاکیی (ساڵی ۱۹٦٨)و لە پۆڵەندا ساڵی (۱۹۸۱). هاوکات زێتر بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی لیبرالیزم. لە پاڵ ئەمەشدا داڕمانی ئابوری سۆڤیەتی. بەمەش کەم توانایی پلاندانی نێوەندی سۆڤیەتی ئاشکرابوو لە وەرامدانەوەی گۆڕانکارییە ئابورییەکان لەجیهاندا.

ستالین سیستەمێکی ئابوری نێوەندی دروست کردبوو، کە لە سەر کانزای قورس و کارخانەی بە دوکەڵ وەستابوو. ئابورییەکی وشک هەڵاتوو، مەبەست تیایدا بەسەریەکەوەنانی هێزی کرێکار بوو، نەک گوێزرانەوە بۆ ئاستی پیشەسازییەک، کە پێداویستییە لە زێدەبووەکان بێنێتەدی.

«**جوزیف شومیتر- سکمیتر**»ی ئابوریزان، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە

سەرمایەداری تێکدەرێکی ئەفرێنەرە. سەرمایەداری، شێوە وەڵامدانەیەکی نەرمە بۆ شەپۆڵی گۆڕانکارییە گەورەکانی تەکنۆلۆژیا. گۆڕانکاری گەورەی تەکنۆلۆژیاش لە شۆڕشی پیشەسازی سێیەمدا، لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا، فراژی بوونی رۆڵی راگەیاندنە- بزاڤی زانیارییەکان- بەو پێیەی کەدانسقەترین سەرچاوەیە لەهەر ئابوریەکدا. سیستەمی سۆڤیەتی لە وەبەرهێنانی بواری راگەیاندن و زانیارییەکان دووربوو، چونکە سروشتی سیستەمە سیاسییەکەی، کە زۆر شاراوەو نهێنی بوو، ئەوەی دەگەیاند کە بزاڤی زانیارییەکان هەردەبێ پەرش و بڵاو و لەسەرەخۆ بێت.

بەرهەمەکانی سۆڤیەتی نەیانتوانی بگەنە ئاستی خواستی جیهانی. ئابوری جیهان لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا دوچاری شڵەژانێکی گەورە بوو، وەلێ ئابوری رۆژئاوا توانی بواری خۆی بۆ بەجێ هێنانی خزمەتگوزارییەکان بگوازێتەوە، پیشەسازییەکانی خۆی سەر لەنوێ رێکبخاتەوەو بۆ بەکارهێنانی کۆمپیوتەر وەرچەرخێ. هەرچی یەکێتی سۆڤیەت بوو، ئەوا نەیتوانی لەگەڵ وەرچەرخانی تەکنۆلۆژی، گەیاندنەکان، راگەیاندن و زانیارییەکاندا... هتد بڕوا بەرێوە. بۆ نموونە کاتێک ساڵی ١٩٨٥ گۆرباچۆف دەسەڵاتی کەوتە دەست، لە یەکێتی سۆڤیەت (٥٠٠٠٠) ئامێری کۆمپیوتەری تایبەت هەبوو، لە کاتێکدا وڵاتە یەکگرتووەکان «٣٠» ملیۆن ئامێری کۆمپیوتەری هەبوو، دوای چوار ساڵ، یەکێتی سۆڤیەت (٤٠٠٠٠٠) ئامێری کۆمپیوتەری هەبوو، ئەمریکا (٤٠) ملیۆن. زانینی جووڵانەوەی بازاڕەکان و سیاسەتەکانی دیموکراسی، ئەوەیان چەسپاند کە زۆر نەرمترن لە وەڵامدانەوەی گۆڕانکارییە تەکنۆلۆژییەکان، لە سیستەمی نێوەندی سۆڤیەتی، کە ستالین لە سییەکاندا بۆ ماوەی پیشەسازییە دووکەڵدارەکانی دانا. یەکێک لە ئابوریزانە سۆڤیەتییەکان دەڵێت لە کۆتایی هەشتاکاندا تەنیا لەسەدا هەشتی کۆی پیشەسازییەکانی سۆڤیەت، دەیانتوانی بچنە نێو رکابەرایەتی لە بازاڕی جیهانیدا، کەواتە زەحمەتە دەوڵەتێکی گەورە بتوانێ پایەی خۆی بپارێزێ، لە کاتێکدا ٩٢٪ی پیشەسازییەکانی لە ئاستێکی نزم دابێت.

کۆتایی هاتنی شەڕی سارد لە جولە هەرە مەزنەکانی سەدەی بیستەم و هاوتای جەنگی جیهانی دووەم بوو، لە رووی کاریگەری بۆ سەر بونیاتی سیستەمی دەولییەوە، وەلێ بەبێ کوشتار روویدا، ئەمە بەگوێرەی سیاسەتی دەولی لە دوارۆژدا چی دەگەیەنێ؟.

شەڕی سارد لە ساڵی ١٩٨٩دا بە کۆتا هات. وەلێ هەندێک لە زانایان، وەکو

«**جون میرز هایمر**» ، پێیان وایە ئاشتیی ئەوروپایی، وەک ئەوەی زۆربەی چاودێرەکان لە کاتی ئێستادا گریمانی بۆ دەکەن، زۆر درێژە ناکێشێ. دەشێ روسیا هاوسێیە ئەوروپاییە رۆژهەڵاتییەکانی داگیر نەکاتەوە، بەڵام لەوانەیە رێچکەی نەتەوەخوازی روسی، بەسەر بێ هێزیی دیموکراسییەتی رۆژئاوا زاڵ بێ و ببێتە سۆنگەی نوێکردنەوەی گیانی فراوانخوازی لە دوا رۆژدا.

هەر ماوەیەک بەسەر هەڵچوونی نێوخۆیی لە روسیادا تێبپەڕێ، ئیدی روسیا چاو دەبڕێتە دەریای باڵتیک و ئۆکرانیاو ئەوروپای رۆژهەڵات. جا ئەگەر ئەمە وادەرچوو، ئەوا ساڵی ١٩٨٩ ، تەنیا ئاگر بەستێکی کاتی دەبێ، لە نێوەڕاست زریانێکی درێژ خایەن. ئەو سیناریۆیە هەر چەند دوورە ئەگەر بێت، بەڵام توێژینەوەیەکی لە سەرەخۆی سیاسەتی دەولی دەمانگەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو ئەگەرە بەتەواوی، دوور نییە.

دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت وەرچەرخانێکی گەورە لە روسیا روویدا. دوای ئابوری نەخشە بۆ کێشراوی دەوڵەتی سۆڤیەت، روسیای دوای شەڕی سارد پشتی بەبەرنامەیەکی بوێرانە بەست لە رێگای دیموکراسی و رزگار کردنی ئابوریدا، کەچی رێگاکە پڕ مەترسی بوو.

لەسەر ئامۆژگاری بانکی دەولی، حکومەتی سۆڤیەتی پشتی بە ئابوری «چارەسەری کردن بە شۆک» بەست وەک رێگایەک بۆ گوێزانەوە لە ئابورییەکی ئۆتوکراتی، بۆ دیموکراسی- لیبرالیزم- ئازاد، وەلێ چارەسەرکردنی بەشۆک، کۆمەڵگای تا ئەو رادەیە شڵەژاند کەوای لە حکومەت کرد دەست پێشخەری بکا لەلادانی و چارەسەری وردە وردە بەچاکتر بزانێ.

لەگەڵ تێکچوونی باری ئابوری روسیا ، رێچکەی نەتەوایەتی روسی ژینگەیەکی لەباری بۆ چالاکی نواندن دۆزیەوە. تیۆرڤانەکان، نموونەی «**مایکل دویل**» ، ئەوانەی پێیان وایە دیموکراسیخوازە لیبرالیستەکان لەگەڵ یەکترا شەڕناکەن، گەیشتنە ئەوەی کە روسیا بۆ ئەوەی لە گوێزانەوە بۆ دیموکراسییەت سەرکەوتن وەدەست بێنێ، پێویستە داوای ئاشتی دەولی بکا ، هەردەبێ کاتێکیشی بەسەردا تێپەڕێت، بەر لەوەی بتوانین رادەی وەڵام دانەوەی سیاسەتی هەندەرانی سۆڤیەتی ببینین، بۆ مەرجەکانی ئاشتییەکی دیموکراتی. یاخود سەرهەڵدانەوەی چریکەی نەتەوایەتی روسی، کە بەگژ وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەوروپای رۆژئاوا دا بچێتەوە.

بەچاوپۆشین لەوەی کە دوارۆژ چی حەشاردراوە، لێرەدا تەلیسمێکی گەورە دەمێنێ،

بۆچی شەڕی سارد ئەو هەموو ماوە درێژە بەردەوام بوو، بەبێ ئەوەی شەڕێک بەکردەوە لە نێو هەردوو دەوڵەتە مەزنەکەدا بەرپابێ. بۆچی پێشتر نەبووە جەنگێکی جیهانیی سێیەم؟

## رۆڵی چەکی ئەتۆمی

بۆچی شەڕی سارد نەبووە شەڕێکی کردەنی؟ هەندێ لە شرۆڤەوانان لەو بڕوایەدان کە کۆمەڵگا گەشەسەندووە پێشکەوتووەکان، وانە لە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم فێربوون و پەندیان لێ وەرگرتن. هەندێکی تر پێیان وایە، کەماوەی «ئاشتیی دوورودرێژ»» لە نیوەی دووهەمی بیستەم سەدەی بیستەم هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئامانجی فراوانخوازی دەوڵەتە گەورەکان سنووردار بوو، کەچی تاقمی سێیەم ئەو ئاشتییە بۆ سروشتی ئەو سەقامگیرییە دەگەڕێننەوە، کەوا سیستەمی دووجەمسەری بەخۆوەی گرتبوو، کە دوو دەوڵەتی گەورە (نەک دوو هاوپەیمانی توندڕەو) کۆنترۆڵیان کردووە. وەلێ زۆربەی شرۆڤەوانەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە گەورەترین بڕی وەرامەکە لە سروشتی تایبەتی چەکی ئەتۆمی و سەنگراندنەوەی ئەتۆمیدا خۆی دەنوێنێ.

## فیزیاو سیاسەت

وزەی فرە تێکدەرانەی چەکی ئەتۆمی، لە هێنانە بەرچاو و ئەندێشە رەت دەکا. تەقینەوەی یەک میگاتۆنی ئەتۆمی، دەشێ پلەیەکی گەرما دروست بکا کە بگاتە سەد ملیۆن پلەی سەدی - واتە چوار، یاخود پێنج هێندەی گەرمایی لە نێوەندی خۆردا. ئەو بۆمبەی لە ساڵی ١٩٤٥دا بە هیرۆشیما دادرا، بە شێوەیەکی رێژەیی بچووک بوو. واتە هێندەی تەقینەوەی (١٥٠٠٠) تۆن TNT بوو، ئەمرۆ رۆکێتەکان دەتوانن هێزێکی تەقینەوەی وا هەڵگرن، کە سێ هێندەی بۆمباکەی هیرۆشیما بێت. لە راستیدا هەموو ئەو تەقینەوانەی لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەکارهاتن، بەسە بۆ ئەوەی یەک بۆمبی ئەتۆمی پێ پڕبکرێتەوە، کە سەنگەکەی (٣) میگاتۆن بێ، ئەو بۆمبەش لەسەر یەکێک لە رۆکێتە کیشوەربڕەکان بەند کرابێ. لە هەشتاکاندا یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکان زێتر لە پەنجا هەزار سەر ئەتۆمیان هەبوو.

تەقینەوەکانی ئەتۆمی هەندێک باندۆری فیزیاویان هەیە کە تا ئێستا پشت راست نەکراوەتەوە، بۆ نموونە تیۆری «زستانی ئەتۆمی» ئەوە دەگەیەنێ کەوا شەڕی ئەتۆمی دەبێتە سۆنگەی کاربۆن و تۆزێکی زۆر لە هەوادا کە ئەمەش هەندێک گژوگیا لە

پرۆسەی پێکهاتەی رووناکی بێ بەش دەکا، واتە کۆتایی ژیان بەو شێوەیەی کە ئێمە دەیزانین. یەکێک لە تۆژینەوەکانی ئەکادیمیای زانستە نیشتمانییەکانی ئەمریکا باسی ئەوەی کردووە کەوا زستانی ئەتۆمی لەوانەیە هەبێ، وەلێ مسۆگەر نییە! لایەنێکی زۆر لە دەرئەنجامەکان پشت بە رووگەی چەکە ئەتۆمییەکە دەبەستێ - واتە لە بەرامبەردا شاری ئەتۆمی، یاخود چەکی ئەتۆمی هەیە - سووتانی شارەکان دەبێتە سۆنگەی بەرزبوونەوەی دووکەڵێکی زۆر کە رێژەیەکی زۆر کاربۆنی تێدایەو بەری خۆر دەگرێ، وەلێ کەس بە وردی نازانێ کەوا دووکەڵەکە چەند لە فەزای سەری سەرەوە بە بلاوی دەمێنێتەوە. یاخود ئەگەر بۆمبەکە لە نیوەگۆی باکووردا تەقییەوە ئایا دووکەڵەکەی دەچێتە نیوەگۆی باشوورەوە؟ هەندێک لە رەشبینەکان دەڵێن دەرئەنجامی خراوتر، لە «زستانە ئەتۆمی»دا نییە، بەڵکو لە «پایزە ئەتۆمی»دایە! ئەمەش دڵدانەوەیەکی بێهودەیە. ئەوەی مسۆگەرە کەوا جەنگێکی ئەتۆمی بەرفراوان بەلایەنی کەمەوە شارستانیەتی نیوەگۆی باکوور وێران دەکا. دەشێ قەشە کاثۆلیکە ئەمریکاییەکان زێدەڕۆییان کردبێ، کاتێک لە راپۆرتەکەی خۆیان لەساڵی ١٩٨٣دا گوتیان: «لە سەردەمی ئەفراندنەوە (تكوين)، ئێمە یەکەمین نەوەین کە توانای خاپوورکردنی گوراندەی (مخلوقات)ی خوامان هەیە[٧]».

چەگی ئەتۆمی گۆڕانکاری لە سروشتی جەنگ هێنایە کایەوە. وەلێ رێگای بنەڕەتی رێکخستنی جیهانی نەگۆڕی. جیهانی دەوڵەتە گێرەشێوێنەکان و لە ئارادا نەبوونی حکومەتە بالاکان، بەردەوام بوون لە مانەوە، لە چاخی ئەتۆمیدا. ئەو رۆژەی ولاتەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٦دا پێشنیاری «پرۆژەی باروخ»ی کرد، بۆ دانانی چاودێرییەکی دەولی بۆ چەکی ئەتۆمی، یەکێتی سۆڤیەت ئەو پرۆژەی بەتەنیا پیلانێک و داودانانەوەیەکی تری ئەمریکی دانا.

دوای ئەو شکستە **ئەلبرت ئەنشتاین** زۆر بە خەمباری و نیگەرانییەوە گوتی: «هەموو شتێک گۆڕا تەنیا بیرکردنەوەی ئێمە نەبێ» وەک ئەوەی گەرەکی بووبێ بڵێ فیزیا لە سیاسەت ئاسانترە!

پاشان هۆی سەربازی و سیاسی لە پەنای ئەوەوە بوون کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، بەکارنەهێنا چەکی ئەتۆمی باندۆرێکی زێتری نەبێ. یەکێک لە هۆیەکان

---

٧- تحدي السلام: وعدالله واستجابتنا، بيان «المؤتمر الكاثوليكي في الولايات المتحدة» مجلة نشره الأصول، المجلد ١٣، العدد الاول، ١٩ آيار ١٩٨٣، ص١.

ئەوەبوو کەوا یەکەم چەکی ئەتۆمی زیانێکی وای نەهێنایە کایەوە کە زۆر گەورەتربێت لەو زیانەی کـە هەمـوو چەکـە تەقلیـدییـەکـان، لە توندترین بەکـارهێنانە خاپوورکارییەکانیان لێیان کەوتەوە. بۆردوومان کردنی بە ئاگر، کە شاری دریسدن لە ئەڵەمانیا دوچاری هات هێندە مرۆڤی کوشت کە زۆر زیاتر بوو لەوەی بۆمبی ئەتۆمی لە هیرۆشیما کردی. راستە یەک چەکی ئەتۆمی، کاری هێرشێکی ئاسمانی بەرفراوانی چەکی تەقلیـدی دەکـرد. کـەچی وڵاتەیەکگرتووەکـان ئەو رۆژانە زۆر چەکی ئەتۆمی نەبوو. لە ساڵی ١٩٤٧دا تەنیا دوو بۆمبی هەبوو، لە ساڵی ١٩٥٨دا، (٥٠) بۆمب. لەبەر ئەوە زۆر لە پسـپۆڕەکـانی پلانداناني سـەربازی وا هەسـتیـان دەکرد کـە بۆمـبی ئەتۆمی زۆر جـیـاواز نییـە لە چەکی تەقلیدی، بەڵکو تەنیـا فراوان کردنێکی شـەڕی تەقلیدییە.

سەرهەڵدانی رکابەرایەتی ئەمریکی - سۆڤیـەتی هۆکـارێکی تر بوو کـە گـۆڕان لەبیـرکـردنەوەی سیـاسی هێـوربکاتەوە، سـۆڤـیـەتییـەکـان بەهاتنە ئارای نەتەوە یەکگرتووەکـان شلەژان و بەوە تاوانبـاریان کـرد کـە پشت بە وڵاتەیەکگرتووەکـان دەبەستێ. ئەمریکاییەکان نەیانتوانی سۆڤیەت ناچاری هاریکاری کردن بکەن. چونکە ئەوروپا لە نێوان هەردووکیاندا بارمتە بوو.

ئەگەر وڵاتەیەکگرتووەکان بە پەلاماردانێکی ئەتۆمی گەفیـان لە سۆڤیـەتییـەکان بکردایە، ئەوا ئەوان بە چەکی تەقلیـدی گـەفـیـان لە ئەوروپا دەکـرد ئەنجـامـەکـەشی حاڵەتێکی وەستان بوو بەبێ پێشەوەچوون، یاخود گەڕانە دواوە. لە سەرەتادا باندۆری فـیـزیایی شـۆڕشگێـڕی، کـە لەگـەڵ تەکنۆلۆژیای ئەتۆمـیـدا هاتە ئاراوە بەس نەبوو بۆ ئەوەی وا لە دەوڵەتان بکا، کە رێگای رەفـتارەکـانی خۆیان لە سایەی سیستەمێکی گێرەشێوێنیدا بگۆڕن.

قۆناغی دووەم لە شۆڕشی ئەتۆمی ئەو رۆژە روویدا کە یەکەم بۆمبی هایدرۆجینی لە سـاڵی ١٩٥٢ تەقـێنرایەوە. بۆمـبی هایدرۆجـینی پشت بە وزەی تەقـاندنەوە دەبەستێ، ناوکەکان لە ناوەوەی بۆمبەکە بەیەکەوە دەلکێنرێن، لەجیاتی ئەوەی پەرش بکرێنەوە. وەک لە بۆمـبی پەرش و بڵاوبووی پێـشـتـر هەبوو. ئەو بۆمـبـە قـەبارەی خاپوورکردنی زێترە لەوەی کە یەک بۆمب دەیهێنایە ئاراوە.

لە سـاڵی ١٩٦١دا گـەورەترین تەقـینەوە لەسـەر رووی زەوی روویدا، کـاتێک سۆڤیـەتییـەکان بۆمبێکی ئەتۆمـیان بە هێزی ٣٠ مـیگاتۆن تەقاندەوە، واتە بیـست هێندەی هەموو ئەوانەی لە جەنگی جیهانی دووەمدا تەقێنرانەوە.

ئەوەی جێگای داخە، گەورەترین گۆڕانکاری کە لەگەڵ بۆمبی هایدرۆجینیدا هاتە ئارا، بچووک کردنەوەی قەبارەکەی بوو. بەیەکەوە لکاندنی ناوکەکان، وایکرد کە بتوانرێ بری زۆر گەورە لە هێزی تەقینەوە لە شوێنێکی بچووکدا هەڵبگیرێ. وای لێهات ئەو سیستەمانەی کە بۆ بەرهەمهێنانی یەکەم چەکی ئەتۆمی دامەزران، بە بەردەوامی گەورە دەبوون، مادام بۆمبەکان قەبارەیان گەورەتر دەبوو و شوێنی زۆرتریان داگیر دەکرد. فڕۆکەی (بی - ٣٦)ی زەبەلاح کە هەشت ماکینەی هەیە، شوێنێکی گەورەی تیایە جێگای یەک بۆمب دەبێتەوە. لە کاتێکدا بۆمبی هایدرۆجینی، کە هەمان هێزی تەقینەوەی هەیە، دەتوانرێ لەناو لولەیەکی بچووک دابنرێ. جا ئەگەر ئەو هێزە خاپوورکارییە گەورەیە لەسەر سەری رۆکێتێکی کیشوەربڕ دابنرێ، ئەو کاتە دەشێ لە ماوەی (٣٠) خولەکدا (ئەو ماوەیەی رۆکێتێک دەیەوێ) شەڕێکی ئەتۆمی لە نێوان کیشوەرەکاندا بەرپا ببێ. بەرامبەر ٨ کاتژمێر، کە فڕۆکەی (بی - ٣٦) پێویستیەتی بۆ برینی هەمان ماوە. هەروەها هێزی خاپوورکاری بۆمبی هایدرۆجینی مەترسی ئەو ئەنجامانەی زێتر کرد کە لە شەڕی ئەتۆمی دەکەوتنەوە، ئەگەر شەڕ بە رێگایەکی تر بە تەواوکەری سیاسەت بژمێردرێ.

فەیلەسووفی جەنگ لە سەدەی نۆزدەهەمدا «**کارل فون کلاوزە فیتز**» رای وابوو کەوا شەڕ کردارێکی سیاسییە. بۆیە شەڕی رەها تەنیا هەراو هۆریایەک بوو. وەلێ هێزی گەورەی خاپوورکاریی چەکی ئەتۆمی ئێستا ئەوە دەگەیەنێ کەوا جیاوازییەک هەیە لە نێوان ئامرازەکانی سەربازی و زۆرینەی ئامانجە سیاسییەکاندا، ئەوەی کە ولاتێک بانگەشەی بۆ دەکا. ئەو کەلێنەی لە نێوان ئامرازەکان و ئامانجەکان، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پەکی بەکارهێنانی ئەو هێزەی دوایی خست. لە ساڵی (١٩٤٥)ەوە چەکی ئەتۆمی بەکار نەهێنراوە. بۆیە سەیرکردنی چەکی ئەتۆمی وەک هێزێکی بەکارنەهاتوو، لەبەر ئەوەیە کە زۆر جیاوازەو زۆر بەهێزە.

بۆمبی هایدرۆجینی پێنج باندۆری سیاسی گرنگی هەیە. ئەگەرچی شێوازی رێکخستنی ئەنارشیستی، کە جیهان کاروباری خۆی پێوە بەرێوەدەبرد با لە ئارادا نەمابێ.

**یەکەم:** پرەنسیپی شەڕی سنووررداری ژیاندەوە. نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم وەرچەرخانێکی لە شەڕی سنووررداری سەدەی نۆزدەهەم بەخۆیەوە بینی، ئەویش دوو جەنگی جیهانی بوو کە دەیان ملیۆن کەس گیانیان لەدەستدا. لە نیوەی سەدەکەدا وای لێهات شرۆڤەوانەکان ئاماژە بۆ سەدەی بیستەم بکەن، کە «سەدەی شەڕی

بەرفراوان»ە، وەلیّ شەڕەکانی نیوەی دووهەم، هاوشیّوەی شەڕەکانی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم بوون. بۆ نموونە شەڕی کۆریا و ڤیّتنام کە هەریەکەیان زیانی (٥٥) هەزار کوژراوی لە ئەمریکاییەکان دا. لە ڤیّتنام و ئەفغانستان، ولاّتە یەکگرتووەکان و یەکیّتی سۆڤیەت دۆڕانیان پیّ باشتر بوو نەک چەکی ئەتۆمی بەکاربهیّنن.

**دووەم:** تەنگژەکان وەک گۆڕەپانیّکی زۆرانبازی جیّگای شەڕی نیّوەندیان گرتەوە. لە کاتیّکدا کە شەڕ ڕیّگایەک بوو بۆ ئاشکراکردنی هەموو کارتەکان، وەلیّ شەڕ، لە چاخی ئەتۆمیدا، زۆر خاپوورکارەو کاتژمیّری زۆرانبازییەکی کۆنی یەکجار مەترسیدارە. لە ماوەی شەڕی سارددا، تەنگژەی بەرلین و تەنگژەی ڕۆکیّتەکانی کوباو تەنگژەکانی ڕۆژهەلاّتی ناڤین لە حەفتاکاندا هاوتای شەڕ، ڕۆلیّکی وەزیفیان دیت.

**سیّیەم:** چەکی ئەتۆمی وای لە سەنگراندنەوە «ورە دابەزاندن بەهۆی چاو لیّ سوورکردنەوە» کرد کە ببیّتە ستراتیژیەتیّکی سەرەکی. ئیّستا بۆتە ئەو هۆکارە یەکلاییکەرەوانەی ئەو هیّزە ڕیّکدەخا کە پیّشتر خەنیمەکەت دەترسیّنیّ. بەمەش دەیسەنگریّنیەوە لەوەی پەلامارت بدا. ئەگەر ولاّتە یەکگرتووەکان لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا توانی ئامیّری جەنگی خۆی وردە وردە تەیار بکاو گەشەی پیّبدا، ئەوا ئەو ڕیّگای تەیارکردنە چیتر سوودی نەماوە، لە کاتیّکدا کە دایسان و بەکۆتاهاتنی شەڕی ئەتۆمی لە چەند کاتژمیّریّک تیّ ناپەڕیّ.

**چوارەم:** باندۆری سیاسی کە گەشەپیّدانی سیستەمی ئاگادارکردنەوەی دەولّەتە گەورەکان بوو. هەردوو دەولّەتە مەزنەکە یەک بەرژەوەندی هاوبەشیان پەرەپیّدا، ئەویش خۆلادان بوو لە شەڕی ئەتۆمی. سەرباری هەموو جیاوازییەکی تالّی ئایدیۆلۆژی لە نیّوانیاندا. لە ماوەی شەڕی سارد، ولاّتەیەکگرتووەکان و یەکیّتی سۆڤیەت لە جیاتی لایەنی دیکە، یاخود بە شیّوەیەکی ناڕاستەوخۆ، تیّکەلّ بە جەنگی نیّوان لایەنەکان بوون. وەلیّ هەردوو دەولّەت هەرگیز خۆیان نەخستە نیّو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی چەکداری ڕاستەوخۆوە.

لەپالّ ئەمەشدا هەردوو دەولّەت ناوچەی نفوزی تایبەت بەخۆیان پەرەپیّدا. ولاّتەیەکگرتووەکان بە خیّرایی بە هانای هەنگارییەکان نەهات، کاتیّک دژی فەرمانڕەوا سۆڤیەتییەکان لە سالّی ١٩٥٦دا ڕاپەڕین. لە ترسی ئەوەی نەوەک ببیّتە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئەتۆمی. سەرباری ئەوەی ئەمریکاییەکان وایان ڕادەگەیاند کە ئەوان لە ڕۆژهەلاّتی ئەوروپا وا لە کۆمۆنیزم دەکەن پاشەکشە بکا. سۆڤیەتییەکان هەمان شتیان لە ڕووی ئاگادارییەوە، لە نیوەگۆی ڕۆژئاواوە کردەوە، بەتەنیا لە کوبا

نەبێ. هەردوولا بە پێشخستنی جۆرە نەریتێک پابەند بوون، کە داوای بەکارنەهێنانی چەکی ئەتۆمی دەکرد. لە کۆتاییدا هەردوو دەوڵەتە مەزنەکە فێری ئەوە بوون کەوا تەماس لە نێوانیاندا دابمەزرێنن. دوابەدوای تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا، هەردوو دەوڵەت هێڵێکی تەلەفۆنی (گەرمیان) لە نێوانِ خۆیاندا دامەزراند، تا بە خێرایی سەرۆکی سۆڤیەتی و ئەمریکی پێوەندی بەیەکەوە بکەن، هەروەها ژمارەیەک لە پەیماننامەی چاودێریکردنی چەکیان مۆرکرد. لەوانە پەیماننامەی دانانی رادەیەک بۆ تاقیکردنەوەی ئەتۆمی لە ساڵی ١٩٦٣. لە سەرەتادا دانوستان لەسەر چاودێریکردنی بەرهەمهێنانی چەک بووە ئامرازێک بۆ لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکانی سەقامگیربوونی سیستەمی چەکی ئەتۆمی.

**پێنجەم:** زۆربەی لێپرسراوەکان وا سەیری چەکی ئەتۆمی بە گشتی و هایدرۆجینی بەتایبەتی دەکەن، کە ناشێ لە رۆژانی شەڕدا بەکاربهێنرێ. چیتر مەسەلەکە وەک ئەو مەسەلەیە نەمایەوە کە بۆمبی هایدرۆجینی چ هێزێکیماڵوێرانکەری بەدواوەیە، بەڵکو چەکی ئەتۆمی حاڵەتێکی هەست کردن بە گوناهی لەگەڵ داهات، کە چەکی تەقلیدی ئەو هەستەی بەخۆیەوە نەبینیبوو.

لە راستیدا ئەندازیار و زاناکان، لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی رابردوودا، توانیان بارگەکانی چەکی ئەتۆمی کەم بکەنەوە، بەشێوەیەک کە رێگای بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان کردەوە هەندێک لەو چەکە لە ڤێتنام یاخود کەنداو یان دژی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەفغانستان بەکاربهێنێ، بەبێ ئەوەی زیانێکی وای لێ بکەوێتەوە کە چەکی هایدرۆجینی دەیگەیاند. لەگەڵ ئەوەش ئەمریکی و روسەکان وەکو یەک خۆیان دوور گرت لە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی کەم بارگەو ئامرازی خاپوورکاری تریان، بەکارهێنانی چەکی وەکو ناپاڵم و بۆمبی سووتێنەرو چەکی تەقلیدی تریان بە باشتر زانی.

مەبەستیش لەو بەکارنەهێنانە، لە لایەکەوە، ترسان بوو لەوەی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی کەم بارگە، هەتاوەکو ئەگەر بەرادەی هێزیی چەکی تەقلیدیش بێ، دەرگا لە بەردەم بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکی ئەتۆمی بکاتەوە ئەو سەرەڕۆییەش ناتوانرێ قبووڵ بکرێ. لەگەڵ ئەمەشدا رەهەندێکی تریش هەبوو. لەوکاتەی بۆمبی ئەتۆمی ئەمریکی بە هیرۆشیما دادرا، خەڵک ئەو هەستەی لا پەیدا ببوو کە چەکی ئەتۆمی شتێکی بێ رەوشتانەیەو، ئەو سنوورەی بەزاند کە شەڕ قبووڵی دەکا. ئەگەرچی ئاستەنگ بوو ئەو وەستێنەرە ئاکارییە بپێورێ. وەلێ روونە کەوا هاندەرێک بوو بۆ

تاوتویّ کردن لەمەڕ چەکی ئەتۆمی، هاوکات یەکێک بوو لەو هۆیانەی کە دەوڵەتانی لە بەکارهێنانی ئەو چەکە دووزخستەوە.

### چەکی ئەتۆمی و شەڕی ڤیتنام

*کاتێک سەرۆک کینیدی، لە ۱۹٦۲-۱۹٦۳دا بڕیاریدا بوونی سەربازی ئەمریکی بە رادەیەکی گەورە پەرەپێبدا، بیری لە دوو مەسەلە دەکردەوە: چی روویدەدا ئەگەر خرۆچۆف دەربارەی تەنگژەی بەرلین ساڵی ۱۹٦۱-۱۹٦۲ باوەڕی پێ نەکردبووایە؟ هەروەها چی دەبوو ئەگەر خرۆچۆف لە تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا (ساڵی ۱۹٦۲) باوەڕی پێ نەکردبووایە؟ وا گومان دەبەم ئێمە لەو دەرئەنجامەدا هەڵەبووین کەوا چینییەکان لە پەنجاکاندا تێکەڵ بە جەنگی کۆریا نەدەبوون، ئەگەرچی ئەمە کاری لە بڕیاری ئەمریکی کرد کە پەلاماری ڤێتنامی باکوور نەدا. لەشکرییان بڕیاریاندا کە چین ناچێتە نێو جەنگەوە. ئەگەر واشی کرد ئەمە دەبێتە سۆنگەی جەنگ(٨).*

***دین رسک، وەزیری هەندەرانی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا***

## تەرازووی تیرۆر یاخود تەرازووی تۆقاندن

چەکی ئەتۆمی شێوەیەکی سەیری لە تەرازووی هێزەکان گوراند، کە هەندێک جار (تەرازووی تیرۆر)یشی پێ دەگوترێ. ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی دەروونیانەی هێز بوو زێتر لەوەی ماددیانە بێت. هەردوولایان ئەو سیاسەتەیان گرتەبەر کە هیچ کامێکیان بە پێش ئەوەی تر نەکەوێ. وەلێ ئەنجامەکەی جیاواز بوو لە سیستەمی هاوسەنگیی پێشان. لەبەر ئەوەی تەرازووی شەڕی سارد، بە پێچەوانەی سیستەمی تەرازووی هێزەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بوونی پێنج دەوڵەتی گەورە، کە بەردەوام هاوپەیمانێتی خۆیان دەگۆڕی، بە روونی لە دەوری دوو دەوڵەتی گەورە کۆببوونەوە، کە هەریەکەیان دەیتوانی لە چرکەیەکدا ئەوەی تر خاپوور بکا.

ئەو ئەژوارییانەی کێشەی ئاسایشی کلاسیکی دەیانوروژێنێ، بە تیرۆری چەکی ئەتۆمی بەکۆتا نەهاتن، وەلێ دەوڵەتە گەورەکان، سەرباری جیاوازی ئایدیۆلۆژییان، بە

---

٨- وزير الخارجية، ديك رسك، صحيفة نيويورك تايمز، ٣٠ نيسان (ابريل) ١٩٨٣، ص٦.

ئاگادارییەوە رەفتاریان کرد. ئاگاداربوونەوەکەیان بە باندۆری گەیاندنە بەردەوامەکان دەچوو، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا، رۆڵی خۆی لە پاریزگاری کردنی تەرازووی هێزەکانی فرەجەمسەریدا هەبوو. هاوکات دەوڵەتە گەورەکان هەوڵیاندا، هاوسەنگیی هێزەکان حسێو بکەن، وەک چۆن لە رابردوودا سەرکردەکان لە حسێوەکانی خۆیاندا، بەراوردیان لە نێوان تۆپ و سوپاو هەرێمەکاندا دەکرد.

تەرازووی تیرۆر هاوکات بوو لەگەڵ ماوەی سیستەمی دووجەمسەریدا، هەندێک لە زانایانی سیاسەت، وەکو «**کینیث والتر**» دووجەمسەری بەوە پێناسە دەکەن، کە ئەو حاڵەتانەیە کەوا دوو دەوڵەت نزیکەی هەموو هێزێکیان لە بندەستدایە.

وەلێ ئەو جۆرە دووجەمسەرییە پوختە، شتێکی دانسقەیە، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دووجەمسەری لە مێژوودا لە کاتێکدا روودەدا کە هاوپەیمانەکان نەرمی خۆیان لەدەست دەدەن و رەقەکار دەبن، وەک ئەوەی لە شەڕی پیلوپونیزی روویدا. ئەو دەوڵەتە شارانەی کەهاوپەیمانێتییان لەگەڵ سپارتاو ئەثینا گرێ دا، دەوڵەتی سەربەخۆ بوون، وەلێ هاوپەیمانێتییەکەیان بووە باڵبەندو و دواتر پتەو بوو، ئەمە گەیاندییە حاڵەتی دووجەمسەری. بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم هەمان حاڵەت روویدا. کە سیستەمی هاوپەیمانێتی پتەو بوو بۆ ئەوەی وەرچەرخێتە سیستەمی دوو جەمسەری.

**والتز** پێی وایە کە دووجەمسەری شێوەیەکی سەقامگیرە لە سیستەمی هاوسەنگیی هێزەکاندا، لەبەرئەوەی گەیاندنەکان ئاسان دەکاتەوە. لەلایەکی ترەوە، سیستەمەکانی دووجەمسەرە نەرمییان نییەو بایەخی ململانێیەکان، کە لە نێوان لایەنەکان روودەدەن، وەکو شەڕی ڤێتنامی، زێتر گەورە دەکەن. وەک پەندە تەقلیدییە کۆنەکە دەڵێ: دووجەمسەری بە یەکێک لەم دووانە کۆتایی دێت: یا سوان، یاخود تەقینەوە. ئەگەر ئەمە راست بێ. کەواتە بۆچی لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، دووجەمسەری نەتەقییەوە؟ لەوانەیە ئەو بەپارێزبوونەی لە چەکی ئەتۆمی کەوتۆتەوە، وەرامەکەی بەخۆوە **هەڵگرتبێ**. ئەو سەقامگیرییەی کە **والتز** بۆ دووجەمسەری پوختی دەگەڕاندەوە، تەنیا ئەنجامێکە بۆ بۆمبی هایدرۆجینی. دەشێ ئەو تۆقاندنەی لەچەکی ئەتۆمی دەکەوێتەوە هۆکارێک بێ بۆ وەدیهێنانی سەقامگیری. وا بێنە بەرچاو کە ئەگەر تەزاری **ئەڵەمانیاو** تەزاری روسیاو ئیمپراتۆری نەمسا لە ئۆگستۆسی ١٩١٤ باوەڕیان بە (تۆپی بلورینی بەخت) کردبوایە، و وێنەی ساڵی (١٩١٨)یان تیا بخوێندبوایەوە، ئەوکاتە دەیانبینی کەوا چۆن تەختیان وەردەگەڕاو سوپاکانیان پەرش و بڵاوەبووەوەو ملیۆنان لە رۆڵەی **گەلەکانیان** دەکوژرا. ئایا ناچار دەبوون شەڕ بکەن؟

لەوانەیە نەخێر.

شوێنەواری مادی چەکی ئەتۆمی، لە ماوەی دوای ساڵی ١٩٤١، دەشێ بە شوێنەواری ئەو تۆپە بلورینە بچێ کە بدرێتە سەرکردەی دەوڵەتەکان بۆ ئەوەی بەختی خۆیانی تیا بخوێننەوە. لەبەر ئەوەی ئەو ئامانجە سیاسییە کەمەی کە بانگەشەی بۆ دەکرا، هاوتای ئەو جۆرە کاولکارییە نەبوو. سەرکردەی دەوڵەتەکان خۆیان لە خستنە نێو سەرەڕۆیی چارەنووسی خراو لادا.

تۆپە بلورینەکان دەشێ رووداوێک قوت بدەن، یاخود خەراوی بخەملێنن، وەلێ لێرەدا بەراوردکردنەکە پێمان دەڵێ بۆچی پێکهاتەی دووجەمسەری و چەکی ئەتۆمی درێژترین ماوەی ئاشتییان لە نێوان دەوڵەتە نێوندەییەکان - گەورەکان - هێنایە بەرهەم، هەر لە سەرەتای سیستەمی دەوڵەتی نوێوە. (ژمارەی پێوراوی پێشوو بۆ ئەم چەشنە ماوەیە لە «١٨٧١»ەوەیە تا ساڵی ١٩١٤).

## کێشەکانی سەنگراندنەوەی ئەتۆمی

سەنگراندنەوەی ئەتۆمی لقێکە لە سەنگراندنەوەی گشتی. وەلێ تایبەتمەندییەکانی چەکی ئەتۆمی لە کاتی شەڕی سارددا شێوازی مامەڵەکردنی دەوڵەتەگەورەکانیان لەگەڵ پەیوەندییە دەولییەکاندا گۆڕی. سەنگراندنەوەی ئەتۆمی ئەو بیانگە لۆژیکییە، دەخاتە روو: ئەگەر پەلامارت دام، رەنگە نەتوانم رێگا لە پەلاماردانەکەت بگرم، وەلێ دەتوانم بەرپەرچت بدەمەوە، هێندە توند تۆڵەت لێ بکەمەوە کە بتسەنگرێنمەوە. بەم چەشنە چەکی ئەتۆمی وەرچەرخانێکی نوێی لە پرەنسیپێکی کۆن هێنایە ئاراوە.

یەکێک لەو رێگایانەی رادەی کاریگەریی سەنگراندنەوەی ئەتۆمی پێ دەخەملێنرێ، شرۆڤەکردنی دژ بەیەکەکانە، (راستەقینە لە توانابووە بەرامبەرییەکان). ئایا بە نەبوونی تیرۆری ئەتۆمی، مەودای وەرچەرخانی شەڕی سارد بۆ شەڕێکی راستەقینە چەندە؟ «**جون میللەر**»ی زانای سیاسەت وایدەبینی کەوا بانگی کەلەشێر بەر لە تیرۆری ئەتۆمی هات: هەروەها دەڵێ گەلانی ئەوروپایی لەودەمەی کە کارەساتەکانی جەنگی جیهانی یەکەمیان بینی، نەفرەتیان لە جەنگ کرد وەک ئامرازێکی سیاسی. هۆی ئاشتی تەنیا زێتر داننانە بە کارەساتەکانی جەنگ، بەلایەنی کەمەوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان. **میللەر** وایدەبینێ کەوا **هیتلەر** حاڵەتێکی لەڕێ لادانەو کەسێکە لە دەرەوەی شتی لێ راهاتوو، پەندی لە جەنگی جیهانی یەکەم وەرنەگرت، ئارەزوو و تینوویتی بۆ چوونە نێو جەنگی هەر لە لا مایەوە.

دوای جەنگی جیهانی دووهەم، نەفرەت کردن لە جەنگ بەهێزترو توندتر بوو. زۆر لە شرۆڤەوانەکان بڕوایان وایە کە شەڕی ڤێتنام ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە وەلانانی بەرپابوونی شەڕی سێیەم. لەوانە بوو تەنگژەکانی بەرلین و مۆسکۆ و کوباو ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەس بوونایە بۆ دایساندنی پتیلی جەنگ. ئەگەر تیرۆری ئەتۆمی پەندو ئاقڵبوونی لە دەروونان نەچاندبوایە، وەک ئەوەی تۆپێکی بلوورین بێت خەڵک دوارۆژی خۆیانی تیابخوێننەوە!

ئەو بابەتی سەنگراندنەوەیە ژمارەیەک پرسیار دەخاتە ڕوو، یەکێکیان: چ شتێک دەسەنگرێنێتەوە؟ سەنگراندنەوەی کاریگەر پێویستە توانای ئازاردانی هەبێ تا باوەڕ بەبەکارهێنانی تیرۆر بکرێ، ئەو باوەڕ پێکرانەش پشت بەو مەترسییانە دەبەستێ کە لە ململانێیەکە دەکەونەوە. هەرگیڤی ئەمریکا کە بۆمبێک بە مۆسکۆدا دەدا بۆ تۆڵەکردنەوەو بەرپەرچدانەوەی پەلاماردانێکی ئەتۆمی، کارێکە باوەڕی پێدەکرێ. با وای دانێین ساڵی ١٩٨٠ ولاتەیەکگرتووەکان هەڕەشەی کرد کە مۆسکۆ بۆردوومان دەکات، چونکە سۆڤیەت ئامادە نەبوو کە هێزەکانی خۆی بکێشێتەوە!

گومانی تێدا نییە ئەمریکا ئەو توانایەی هەیە، وەلێ ئەو هەڕەشەیە باوەڕپێکرانی گەرەکە، لەبەرئەوەی ئەنجامی هەڕەشەکە زۆر لە خودی هەڕەشەکە بێ بایەخ ترە، سۆڤیەتییەکان بەرامبەر ئەوە دەتوانن هەڕەشەی لێدانی واشنتۆن بکەن، بەم چەشنە دەبینن سەنگراندنەوە بە تەنیا بە توانابوونەوە پەیوەست نییە، بەڵکو بە باوەڕ پێکرانەوەش پەیوەستە.

ئەژواری باوەڕپێکران بەرەو مەسەلەی جوێ کردنەوەمان دەبات لە نێوان سەنگراندنەوەی ئەو هەڕەشەیەی کە ئامانجی نیشتمانە، لەگەڵ ئەو هەڕەشەی کە ئامانجی هاوپەیمانەکانە. لەمەش ولاتەیەکگرتووەکان نەیتوانی لە ڕێگای سەنگراندنەوەی ئەتۆمییەوە ڕێگا لە سۆڤیەت بگرێ کە غەزووی پاژنەکان (اعقاب) بکات. وەلێ بە درێژایی چوار دەیەک لە شەڕی سارد هەڕەشەی بەبەکارهێنانی تیرۆری ئەتۆمی دەکرد ئەگەر یەکێتی سۆڤیەت پەلاماری دەوڵەتەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئەندامەکانی هاوپەیمانێتی ئەتلەسی (ناتۆ) بدا کەواتە ئەگەر ویستمان لە باندۆری تیرۆری ئەتۆمی بکۆڵینەوە لە گەیاندنی سەنگراندنەوەکەو وەلانانی شەڕدا، پێویستە ڕوو لە تەنگژە گەورەکان بکەین، کە مەترسییەکان و کاردانەوەکانیان بەرزە.

ئایا مێژوو دەتوانێ وەلامی ئەو پرسیارانەو باندۆری تیرۆری ئەتۆمی بداتەوە؟ دەشێ بە تەواوی نەتوانێ، وەلێ یارمەتی دەدا.

هەر لە ساڵی ١٩٤٥ تا ساڵی ١٩٤٩، تەنیا وڵاتەیەکگرتووەکان چەکی ئەتۆمی هەبوو، وەلێ بەکاری نەهێنا. کەواتە بەر لە پەیدابوونی سەنگراندنەوەی دوولایەنە، جۆرێک لەخود سەنگراندنەوە هەبوو. بەشێک لە هۆیەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەمی جبەخانەی ئەو رۆژگارەو تێنەگەیشتن لەو چەکە نوێیە، هەروەها ترسی ئەمریکاییەکان لە سۆڤیەتییەکان کە بەهۆی هێزە تەقلیدییە چڕەکەیانەوە هەموو ئەورووپا داگیر بکەن. لە پەنجاکاندا ئەمریکا و سۆڤیەتییەکان، هەردوولایان چەکی ئەتۆمیان هەبوو، زۆر تەنگژەش روویدا. لەو کاتەدا سەرۆکە ئەمریکاییەکان بیریان لە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی کردەوە. تیرۆری ئەتۆمی لە شەڕی کۆریا، یاخود لە ساڵانی ١٩٥٤و ١٩٥٨ بەکارنەهێنرا. کاتێک کۆمۆنیستەکانی چین هێزەکانی خۆیان بۆ پەلاماردانی دورگەی تایوان سازدا، کە نەتەوەخوازەکان فەرمانڕەواییان تێدا دەکرد. سەرۆک **ترومان و ئیزنهاور**، زۆر کەڕەت بەرهەڵستی بەکارهێنانی تیرۆری ئەتۆمیان دەکرد. لە شەڕی کۆریادا هیچ ئامرازێک نەبوو بۆ ئەوەی دڵنیایان بکاتەوە کە لێدانی بۆمبێکی ئەتۆمی، چینەکان دەوەستێنێ. هاوکات وڵاتەیەکگرتووەکان دەربارەی کاردانەوەی سۆڤیەتی دوچاری دڵەڕاوکێ ببوو. هەمیشە مەترسی بەرزبوونەوەی هەڕەشەکان و ئەگەری ئەوە لە ئارادابوو کەوا سۆڤیەت بۆ یارمەتیدانی هاوپەیمانە چینییەکانی چەکی ئەتۆمی بەکاربهێنێ، بەم چەشنە دەبینین مەترسی بەرەو شەڕێکی بەرفراوانتر، کە لە چین و کۆریا رەت بکا لەکایەدا بوو، هەرچەندە وڵاتەیەکگرتووەکان لە رووی ژمارەی سەرە ئەتۆمییەکانەوە باڵادەستر بوو.

هەڵوێست و رای گشتیش رۆڵی خۆیان هەبوو. لە پەنجاکاندا وڵاتەیەکگرتووەکان ئەوەی خەملاند کەوا ژمارەی کوژراوەکان لەنێو هاووڵاتیاندا زۆر دەبێ، بۆیە بیرۆکەی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی خستەلاوە، کاتێک لەم بارەیەوە لە سەرۆک ئیزنهاوەریان پرسی، گوتی: ناتوانین بۆ جاری دووهەم ئەو شتە ترسناکانە دژی ئاسیاییەکان بەکاربێنین[٩].

بەم چەشنە دەبینین کۆمەڵێک هۆکاری تێکەڵ بەیەک لە پەنجاکاندا، وای لە ئەمریکاییەکان کرد کە تیرۆری ئەتۆمی بەکارنەهێنن. سەرباری ئەوەی لە رووی ژمارەوە، لە سەرەوەی سۆڤیەتییەکان بوون.

---

٩- ستيڤن امبروز، ايزنهاور (نيويورك: دار سالمين و شوستر، ١٩٨٣) ص١٨٤.

## تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا

دۆزی یەکەم – سەرەکی –، تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبا بوو لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٢دا، دەشێ ئەو تەنگژەیە لە هەمووان ورووژێنەرتر بووبێت کە زنجیرەیەک رووداوی لێ بکەوێتەوەو دەشیا ببێتە سۆنگەی شەڕێکی ئەتۆمی. ئەگەر بینەرێک بۆی رێککەوتبا زۆر لە دەرەوە (مرۆڤێک لە مەریخ) سەیری بارەکە بکا. ئەوا دەبینێ ولاتە یەکگرتووەکان لە سەرەوەی یەکێتی سۆڤیەتە لە رووی چەکی ئەتۆمییەوە بە رێژەی (١٧٪). ئێستا دەزانین کە ئەو دەمە سۆڤیەتییەکان تەنیا (٢٠) رۆکێتی کیشوەر بڕیان هەبوو کە دەگەیشتە ولاتەیەکگرتووەکان. وەلێ سەرۆک **کینیدی** ئەو رۆژانە ئەو راستەقینەیەی نەدەزانی، کەواتە بۆچی ولاتەیەکگرتووەکان لە ناکاو پەلاماری شوێنی رۆکێتەکانی یەکێتی سۆڤیەتی نەدا، کە بەشێوەیەکی رێژەیی دەکەوتە چوارچێوەی بۆردوومانەکە، وەرامەکە ئەوەیە هەتاوەکو ئەگەر رۆکێتێک یان دوان لە تێکدان دەربازبوونایەو پاشان بۆ شارێکی ئەمریکی بهاوێژرابوونایە، ئەمە مەترسییەکی چارەنووس خراپ بوو، بەشێوەیەک بەس بوو بۆ ئەوەی بیسەنگرێنێتەوە. سەرباری ئەمەش سەرۆک **کینیدی و خرۆچۆف** لەوە دەترسان ستراتیژییەتی ئەقلانی و حسێوکردنی ورد لە بیرۆکەیان دەرچێ. ئەوەتا **خرۆچوف** بە زمانێکی خواستراوی جوان لە یەکێک لە نامەکانیدا بە **کینیدی** دەڵێ: «لەیادمە کە ئێمە بەیەکەوە هەردوولای ئەو پەتە رادەکێشین کە مەدالیای بە گەردنی شەڕەوە کردووە[١٠]».

لە کۆنگرەیەکدا کە لە ویلایەتی فلۆریدا بەسترا، دوای بیست و پێنج ساڵ لە رووداوەکە، ئەو ئەمریکاییانەی کە لە سەردەمی سەرۆکایەتی **کینیدی**، پەیوەندییان بە لیژنەی جێبەجێکردن لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە هەبوو، لەگەڵ ژمارەیەک لە مامۆستاو زانا کۆبوونەوە. لە هەوڵدانێک بۆ سەرلەنوێ چێکردنەوەی وێنەی تەنگژەی کوبی، یەکێک لە توندترین خاڵی ناکۆکی لە نێوان بەشداربووواندا، مەسەلەی دیاریکردنی رادەی ئامادەیی هەریەک لە لایەنەکان بوو بۆ سەرەڕۆیی. ئەمەش لە بەرامبەردا پشت بە دیدی هەریەکەیان دەبەستێ لە ئەگەرەکانی دایسانی شەڕ. دەبینین «**روبەرت ماکنمارا**» وەزیری بەرگری سەرۆک کینیدی، لەگەڵ گەشەسەندنی تەنگژەکە، زێتر ئاگادار دەبێ. وەلێ لە کۆنگرەکە دەڵێ کە ئەو لەو بڕوایەدا بوو، لە کاتی

---

١٠– رونالد هوب، وجهات النظر السوفياتية في ازمة الصواريخ الكوبية: الخرافة والواقع في تحليل السياسة الخارجية (واشنطن: مطبعة الجامعة الامريكية، ١٩٨٣) ص٤٨.

تەنگژەی ڕۆکێتەکانی کوبی، ڕەگەزی مەترسیداری شەڕی ئەتۆمی بەرێژەی یەک لە پەنجا بوو، (واتە ڕێژەی دوو لە سەدا). وەزیری خەزینە «**دوگلاس دیلن**» گوتی کەوا ڕێژەکە نزیکەی سفر لەسەدا بوو. هیچ شتێکی وای لە بارەکەدا نەبینی کە دەشێ ببێتە سۆنگەی شەڕێکی ئەتۆمی. بەشێوەیەکی دیکە ئەو لە ماکنمارا زێتر ئارەزووی دەکرد فشار بخرێتە سەر سۆڤیەتییەکان. ژەنەراڵ «**ماکسویل تیلەر**» سەرۆکی دەستەی ئەرکانی هاوبەش لەو بڕوایەدا بوو کەوا مەترسی دایسانی شەڕی ئەتۆمی کەم بوو، گلەیی لە وڵاتەیەککگرتووەکان کرد کە لە تەنگژەی کوبیدا لەگەڵ سۆڤیەتییەکان نەرم بوو. ڕای وابوو کە پێویستە وڵاتەیەککگرتووەکان فشاری زێتر بخاتە سەر سۆڤیەتییەکان و داوای لادانی سەرۆکی کوبی «**ڤیدل کاسترۆ**» بکا. هەروەها گوتی: من دڵنیابووم کە ئێمە لە گۆشەیەکمان پەستابوون و دەربارەی ئەنجامیش هەرگیز دڵەڕاوکێم نەبوو[11]. وەلێ مەترسی لەدەست دەرچوونی بارەکە بۆ سەرۆک **کینیدی** شتێکی ئاسان نەبوو، ئەو کەسە زۆر ئاقڵانە ڕەفتاری دەکرد، زۆر ئاقڵانەتر لەوەی هەندێک لە ڕاوێژکارەکانی ئارەزوویان بوو. مەغزای چیرۆکەکە ئەوە بوو کەوا سەنگراندنەوەی ئەتۆمی لەگەڵ بچووکی قەبارەکەی، شوێنەواری دووری هەبوو. ئەوە ئاشکرابوو کە سەنگراندنەوەی ئەتۆمی لە تەنگژەی ڕۆکێتەکانی کوبیدا، بایەخێکی تری هەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا تا ئێستا هەندێک لایەنی نادیار لە تەنگژەی ڕۆکێتەکاندا هەیە، وا دەکا گێڕانەوەی هەموو ئەنجامەکان بۆ هۆکاری ئەتۆمی ئاستەنگ بێت. لێرەدا کۆڕایەک لە ڕای گشتی ئەمریکیدا هەیە، کە وڵاتەیەککگرتووەکان سەرکەوتوو بوو. وەلێ زێدەڕۆییەک هەیە لە خەمڵاندنی قەبارەی سەرکەوتنی وڵاتەیەککگرتووەکان و پێویستییەکانی ئەو سەرکەوتنە. لێرەدا بەلایەنی کەم توانای سێ ڕاڤەکردن هەیە: یەکێکیان وایدەبینێ کە وڵاتەیەککگرتووەکان چەکی ئەتۆمی لە یەکێتی سۆڤیەت زێتر هەیە، بۆیە سۆڤیەت چۆکی دادا. ڕاڤەکردنی دووهەم حەز دەکا چەند جۆرێکی تر بخاتە سەر کاردانەوەو مەترسییەکان، بەگوێرەی هەریەک لە دەوڵەتە مەزنەکان، لەو بارەیەوە کوبا ماوەی تیرئەنگاوێکە بۆ وڵاتەیەککگرتووەکان، کەچی بەگوێرەی سۆڤیەتییەکان قومارکردنە بەلایەنێکی دوورەوە. ئەمریکییەکان بەتەنیا بە گوێرەی کوبا لە بارێکی باشتر نەبوون لە سۆڤیەتییەکان. بەڵکو لە توانایاندا بوو هۆکاری سێیەمیش بخەنە

---

١١- جيمس پليت، على الحافة: الامريكان والسوفييت يعيدون فحص أزمة الصواريخ الكوبية (نيويورك: دار هيل و وانغ، ١٩٨٠) ص٨٠.

ناو گۆڕەپانی ململانێیەکەوە. ئەمەش توانای بەکارهێنانی هێزی تەقلیدی بوو، پاشان ئابلووقەیەکی دەریایی بسەپێنن، کە لە تواناداببوونی پەلامارێکی ئەمریکی بۆ سەر کوبا، ڕۆڵی خۆیان هەبوو. بارگرانییە دەروونییەکە بەشی سۆڤیەتییەکان بوو، چونکە زیانی زۆر گەورە بەوان دەکەوت هێزە. تەقلیدییەکانی ئەمریکی ئامادەی پەلاماردانی کوبا بوون، کە ئەمە باوەڕپێکردنێکی تری دایە هەڵوێستی سەنگراندنەوەی ئەمریکی.

دواجار، ڕاستە تەنگژەی ڕۆکێتەکانی کوبا بە سەرکەوتنێک دەژمێردرێ بۆ ئەمریکاییەکان و سیستەمەکانی سازترش سەوداکردنی دامەزراند، وەلێ ئەمریکییەکان لەو تەنگژەیەدا سێ ڕێگاچارەیان هەبوو: یەکێکیان تەقەکردن بوو، واتە بۆردومان کردنی شوێنی ڕۆکێتەکان. دووەمیان سۆڤیەت ناچار بکا دەربچێ بەوەی ئابلووقە بسەپێنێتە سەر کوباو، سۆڤیەتییەکان ڕازی بکا کە پێویستە ڕۆکێتەکان بکێشێتەوە. سێیەمیشیان (صفقە)یەک گرێ بدەن. ئەمەش بە ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ سۆڤیەتییەکان بەشتێک کە بەرامبەر کێشانەوەی ڕۆکێتەکان لە کوبا. وەک ئەوەی ئەمریکاییەکانیش ڕۆکێتەکانیان لە تورکیا بکێشنەوە. دەربارەی ڕووەکانی دەستبەندی ئاڵوگۆڕکردنەکە، بەشداربووەکان ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوون. وەلێ بەڵگەکانی دواتر ئەوەیان سەلماند کەوا بەڵێنێکی هێمنی ئەمریکی بۆ کێشانەوەی ڕۆکێتە کۆنەکانی لە تورکیا، گرنگتر بوو لەوەی لەو کاتەدا بڕوایان پێی دەهات.

دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە سەنگراندنەوەی ئەتۆمی پایەی خۆی هەبوو لە تەنگژەکەداو ڕەهەندی ئەتۆمی بە ڕاستی کەلێنێکی گەورەی لەبیرکردنەوەی **جۆن کینیدی** دا گرتبوو. لەلایەکی ترەوە ژمارەی تیرۆری ئەتۆمی بەهەمان ڕادە بایەخی نەبوو، ڕێژەی تیرۆرەکە گرنگ نەبوو، بەڵکو لە ڕاستیدا، هەرچەندە ژمارەکە، کەم بوایە، دەیتوانی کاولکارییەکی بەرفراوان بێنێتە ئاراوە.

*لە ساڵی ١٩٦٢ سەرۆک جۆن کینیدی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، کتێبی «تۆپەکانی ئاب»ی «بەربارا تاچمان» بخوێننەوە. کتێبەکە باسی ئەوە دەکا کە چۆن گەلانی ئەوروپایی بەبێ ئەوەی سەرنجیان دابێ، لە شەڕی یەکەمەوە تێوەگلان. نووسەرەکە بە توانجێکی پسمارکەوە دەست پێ دەکا، کە تیایدا دەڵێ: «هەندێک گەمژەلی نەفرەت لێکراو لە باڵکان» بەسە بۆ ئەوەی پتیلی شەڕی داهاتوو داگیرسێنن. نووسەرەکە لە گێڕانەوەی زنجیرە هەنگاوێک بەردەوام دەبێ، دوای کوشتنی پەیمانگری نەمسا ئەرشیدوک*

*فـرانس فـردیناند لە ٢٨ی حـوزەیرانی ١٩١٤، بەدەسـتی نەتەوەخـوازە سربییـەکان، کە هەنگاوێکی پووچ بوو خۆی لەخۆیدا و هیچ سەنگێکی نەبوو، بووە سۆنگەی درێوترین ململانێی سەربازی لە مێژووی جیـهاندا. سـەرۆک دەوڵەتان لە هەمـوو کـەرەتێکدا، کە لە سـەر لێـواری جەنگن، هەوڵی پەژیوان بوونەوە دەدەن. وەلێ زەخمی ڕووداوەکان بەرەو پێشەوەیان ڕاپێچ دەکەن. سەرۆک کینیدی گفتوگۆیەکی ساڵی ١٩١٤ی بیر هێنایەوە کە لە نێوان دوو ڕاوێژکاری ئەڵمانی ڕوویدابوو، دەربارەی ئەو بنەمایانەی کـە شـەڕیان لێ کـەوتەوە، یەکـێکیـان پرسی: شـەڕ چۆن ڕوویدا؟ ڕاوێژکـارەکـەی پێـشـوو وەڵامی دایەوە: خـۆزگـە دەمـزانی! ئەمە ڕێگای کینیدی بوو کە بە بەردەوامی خراو خەملاندنی وەبیر دەهێنایەوە*(١٢).

## کێشەگەلی ئاکاری

دوای تەنگژەی ڕۆکێتەکانی کوبا، ڕادەی توندیی شەڕی سارد، بەشێوەیەکی ڕێژەیی کزبووەوە. وڵاتەیەککگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت ساتمەیان کردو لەسەر ڕۆخی هەڵدێر کـەوتنە سـەر زەوی و خـۆیان گـرتەوەو سـەیری هەڵدێرەکـەو قـووڵی هەڵدێرەکـەیان کـرد بۆیان دەرکەوت، لە ڕۆخەکەیدا گەڕانەوە دواوە.

لە سـاڵی ١٩٦٢دا هێـڵـێکی تەلەفـۆنی ڕاستـەوخـۆ لە نێـوان مـۆسکۆ و واشنتـۆن ڕاکـێشـراو ڕێکەوتننامـەی چاودێریکردنی تـیـرۆرو دانانی ڕادەیەک بۆ تـاقـیـکردنەوەی ئەتۆمی لە هەوادا، ئیمزا کرا. **جون کینیدی** ڕایگەیاند کە وڵاتەکەی حەزدەکا بازرگانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا پەرەپێبداو بەمـجۆرە گرژییەکە کەمێـک سووک بوو. لە ماوەی شەستەکاندا وڵاتەیەککگرتووەکانی ئەمریکا بە شەڕی ڤێتنامییەوە خەریک بوو، وەلێ چاودێریکردنی چەک مایەوەو کاری پێ دەکرا.

دوای ئەوەی سـۆڤـیـەتیـیـەکـان لە سـاڵی ١٩٧٩دا پەلامـاری ئەفغـانسـتـانیـان دا، ترسـێکی زۆر لە بەرپابوونی شـەڕێکی ئەتۆمی سـەری هەڵدایەوە. لە مـاوەی (شـەڕی سـاردی بچـووک) لە نێـوان سـاڵانی ١٩٨٠و١٩٨٥دا. گـفـتـوگـۆ سـەبـارەت بە دانانی ڕادەیەک بۆ تیـرۆر وەسـتـاو زمـانی ڕاگـەیاندن زبربۆوە، هـاوکـات ژمـارەی سـەرە

---

١٢- روبرت ماكنمار، التورط في كارثة، عبور القرن الاول من العصر النووي (دار بانشيون، ١٩٨٠) ص١٤.

ئەتۆمییەکان و لەگەڵیدا بودجەی سەربازی زێدەبوو. سەرۆک **رونالد ریگان**، دەربارەی ئەنجامدانی شەڕێکی ئەتۆمی ئاخاوت. کەچی ئەو تاقمانەی بانگەشەیان بۆ ئاشتی دەکرد پتر کەوتنە خۆ بۆ وەستاندنی تیرۆری ئەتۆمی، وەک رێگا خۆشکردنێک بۆ رەتکردنەوەی شەڕ.

لەو بارە تژی دڵەڕاوکێیەدا، خەڵکێکی زۆر پرسیارێکی بنەڕەتیان دەکرد: ئایا سەنگراندنەوەی ئەتۆمی کارێکی ئاکار ئامێزە؟ لە بەشەکانی پێشوودا بینیمان کە تیۆرەکانی جەنگ - پەیوەست بە جەنگ - بەتەنیا ئەوان دەڵێن کە چەند حاڵەتێکی دیاریکراو هەیە وا پێویست دەکا بە ئەحکامی ئاکاری مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، بەرگری لە خۆکردن بە دۆزێکی رەوا دادەنرێ. وەلێ ئەو ئامڕازانەی کە بەهۆیانەوە شەڕ دەکرێ و ئەو ئەنجامانەی لێیان دەکەونەوە، زۆر جۆرن. جا ئەگەر هاتینە سەر ئامڕازەکان پێویستە مەدەنی و شەڕکەرەکان لێک هاوێربکەین. هەرچی لە رووی ئەو ئەنجامانەیە کە لێیان دەکەونەوە، پێویستە جۆرە هاوسەنگییەک هەبێ، هەندێک پەیوەندی هەبێ لە نێوان رێگاکان و ئەنجامەکاندا.

ئایا شەڕی ئەتۆمی لەگەڵ تیۆری شەڕی رەوا دەگونجێ؟ لە لایەنی تەکنیکییەوە دەشێ زەخیرەی ئەتۆمی کە هێزێکی سنوورداری هەبێ بەکاربهێنرێت، وەک گوللە تۆپ. بۆ نموونە، کە هێزە خاپوورییەکەی لە هێزی خاپوورکاری تەقلیدی زێتر نییە. کە لە سیستەمەکانی رادارو کەشتی ناو دەریاو بارەگای سەرکردایەتییە سەربازییەکانی ژێر زەوی دەگیرێ. لەم بارەدا دەشێین شەڕکەرو شەڕنەکەر لەیەکتر هاوێربکەین و بەشێوەیەکی رێژەیی رادەیەک بۆ زیانەکان دابنێین. وەلێ شەڕو جەنگ لەو رادەیەدا دەوەستێ، یاخود گەرمتر دەبێ؟ مەترسی گەورە لە توندبوون و فراوان بوونی چوارچێوەی شەڕدایە. ئایا هیچ شتێک هەیە کە شایەنی بە فەتارەت دانی سەد ملیۆن مرۆڤ، یاخود بەکۆتاهێنانی ژیان بێت لەسەر ئەم هەسارەیەدا؟ لەکاتی شەڕی سارددا هەندێک وەڵامی ئەو پرسیارەیان دایەوە، با ببینە کۆمۆنیست، باشترە لەوەی بمرین!

وەلێ دەشێ ئەو شێوە پرسیار کردنەکە هەڵەبێت. بەرامبەر ئەوە دەتوانین بپرسین ئایا دەشێ، ئەگەر کەمێکیش بێ، سەرەڕۆیی بکەین بۆ چوونە ناو کارەساتێکی گەورەوە؟ لەکاتی تەنگژەی رۆکێتەکانی کوبادا، ئەو ئاخاوتنەی **جون کینیدی** ناوبانگی دەرکرد، کەوا رێژەی سەرکەوتنی تیرۆری تەقلیدی سێیەکە. مەترسی هەڵگیرساندنی شەڕێکی ئەتۆمی کەمە، ئایا دەکرا بچێتە نێو ئەو سەرەڕۆییەوە؟ با بگەڕێینەوە بۆ رێسای دژبەیەکەکان. ئەگەر **کینیدی** ئارەزووی سەرەڕۆیی نەبوایە لە

کویا، ئایا **خرۆچۆف** لەو بڕوایەدا دەبوو کە شەڕ شتێکی زۆر مەترسیدارترە؟ چی دەبوو ئەگەر دواتر سەرکەوتنێکی سۆڤیەتی ببوایە سۆنگەی تەنگژەیەکی ئەتۆمی، یاخود بلێ سۆنگەی شەڕێکی تەقلیدی بەرفراوانتر، بۆ نموونە لەسەر ئەژواری بەرلین، یاخود کەنالی پەنەما؟

لەوانەیە تیرۆری ئەتۆمی رۆلێکی گێڕابێ لەوەی نەهێلێ شەڕی سارد وەرچەرخێ بۆ شەڕێکی بەڕاستی. لە هەشتاکاندا کاردینالە کاتۆلیکە ئەمریکاییەکان فتوایان دا کەوا سەنگراندنەوەی ئەتۆمی دەشێ لەسەر بنەمایەکی مەرجدار پاساودانی بۆ بکرێ. بەوەی کارڕاییەکی گوێزرانەوەی قبوولّ کراوە، وەک رێگا خۆشکردنێک بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێکی باشتر. وەلێ درێژیی ماوەی گوێزرانەوەکە چەندە؟ تا ئەو دەمەی زانینی ئەتۆمی لەئارادابێ، شتێک لە سەنگراندنەوەی ئەتۆمی هەردەمێنێ. راستە لە کاتی شەڕی سارد دا تیرۆر رادەیەکی لە ئاقلبوونی هێنایە بەرهەم لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا، دلەڕاوکێ لە بلاوبوونەوەی تیرۆری ئەتۆمی، رۆلێکی سەرەکی بینی لە زۆر تەنگژەی دەولیدا.

بلاوبوونەوەی تیرۆری ئەتۆمی بەردەوامە، ئەگەرچی ۱۷۰ دەوڵەت پەیماننامەی قەدەغەکردنی بلاوبوونەوەیان ئیمزا کردووە. هەروەها هەندێک دەوڵەتی تر، وەکو عێراق و ئێران و کۆریای باشوور، هەوڵی پەیداکردن یان بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی دەدەن، مەسەلەیەکی تر کە دەبێتە سۆنگەی دلەڕاوکێیەکی توند، مەسەلەی بلاوبوونەوەی تیرۆری ناتەقلیدییە، وەک چەکی میکرۆبی - بایۆلۆجی - کیمیاوی. بۆ نموونە لیبیا. سەرباری ئەوەی کە دوچاری سزای دەولی هاتووە، بەردەوامە لە دامەزراندنی کارگەی چەکی کیمیاوی. شەڕی کەنداو لە ساڵی ۱۹۹۱داو، گەیشتنی تەنگژەی نێوان ولاتەیەکگرتووەکان و کۆریای باکوور، تا سنووری رووبەڕووبوونەوە لە ساڵی ۱۹۹٤داو زانیاری متمانە پێکراو، دەربارەی چوونە دەرەوەی کەرەستەی ئەتۆمی لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشووەوە بۆ بازاڕی رەشی دەولی. ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئەو تیرۆرە هەتاوەکو ئێستا دەتوانێ گرژی بگورێنێ، و دەوڵەتان بخاتە کەناری جەنگەوە.

هەر لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە، نارەزایی دەربڕدرا بەرامبەربە بەکارهێنانی تیرۆری کیمیاوی و میکرۆبی. کاتێک بەکارهێنانی گازی خەردەل لەلایەن دەوڵەتانی هاوپەیمان و میحوەرەوە، وەکو یەک، رووبەڕووی نارەزاییەکی توند بووەوە.

هەرچی دەربارەی رەهەندی ریالیستییە، ئەوا ئاسانە: چەکی کۆکوژ، مەترسی

بەرزبوونەوەی توندوتیـژیی شـەڕو توانـای خـاپـوورکـردنێـکی گـەورەی هەڵگرتووە. بە هەبوونی ئەو تیرۆرە دینامیکییەتی ململانێیەکە دەگۆڕێ. ئەو دەوڵەتە بێ هێزانەی کە چەکی ئەتۆمـیـان، یاخـود چەکی ناتەقلیـدییـان هەیە، دەتوانن هەڕەشـە لە دەوڵـەتە بەهێـزەکـان بـکەن. لەکـاتێـکدا دەوڵەتە بەهێـزەکـان کـە ئەو جـۆرە تیـرۆرەیان هەیە، لە رووی هەڕەشەو سەنگراندنەوەی دژەبەرەکـان پایەیەکی باشتریان هەیە. هاوکات ترسان لە بەکـارهێنانـی ئەو جـۆرە چەکـە، لە حـاڵەتێکدا تەنگژەیەک لەژێر کـۆنتـرۆڵ کـردندا دەربچێ، دەبێـتـە سۆنگەی گـرژی، جا ئـەگەر لە نێـوان وڵاتەیەکگرتووەکان و کـۆریای باکـوور، یاخـود لە نێوان هینـدو پاکسـتـاندا بێ. دەشێ شەڕی سـارد بەکـۆتا هاتبێت، وەلێ چاخی تیرۆری ئەتۆمی و ناتەقلیدی هێشتا بەکۆتا نەهاتووە.

# پرەنسیپی سەروەریتی و
# خۆتێهەڵقورتاندن لە ململانێیە هەرێمایەتییەکاندا

جەنگی سارد لە نێوان هەردوو جەمسەرە سەرەکییەکەدا کۆتایی هات، بە کۆتاهاتنی شەڕی سارد ئەگەری دایسانی جەنگێکی جیهانی (بەواتا گشتییەکەی) کەم بۆوە. وەلێ ململانێیە ناوچەییەکان زۆر بەرفراوان بوون و فشار بۆ سەر دەوڵەتە رۆژئاواییەکان (بەتایبەتی دەوڵەتە گەورە گەورەکان) و دام و دەزگا دەولییەکان دەهێنن، وەکو نەتەوە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی، بۆ ئەوەی خۆیان لەو ململانێیانە هەڵقورتێنن. خۆتێهەڵقورتاندن هەم لەرووی چەمکی وەسفی و هەم بەپێوەری وشەکەوە، پرەنسیپێکی شڵەژاوەو بەتەنیا بەوەسف کردنی ئەو شتانەی روو دەدەن ناوەستێ، بەڵکو کە بڕیە ئەحکامیش دەدا. هەروەها خۆتێهەڵقورتاندن لە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتانی خودان سەروەریتی، پێوەرێکی بنەڕەتییە لەیاسای دەولیدا، هاوکات پرەنسیپێکی سەرەکییە لە پەیوەندییە دەولییەکاندا. لە سۆنگەی ئەو باندۆرەی کە لە سیستەم و عەدالەتدا هەیەتی. سیستەم، سنوور بۆ گێرەشێوێنی دادەنێ، واتە گێرەشێوێنی دەولی (بەواتای لە ئارادا نەبوونی حکومەتێکی باڵا، نەک بەواتای نەبوونی سیستەم و تێکەڵ بوونی رەش و سپی).

ئەگەر پرەنسیپە بنەڕەتییەکانمان لەبەر چاوگرت، ئەوا سەروەریتی و خۆتێهەڵقورتاندن دوو پرەنسیپی سیستەمن (دیسپلینن) لە سیستەمی گێرەشێوێنی جیهانیدا، دەرئەنجامی گێرەشێوێنی کار لە عەدالەت دەکات، هەتاوەکو ئەگەر خۆتێهەڵقورتاندنیش لە ئارادا نەبێ. گەلان لە کۆمەڵگای ئادەمیزاددا، مافی ئەوەیان هەیە ژیانی گشتی خۆیان لەچوارچێوەی دەوڵەتەکەی خۆیاندا بەرێوەببەن. لەسەر بێگانەکانیش (لایەنە دەرەکییەکان) پێویستە رێزی سەروەریتی و یەکپارچەیی خاکی ئەو کۆمەڵگایە بگرن. وەلێ ئەم نموونەیە هەموو دەوڵەتان ناگرێتەوە.

زۆرجار گرژییەک لە نێوان سیستەم و عەدالەتدا پەیدا دەبێ، لەو کاتەدا جۆرە نابرواییەک، لە خۆتێهەڵقورتاندن، یا خۆتێهەڵنەقورتاندن دێتە ئاراوە.

## پێناسەی خۆتێهەڵقورتاندن

وشەی خۆتێهەڵقورتاندن (دەستتێوەردان)، بەواتا بەرفراوانەکەی، ئاماژە بۆ ئەو کردارە دەرەکییە دەکات، کە کار لەکاروباری نێوخۆیی دەوڵەتێکی تری خودان سەروەریتی دەکات. هەندێک لەشرۆڤەوانان ئەم زاراوەیە بەشێوەیەکی تایبەت بۆ ئەو واتایە بە کاردەهێنن، کە بەخورتی و بەئەنقەست خۆ لە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتێکی تر هەڵبقورتێنرێ. پێناسەیەکی زێتر تایبەتمەند، خۆتێهەڵقورتاندن تەنیا زنجیرەیەک لە کاریگەرییە لە نێوان بەزۆرپێکردنی (إکراه) نزم و سووک و- بە زۆر پێکردنی بالا- توند- بڕوانە ئەم وێنەیەی خوارەوە




لە پلەی نزمی هێڵی بەزۆر پێکردن، دەشێ لە وتارێک زێتر نەبێت، بەمەبەستی کارتێکردن لە سیاسەتی نێو خۆیی دەوڵەتێکی تر. وێنەی ئەمە، کاتێک لە ساڵی ۱۹۹۰دا **سەرۆک بۆش** داوای لە گەلی عێراق کرد کە (سەدام حوسێن) بڕوخێنن، ئامانجی لەم وتارەدا خۆتێهەڵقورتاندن بوو لە سیاسەتی نێو خۆیی عێراقدا. هەروەها لە هەشتاکاندا ولاتە یەککگرتووەکان (رادیۆی مارتی) دامەزراند، بۆ بلاوکردنەوەی نامەو پرۆگرامی دژ بە فیدل کاسترۆ لە کوبا.

یارمەتیدانی ئابوری رێگایەکی ترە بۆ تاسیردانان لە کاروباری نێو خۆیی دەوڵەتێکی تر. بۆ نموونە یارمەتی ئابوری ئەمریکی بۆ سلڤادۆر، و یارمەتی سۆڤیەتی بۆ کوبا، مەبەست کارتێکردن بووە لە کاروباری نێو خۆیی هەردوو دەوڵەتدا. هەروەها بەرتیل دانیش یارمەتیدانێکی ئابوری نامەشرووعە. ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی CIA و ئاژانسی هەواڵگری سۆڤیەتی KGB، لە ماوەی جەنگی سارد دا پارەیەکی زۆریان لە هەڵبژاردنەکانی ولاتانی بێگانەدا خەرج دەکرد. هاوکات لە حەفتاکاندا حکومەتی کۆریای باشوور پارەیەکی زۆری لە پروپاگەندە کردن خەرج کرد، بۆ هەڵبژاردنی کەسایەتییە سیاسییەکانی ئەمریکی، ئەوانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کۆریای باشووردا هاوسۆز بوون.

ئەگەر نەختێکی تر لە هێڵی بەزۆر پێکردنە سەرکەوین، راوێژکاریی سەربازی

دەبینین. لە رۆژانی یەکەمی جەنگی ڤێتنامدا، سەرەتا خۆتێهەڵقورتاندنی ئەمریکی بەشێوەی یارمەتیدانی ئابوری بوو، دواتر یارمەتیدانی سەربازی بەدوادا هات. بە هەمان شێوە کوباو یەکێتی سۆڤیەت، یارمەتی ئابوری و راوێژکاریی سەربازیان پێشکەش بە نیکاراگواو دەوڵەتانی تری سەربەخۆیانیان دەکرد.

لە شێوەکانی تری خۆتێهەڵقورتاندن، پاڵپشتی کردنی هێزە بەرهەڵستکارەکانە. لە حەفتاکاندا، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پارەی بەسەر بەرهەڵستکارەکانی سەرۆکی چیلی هەڵبژێردراو (**سلڤادور ئالندی**) داباراند.هەروەها یەکێتی سۆڤیەت پارەی بۆ کۆمەڵەکانی ئاشتی، لە ئەوروپای رۆژئاوادا خەرج دەکرد.

بەر لەدیماهی بەزۆر پێکردنەکە، کاری سەربازی سنووردارمان بەرچاو دەکەوێ لە هەشتاکاندا، ولاتە یەکگرتووەکان لیبیای بۆردومان کرد. لەبەر ئەوەی بەپاڵپشتی کردنی تیرۆر تاوانباری دەکرد. هەروەها یەکێتی سۆڤیەت، لە شەڕی نێو خۆیی یەمەنی باشووردا، یارمەتی لایەکیانی دا.

هەرچی لە سەرووی هێڵەکەوەیە، ئەوا پەلاماردانی سەربازی تەواو، یاخود داگیر کردنە. نموونەی بۆ ئەمەش کرداره سەربازییەکانی ئەمریکابوو، لە دومینیکان (ساڵی ١٩٦٥) و لە گرینادا (ساڵی ١٩٨٢)و لە پەنەما (ساڵی ١٩٨٩). هەروەها کرداری سەربازی یەکێتی سۆڤیەت لەمەجەر (هنگاریا) لە ساڵی ١٩٥٦. چیکوسلوڤاکیا ساڵی ١٩٦٨و ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٧٩. بەتەنیا دەوڵەتە گەورەکان بەزەبری هێز دەخالەت ناکەن، ساڵی ١٩٧٩ تەنزانیا هێزەکانی ناردە ئۆگەندا، ڤێتنام پەلاماری کەمبۆدیای دا. پەلاماردانی عێراقیش بۆ کوێت لە ٢ی ئابی ١٩٩٠دا، نوێترین نموونەی ئەم بابەتەیە.

پێناسەکە بە واتا بەرفراوانەکەی، هەموو پلەکانی پەیژەکە، یاخود هێڵەکە دەگرێتە خۆی. لەپلەی بەزۆرپێکردنی نزمەوە تا دەگاتە پلەی بەزۆر پێکردنی بالاوە. رادەی بەزۆر پێکردن،(اکراه) لە خۆتێهەڵقورتاندن، لەو رووەوە گرنگە، کە تا چەند گەلی زۆر لێکراو ئازادی هەڵبژاردنی هەیەو توانایی هێزی دەرەکی لە پێشێل کردنی سەربەخۆیی ئەو گەلەدا چەندە.

## سەرووەریێتی Sovergnity

پرەنسیپی سەرووەریێتی بەلای کۆمەڵەی گەلانەوە، پرەنسیپێکی زۆر زیندوو بوو. لەو پیلەکەو گفتوگۆیانەی دەربارەی مەسەلەی شەرعییەتی خۆتێهەڵقورتاندن دەکران

ئەم پرەنسیپە، ریزی پیشەوەی گرتبوو. کەچی دەبینین سەروەریتی رەها (السیادة المطلقة) بەواتا یاساییەکەی، دەستەلاتی راستەقینەی حکومەت، لە چوارچیوەی سنووری خویدا، مەسەلەیەکە لە زور کاتدا گفتوگو هەلدەگری...

شتیکی زور دانسقەیە، ئەگەر حکومەتان بتوانن هەموو شتەکان کە لە ناوەوەی خاکی ئەواندا روودەدا بخەنە ژیر کونترولی خویانەوە، ئەمەش لەبەر چەند هویەک: یەکیکیان پشت بەیەکتر بەستنی ئابوری دەولییە. دەشی دەولەت لە رووی یاساییەوە خودانی سەروەریتی بیت، وەلی نوینەران لەدەرەوە، کاریگەرییان بەسەر ئەو شتانەدا هەیە کە لەسەر تەختی شانوکە روودەدەن.

هەندیک جار خوتیهەلقورتاندن، سەربەخویی بە هیز دەکات. چونکە هەندیک دەولەتی هەژار، لە راستیدا، تەنیا بریکی کەم سەربەخوییان هەیە، چونکە تواناکانیان زور کەمە. هەندیک جوری خوتیهەلقورتاندن ئەو توانایە لەدوا روژدا زیتردەکات و سەربەخویی راستەقینە بەهیزتر دەکات. یارمەتیدانی ئابوری، یاخود سەربازی، بەتیپەربوونی کات، دەشی وا لەدەولەتیک لەدەولەتەکان بکات، زیتر سەربەخو بیت. ئەوەی روژیک لە روژان بەلەدەست دانی سەربەخویی دیتە بەرچاو، دەشی لە دواییدا سەربەخویی پتەوتر بکات. کەئەمە بەشیکە لە ئالوزیی پەیوەندی نیوان سەروەریتی و سەربەخویی و خوتیهەلقورتاندن.

## حوکمدان لەسەر پرەنسیپی خوتیهەلقورتاندن

ریالیستەکان و کوزموپولیستەکان و ئاکاریستەکانی دەولەت (لایەنگرانی ئاکارخوازیی دەولەت)، بوچوونی جیاوازیان لەمەر مەسەلەی خوتیهەلقورتانەوە هەیە. ریالیستەکان سیستەم و ئاشتی، وەک دوو بەهای سەرەکی لە سیاسەتی دەولی و تەرازووی هیزەکان و دام و دەزگای سەرەکی، دەژمیرن. بویە بەلای ئەوانەوە ئەگەر خوتیهەلقورتاندن بو پاراستنی تەرازووی هیزەکان و سیستەم پیویست بوو، دەتوانری پاساوی بو بهیندریتەوە. نموونەی ئەمەش ناوچەی نفوز بوو لە روژانی شەری ساردا (ناوچەی نفوزی ئەمریکی لە نیوە گوی روژئاواو ناوچەی نفوزی سوڤیەتی لە روژهەلاتی ئەوروپا). لە سالی ١٩٦٥دا ولاتە یەکگرتووەکان دەستی لەناو دومینیکان وەردا، لەسەر ئەو بنەمایەی کە چیتر ریگا نادا حکومەتیکی دیکەی کومونیستی لە نیوەگوی روژئاوادا دابمەزری. هەروەها یەکیتی سوڤیەتیش بو ئەوەی حکومەتە کومونیستەکان لە روژهەلاتی ئەوروپادا بهیلیتەوە دەخالەتی دەکرد. لە

راستـيدا سۆڤـيـەتيـيـەكـان پرەنسـيـپـی «**برجنيف**»يان راگەياند، كە بۆ پاراستنی سیستەمی سوسيالیزم لە ناوچەكانی نفوزی خۆياندا. مافی خۆتێهەڵقورتاندنيان هەيە. رياليستەكان، مەيليان وابوو كەپاساوی ئەم جۆرە خۆتێهەڵقورتاندنە، لەسەر ئەو بنەمـايە بدەنەوە كـەئارامی دەپارێزێ و وا دەكـا لەيەک نەگـەيشتن و خـراو خەمـلاندن، نەبێـتـە سۆنگەی بەرزكـردنەوەی كـەش و هەوای جەنـگ، بە تايبـەتيش جەنگی ئەتۆمی.

كۆزمۆپۆليتەكان عەدالەت بە بەهای يەكەم و كۆمەڵگای تاكەكانيش بەيەكەم دام و دەزگـای دەولی دەژمـێرن. لەسـەر ئەو بنەمـايە، ئەگـەر خـۆتێـهـەڵقـورتاندن لە راژەی عەدالەتدابێت، ئەوا پاساوی بۆ دەكرێت و خۆتێهەڵقورتاندن لە رێگای چاكەدا رێگای پێ دەدرێت. وەلێ چاكە چييە، چۆن دەتوانين چاكە دياری بكەين؟ لە ماوەی جەنگی سارددا كۆسمـۆپۆليتە سەربەخۆ خوازەكان، ليبراليستەكان، گەيشتنە ئەو رايەی، كە خۆتێـهەڵقـورتاندن دژی سيـستـەمـە راسترەوەكـان، وەكو ديكتـاتۆريەتی **ماركۆس** لە فيليـپين و حكومـەتی رەگەزپەرستی لە باشووری ئەفەريقا، كارێكی مەشرووعە. لە كـاتێكدا كـۆزمـۆپۆليـتـە خـۆپارێزەكـان، پاسـاو بۆ خـۆتێـهـەڵقـورتاندن دژی حكومـەتە چەپرەوەكـان دەهێننەوە. لە هەشـتـاكـاندا هەندێک لەئەمـريكاييـەكـان «**پرەنسـيـپی ريگان**»يان راگەياند، واتە بەبەرژەوەندييـان زانی كە خۆيان دژی حكومـەتی ساندينی لە نيكاراگوا و هەردوو حكومەتی كۆمـۆنيستی لەئەنگۆلاو مۆزەمبيـق، هەڵقورتێنن. لەبەرئەوەی مافەكانی ديموكراسيان پێشێل كردووە.

لەنەوەدەكـان (نەوەدەكـانی سـەدەی بيـسـتـەم)و لە كـۆتايی شـەڕی سارد، لە سـاڵی ١٩٩٢دا، كـۆزمۆپۆليـتـەكان داوايان كرد كە دەستـێوەردانی مرۆڤايەتی لە «سۆمـاڵ»دا بكرێت تا برسيەتی بوەستێنرێت و بلاونەبێتەوە. هەروەها لە هايتی، بۆ گەڕاندنەوەی سەرۆكی هەڵبژێردراو (**جان برتران ارستيد**) لە ساڵی ١٩٩٤ بۆ دەسەلات. هەروەها لە ساڵی ١٩٩٦ لە زائير، بۆ وەستاندنی برسيەتی و كاری توندوتيژی رەگەز پەرستانە، كـە لەگـەڵ شـەپۆلی پەنابەرەكـان بۆ «رواندا»ی هاوسێ هاتە ئاراوە. بەگـوێرەی ئەو خوێندنەوەيە، ئەوەی كۆزمۆپۆليتە راستڕەوو چەپرەوەكان بەيەكەوە كۆدەكاتەوە، پاساو هێنانەوەيانە بۆ خۆتێهەڵقورتاندن، ئەگەر لە راژەی عەدالەتدا بێ.

هەرچی لايەنگيرانی ئاكاريـيەكانی دەوڵەتن، بەهای بنەڕەتی لە سياسەتی دەوليدا لە روانگەی ئەوانەوە، سەربەخۆييە بۆ دەوڵەت و گەل و دام و دەزگا سەرەكييـەكان. بەوپێيەی كە رێسای دياريكراو ئاكارين لە ياسای دەوليدا. گرنگترين ئەو رێسايانەش

خۆتێهەڵنەقورتاندنە لەدەوڵەتێکی خودان سەروەریتی. لەسەر ئەو بنەمایە، ئاکاریستەکان بەدەگمەن پاساو بۆ خۆتێهەڵقورتاندن دەهێننەوە. پاساو بۆ جەنگی بەرگری کردن لە یەکێتی خاکی دەوڵەت، یاخود سەروەریتی، دژی دەستدرێژیکاریی دەرەکی دەهێننەوە، کەچی جیهانی ریالیستی هەندێک جار لەم وێنەیە زۆر ئاڵۆزترە. زۆر جار دەستدرێژیکاریی دەرەکی داپۆشراوەو ئادگارەکانی روون نین. لە حوزەیرانی ١٩٦٧دا، ئیسرائیل سنووری بەزاندو و سەرەتا پەلاماری میسری دا. ئەو دەستدرێژکردنەی بەوە پاساودایەوە کە ئیسرائیل دەستدرێژیکەر نییە، چونکە ئەو هیچی نەکردووە، تەنیا دەستی خۆی پێشختووەو دەستی وەشاندووە، کە میسر خەریک بوو بیکات. کەواتە کێ دەستدرێژیکارە؟ ئایا میسرییەکان، کە هێزەکانیان بەشێوەیەک لەسەر سنوور کۆکردبووەوەو گوایا خۆیان بۆ پەلاماردانی ئیسرائیل ئامادە کردبوو یاخود ئیسرائیلییەکان کەبەر لە پەلاماری میسرییەکان دەستی خۆیان وەشاند؟..

## چەند هەڵاوێردنێک لە ڕێسایەکە

**مایکل والزر** Michael Walzer، لە کتێبەکەیدا Just and Unjust War (شەڕی ڕەواو شەڕی ناڕەوا)، گفتوگۆ لەسەر چوارحاڵەت دەکا، کەدەشێ جەنگ، یاخود دەستێوەردانی سەربازی لەباری ڕەوشتەوە پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، بەبێ ئەوەی دەستدرێژیکاریەکی ڕاست- ئاشکرا- لە ئارادابێ.

هەڵاوێردنی یەکەم لە یاسای توندی خۆتێهەڵنەقورتاندن، خۆتێهەڵقورتاندنێکی دەستپێشخەریانەیە. وەکو هێرشەکەی ساڵی ١٩٦٧ی ئیسرائیل، ئەگەر هاتوو هەڕەشەیەکی جدی و روون بۆ سەر سەروەریتی دەوڵەتێک لە ئارادا بوو، ئەوا لەسەر ئەو دەوڵەتە پێویستە بەر لەوەی کارلەکار بترازێ، بجووڵێتەوە، بەمەرجێک هەڕەشەکە خەریک بێت هائێستا نائێستا رووبدات. کەچی هێنانەوەیەکی لەم چەشنە، بۆ نموونە، پاساو بۆ خۆتێهەڵقورتاندنەکەی سۆڤیەت لە ئەفغانستان ناهێنێتەوە. لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان شەڕی دەستپێشخستن و شەڕی خۆپاراستن. دەستوەشاندنی دەستپێشخەرانە، ئەوکاتە دەبێت کە پەلامارێکی دژ بەئەو خەریکە روودەدا. هەرچی شەڕی خۆپاراستنە، ئەوکاتە روودەدا، کە بەرپرسەکان پێیان وایە پەلەکردن لەشەڕ باشترە نەک دواخستنی. لەساڵی ١٩١٤دا، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، بیری سەرۆکایەتی ئەرکانی ئەڵەمانی داگیرکردبوو. کاتێک بەرپرسە ئەڵەمانەکان لەوە

ترسان، ئەگەر هەتا ساڵی ١٩١٦ چاوەڕێ بکەن، ئەوکاتە روسیا تا ئەو رادەیە بەهێز دەبێت کە «**پلانی شیلفن**» دووچاری شکستهێنان بکا. هەڵاوێردنی یەکەمی **میشال والرز** Michael Walzer، لە رێسای خۆتێهەڵنەقورتاندن، رێگای بەشەڕێکی خۆپاراستن نەدەدا، چونکە ئەوکاتە ئەڵمانیا دووچاری هەڕەشەیەکی خێراو روون نەبیۆوە. پێشتر بەهۆی نموونەی دژ بەیەکەکان ئەوەمان بینی کەوا چەند کاری تر هەبوون دەیانتوانی بارەکە بگۆڕن لە نێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩١٦ دا.

هەڵاوێردنی دووهەم لە رێسای خۆتێهەڵنەقورتاندن، ئەو کاتە دەبێت کە خۆتێهەڵقورتاندنەکە دەبێتە کارێکی پێویست بۆ هاوسەنگ کردنەوەی خۆتێهەڵقورتاندنێکی پێشتر، ئەو رێسایەش بۆ **جون ستیوارت میل** John Stuart Mill و رای لیبرالیستەکان دەگەڕێتەوە، لەسەدەی نۆزدەهەمدا، کە دەڵێن گەل مافی چارەی خۆنووسینی هەیە، ئەگەر کۆسپ خرایە بەردەم هەرگەلێک بۆ دیاریکردنی چارەی خۆنووسینی خۆی، ئەوکاتە دەتوانرێ پاساو بۆ خۆتێهەڵقورتاندنی بەرامبەر بکرێ، بۆ چروک کردنەوەی کاریگەریی خۆتێهەڵقورتاندنی یەکەم. لەبەرئەوەی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەل دەگەڕێنێتەوە، وڵاتە یەکگرتووەکان هەندێک جار ئەو بیانگەیەی بەکاردەهێنا بۆ تێوەگلانی لە جەنگی ڤیتنامدا. هەرچی نامەکەی **میلله** Mill کە رێگا بە خۆتێهەڵقورتاندن دەدا لە حاڵەتی هاوسەنگ کردن لەگەڵ دژەکاندا، بەو پێیەی کەتەنیا خۆتێهەڵقورتاندنێکی پێشینەیە نەک بەو پێیەی پاساوی هەیە، لە ساڵی ١٩٧٩دا چین دەخالەتی لە ڤیتنام کردو سنووری ئەو وڵاتەی بری، وەلێ چین گەڕایەوەو لەماوەی چەند هەفتەیەکدا هێزەکانی خۆی کێشایەوە. چین بیانگەی ئەوەبوو کە رووبەڕووی خۆتێهەڵقورتاندنێکی ڤیتنامی دەبووەوە لە کەمبۆدیا، خۆتێهەڵقورتاندن تا ئەو رادەیە رێگای پێ دەدرێ، کە کاریگەریی خۆتێهەڵقورتاندنی یەکەم چروک بکاتەوە، نەک زۆرتر. لە بەرئەوەی پرەنسیپی سەرەکی بۆ ئەو خۆتێهەڵقورتاندنە، رێگا خۆشکردنە بۆ گەل، هەر گەلێک، بۆ ئەوەی خۆی ئەژوارییەکانی خۆی چارەسەر بکا.

هەڵاوێردنی سێیەم بۆ رێسای خۆتێهەڵنەقورتاندن، ئەوەیە کە خۆتێهەڵقورتاندن دەبێتە پێداویستییەک بۆ رزگارکردنی خەڵکێک کە دوچاری مەترسی قەسابخانەیەک دەبنەوە. ئەگەر دەستپێشخەری نەکا بۆ رزگارکردنی ئەو جۆرە خەڵکە، ئەوا خۆتێهەڵقورتاندن، وەک پەیوەندییەکی رێزداری بۆ سەربەخۆیی خۆیان و مافەکانیان، هیچ سوودێکی نابێ. تەنزانیا پەلاماری ئۆگەندای دا، ئەو رۆژە فەرمانڕەوایەکی

دیکتاتۆر کەوتبووە کوشتن و بڕینی خەڵک. پەلاماردانەکەی بەوە پاساودایەوە، کە رزگارکردنی گەلێکە لەسەربڕین. ڤێتنامیش بیانگەیەکی هاوچەشنی بۆ پەلاماردانی کەمبۆدیا بەکارهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا قەسابخانەنانەوەو هەڵمەتی جینوساید، نابێتە سۆنگەی ئەوە کەدەوڵەتان، یاخود کۆمەڵگای دەولی، هەردەبێ دەخالەت بکا. تێبینی و دوو دڵی ئەمریکاییەکان بکە لە ناردنی هێز بۆ رواندا لە ساڵی ١٩٩٤دا، یاخود بۆ بۆسنە لە ساڵی١٩٩٢و ١٩٩٥دا یاخود بۆ لیبریا لە ساڵی ١٩٩٦.

هەڵاوێردنی چوارەم، یارمەتیدانی بزاڤە جوێخوازەکانە (سەربەخۆییخوازەکان). کاتێک ناسنامەو بڕیاری خۆیان رادەگەیەنن. بەواتایەکی تر، ئەگەر کۆمەڵێک خەڵک بەروونی و بەراشکاوی رابگەیەنن کە دەیانەوێ نیشتمانێکی سەربەخۆیان هەبێت. بەپێی شەرعیەتی دەولی کەیارمەتیان دەدا بۆ جوێبوونەوە. ئەمە بە بۆچوونێک دادەنرێ بۆ یارمەتیدانی ئەو بزاڤە لەپێناو وەدەستهێنانی مافەکانی و پێشخستنی سەربەخۆییەکەی وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ. وەلێ بزاڤی جوێخوازیی کەی شایەنی یارمەتیدان دەبێت؟ ئایا سەرکەوتنەکەی دەبێتە پێوەرێک بۆ هەبوونی توانای سەربەخۆبوونی؟ نامەکەی **میلل** Mill دەڵێ: ئەو کۆمەڵەی بانگەشەی ئەوە دەکا کەوەکو نەتەوەیەک دانی پیابنرێ، پێویستە توانای هەوڵدانی هەبێت، بۆ ئەوەی رزگاری وەدەست بێنێت و خەبات لە پێناوی ئازادی خۆیدا بکات. ئەم رایەش بەلایەنی کەمەوە لەگەڵ پرەنسیپی خۆتێهەڵقورتاندن دەگونجێ. وەلێ وەک پرەنسیپێکی ئەخلاقی کەم و کوڕی تیایە، چونکە سروشتی ئەو واتایەی تێدایە کە «هێز ماف دروست دەکات».

## مافی چارەی خۆنووسین

ئەژواری خۆتێهەڵقورتاندن لەبەرژەوەندی بزاڤە جوێخوازەکاندا لە پێناسەی گەل چییە، خۆی دەبینێتەوە؟ کێ بەشداری لە دروستکردنی ژیانی هاوبەشدا دەکات، ئایا بێگانەکان دەزانن، داخۆ خەڵک بەڕاستی رەزامەندی خۆیان دەربڕیوە کە مافەکانیان لە حەوزی یەک کۆمەڵگا، یان یەک دەوڵەتدا بکاتەوە؟ مافی چارەی خۆنووسین پرەنسیپێکی گرنگە، وەلێ هەمیشە پرسیارێک رووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەوا کێ بڕیاری لەسەر دەدا؟ سۆماڵ بەنموونە وەربگرە. لە دەوڵەتە ئەفریقاییەکانی تر جیایە، گەلەکەی یەک بنەمای ئیتنی، یاخود یەک زمان بەیەکەوە کۆیان ناکاتەوە. هەروەها کینیای هاوسێی، کە دەسەڵاتی ئیمپریالیستی، لەدەیان کۆمەڵە خەڵک و

هۆزی جیا جیاو خوونەریتی جیاواز هێناویەتە ئارا. بەشێک لە باکووری کینیا سۆمالییەکانی لێ دادەنیشن، سۆمال دەڵێ پێویستە پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین رەچاوبکرێ و رێگا بە سۆمالییەکانی باکووری رۆژهەلاتی کینیاو باشووری حەبەشە (ئەثیوپیا) بدرێ کەجیا ببنەوە. لەبەر ئەوەی ئەوان لەبنەڕەتەوە یەک نەتەوەی سۆمالین. کینیاو حەبەشە ئەمەیان رەتکردەوە، گوتیان سۆمال تائێستا هەوڵ دەدا نەتەوەیەک و نیشتمانێک بەیەکەوە بنێ. دەرئەنجامیش، چەندان شەڕو شۆڕ لە باکووری رۆژهەلاتی ئەفەریقا، لەسەر مەسەلەی سۆمالی و مەسەلەی نەتەوایەتی قەومان.

هەمیشە دەنگدان ئەم جۆرە ئەژواریانە چارەسەر ناکات، مەسەلەی ئێرلەندا بەنموونە وەربگرە، ئەگەر دەنگدان لەچوارچێوەی سیاسیی ئێرلەندای باکووردا ئەنجام درا، ئەوا پروتستانتەکان کە دوو لەسەر سێی خەڵکی ناوچەکەن دەسەلات دەگرنە دەست، کەچی ئەگەر لەچوارچێوەی جوگرافی هەموو دورگەکەدا دەنگدان ئەنجام بدرێ، ئەوا کاثۆلیکەکان، کە دوو لەسەر سێی هەموو دانیشتوان پێکدەهێنن، جلەوی دەسەلات دەکەوێتە دەست ئەوان. کەواتە کێ بڕیاردەداو دەنگدانەکە لەکوێ ئەنجام دەدرێ؟ بەپێی چ بنەمایەک رۆڵەکانی ناوچەکە، دەنگی خۆیان دەدەن؟ بۆ نموونە سۆمالییەکان ویستیان دەنگدان ئەنجام بدرێت، لە کاتێکدا کینییەکان ویستیان بۆ ٤٠ تا ٥٠ ساڵی تر دوابخرێ، تاوەکو سیمای نەتەوەیی سۆمالی تەواو دەبێ.

ئایا جوێ بوونەوە ئازاری ئەوانە دەدات کە لێیان جوێ دەبنەوە؟ ئەی چی دەربارەی ئەو کەرەستانەی جوێخوازەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن، یاخود دەبنە سۆنگەی شلەژانی ئەو وڵاتەی لێی جوێ دەبنەوە؟ وەک ئەوەی کە دوای لەباریەک هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریای نەمساوی لە ساڵی ١٩١٨دا روویدا. هەرێمی سوودێت، سەرباری ئەوەی دانیشتوانەکەی بەئەڵەمانی دەپەیڤن، بەدەوڵەتی چیکوسلۆڤاکیاوە لکێنرا، دوای رێکەوتننامەی میونخ لە ساڵی ١٩٣٨دا، سوودێتییەکان لە چیکوسلوڤاکیا جوێ بوونەوەو چوونە پاڵ ئەڵەمانیا، وەلێ بەمەش ناوچە چیاییەکانی سەر سنوور دەکەوتنە دەست ئەڵەمانەکان، ئەمەش زیانێکی زۆر گەورەی لە بەرگری چیکی دەدا. ئایا راست بوو مافی چارەی خۆنووسین بدرێت بە سوودێتییەکان. هەرچەندە ئەمە چیکوسلوڤاکیا لە ئامرازەکانی بەرگریکردنی سەربازی بێبەش دەکا؟! یا لە مێژوویێکی نزیکەوە نموونەیەک وەربگرین، کاتێک لەشەستەکاندا، نێجیرییە رۆژهەلاتییەکان، ئارەزووی جوێ بوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی «بیافرا»یان دەربڕی،

نێجرییەکانی تر بەرهەڵستی ئەو هەوڵەیان کرد، چونکە «**بیافرا**» زۆربەی بیرە نەوتەکانی نێجیریای بەخۆوە دەگرت. گوتیان نەوت موڵکی هەموو گەلە، نەک بەتەنیا هی ناوچەی رۆژهەلات.

دوای ساڵی ١٩٨٩، لەئەوروپای رۆژهەلات و لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا، بەتاوتر داوای چارەی خۆنووسین کرا. چیکوسلۆڤاکیا، هەمدیس بەگوێرەی ئینتیمای رەگەزی دابەشکرایەوە، وەلێ ئەمجارەیان بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە، کۆماری چیکی لە رۆژئاواو سلوڤاکی لە رۆژهەلات دامەزرا. یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو کۆمەڵێک رەگەزی جیاوازی تێدابوو، داوای مافی چارەی خۆنووسینیان دەکرد، بەتەواوی وەک لە نێوان ساڵانی ١٩١٧و ١٩٢٠دا، زۆربەیان داوایان دەکرد، دانیشتوانی قەوقازو ئازەربیجان و ئەرمینیاو گورجستان و ئوزبەکستان و چەچان، لەسەر بنەڕەتی مافی چارەی خۆنووسین کە سادەترین مافە، داوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیان دەکرد. لەدەوڵەتی یوگسلاڤیای پێشووش، کۆمەڵەی ئایینی و رەگەزی جیاجیا جوێ بوونەوەو بانگەشەیان بۆ مافی چارەی خۆنووسین دەکرد. سلوڤییەکان و سربەکان و کرواتییەکان، توانیان کۆماری سەربەخۆ دابمەزرێنن. وەلێ سەرکەوتنی موسڵمانەکانی بۆسنەو هەرزەگوڤینیا، کەمتر بوو. لە کاتێکدا سربی و کرواتییەکان کەمینەی رەگەزیی تریان بەخۆوە دەگرت. دەبینین بۆسنە لە رووی رەگەزیەوە تێکەڵەیەک بوو. هەردوو هەرێمی سربیاو کرواتیای گەورەی بەخۆوە دەگرت. دوای ساڵی ١٩٩٢ موسڵمانەکانی بۆسنە دوچاری هەڵمەتێکی پاکسازی رەگەزی بوونەوە، لەسەر دەستی هێزەکانی سرب و کروات. شەڕ لە بۆسنەدا بۆ دانیشتووانە مەدەنییەکانیش ماڵوێرانی بوو، بۆیە لەلاهای دادگای جەنگ پێکهێنرا بۆ ئەو کەسانەی لە کوشتارەکاندا بەرپرسیاربوون. لەگەڵ ئەمەشدا دام و دەزگا دەولییەکان، نەتەوە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانییەتی باکووری ئەتلەسی و یەکێتی ئەوروپایی، لەسەر چۆنیەتی بەرپەرچدانەوە، لە زۆربەی کاتەکاندا لە نێوخۆیاندا دابەش ببوون. یەکێک لەو هۆکارانەی مەسەلەی جەنگی بۆسنەی لەدیدی کۆمەڵگای دەولییەوە بەزەحمەت یەخست، ئاستەنگی دۆزینەوەی رادەیەکی یەکلاییکەرەوە بوو، لە نێوان ئەوەی کە ململانێی بۆسنە شەڕێکی نێوخۆیی بوو لە نێوان کروات و سربییەکان لەلایەک و موسڵمانەکان لەلایەکی تر، لەگەڵ ئەوەی کە خۆتێهەڵقورتاندنێک بوو لەلایەن سربییەکانەوە، جا ئەگەر دەستدرێژیکاری نەبوایە تاکە بوار بۆ خۆتێهەڵقورتاندن ئەوە بوو رێگایان نەدابوایە قەسابخانەیەک بەرپابێ. لە رواندا‌ش بارەکە بەهەمان شێوەبوو. کۆمەڵگای دەولی هەمووی هەڵوێستی

سەرکۆنەکردنی وەرگرت، وەلێ تا کاتێکی درەنگ لە دایسانی ململانێیەکە لە ساڵی ١٩٩٥دا، نەیتوانی لەسەر کارێکی هاوبەشدا رێککەوێ.

## پاڵپێوەنەرەکان، ئامراز و دەرئەنجامەکان

ئەگەر رک بەرکەی هەڵوێستەکان کارێکی نەبووەو رێ تێنەچوویێت، کەواتە ئەو پرەنسیپانە چین کەدەشێ بۆ بریاردان لەسەر خۆتێهەڵقورتاندن بەکاربهێنرێ؟ لێرەدا سێ رەهەند بۆ بریاردان هەیە، کە دەگەرێتەوە بۆ نەریتی بریاردان لەسەر شەرعی بوون یان ناشەرعی بوونی جەنگ، ئەوانیش: پاڵپێوەنەرەکان، ئامرازەکان، ئەو دەرئەنجامانەن کە لێیان دەکەونەوە. هەر سێ رەگەزیش گرنگن، لەبەرئەوەی حوکمدان لەسەر خۆتێهەڵقورتاندن لەیەک گۆشەنیگاوە، لەوانەیە وەلامێکی هەڵە بە خۆوە هەڵگرێ، بۆ نموونە، حوکمدان لەسەر خۆتێهەڵقورتاندن بە تەنیا لە رێگای ئەو دەرئەنجامانەی کە لێی دەکەونەوە، وەک ئەو رایەیە کە دەڵێ: «هێز، ماف دروست دەکات». پێویست ناکا بڵێین دەبێ هۆکارەکانی تر، لەپاڵ ئەو دەرئەنجامانەی دەکەونەوە، لەبەر چاو بگێرین. هەروەها نیازی چاکەکردن بەتەنیا بەس نییە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ خۆتێهەڵقورتاندن. بۆ وێنە، **نورمان پودهورتز** Norman Podhoretz ی نووسەر، ولاتە یەکگرتووەکان بە راست دەزانێ، کە دەخالەتی لە ڤێتنامدا کرد، لەبەر ئەوەی ئەمریکاییەکان دەیانویست ڤێتنامی باشوور لە حکومەتێکی دیکتاتۆری رزگاربکەن. کەواتە ئەگەر بۆچوونەکەی راست بێت، کەوا وەسفی کرداری سەربازی ئەمریکی لە ڤێتنام کردووە کە «دزێو بوو، وەلێ ئەخلاقی بوو» ئایا وادەکات کە نیاز چاکی بۆ کارێکی راست، مەشرووع بێت؟ پێویستە بەتەنیا لای پاڵپێوەنەرەکان نەوەستین، بەڵکو ئەو دەرئەنجامانەش بە هەند وەرگرین کەلێی دەکەونەوە.

لەشەری ڤێتنامدا، بەتەنیا هێندە بەس نەبوو کە ولاتە یەکگرتووەکان هەوڵی رزگارکردنی ڤێتنامی باشوور بدا، لەو مەرگەساتەی ڤێتنامییەکانی باکوور، بەسەریان هێنابوون. ئەو ئامرازانەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بەکارهێنران خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەکەو عەدالەتی ئەو دۆزەش مەسەلەیەکی ترە، ئەو پرسیارانەی کەلەم دەروازەیەوە دەکرێ ئەوەیە: ئایا ئەلتەرناتیڤی تر هەبوو؟ ئایا خۆتێهەڵقورتاندن دوا چارەسەر بوو؟ ئایا نەدەکرا خەڵکی بێ تاوان بپارێزرێن؟ ئایا عەدالەت لە ئارادا هەبوو، واتە وەک دەڵێن سزاکە بەقەدەر تاوانەکە بوو، یاخود زێدەرۆیی تێدابوو؟ ئایا کارڕایی حوکمدانێکی بێلایەنانە دابین کرا؟ تا چ رادەیەک بایەخ بە کارڕایی دەولیی

فرەلایەن درا، کە رادەیەک بۆ مرۆڤ دادەنێ لە قۆستنەوەی شتەکان لە پێناو مەبەستی خۆیدا؟ ئەی چی دەربارەی ئەودەر ئەنجامانەی لێی دەکەونەوە؟چی دەربارەی هەلی سەرکەوتن؟ چی دەربارەی ئەو مەترسییانەی حسێویان بۆ نەکرابوو، لە سۆنگەی ئەوەی بەشێوەیەکی تەواوو بێلایەنانە لەبارەکە نەتوێژرابووەوە؟ یاخود لە سۆنگەی ئاستەنگی لەیەکتر جوێکردنەوەی مەدەنییەکان و جەنگاوەرانی شەڕی پارتیزانی؟ وەک ئاشکرایە، پێتڤییە، کە سەیری بارێکی ئاوا دەکەین، کە بەرِادەیەکی گەورە ئاڵۆزو تێک شێواوبێت، لەسەرەخۆبین. بەشێوەیەکی تر، بریاردان پێویستی بە توێژینەوەی پاڵپێوەنەرەکان و ئامرازەکان و ئەو دەرئەنجامانە هەیە کەلێیان دەکەونەوە.

تێبینی ئەوە بکە، سیاسەتی بەخۆوەگرتن لە ڤێتنام چۆن بەرەو خۆتێهەڵقورتاندن چوو، پێشتر تێبینی ئەوەمان کردبوو. لە قۆناغەکانی یەکەمی شەڕی ساردا، کە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە هات، ئەو مەسەلەیە خراوەتە روو، کە ئەگەر لەسەر وڵاتە یەکگرتووەکان پێویست بووبێت، شوێنی بەریتانییەکان بگرێتەوە لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا، تا تورکیاو یونانییەکان لەداو بۆ دانانەوەی سۆڤیەتییەکان بپارێزێ.

دەمەتەقێ لە نێو وڵاتە یەکگرتووەکان لە سەر ئەوەبوو کە چۆن بۆ گەلی ئەمریکی شی بکەنەوە! وەزیری هەندەران «**جورج مارشاڵ**» و بەرپرسەکانی تر بەتەواوی وریا بوون، لە کاتێکدا جێگری وەزیری هەندەران دین **ئاچیسون** Acheson Dean و **سیناتور ئارثەر ڤاندنبرک** Arthur Vandenburg داوایان دەکرد، تا مەسەلەکە ببێتە مەسەلەیەکی مرۆڤایەتی، پشت بە وتارێکی ئاکاری ببەسترێ، بۆیە سەرۆکی ئەمریکا **ترومان** Truman دەستی بە باسکردنی رزگارکردنی خەڵکانی رزگاریخواز کرد لە هەموو شوێنێکدا.

**جورج کینان** George Kennan دەربارەی سیاسەتی بنکۆڵکردن دوچاری بێ ئومێدی ببوو. لە پلانە دوژمنکارانەکەی **ستالین** ئاگاداری کردنەوە، ئەو پێی وابوو وڵاتە یەکگرووەکان هەوڵی بنکۆڵکردنی هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەتی دەدا، بەشێوەیەکی تر هەر شتێک کە ببێتە سۆنگەی هێنانەدی هاوسەنگی لەگەڵ ئەو هێزە دەدا، بەبێ ئەوەی هێزەکانی ئەمریکایی بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەخالەت بکەن. شتێکی باشە، وەلێ ئەوانەی بەلای بەروانگەی ئایدیۆلۆژییەوە بوون، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەوا کۆمۆنیزم بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەخۆوە بگیرێ. بەتێپەڕبوونی کات، لەبەردەم روانگەیەکی فراوانتردا، بنکۆڵکردنی هێزی کۆمۆنیزم گەڕایەوە دواوە. ئەویش پارێزگاری کردنی هەموو جیهان بوو لە کۆمۆنیزم. ئەو روانگەیە وای لەسەر

کردە ئەمریکاییەکان کرد کە لە بەهای جیاوازییە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی نێوان دەوڵەتە کۆمۆنیستەکاندا کەم بکەنەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان وای لێهات هەست بکا کە پێویستە، هەردوو هێزی سۆڤیەتی و چینی و بڵاوبوونەوەی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم بنکۆڵ بکا. لەگەڵ ئەوەی لەساڵی ١٩٤٧دا پرەنسیپی بەخۆوەگرتن لە رۆژهەڵاتی ناڤینەوە بۆ باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا گوێزرایەوە، بۆ خۆتێهەڵقورتاندنێکی زۆر سەرەرۆیانەو چارەرەش وەرچەرخا، لەپەنجاکاندا.

لەمەدا ئەوە پوخت دەکەینەوە، کە پێوەری خۆتێهەڵنەقورتاندن هەربەگرنگی دەمێنێتەوە. هەرچەندە پرەنسیپی خۆتێهەڵنەقورتاندنی رەهای سادە، زۆرجار بەشێوەیەکی کردەنی پێشێل کراوە. هەرچی هەڵاوێردنەکانی رێسای خۆتێهەڵنەقورتاندنە پێویستە هەریەک بەتەنیا حوکمیان لەسەر بدەین، لە رێگای سەیرکردنی پاڵپێوەنەرەکان و ئامرازەکان و ئەو دەرئەنجامانەی لێیان دەکەونەوە.

## یاساو رێکخراوەی دەولی

سەروەریتی نیشتمانی و خۆتێهەڵنەقورتاندن دوو پرەنسیپی پیرۆزن لە دیدی یاساو رێکخراوەی دەولییەوە. هەندێک خەڵک لەبەرئەوەی پشت بە نموونەی خۆجێی دەبەستن لە یاساو رێکخراوە دەولییەکانی ناگەن، وەلێ رێکخراوەی دەولی وەک حکومەتێکی نیشتمانی نییەو یاسای دەولیش وەک یاسایەکی خۆجێی نییە. لەبەر دوو هۆ رێکخراوەکە حکومەتێکی جیهانی نییە: یەکەمیان چونکە سەروەریتی دەوڵەتانی ئەندام لە میساقی زۆربەی رێکخراوە دەولییەکاندا پارێزراوە. بەندی (٢-٧) لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێ: «لە میساقەکە، هیچ شتێک رێگا بەنەتەوە یەکگرتووەکان نادا، لەوکاروبارانەی دەکەونە چوارچێوەی سنوورەکانی دەسەڵاتی قەزاییەوە»، واتە رێکخراوەکە ئەلتەرناتیڤێک نییە بۆ دەوڵەتانی خودان سەروەریتی.

هۆی دووهەم کە رێکخراوی دەولی، حکومەتێکی جیهانی نییە، بێ هێزیی رێکخراوەکەیە. راستە دەسەڵاتێکی قەزایی دەولی هەیە: «دادگای عەدلی دەولی»، کە لە ١٥ قازی پێکهاتووەو UN هەڵیاندەبژێرێ کە بۆماوەی (٩) ساڵ لە دادگاکەدا کاربکەن. وەلێ دادگای عەدلی دەولیی، دادگایەکی باڵای جیهانی نییە. دەوڵەتان دەتوانن دان بە دەسەڵاتە قەزاییەکەیدا نەنێن. هەروەها دەوڵەت دەتوانێ ئەو حوکمە رەتبکاتەوە کە ئەو دادگایە دەری دەکات، هەرچەندە دانی بەدەسەڵاتە قەزاییەکەشیدا

نابێت. بۆ نموونە، لە هەشتاکاندا ئیدارەی سەرۆک «**ریگان**» ئەو بڕیاری دادگای ناوبراوی ڕەتکردەوە کە دەڵێ: مین چاندنی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەندەرەکانی نیکاراگوا، شەرعی نییە.

ئەگەر وامان هێنایە بەرچاو، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هاوشانە لەگەڵ ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی، خۆمان لەبەردەم جۆرێکی سەیر لە ئەنجوومەنی یاسادانان دەبینینەوە. ئەو لەسەر ئەو پرەنسیپە دەوەستێ کە «هەردەوڵەتێک یەک دەنگی هەیە». وەلێ ئەو پرەنسیپە رەنگدانەوەی دیموکراسی، یاخود پەیوەندی هێزەکان نییە لە جیهاندا. چونکە دیموکراسی لەسەر پرەنسیپی «بۆ هەر تاکێک دەنگێک» راوەستاوە.

لە کاتێکدا لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەبینین، دورگەکانی مالدیف لە باشووری ئۆقیانووسی هیندا، کە ژمارەی دانیشتوانیان دەگاتە سەد هەزار کەسێک، یەک دەنگی هەیە، چینیش کە ژمارەی دانیشتوانی زێتر لەیەک ملیارە، ئەویش یەک دەنگی هەیە. واتە هێزی دەنگدانی هەر کەسێکی مالدیف، بەرامبەر هێزی دەنگدانی سەد هەزار کەسی چینییە. ئەمەش نە لەگەڵ پێوەرەکانی یاسادانانی دیموکراسیدا دەگونجێ، نەبەشێوەیەکی باش رەنگدانەوەی هێزی راستەقینەیە. چونکە دورگەکانی مالدیف لە کۆمەڵەی گشتی دا تەبای وڵاتە یەکگرتووەکان، یاخود هیندستان، یاخود چین یەک دەنگی هەیە. کەواتە ئەمە رەخنەیەکە لە کۆمەڵەی گشتی دەگیرێ و وا لە دەوڵەتان دەکا حەز نەکەن رێگای کۆمەڵە بدەن یاسای پابەندکار دەربکات. بۆیە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، تەنیا بڕیارن، نەک یاسا.

لە کۆتاییدا لەوانەیە ئەمینداری نەتەوە یەکگرتووەکان، وەک سەرۆکێکی نوێی جیهان بێنینە بەرچاوی خۆمان، وەلێ ئەمە رێگا ونکردنێکی ترە. ئەمینداری گشتی بەڕێوەبەرێکی بێ هێزی تەنفیزییە، ئەگەر دەسەلاتێکیشی هەبێت، ئەوا لەدەسەلاتی پاپا نزیکترە، تا دەسەلاتی سەرۆک دەوڵەتێک. هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە رێکخراوە دەولییەکان، لە رێگای بەراوردکردنی لەگەڵ حکومەتدا، جا هەر حکومەتێک بێت، بێگومان دەبێتە هۆی وەدەست هێنانی وەلامی ناراست و هەڵە.

بەهەمان شێوە یاسای دەولی، بەیاسای خۆجێی ناچێت. یاسای خۆجێی لە دایک بووی یاسادانەران و نەریتی یاساییە، کە هەندێک جار پێی دەگوترێ «یاسای گشتی». هەروەها یاسای خۆجێی بەندو ئەحکامی وای تێدایە، کە لەلایەن تاکەکانەوە کاریان پێدەکرێ و جێبەجێ دەکرێ (دەتوانی بچییە دادگاو داوایەک بەرزبکەیتەوە)و

بە هەمـوارکـردنی یاسـایی راست دەکـرێتـەوە. بەم واتایە، یاسـای گـشـتـی دەولی لەم مـانایە نزیکە، لەو رووەوە کـە ئەویش بەڵـێننامـە بەخـۆوە دەگـرێ، کـە ئەو ژی رێکەوتننامەیە لە نێوان دەوڵەتاندا، نەریتی دەولی کە بەشێوەیەکی گشتی پراکتیکی قبوول کراوی دەوڵەتانە. وەلێ لە رووی هێزی جێبەجێ کردن و سنووری قەزاییەوە، بەرادەیەکی زۆرگەورە جیاوازییان هەیە. ئەگەر چووینە سەر هێزی جێ بەجێکردن، دەبینین هیچ دەزگـایەکی جـێبـەجێ کـردن لە ئارادا نیـیـە کـە وا لە دەوڵەتان بکا بریارەکـانی دادگـا قبـوول بکەن. سـیاسـەتی دەولی سـیسـتـەمێکە خۆی راژەی خۆی دەکات.

پێشان دەوڵەتە گەورەکان، یاسای دەولیان بەشێوازێکی کلاسیکی پیادە دەکرد. بۆ نموونە لە یاسـای دەریاوانیـدا، نەریتـێک سـەری هەڵدا دەڵێت: دەوڵەت، جـا هەر دەوڵەتێک بێت، دەتوانێ مـافی ئاوی هەرێمی بۆ مـاوەی سێ مـیل بسـەپێنێ. ئەو رۆژەی کە دەوڵەتانی وەک پورتوگال و ئورگوای، لە سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا سنووری ناوچەی ئاوی خـۆیان فـراوان کـرد، بەریتـانیـا ئەو رۆژە گـەورەترین هێـزی دەریاوانی بوو لە جیـهاندا، کەشتیگەلی خۆی نارده دووری سێ میل لە کەنارەکانی هەردوو دەوڵەتەکـە. بەم چەشنە ئەم دەوڵەتە مەزنە یاسایەکی نەریتی سـەپاند. دەشێ مرۆڤ بپرسێ، ئەدی ئەگەر بەریتانیا یاسای پێشێلکرد، کێ یاسای لەسەر جێبەجێ دەکات؟ وەلام، جێبەجێکردنی یاسا لەسایەی سیسـتـەمی «خۆت راژەی خۆت بکە» یەک تاقە رێرەوی هەیە.

دادگایی کردن لەیاسای دەولیدا، لە نێوان دەوڵەتاندا بەرێوەدەچێت نەک لە نێوان تاکەکاندا. بەتەنیا دەوڵەتان، نەک چەندین ملیار مرۆڤی سەر رووی زەوی، دەتوانن کێشەکانی خۆیان بخەنە بەردەم دادگای دەولییەوە. دەوڵەتانیش بەشێوەیەکی ئاسایی کێشەکانی خۆیان ناخەنە بەردەم ئەم دادگایە، تەنیا ئەگەر ویستیان خۆیان لە کێشەکە بکشێننەوە، یاخود بەهەلێکی لە باریان دیت کە کێشـەکە دەبەنەوە بەم شێوەیە، تەنیا ژمـارەیەکی کـەمی کـێشـە لەبەردەم ئەم دادگـایە دایە. پاشـان هەتا ئەگـەر لەسـەر پرەنسیـپـەکەش رێککەوتن، ئەژواری راڤەکـردنی رێساکانی نەریتی و هەڵبژاردنی چ نەریتێ لە ئارادایە. بۆ نموونە، پرەنسـیـپی مـوڵک زەفـتـکردن، یاخـود خـۆمـاڵی کـردن وەربگرە، ئەوەی زانراوەو قـــبـــوول کـــراوە ئەوەیە کـــە هەر دەوڵەتێک دەتـوانێ کۆمـپـانیـایەکی بێگانە خـۆمـاڵی بکـا، کەلەسەر خـاکی ئەودا کـاردەکـات. (وەک چۆن میسر کەناڵی سوێسی خۆماڵی کرد، هەروەها عێراق لە ساڵی ١٩٧٢ نەوتی خۆماڵی

کرد). وەلێ ئەو دەوڵەتە پابەندە بەوەی کەچەندەی پێدەشێ، قەرەبووی کۆمپانیایەکە بداتەوە. وەلێ کێ بڕیار دەدا کە قەرەبووەکە رەوایە، یاخود ناڕەوایە؟ زۆر لەدەوڵەتە دواکەوتووەکان داوای قەرەبوو کردنەوەیەکی زۆر بەرز دەکەن.

لەکۆتاییدا، ئەو بڕیارانەی کە کۆمەڵەی گشتی دەریان دەکات، بڕێکی زۆر تەم و مژییان پێوەیە، ئەو بڕیارانە یاسای دانراوی پابەند نین. تاکە شوێن کەدەوڵەت ناچار دەکات پابەندی بڕیارەکان بێ لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەشی حەوتەمە، کەهەڕەشەکردن و پێشێلکردنی ئاشتی وکرداری دوژمنکارانەی باسکردووە. جا ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش- نەک کۆمەڵەی گشتی- بینی کەوا کارێکی دوژمنکارانە، یاخود هەڕەشەکردن لە ئاشتی لە ئارادایە و پێویست بەوە دەکات سزا بسەپێنێ، لەسەر دەوڵەتە ئەندامەکان پێویستە سزاکان جێبەجێ بکەن. ئەمە لە ساڵی ١٩٩٠دا روویدا، کاتێک عێراق پەلاماری کوێتی دا.

رێگایەکی تر کە هەندێک جاران یاسایەکی نوێی پێ دادەڕێژرێ، کۆنگرە گەورەکانە. کاتێک دانوستان دەکرێ بۆ داڕشتنی پەیماننامەیەک کەحکومەتە بەشداربووەکان ئیمزای دەکەن. زۆربەی ئەو کۆنگرانە بەر فراوانن و بەیەکەوە لکاونین. نموونەش بۆ ئەمە کۆنگرەی یاسای دەریاییە، کە لەحەفتاکاندا گرێ درا. زێتر لەسەد دەوڵەت بەشداریان تیادا کردو هەوڵیاندا پرەنسیپەکانی ئاوی هەرێمی، کە (١٢) میل درێژە دابڕێژن. بۆ ماوەی (٢٠٠) میل درێژ بکرێتەوە و یەدەگی مەنگەنیز لە قوولایی دەریاکان بە موڵکی هەموو مرۆڤایەتی دابنرێ. ئەژواریەکە لەوەدابوو کە هەندێک دەوڵەت، تەنیا بەچەند بەشێکی دەقەکە رازی بوون. دەرئەنجامەکانیان لە یاسای دەولی بەنادیارو ناروونی هێشتەوە.

یاسای دەولیی، لە بنەڕەتەوە رەنگدانەوەی سروشتی سیاسەتی دەولی نایەکدیگیرە. هەست کردنێکی لاواز بەکۆمەڵگا، واتای ئەوەیە توانای گوێڕایەڵی، یاخود جڵەوگیری خود، بەوپێیەی هەست کردن بەپابەندبوون، یاخود قبووڵکردنی مەرجەعیەت، کەمە.

لەئارادا نەبوونی دەستەیەکی هاوبەشی جێبەجێکردن، کە مافی بە کارهێنانی هێزی هەبێ، واتای ئەوەیە دەوڵەتانی خودان سەروەرێتی لەجیهانی «خۆت راژەی خۆت بکە» و جیهانی «بەکارهێنانی هێز لە پێناو مانەوەیدا» دەژی. پێی ناوێ باسی ئەوە بکەین، کاتێ کاری پەیوەست بەمانەوە بەدیاردەکەوێ، یاسا بۆ پایەی دووهەم دەگەڕێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا یاسای دەولی و ڕێکخراوەکانی دەولیی لایەنێکی گرنگ لە واقعی سیاسی پێکدەهێنن، لەبەرئەوەی کار لە ڕەفتاری دەوڵەتان دەکەن. دەوڵەتانیش لەبەر دوو هۆ بایەخ بەیاسای دەولیی دەدەن. (الاستشراف) و شەرعییەت.

دەوڵەتان تا هەتایە لەگەڵ یەکتردا لە ململانێ دان. سەوداو مامەڵەی دەولی بەگشتی و تایبەتییەکەیەوە زۆر ئاڵۆزە و لک و پۆپی لێ دەبێتەوە: بازرگانی و گەشت و گوزارو نێردە دیپلۆماتیکییەکان و پەیوەندی نێوان خەڵک بەڕێگای سنوورەکانەوە. لەگەڵ فراوان بوونی چوارچێوەی پشت بەیەکتربەستن، چوارچێوەی ئەو پەیوەندییانە فراوان دەبێت. لەگەڵ ئەویشدا ئەگەرەکانی بەیەکترکەوتن زێتر دەبن، یاسای دەولیش لەسەر ئاستێکی بەرز، هەل بۆ حکومەتان دەڕەخسێنێ کە ئەو یەککەوتنە ڕوودەدا خۆیان پێکدادان بپارێزن. بۆ نموونە، ئەگەر گەشتیارێکی بەریتانی بەهۆی ئاودیوکردنی ماددەی بێ هۆشکەر (مخدرات) لە تایلەند گیرا، یاخود کەشتییەکی فەڕەنسی لە دەریای باکوور خۆی لە کەشتییەکی نەرویجی دا، یاخود کۆمپانیایەکی ژاپۆنی رایگەیاند کە کۆمپانیایەکی هیندستانی لاسایی بەرهەمەکانی ئەو دەکاتەوە. دەشێ حکومەتەکانی ئەو وڵاتانە نەیانەوێ بەهۆی ئەو ڕووبەڕووبوونەوە تایبەتییانە، پەیوەندییەکانی نێوانیان تێک بدەن. چارەسەری ئەم جۆرە کێشانە، بەگوێرەی یاسای دەولی و ئەو پرەنسیپانەی لەسەری ڕێککەوتوون، وا دەکا ئەوانە لەو مەسەلانە دەرهاوێ کە بۆیەکی سیاسیان پێوەیەو توانای سەرپەرشتیکردن یاخود «وەرگرتن و دانەوەی» هەبێ. لەبەر ئەوەی وەرگرتن و دانەوە پێویستین بۆ چالاک کردنی مامەڵەکردنەکان و چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکیانەی کەلێیان دەکەوێتەوە، بەڕێگایەکی گونجاو.

«شەرعییەت» هۆی دووهەمە بۆ ئەوەی حکومەتەکان بایەخ بەیاسای دەولیی بدەن. سیاسەت بە تەنیا خەبات کردن نییە لە پێناو هێزی ماددی، بەڵکو پێشبڕکێیەکیشە لە پێناو شەرعییەتدا. هێزو شەرعییەتیش دوو شتی دژ بەیەک نین، بەڵکو تەواوکەری یەکترین.

مرۆڤ هەموویان لە سەداسەد ئاکاری نین. یەکێک لە ڕاستەقینە سیاسییەکان ئەوەیە کە باوەڕهێنان بەڕاستی و ناڕاستی یارمەتی ئەوە دەدا کە پاڵ بە خەڵکەوە بنێ، بۆ ئەوەی کاربکەن. بۆیە شەرعییەت سەرچاوەی هێزە. ئەگەر ڕەفتارەکانی دەوڵەتێک بەنامەشروع حسێو کرا، وای لێ دێت تێچوونی سیاسەتەکەی زۆرگران لەسەر بوەستێ. بۆیە دەوڵەتان لە سیاسەتەکانیاندا، یاخود بۆ لەکەدارکردنی سیاسەتی

دەوڵەتانی تر، پەنا بۆ «ناشەرعی» بوون دەبەن. زۆربەی کاتیش ئەمە شێوەی تەکتیکاتەکانی ئەو دەرئەنجامانە دەنەخشێنێ کە لێیان دەکەونەوە.

## کەناڵی سوێس

تەنگژەی کەناڵی سوێس لە ساڵی ١٩٥٦دا، نموونەیەکی باشمان پێشکەش دەکات. کەناڵی سوێس لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بە دەستی بەریتانی و فەرەنسییەکان هەڵکەنرا. بۆ رێگای بەریتانییەکان بۆ هیندستان گرنگی هەبوو. لە ساڵی ١٩٥٦دا نزیکەی چواریەکی ناردنە دەرەوەی بەریتانیا لە رێگای کەناڵی سوێسەوە بوو. لە تەمووزی ئەو ساڵەدا، سەرۆکی میسر، **جەمال عەبدولناسر** ئەو کەناڵەی خۆماڵی کرد. سەرۆک وەزیرانی بەریتانی «**سیر ئەنتۆنی ئایدن**»، ئەو هەنگاوەی بە هەڕەشەیەکی گەورە بۆ سەر بەریتانیا لێکدایەوە، **عەبدولناسری** بە **هیتلەرێکی** نوێ لە قەڵەم دا. ئەم بارەی لەگەڵ باری سییەکاندا بەراورد کرد. کە بەریتانیا شکستی هێنا لە وەرگرتنی هەڵوێستێکی توند، لە چوونە ناوەوەی **هیتلەر** بۆ نێو خاکی«راین». بەریتانیا لەوە ترسا کە **عەبدولناسر** ببێتە سۆنگەی راکێشانی نەتەوە خوازەکانی عەرەب و شوێن پایەی بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بلەقێنێ. هەروەها ئەوەش بەریتانیای دوچاری دڵەڕاوکێ کردبوو کە عەبدولناسر رازی ببوو چەک لە سۆڤیەت بکرێ. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە جەنگی سارد لە چڵەپۆپە دابوو.

لە مانگی ئاب و سەرەتای ئەیلوولی ١٩٥٦دا، بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە کۆمەڵەی سوودمەندانی کەناڵی سوێس دابمەزرێنن، گوتیان میسر بۆی هەیە کەناڵەکە خۆماڵی بکات، بەو مەرجەی کۆنترۆڵکردنی کەناڵەکە لە دەست ئەو کەسانەدا بمێنێتەوە کە بۆ دەریاوانی بە کاری دەهێنن. **عەبدولناسر** ئەو چارەسەر کردنە نێوەندییەی رەتکردەوە. ئەو کاتە بەریتانیا پلانێکی نهێنی لەگەڵ فەڕەنسا و ئیسرائیل، کە بە دەستی چالاکی پێشمەرگە عەرەبەکان کەوتبوونە زاڵەو عەبدولناسر هانی دەدان، ئامادەکرد کە تیایدا داوای دەکرد ئیسرائیل پەلاماری میسر بدات، ئەو کاتە بەریتانیا و فەرەنسا خۆیان تێهەڵدەقورتێنن، بەو داوایەی کەوا کەناڵ دوچاری هەڕەشە بووە، بەم چەشنە بە بیانگەی بەرگری لە خۆکردنەوە، هێزەکانی ئیسرائیل هاتنە ناو سیناو پشتیان بە بەندی(٥١)ی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان بەستبوو. کە لە کاتی بەرگری لە خۆکردن رێگای بە بەکارهێنانی چەک دەدا. لە کاتێکدا بیابانی سینای دەبڕی و بەرەو کەناڵ دەچوو، بەریتانیا و فەرەنسا،

رایانگەیاند کە بۆ ئەوەی زیان بە کەناڵەکە نەگات، ئەوانیش گەرەکیانە دەخالەت بکەن. ئەنجوومەنی ئاسایشی دەولی لە تەنگژەکەی کۆڵیەوە. بیانگەکانی دەست درێژکارییەکەی رەتکردەوە و داوای وەستاندنی تەقەی کرد. بەریتانیا و فەرەنسا مافی«ڤیتۆ»یان بە کارهێنا. بۆ ئەوەی رێگا نەدەن تەقە بوەستێنرێ. ویستیان بەردەوام خۆیان تێهەڵقورتێنن تا بتوانن **عەلبدولناسر** لە کۆڵ بکەنەوە.

ئەمیینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان «**داغ هامر شولد** Dag Hammar. skjold بە هاوکاری وەزیری هەندەرانی ئەو کاتەی کەنەدا «**لیستر پرسن** Pearson Lester» پلانێکیان پێشکەش کرد، سەبارەت دابەزینی هێزەکانی ئاشتیپارێزی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە نێوان هێزەکانی میسر- ئیسرائیلدا. کە هیچ بیانگەیەکی خۆتێهەڵقورتاندنی لای بەریتانی و فەرەنسییەکان نەدەهێشتەوە. لە کۆمەڵەی گشتی بریارێک دەرچوو و مافی «ڤیتۆ» بە کارنەهێنرا، کە رێگای دەدا هێزێکی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان لە سینادا بلاو بکرێتەوە. ولاتە یەکگرتووەکان پشتگیری هاوپەیمانە ئەورپاییەکانی نەکرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا ئەو خۆ تێهەڵقورتاندنە رق و کینەی نەتەوە خوازە عەرەبەکان بورووژێنێ و هەلی هاتنە ناوەوەی سۆڤیەتییەکان بۆ رۆژهەلاتی ناڤین زێتر بکات. بۆیە ولاتە یەکگرتووەکان پاڵپشتی پلانەکەی «**هامر شولد- پیرسن**»ی کرد. بە ئەنقەست زێتر فشاری خستە سەر بەریتانیاو نەیهێشت سندووقی دراوی دەولیی قەرزێکی پشتگیری کردنی بداتێ لە کاتێکدا پاوەنی ئیستەرلینی دوچاری فشارێکی گەورە ببووەوە، بەریتانی و فەرەنسییەکان خۆیان دایە دەست بارەکەو رەزامەندیان لەسەر تەقە وەستاندن نواند. سۆڤیەتییەکان ئەو کاتە خەریکی دەخالەتکردن لە «هەنگاریا» بوون: کە هەولیدەدا ئازادی خۆی وە دەست بێنێت.

***دەقی نامەکەی سەرۆک وەزیرانی***

***بەریتانیا «ئەنتۆنی ئایدن» بۆ سەرۆکی ئەمریکی ئایزنهاور***

*لە سییەکاندا هیتلەر لە رێگای زنجیرەیەک جوولانەوەی دیراسەتکراوەوە شوێنی خۆی چەسپاند. بە داگیرکردنی خاکی«راین» دەستی پێکرد و ئەمەش کاری دوژمنکارانەی یەک لە دوای یەکی بە دوادا هات دژی نەمسا و چیکۆسلۆڤاکیا و پۆڵەندا، رۆژئاوا بە شێوەیەکی گشتی، زۆر لە دانیشتوانی ئەوروپا ئەمەیان قبووڵ کرد، پاساویان بۆ هێنایەوە... ئێمە لەو بروایە داین کە دەست بەسەر داگرتنی*

*کەناڵی سوێس، سەرەتای هەڵمەتێکی نەخشە بۆکێشراوە. کەعەبدولناسر دایڕشتووە، بۆ ئەوەی نفوز و بەرژەوەندی ڕۆژئاواییەکان لە وڵاتە عەرەبییەکاندا نەهێڵێ. ئەو لەو بڕوایەدایە ئەگەر ئێستا توانی لەسزادان رزگار بێت، بتوانێ بە سەرکەوتوویی بەرەنگاری هەژدە دەوڵەت بێتەوە لە جیهانی عەرەبیدا. بەمەش پایەی هێندە بەرز دەبێتەوە کە وا لە ئەفسەرە گەنجەکان دەکات لە سعودیە و ئوردن و سوریا و عێراق(دەزانین ئێستا عێراق خۆی بۆ شۆڕشێک ئامادە دەکات، ئەو وڵاتەی کە لەهەموان سەقامگیرتر و پێشکەوتوو ترە) شۆڕش بەرپا بکەن. ئەو حکومەتە نوێیانە دەبنە پاشکۆیەک لەفەلەکی میسری، ئەگەر لەفەلەکی سۆڤیەتیدا نەبێت. کە پێویست دەبێت داهاتی نەوتی خۆیان هەموو بخەنە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتووەوە، لە ژێر سەرکردایەتی میسر و سەر بە یەکێتی سۆڤیەت. ئەو ڕۆژەی کە شتێکی ئاوهاش بێتە دی، عەبدولناسر دەتوانێ ئەورووپای ڕۆژئاوا لە نەوت بێبەش بکات، ئێمەش دەکەوینە ژێر میهرەبانیی ئەوەوە».*

***سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا- ئایدن***

بەریتانی و فەرەنسییەکان بە هۆی فشاری ئەمریکاییەکان لەلایەک و سەرنەگرتنی داواکانیان لە لایەکی ترەوە، ناچاربوون تەقە رابگرن. ڕێگایەکی تر هاتە ئاراوە بۆ لێک کردنەوەی هێزەکانی میسر و ئیسرائیل بۆ پاراستنی کەناڵی سوێس لە زەرەر و زیان. لە (١٥)ی تشرینی دووهەم، کۆمەڵەی یەکەم لە هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە سینا لە نێوان هێزە شەڕکەرەکاندا دانرا. مانگی دواتر ڕێکخراوی دەولیی دەستی کرد بە پاک کردنەوەی کەناڵ لەو کەشتیانەی تیایدا نغرۆ ببوون. یاسای دەولی و پێشێلکردنی هەروەها چوونە نێو ڕێکخراوی دەولی، ڕۆڵێکی بنەڕەتیان هەبوو لە سیاسەتەکانی تەنگژەی کەناڵی سوێسدا.

لەوانەیە یاسای دەولی لە ململانێ لەسەر بەرژەوەندییە گەورەکان، نەتوانێ جڵەوی دەوڵەتان بگرێتەوە، وەلێ زۆربەی کات لە نەخشەکێشانی رووگەی سیاسەتەکاندا، سوودی دەبێت. یاسا بەشێکە لە ململانێی هێز. دەشێ گومانکاران بڵێن ئەمە تەنیا یارییەکە و پارێزەرە گەورەکان دەیکەن. وەلێ لە ڕاستییەکەی کاتێ حکومەتان دەزانن کە دەبێ بیانگەی یاسایی بخرێتەڕوو، یاخود بڕیارەکانی ڕێکخراوە دەولییەکان لەبەر

چاو بگرن، واته ئەو بڕیارانە تەواو بێ بەها نین. ئەمەش ئەو پەندەی لەسەر پراکتیزە دەبێت کە دەڵێ: «ئەگەر خراپە، خۆی پێ چاک بوو، کەمترین واتا ئەوەیە کەوا چاکە بەهایەکی هەیە». بە واژەیەکی سادەتر دەڵێین: لەوانەیە حکومەتان بکەونە تۆڕی ئەو بیانگە سیاسییانەی کە خۆیان دەیهێننەوە.

نموونەیەکی تر، بڕیاری ژمارە(٢٤٢)ی ئەنجوومەنی ئاسایشە، ئەو بڕیارە دوای شەڕی ١٩٦٧ دەرچوو. بڕیارەکە داوای لەلایەنەکانی شەڕەکە کرد کە بگەڕێنەوە بۆ سنوورەکانی بەر لە جەنگ. بە درێژایی ساڵانی رابردوو بانگەشەی ئەوە دەکرا کە ئەو زەوییانەی ئیسرائیل لە کاتی جەنگ داگیری کردوون شەرعی نین. هەڵوێستی ئیسرائیل لە نەتەوە یەکگرتووەکان تەنیا هەڵوێستێکی بەرگریکەرانە بوو. راستە عەرەبەکان جەنگیان دۆڕاند، وەلێ لە پایەیەکی وادابوون، کە دەیانتوانی فشار بخەنە سەر ئیسرائیل. ئەو رۆژەی هاوبەندیی عەرەبانیش لە ساڵی ١٩٧٦دا هەوڵیاندا ئیسرائیل لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەدەرنێن، وڵاتە یەکگرتووەکان هەوڵێکی سیاسی زۆر گەورەی دا بۆ ئەوەی ئیسرائیل دەرنەکرێت. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەوەی سیمبولی شەرعییەت لە رێکخراوە دەولییەکاندا، بەشێکە لە ململانێی هێز.

کاتێک مانەوە هەڕەشەی لێ دەکرێت، دەوڵەت ئەو شێوە هێزەی لە هەمووان کاریگەرترە بە کاردەهێنێت، کە هێزی سەربازییە. ئەمەش ئەو سەرکەوتنە سنووردارە راقە دەکات کە کاری یاسا و رێکخراوە دەولییەکان وەدەستی دێن لە کاتی چارەسەر کردنی مەسەلەی بە کارهێنانی هێز. چارەسەر کردنی مەسەلەکان، وەک ئاودیو کردنی ماددەی بێ هۆشکەر(مخدرات) و بەیەککەوتنی کەشتییەکان لە ناوەڕاستی دەریادا، یاخود لاسایی کردنەوەی نیشانەیەکی بازرگانی، شتێکە و، سەلامەتی وڵاتێک کە لە پەنای پابەند بوونی بە یاسای دەولیی دوچاری هاتبێت، شتێکی ترە. ئەمە ئەژواری ئاسایشی بە کۆمەڵ بوو لە سییەکاندا. وەلێ میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان، شێوازێکی تری ئاسایشی بە کۆمەڵی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

### پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی بە کۆمەڵ لەسایەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا

تەرازووی کلاسیکی هێزەکان جەنگی بەشتێکی نایاسایی دانەدەنا. بەکارهێنانی هێز شتێکی قبووڵ کراو بوو، زۆربەی کات دەبووە سۆنگەی دابینکردنی سەقامگیریی سیستەم. لە سەدەی نۆزدەهەمدا گۆڕانکارییە تەکنۆلۆژییەکان، وایان کرد جەنگ توند

و تیژ و کاولکارانەتر بێت. بانگەشە بۆ پرەنسیپەکانی دیموکراسیزم و ئەو بزاڤانەی داوای ئاشتیان دەکرد بە هێزتر بوو. بۆیە ئەو ماوەیە هەوڵی زۆری بە خۆیەوە بینی بۆ رێکخستنی دەوڵەتان لە هەڵوێستێکی دژ بە جەنگ. بیست وشەش دەوڵەت، لە ساڵی ١٨٩٩دا لە لاهای کۆنگرەی ئاشتیان گرێدا. لە ساڵی ١٩٠٧دا بە بەشداری کردنی چل و چوار دەوڵەت، کۆنگرەیەکی تر لەلاهای گرێدرا. لە هەردوو کۆنگرەکەدا، چارەسەر کردنی مەسەلەکانی شەڕ و ئاشتی، سروشتێکی یاساییانەیان هەبوو. ئەوانەی لە کۆنگرەکەدا بەشدارییان کرد هانی دەوڵەتانیان دا، ئەو رێکەوتنامانە ئیمزا بکەن کە پشت بە ناوبژیکردن دەبەستێ، بۆ ئەوەی بە ناوبژی کردن ناکۆکییەکان چارەسەر بکرێت نەک بە بەکارهێنانی هێز. هەروەها هەوڵیاندا لە کاتی شکست هێنانی ناوبژیکردن (تحکیم) رێساکانی جەنگ دابڕێژن.

پێشتر ئەوەمان بینی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، لایەنی مرۆڤایەتی لە کۆمەڵەی گەلاندا ئەو هەوڵە بوو لە پێناو دروست کردنی هاوبەندییەکی دەولی بۆ ئەوەی دەستدرێژیکەران بسەنگرێننەوە و سزایان بدەن.

جەنگی جیهانی یەکەم، لە روانگەی «**ودرو ولسون**» و ئەوانەی وەکو ئەو بیریان دەکردەوە، شەڕێکی بەرێکەوت بوو، پێویست نەبوو. هاوسەنگیی هێزەکان بووە سۆنگەی ئەم جۆرە شەڕە کە بە هاوپیمانیەتی هەموو دەوڵەتان و لە پێناو ئاسایشی بە کۆمەڵدا دەتوانرێ وەلاوە بنرێ. دیارە کۆمەڵەی گەلان وا نەخشەی بۆ کێشرا کە دوای ئەو رووداوە، جەنگی جیهانی نەکەوێتەوە، ئەوا نەتەوە یەکگرتووەکان لە نێوان ساڵانی ١٩٤٢-١٩٤٥دا بۆ ئەوە هاتەگۆڕێ، تا رێگای ئەوە نەدەن جەنگی جیهانی دووەم رووبدا. لە ساڵی ١٩٤٥دا چل و نۆ دەوڵەت لە شاری سان فرانسیسکۆ کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی میساقێک مۆر بکەن بۆ چاک کردنەوەی کەم و کوڕییەکانی کۆمەڵەی گەلان. هەڕەشە کردن، یاخود بەکارهێنانی هێز لە کاتی بەرگری لە خۆکردن، یاخود هەڕەشە کردن لە ئاسایشی بە کۆمەڵ، ئەمانەی هەموو حەرام کرد. بەکارهێنانی هێز (هی هێرش بردن نا) بووە شتێکی نامەشروع بۆ هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە ئەو میساقەیان ئیمزا کردووە. بە پێچەوانەی سیستەمی هاوسەنگیی هێزەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا. هەر بەکارهێنانێکی هێز، پێویستە لە روانگەی بەرگری لە خۆکردنەوە بێت، چ بە تاک یاخود بە کۆمەڵ یاخود لە ئاسایشی دەستە جەمعی.

دامەزرێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجوومەنی ئاسایشیشیان دامەزراند، کە لە پێنج ئەندامی هەمیشەیی پێکهاتووە و ئەوانەی تر یەک لە دوای یەک دەگۆڕدرێن،

دەتوانرێ لە چوارچێوەی ئاسایشی بە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، پرەنسیپی هاوسەنگی هێزەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بە ئەنجوومەنی ئاسایش بچوێنرێ. بەپێی بەندی حەوتەم لە میساقەکە، ئەنجوومەنی ئاسایش بۆی هەیە بڕیاری پابەندکەرانە دەربکات. ئەگەر هەر پێنج هێزە گەورەکەی ئەندامی هەمیشەیی (ئەنجوومەنی ئاسایش) لەسەر مەرجەکە رێک نەکەوتن، هەریەکێکیان مافی بەکارهێنانی«ڤیتۆ»ی هەیە، کە وەک کوژاندنەوەی هێڵی کارەبایە لە سیستەمی رووناک کردنەوەدا. ئەو «ڤیتۆ»یەش کە رووناکییەکە دەکوژێنێتەوە لەوە باشترە ماڵەکە بە شێوەی جەنگێک دژی دەوڵەتێکی گەورە کاول بێت و بسووتێت.

لە ماوەی جەنگی سارد دا سیستەمی ئاسایشی بە کۆمەڵ سوودی نەبوو. ململانێی ئایدیولۆژیی جەنگی سارد، هیچ بوارێکی بۆ ئەوە نەهێشتەوە کە لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی مەشروعی هێز رێک بکەون. زۆر ئەژواری گەورە دەربارەی پێناسە کردنی دەستدرێژیکاری هاتە ئاراوە. چۆن مرۆڤ دەتوانێ کرداری دزە کردنی نهێنی بەرامبەر هێزێک هەڵبسەنگێنێ، کە بۆ یەکەمجارە سنووری بڕیوە؟ ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٦٧دا، بە دەست هێزی نهێنی پێشمەرگە میسرییەکانەوە دەیناڵاند، لەگەڵ ئەوەشدا هێزە تەقلیدییەکانی ئیسرائیل یەکەمجار ئەوان سنووریان بەزاند. لێرەدا ئەو روانگەیەی کە دەڵێ یەکەمجار کێ دەستدرێژییەکەی دەست پێکرد، جیاوازە بە گوێرەی ئەو لایەنەی کەوا مرۆڤ لە شەڕی ساردا لایەنگیری بوو.

بە درێژایی بیست ساڵ لە تەمەنی جەنگی ساردا، لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەوڵیاندەدا، واتای دەستدرێژیکردن دیاری بکەن. تا لە کۆتاییدا لیستێک بۆ کردارە دوژمنکارانەکان ئامادە کراو چەند مەرجێکی پێوە لکێنرا. کە باسی ئەوەی دەکرد، ئەنجوومەن دەتوانێ بڕیار بدا کە کامە کردار دەستدرێژیکارانەیە یاخود نا. کەواتە دوژمنکاری لە روانگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە دوژمنکاری ناژمێردرێ ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاری لەسەر نەدا. هەموو شتێک پشت بە بڕوایی هاتنی ئەنجوومەنی ئاسایش دەبەستێ، ئەو بڕوا هێنانەش لە ماوەی شەڕی ساردا شتێکی زۆر دەگمەن بوو.

ئەو حاڵەتی وەستانەی کە باڵی بەسەر پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵدا هەڵکێشابوو، بووە سۆنگەی سەرهەڵدانی پرەنسیپی دیپلۆماتیکی خۆپارێزی، لە جیاتی دیاریکردنی لایەنی دەستدرێژیکەر و سزادانی کە پرەنسیپێکی بنەڕەتی ئاسایشی بە کۆمەڵ بوو- نەتەوە یەکگرتووەکان کەوتە ئەوەی هێزی سەربەخۆ لەم لا و

لەولادا کۆبکاتەوە و لە نێوان هێزە شەڕکەرەکانی دابنێ. دواتر زۆرجار ئەو نموونەیەی بەکارهێنا کە لە ساڵی ١٩٥٦ **هامر شولد و لیستەر** دایاننا.

ئەگەرچی حاڵەتی شەڕی سارد بووە سۆنگەی ئەوەی کە پرەنسیپی هەموار کراوی ئاسایشی بە کۆمەڵ جێبەجێ نەکرێ. بەڵام ئەمە ڕێگای لەوە نەگرت کە ڕێگای نوێ بەکاربهێنرێ، لە بەکارهێنانی هێزی دەولی بۆ یەکتر جوێکردنەوەی لایەنە شەڕکەرەکان.

بەپێی پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵ ئەگەر دەوڵەتێک سنووری دەوڵەتێکی دیکەی بەزاند، هەموو دەوڵەتان یەک دەگرن تا بیگەڕێننەوە ئەو شوێنەی کە پێشتر لێی بووە، هەرچی لە دیپلۆماسیەتی خۆپاراستن دایە، ئەگەر دەوڵەتێک سنووری بەزاند، ئەوا نەتەوە یەکگرتووەکان خۆی تێهەڵدەقورتێنێ بۆ ئەوەی لایەنە دژبەرەکان لە یەکتر جوێ بکاتەوە، بەبێ ئەوەی دەست نیشانی ئەوە بکا کە کێ دەستدرێژیکەرەو کێ دەستدرێژیلێکراوە.

نەتەوە یەکگرتووەکان لە ماوەی شەڕی سارد دا، هەمیشە دەیویست هێزەکانی ئاشتیپارێز کە سەربەخۆی بوون، لە دەوڵەتە بچووکەکان پێکبهێنێ نەک لە یەکێتی سۆڤیەت یاخود وڵاتە یەکگرتووەکان، بۆ ئەوەی دەوڵەتە گەورەکان لەوە دوور بخاتەوە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ تێکەڵ بە ململانێیەکە بن. دیپلۆماتیکی خۆپاراستن و هێزی ئاشتیپارێز نوێ کردنەوەیەکی گرنگ بوو، تا ئێستاش ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕن. وەلێ پەیوەندی بە ئاسایشی بە کۆمەڵەوە نییە.

لە (٢) ئابی ١٩٩٠دا عێراق پەلاماری کوێتی دا. ئەمە یەکەمین تەنگژەی دوای شەڕی ساردبوو. لە ماوەی چل ساڵدا، نەتەوە یەکگرتووەکان توانی بۆ یەکەمین جار (بە باشترین شێوە) پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵ پراکتیزە بکات، لە سۆنگەی ئەوەوە کە چین و یەکێتی سۆڤیەت مافی «**ڤیتۆ**»یان بە کارنەهێنا. ئەو بووژانەوە گەورەیە، سێ هۆی هەبوو:

**یەکەم:** عێراق دەستدرێژییەکی وا ئاشکرای کرد کە گفتوگۆ هەڵنەگرێ. وەک لە سییەکاندا ئەڵەمانیا ئەنجامیدا. ئەو کارە ئەو ڕۆژەی بەبیری سەرانی دەوڵەتان هێنایەوە کە ئاسایشی بە کۆمەڵ شکستی هێنا.

**دووەم:** هەستکردن بە شکستهێنانی پرەنسیپەکانی ئاسایشی بە کۆمەڵ لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دەستدرێژکارییەکی وا ئاشکرادا، واتای ئەوە بوو کە ئەو پرەنسیپە لە جیهانی دوای شەڕی سارد بە کەڵکی دابینکردنی ئاسایش نایەت.

**سێیەم:** دەوڵەتە بچووکەکان لە نەتەوە یەکگرتووەکان لایەنگیری ئەو جوولانەوەیان کرد، چونکە زۆربەیان لە سەردەمی وەرگرتنی سەربەخۆییەوە، گرفتی سنووریان لە دەسەلاتی کۆلۆنیالیستەوە بۆ ماوەتەوە. ئەو دەوڵەتانە لە بیانگەکانی(سەدام حوسێن) بۆ پەلاماردانی کوێت هەڕەشەیان بۆ سەربەخۆیان دەبینی. بۆ نموونە نوێنەری هایتی لە نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بارەیەوە گوتی: نایەوێت ولاتەکەی ببێتە کوێت بۆ هەندێک کەس.

ئایا پرەنسیپی نەتەوە یەگگرتووەکان بۆ ئاسایشی بە کۆمەڵ، دەبێتە سیستەمێکی جیهانی نوێ؟ بەڵێ. بەڵام بە شێوەیەکی پاژەکی پاشان هەندێک تایبەتمەندی گرنگ هەیە.

**یەکەمیان:** سیستەمی کاری نەتەوە یەکگرتووەکان بە باشترین شێوە بەڕێوەدەچێ کە دەستدرێژیکارییەکی راشکاوانەی گفتوگۆ هەڵنەگر لە ئارادا هەبێ.

لە کاتێکدا لە کاودانی شەڕی نێوخۆییدا، پراکتیزە کردنی ئاستەنگ دەبێت.

**دووەمیان:** کاتێ بە کارهێنانی مافی«ڤیتو» لە ئارادا نابێ، ئاسایشی بە کۆمەڵ بە شێوەیەکی پوزەتیڤانە بەڕێوەدەچێ. وەلێ ئەگەر بەرژەوەندییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ولاتە یەککگرتووەکان، یاخود ولاتە یەککگرتووەکان و چین کەوتنە دوو سەنگەری لێک جوداوە، ئەوا هەمدیس کارکردن بە پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵ رادەگیرێ. سەرباری ئەمەش پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵ، کە لە ساڵی ١٩٤٥ دا نەتەوە یەککگرتووەکان پەسەندی کرد. مەبەست تیایدا ئەوە بوو لەسەر پێنج دەوڵەتە گەورەکە پراکتیزە بکرێت کە خاوەنی بە کارهێنانی مافی«ڤیتۆ» بوون لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا.

**سێیەمیان:** ئاسایشی بە کۆمەڵ دەبێتە کارێکی بەرجەستە، کاتێک دەوڵەتە ئەندامەکان پارەی پێویستی بۆ تەرخان بکەن. وەلێ چۆن دەتوانن ئاسایشی بە کۆمەڵ وەکو کردارێکی راستەقینە بێنینە بەرچاو، ئەگەر پارە بۆ ئەو دەوڵەتانە نەبوو کە بەهێزی سەربازی هاوبەشیان تێدا کردووە.

ئاسایشی بە کۆمەڵ لە سییەکاندا شکستێکی گەورە بوو. لە ماوەی شەڕی سارد دا خرایە نێو سارنجۆکەوە، تا شەڕی کەنداوی ساڵی ١٩٩٠، ئینجا ژیاوە و بووژایەوە، کەوا جیهانی دوای شەڕی سارد پێویستی پێیەتی.

هەتاوەکو ئەگەر پرەنسیپەکانی ئاسایشی بە کۆمەڵ نەتوانرا پراکتیزە بکرێن، نەتەوە یەککگرتووەکان باندورو کاریگەری خۆی هەیە. چونکە خۆپارێزی لە بەکارهێنانی هێز وەک لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە. ئەرکی پاساو بۆ هێنانەوەیەکی

مەشروع دەخاتە ئەستوێ ئەوانەی کە گەرەکیانە ئەو هێزە بە کاربهێنن. هەروەها گفتوگۆ توندوتیژەکانی ناو ئەنجوومەنی ئاسایش، بایەخێک بە دڵەڕاوکێی کۆمەڵی دەدا و گرنگی بە زۆربەی تەنگژەکان دەدات. هەندێک جار روانگەی وا پێدەگەیەنێ کە بەرەو دەرککردن دەڕوا کە مەودای بەکارهێنانی دوژمنکارانەی هێز چەندەی تێدەچێت، کە وەک سەرپۆشێکی سەلامەتییە بۆ کارکردنی هەوڵە دیپلۆماتیکییەکان. لە کۆتاییدا رۆڵی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی ئاشتی سنووردارە، وەلێ سوودی زۆری هەیە، ئەو ناوچانەی کە هێزەکان لەیەک دادەبڕێ و لە چەک داماڵراون، ئامرازێکن کە دەوڵەتان لە جارێک زێتر بینویانە کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانیان دەکات. کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، هەلی زۆرتری بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان رەخساند. ئەوە بوو رۆڵی کۆلۆنیالیزمی لە نامیبیا بە کۆتاهێناو چاودێری پێشێل کردنەکانی مافی مرۆڤی کرد لە سلڤادۆر. هەروەها چاودێری هەڵبژاردنەکانی کرد لە نیکاراگوا و باری حکومەت لە کەمبودیا، هاوکات سەرپەرشتی کردنی هێزەکانی ئاشتیپارێز. راستە پرەنسیپە رەسەنەکانی ئاسایشی بە کۆمەڵ بە دەستپاکییەوە جێبەجێ ناکرێ، وەلێ کارێکی هەڵەیە ئەگەر رۆڵی یاسای دەولیی و نەتەوە یەکگرتووەکان و کاریگەریان رەت بکرێتەوە. ئەوان بەشێکن لە راستەقینەی سیستەمی دەوڵەتی گێرە شێوێن، لە مامەڵە کردنمان لەگەڵ یاسای دەولی و رێکخراوی دەولیدا، راست نییە زۆر بە گومان و ساویلکە بین، لەبەر ئەوەی دەوڵەتان ناتوانن بە تەنیا بە یاسا بژین، هەروەها ناتوانن بە تەواویش بەبێ یاسا بژین.

## ململانێیەکان لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا

رۆژهەڵاتی ناڤین، کە ناکۆکی و ململانێ لە بارێکی هەڵکێشاوە، حاڵەتێکی لەبارە بۆ توێژینەوە لە ململانێیە ناوچەییەکان، ئەو بارەی لێرە لە ئارادایە خزمەتی روانگەی ریالیستەکان دەکات لە سیاسەتی دەولیی. شوێنێکە یاسای دەولیی و نەتەوە یەکگرتووەکان رۆڵێکی گەورەیان تیا بینیوە. ئایا سۆنگەی ئەو هەموو ململانێیە چییە؟ بەشێک لە وەڵامی ئەو پرسیارە خۆی لە چریکەی نەتەوایەتی و ئایین و سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەکان دەنوێنێ.

شەڕی عێراق و ئێران، کە لە ئەیلوولی ١٩٨٠دا دەستی پێکرد، نموونەیەکی باشمان لەم بارەیەوە پێشکەش دەکا. بۆچی عێراق پەلاماری ئەو هاوسێیە گەورەیەی خۆی دا؟

یەکێک لە هۆیەکان، شۆڕشی ئیسلامی بوو کە شای لەسەر تەخت هێنایە خوارەوە. لەسەردەمی شادا، ئێران داوای سەروەرێتی خۆی بەسەر هەموو ڕێڕەوە ئاوییەکانی نێوان ئێران و عێراقدا دەکرد. دوای ئەوەی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٩دا حوکمی شای ڕووخاند، ئێران دوچاری هەلا هەلا بوون بوو. «سەدام حوسێن» ئەمەی بە هەلێکی ڕەخساو زانی و پەلاماری ئێرانیدا، سەرباری ئەمەش شۆڕشی ئیسلامی دەیەویست ئەژواری لە ناوەوەی عێراق بنێتەوە. عێراق دەوڵەتێکی موسڵمانە(٤٠٪) سوننە و (٦٠٪) شیعەیە.

شیعە توندڕەوەکانی - ئوسولییەکان - ئێران کەوتنە هاندانی شیعە عێراقییەکان، بۆ ئەوەی دژی «سەدام حوسێن» و ڕژێمەکەی شۆڕش بەرپا بکەن. وەلێ ئەو بانگەشە ئایینییە لە نێوان ئەم دوو گەلەدا شکستی هێنا، کاتێک«سەدام حوسێن» ژمارەیەک لە سەرۆکی شیعە عێراقییەکانی کوشت. وەلێ «سەدام حوسێن» وەک پیشەی خۆی بارەکەی خراو خەملاند. چونکە ئێرانییەکان عەرەب نین. لەو هەرێمانەی کە بە عێراقەوە لکاون کەمینەیەک هەیە کە بە عەرەبی داخێون. عێراقییەکان وایانزانی لەو هەرێمانەدا وەکو ڕزگارکەر پێشوازییان لێ دەکەن. وەلێ ئەو گومانەیان بێ هێوی بوو و ئەنجامەکەی بە پێچەوانە بوو. چونکە پەلامارەکەی عێراق، ڕیزی ئێرانییەکانی یەکخست.

ئەو دوو خەملاندنە هەڵەیە، وایکرد جەنگ نەتوانێ هیچ پێشەکەوتنێک بە خۆیەوە ببینێ. لە جیاتی شەڕێکی بروسکەیی کورت کە«سەدام حوسێن» دەیخواست، بووە شەڕێکی درێژ خایەن، پەلاماردان و گەڕانەوە. بۆیە عێراق بڕیاریدا لە شەڕ بکشێتەوە. ئایەتوڵڵا خومێنی، سەرۆکی ڕۆحی ئێران، ڕایگەیاند کە ئێران شەڕ ڕاناگرێ، تەنیا بە ڕووخانی«سەدام حوسێن» و ڕژێمی بەعسی نەبێت لە بەغدا. جیهانیش نزیکەی دە ساڵ سەیری ئەم گەمەیەی کرد. دەوڵەتە عەرەبییە خۆپارێزەکان وەکو سعودیە و کوێت، لە ترسی هێزی شۆڕشگێڕی ئێران، لای عێراقیان گرت. وەلێ سوریای عەرەبی، کە ڕژێمێکی عیلمانی و ڕادیکاڵ و لە زۆر ڕووەوە لە ڕژێمەکەی عێراق دەچێت، لەبەر چەند هۆیەک کە پەیوەستە بە هاوسەنگیی هێزەکانەوە، پشتگیری ئێرانی کرد، هێزی گەشەسەندووی عێراقی هاوسێی، زێتر سوریای دوچاری دڵەڕاوکێ کردبوو نەک هێزی ئێران کە لێیەوە دوور بوو.

ڕای گشتیش لە دەرەوە لایەنگیری ئەم، یاخود ئەو لایەنی شەڕی دەکرد. وڵاتە یەکگرتووەکان کە گەشەسەندنی هێزی ئێران، تووشی دڵەڕاوکێی کردبوو، بە نهێنی

یارمەتی عێراقی دەدا.

ئسرائیلیش بە نهێنی چەکی ئەمریکی بۆ ئێران دەنارد. ئێرانییە ئوسولییەکان داوای نەهێشتنی ئیسرائیلیان دەکرد. دەتوانین ناردنی چەکی ئیسرائیل بۆ ئێران لە رێگای هاوسەنگیی هێزەکانەوە تێبگەین. ئیسرائیل لە ئێران و عێراق دەترسا، وەلێ هەڕەشە کردنەکەی عێراق نزیکتر بوو. بۆیە ئیسرائیل یارمەتی ئێرانی دا لە روانگەی ئەو پرەنسیپەی کە دەلێ: «دوژمنی دوژمنم دۆستمە». بەم چەشنە دەبینین جەنگ لە خراو خەملاندێک دەستی پێکرد، کە رەگی ئایینیی و نەتەوایەتی و بەرژەوەندی و چاو تێبڕینی لە دواوە بوو. هاوسەنگیی هێزەکانی پەرە پێدا بۆ ململانێیەکی دڕندانە، کە نزیکەی دە سالی خایاند.

## دۆزەکانی ناسیۆنالیزم

چریکەی نەتەوایەتی چۆن جەنگ دروست دەکا؟ ئەرێ بەڕاست ناسیونالیزم چییە و نەتەوە چییە؟ فەرهەنگ پێناسەی ئومەت وا دەکا کە کۆمەلێک خەلکن بانگەشە بۆ ناسنامەیەکی هاوبەش و مافی دامەزراندنی دەولەت دەکەن. وەلێ ئەو پێناسەیە کام جۆر لە کۆمەلەی ئادەمیزاد دەگرێتەوە؟ سەرچاوەی ناسنامەی هاوبەش چییە؟ زۆر خەلک دەلێن لە یەکچوونی رەگەزییە. وەلێ ولاتە یەککگرتووەکان ئومەتێکی فرە رەگەزە. هەندێکی تر دەلێن دەشێ ئایین ببێتە بنەمایەک بۆ نەتەوە. دەولەت هەیە تاڕادەیەکی زۆر لەسەر ناسنامەی ئایینی دامەزراوە، وەکو ئیسرائیل و پاکستان. ئەو خالەی شایەنی تێبینی کردنە، ئەوەیە کە دەشێ سەرچاوەی جیاواز بۆ ناسنامە لە ئارادابێت. هزرڤانی فەرەنسی «**ئارنست رینان** Ernest Renan» لەم بارەیەوە دەلێ خالی کرۆکی لە ئومەت ئەوەیە کە «ئەندامەکانی لە زۆر شت هاوبەش بن، وەلێ پێویستە لەسەریشیان زۆر شت لە یاد بکەن»[١].

زاراوەی ناسیونالیزم زۆر وردە و بە تەنیا زاراوەیەکی وەسفی نییە، بەلکو زاراوەیەکی رێنیشاندەر و سازدەرانەشە. کاتێکیش وشە وەسفی و سازدەرانە دەبێت، دەبێتە وشەیەکی سیاسی و لە تێکۆشان لە پێناو دەسەلاتدا بەکاردەهێنرێ. لە جیهانی

(١) وتەیەکی ئارنست رینانی Ernest Renan فەیلەسوفە کە لە کتێبی «القومیة: معناها و تاریخها» هانز کون Hans Kohn هاتووە.(برنستن- ولایة نیو جیرزي دارمان نوستراندة ١٩٥٥) ص ١٣٧.

نوێدا، نەتەوایەتی بۆتە سەرچاوەیەکی یەکلایی کەرەوە بۆ شەرعییەتی دەوڵەت. لێرەوە داواکردنی ناسنامەی نەتەوایەتی دەبێتە کەرەستەیەکی زۆر بەهێز، ئەگەر گەلێک توانی وا لە خەڵکی تر بکا داواکەی بۆ پێکەوەنانی دەوڵەت قبوول بکەن. ئەمە وای لێ دەکات داوای مافە نیشتمانییەکان بکا و ئەم داوا کردنەش وەکو چەکێک بەکاربهێنێ دژی دوژمنەکانی. بۆ وێنە دەوڵەتە عەرەبییەکان لە حەفتاکاندا سەرکەوتنیان وەدەست هێنا کە توانیان وا لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن بڕیارێک دەربکا کە زایونیزم بزاڤێکی ڕەگەز پەرستانەیە. مەبەستیشیان ئەوە بوو ئیسرائیل لە شەرعییەتی ئومەت بێبەش بکەن. کەواتە لەکەدار کردن بە ڕەگەزپەرستی کارێکی خراپە. لە کاتێکدا خۆناونان بە ناوی نەتەوایەتی بە شێوەیەکی گشتی باشە. کاتێک دەڵێن ئیسرائیل ئومەت نییە، ئەوا وشەکە وەکو چەک بەکاردێت.

ئەو کێشە شرۆڤەکارییەی ئەو داوایەی لێ دەکەوێتەوە، ئەوەیە کەوا ئایین دەشێ ببێتە بنەمایەک بۆ ناسنامەی نەتەوەیی. هەروەها ئەوەش ڕاستە کە دەبێ بگوترێ بنەمای ئایینی، ئاستەنگ دەخاتە بەردەم وەدەستهێنانی ناسنامەی نەتەوەیی ئەو کەمینانەی لە دەرەوەی ئایینەکەن.

لە ئیسرائیل کاودانەکە لەبەردەم موسڵمانەکاندا ئاستەنگترە وەک لەبەردەم جولەکەکان، هەروەها لە هیندستان لە بەرامبەر هندوسەکاندا ئاستەنگترە، وەک لەبەردەم موسڵمانەکان. وەلێ ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر گەل بۆ ناسنامەی نیشتمانی پشتی بە ئایین بەستا، دەوڵەتێکی ڕەگەز پەرستی دادەمەزرێنێ.

بەر لە سەدەی هەژدەهەم بیرۆکەی نەتەوایەتی هەرگیز گرنگ نەبوو. ئەی بۆچی ئێستا خواستەکانی نەتەوایەتی گرنگ بوون؟ هەر چۆنێک بێت، مرۆڤ دەتوانن لە ژێر زۆر (ولاء) کۆببنەوە، کە لە سەرەوەی ئاستی دەوڵەت، یاخود لە خوارەوەی دابێت.

ئەو (ولاء)انە دەگۆڕێن، ئەو کاتەش دەیانەوێ بگۆڕێن، ژیی ژیان دوچاری هەژان دەبێت. بیرۆکەی ئومەت زۆربەی کات لە دەوری ئەو ژییانە سەر هەڵدەدات کە لە هەمووان زێتر دوچاری هەژان دەبێت، واتە لە نێو ئەو کەسانەی لابەلان و ڕادەی ڕۆشنبیرییان کەمترە و کەمتر پێ لەسەر ئینتیمای نەتەوەیی خۆیان دادەگرن. زۆربەی کات ئەوانە خەڵکێکن کە چوارچێوە سروشتییەکان خستونیەتە دەرەوە، دەست بە پرسیاران دەکەن. زۆربەی کات داخوازییە نەتەوەییەکان لە نێو ڕۆشنبیراندا، یاخود کۆمەڵە ئایینە لادارەکانەوە سەرهەڵدەدەن. بۆ نموونە لە سەرەتاکانی سەدەی

نۆزدەهەمـدا، نەتەوە خـوازەکانی عـەرەب، زۆربەیان دیان بـوون، نەک مـوسـڵـمـان. ئەو جۆشەیان بۆ وەدەستهێنانی ناسنامەی نوێ، وردە وردە لەلایەن پیشـەسازی و بژافی بە مەدەنی کردن پشتگیری کراوە، کە ئەستـوندەکـانی کۆمەڵگای لادێیی و پابەند بوونە تەقلیدییەکانی دەلەقاند.

ئەو هەژانانەی کە خەڵک بەرەو ناسنامـەیەکی نەتەوەیی نوێ دەبەن، دەشێ لەلایەن هێزی نێو خۆیی، یاخود دەرەوەکیەوە بن. تارادەیەکی زۆر شۆڕشی فـەرەنسی لە پشت سەرهەڵدانی ڕێچکەی نەتەوایەتی نوێ بوو. سەرهەڵـدانی چینی ناوەند، چوارچێوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی تەقلیدی هەژاند. ئەو کۆمەڵە سیاسییە سەرهەڵداوانەی، چیتر نەیاندەویست لە ڕێگای پاشـاوە دان بە دەوڵەتی فـەڕەنسی بنێن، بەڵکو دەیانویست ئەو دان پیـانانە لە ڕێگای هەمـوو گـەلی فـەڕەنسـیـیـەوە بێت. هەرچی لەرووی هەندەرانەوەیە، ئەوا کاتێ سوپای ناپلیۆن ئەوروپای داگرت، ئەستوندەکانی کۆمەڵگای ئەوروپایی هەژاند. هانی هەستی نەتەوایەتی دا لای ئەوانەی بە ئەڵەمانی داخـاوتن، هانی خـەڵکانی تریشی دا. بە تێـپـەڕبوونی نیـوسـەدە چوارچێـوەی باوەڕهێنان بەو بیرۆکەیە فراوان بوو کە دەڵێ: هەموو کۆمەڵێک مافی ئەوەی هەیە دەوڵەت بۆ خۆی دامەزرێنێ. ئەنجامی ئەم بیرۆکەیەش یەکێتیی ئەڵەمانیا و یەکـێتیی ئیتـاڵیا بوو. سەیر ئەوەبوو پسمارک خۆی پیاوێکی خۆپارێز بوو، نەیدەویست هەموو ئەوانە یەکبخا کە بە ئەڵەمانی داخاوتن، بەڵکو دەیویست تەنیا ئەوانە یەکبخا کە دەتوانێ (ولاء)یان بۆ تەختی پڕوسـیـا دابین بکات. کـەچی بۆ خـزمـەت کـردنی ئەو مـەبەسـتـە، بـوو بە داواکارێکی نەتەوەخواز. یەکـێتیی ئەڵەمـانیا و ئیـتـاڵیا، دواتر بوون بە نموونەیەک کە ڕێچکەیان بگیرێ.

جەنگی جیهـانی دووهەم، ئیمپراتۆریا کۆلۆنیـالیسـتەکانی ئـەوروپای لاواز کرد. بۆ مـاوەی سێ دەیەکی داهاتوو، یەکـێک لە بزاڤە سـەرەکییەکـانی ئاسـیـا و ئەفەریقـا، هەڵوەشاندنەوەی کـولونیـالیـزم بوو. هەمـان جەنگ، کۆمەڵگای پایتەختـە گەورەکـانی لاواز کرد. پێشڕەوەکان ڕووناکبیرەکان لە ناوچەی کۆلۆنیالەکاندا، کەوتنە بەکارهێنانی بیری نـەتەوەیی دژی ئیـمـپراتۆریا ئـەوروپاییەکـان. وەلێ ئەگـەر نموونەی ئەو دەوڵەتانە بەکـاربهێنرابووایە کـە لە سـەدەی نۆزدەهەمـدا لەسـەر بنەمـای یەکـێـتی ئایین و ڕەگـەز دامـەزرابوون، بۆ ڕێکخـسـتنی جیـهـانی دوای کـولونیـالیـزم، ئەوا دەبووە سـۆنگەی دامـەزراندنی هەزاران دەوڵـەتۆکـەی بچـووک بچـووک لە ئەفـەریقـا و هەندێک بـەشی ئاسـیـا. وەلێ ئـەوەی دوای قـوناغی کـولونیـالیـزم روویدا، توێژی ڕووناکـبـیـر

«هەڵبژێردراو» بۆ گوراندنی نەتەوە پێیان لەسەر دامەزراندنی دەوڵەت داگرت، کە ئەمە بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەو شێوازە بوو کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا لە ئارادا بوو. سەرکردە ناوچەییەکانیش بڕوبیانوی خۆیان لەسەر ئەوە بینا دەکرد، تا بە یەکخستنی توێژی هۆزە بچووکەکان، نەتەوەیەک دامەزرێنن، پێویستیان بە ماکینەی دەوڵەت هەیە، ئەوەی کە کولونیالیستەکان دایانمەزراندبوون - وەکو بۆدجە، پۆلیس و دەزگای ئیداری - بەم چەشنە دەبینین ئایدیولۆژیای نەتەوەیی بۆ پاساودانی دوو کاری دژ بە یەکتر بەکاردەهێنرێ: ئەویش ئومەت، دەوڵەت دروست بکات و دەوڵەت، ئومەت دروست بکات! لەبەر ئەوەی نەتەوایەتی، وشەیەکی سیاسییە، سودێکی پراگماتیانەی هەیە.

کاتێک بزاڤی رزگاربوون لە کولونیالیزم لە قوناغە سەرەتاییەکاندا بوو، بە شێوەیەکی رومانتیکی، لە رێگای بانگەشە کردن بۆ رزگارکردنی هەمووان(پان ئەفەریقا، پان عەرەب Pan Africa, Pan Arabs) گشتگیرییەکی سەرکەتووی هەموو ناکۆکییەکان کرا.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بانگەشە بۆ رزگاربوونی سلاڤییەکان لە ئەوروپادا سەری هەڵدا، کە دەیگوت: ناسنامەیەکی هاوبەش هەیە هەموو ئەوانە بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە کە بە سلاڤی قسان دەکەن. رۆژهەڵاتی ناڤینیش بانگەشەی رزگار کردنی عەرەب و رزگار کردنی ئەفەریقای بە خۆیەوە بینی، ئەوانەی لەبەراییدا دژی کولونیالیستان راستبوونەوە، پێیان وابوو ژان و دەردی هەموو ئەو گەلانە وەک یەک وایە کە لە ژێر فەرمانڕەوایی کولونیالیزم دان. کەواتە لەسەر ئەو گەلانە پێویستە لە ژێر ئاڵای خەباتێکی هاوبەشی ئەفەریقی، یاخود عەرەبی کۆببنەوە. وەلێ کاتێ بەکردەوە کارگەیشتە سەر مەسەلەی فەرمانڕەوایی کردن. ئەو حکومەتە نیشتمانیانە خۆیان لەبەردەم ئەوەدا بینییەوە کە پێویستیان بە ئامرازو کەرەستەکانی دەوڵەت هەیە: بۆدجە و پۆلیس و دەزگای ئیداری. ئەو کەرەستانە بە شێوەیەکی بەر فراوان لە ئارادا نەبوون، بەڵکو لەسەر ئاستی ئەو وڵاتانە لە ئارادا بوون کە کولونیالیستان سنووریان بۆ کێشابوون. لەگەڵ توانەوەی وردە وردەی ئەو جۆشە رومانتیکییە، وای لێهات ناسنامەی دەوڵەت، شوێنی ناسنامەی نەتەوە بگرێتەوە، کە بەرایی بزاڤە رزگاریخوازەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، بانگەشەی رۆمانتیکی رزگارکردنی بە کۆمەڵ، وەک هێزێکی شڵەژێنەر بۆ بۆچوونە ناوچەییەکان هەرمایەوە.

ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بەردەوام بانگەشەی یەکخستنی ریزی عەرەبی بە خۆیەوە دەبینێ، ئەمە وێڕای هەندێک حاڵەتی سەر پێیی، کە لەنکاوڕا، دەوڵەتان یەکێتیان لە نێوان خۆیاندا رادەگەیاند، وەک یەکێتی میسر و سوریا، لە ژێر ناوی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، لە ساڵی ١٩٥٨. یاخود یەکگرتنی دوو وڵاتی دوور لە یەکتر، وەک یەکێتی لیبیا و مەغریب لە ساڵی ١٩٨٩. وەلێ ئەو هێزانەی کە پشتگیری دەوڵەتیان دەکرد بە تێپەڕ بوونی کات، سەرکەوتنیان بەسەر لایەنگرانی بزاڤە نەتەوەخوازییەکاندا وەدەست هێنا. نموونەی ئەمەش شەپۆلی نەتەوە خوازانی میسرە کە پاڵپشتی بیرۆکەی دەوڵەتیان دەکرد، لەسەر حسێوی بزاڤە نەتەوایەتییەکان عەرەبی، وردە وردە لای رای گشتی بە هێز بوو. وەلێ ئەو رەوتە پلەپلەییە، تا ئێستا لە هێڵی کۆتایی دوورە، هێشتا لە جیهانی دوای کولونیالیزم زۆر ناوچە، بەهۆی گۆڕانکارییە ئابوری و پەیوەندییە نوێیەکانەوە بە شێوەیەکی توند هەماهەنگی ژیانی ئاسایی لەبەریەک هەلتەکان بە خۆیەوە دەبینێ.

سەرکردە سیاسییەکان هەوڵدەدەن ئەو حاڵەتە ناڕەزاییە کۆنترۆڵ بکەن کە دوای کولونیالیزم جیهانی گرتۆتەوە، هەندێک پەنا بۆ هەستی نەتەوایەتی دەبەن، هەندێک دروشمی نەتەوایەتی عەرەبی بەکاردەهێنن، هەندێکی تر پشت بە خولیای ئوسولی ئایینی سەلەفی دەبەستن، هەموو ئەمانەش ئەو هێزانە ئالۆزتر دەکەن کە ململانێ لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناڤیندا دەخولقێنن.

## ململانێی عەرەب و ئیسرائیل

ململانێی عەرەبی- ئیسرائیلی، شەش جەنگی لە نێوان دوو کۆمەڵەدا خولقاندووە کە پێ لەسەر جیاوازی ناسنامە دادەگرن، وەلێ هەردووکیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مافیان بەسەر پارچە زەوییەکی بچووکەوە هەیە، کە بە قەبارەی پوولێکی پۆستەیە. داواکردنی ئەو پارچە زەوییە سەبارەت بەجولەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگارەکانی تەورات، کاتێک هەموو ناوچەکە لەبن دەستی جولەکە بوو، بەر لەوەی لە ساڵی ٧٠ زدا دەربکرێن و ئاوارە بکرێن. لە سەدەی نوێدا، جولەکەکان سوودیان لەو بارە بینی کە لە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووهەمدا بەسەریان هات. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا حکومەتی بەریتانیا لەسەر زمانی«**لورد روچیلد**» هەرێی بە نوێنەری یەکێتی زایۆنیستی بەریتانیا دا، کە ئەوان کار بۆ دامەزراندنی نشتیمانێک لە فەلەستین بۆ جولەکە دەکەن .

ئیسرائیلییەکان دەڵێن، ئەو کارە پڕ شەرەمەزارییانەی هیتلەر لە جەنگی جیهانی دووەمدا دژ بە جولەکەکان ئەنجامی دان، ئەو راستیەیان ساغ کردەوە کە پێویستە دەوڵەتێک بۆ جولەکە دابمەزرێ. لە ساڵی ١٩٤٨دا جولەکە نشتەجێ کراوەکان ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە دابەشکردنی فەڵەستین قبووڵ بکەن، عەرەبەکانی فەڵەستین ئەوەیان رەتکردەوە. نەتەوە یەکگرتووەکان دانی بە دەوڵەتی جولەکە نا، وەلێ ئیسرائیلییەکان لەبەر هێرشی عەرەبان ناچار بوون پەنا بۆ کوشت و کوشتار بەرن، هەروا دەڵێن ئا ئەمە بنەمای مێژوویی دەوڵەتی ئیسرائیل و پاساوی بوونی ئەو دەوڵەتەیە.

عەرەبەکان بەرپەچی ئەو داوایە وا دەدەنەوە کە ئەوان بە درێژایی چەندین سەدە لەو ناوچەیەدا ژیاون. ئەو رۆژەی بەلفۆر، لە جەنگی جیهانی یەکەم گفتەکەی دا، عەرەبە فەڵەستینییەکان ٩٠٪ دانیشتووانی فەڵەستینیان پێکدەهێنا. ئەوەی راست بێت تا ساڵی ١٩٣٢، عەرەب لە فەلەستین ٨٠٪ رێژەی دانیشتووان بوون. عەرەبەکان بیانگەیان ئەوەبوو کە بەریتانییەکان هیچ مافێکیان نییە لەسەر حسێوی ئەوان هەرێ بە جولەکە بدەن. بەردەوام دەبن و دەڵێن: چەوساندنەوەی جولەکە یەکێکە لە گوناه و تاوانە گەورەکانی مێژوو، وەلێ ئەوروپاییەکان خۆیان ئەنجامیان داوە، بۆچی دەبێ عەرەب نرخەکەی بدەنەوە؟! هەردوولا خاڵی ماقووڵیان هەیە.

ئەو ناوچەیە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەبەر دەستی تورکان دابوو. دەوڵەتی عوسمانیش هاوپەیمانی ئەڵەمانیا بوو. دوای ئەوەی لەشەڕ دۆڕان، ئەو دەوڵەتە لە باریەک هەڵوەشایەوە، ناوچە عەرەبنشینەکانیش کەوتنە ژێر مانداتی کۆمەڵەی گەلانەوە. فەرەنسا فەرمانڕەوایی سوریا و لوبنانی کرد. بەریتانیا ناویان لەو ناوچەیە نا فەڵەستین، کە دەکەوێتە نێوان دەریای ناوەڕاست و رووباری ئوردنەوە لە فەڵەستین. ئەوەی لە دواوەی رووبارەکەش بوو بە رۆژهەڵاتی ئوردنیان ناوزەد کرد. لە بیستەکاندا کۆچی جولەکە بۆ فەڵەستین لەسەرەخۆ زێدە دەبوو، وەلێ لە سییەکاندا، کەسەرهەڵدانی هیتلەری بە خۆیەوە بینی، هەڵمەتی دژ بە سامییەکان لە ئەوروپادا توندتر بوو، ئەو کۆچکردنەش خێرا زێدەی کرد، ساڵی ١٩٣٦ وای لێهات جولەکە ٤٠٪ دانیشتووانی فەڵەستین پێکبهێنن، ئەو کۆچە وای لە دانیشتووانە عەرەبەکان کرد راپەڕن، بۆیە بەریتانییەکان لیژنەیەکی پاشایەتیان پێکهێنا، ئەو لیژنەیە وای بەباش زانی کە ئەو وڵاتە بۆ دوو دەوڵەت دابەش بکریت. لە مایسی ١٩٣٩دا، کە جەنگی جیهانی دووهەم لەسەروبەند دابوو، بەریتانییەکان خۆیان بە شێوەیەک بینیەوە کە دژی

ئەڵمانیای هیتلەری، پێویستیان بەلایەنگیریی عەرەبەکان هەیە، بۆیە هەرییان پێدان کەوا ئاستەنگ بخەنەبەر کۆچی جولەکەکانەوە. وەلێ سەپاندنی ئەو پێوەندە دوای جەنگ کارێکی زەحمەت بوو، زۆر لە ئەورووپاییەکان بە هۆی چەوساندنەوەی نازییەکان هاوسۆز بوون لەگەڵ بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێک بۆ جولەکە. سەبارەت بەئەمەش هەندێک لە نیشتەجێ کراوە جولەکەکان کاری تیرۆرستانەیان دژی فەرمانڕەوایە بەریتانییەکان ئەنجام دەدا. ئەو رۆژگارە کە بەریتانیا لە رووی ئابوری و سیاسییەوە، لە ئەنجامی جەنگی جیهانی دووهەم و بە کۆتا هێنانی کولونیالکردنی لە هیندستان لە ساڵی ١٩٤٧، پەکی کەوتبوو، بڕیاریدا فەلەستین بخاتە بن ماندانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

لە ساڵی ١٩٤٧دا، نەتەوە یەکگرتووەکان پێشنیاری کرد فەلەستین دابەش بکرێ. ئەوەی سەیر و جێگای ئازار بوو، وەک دواتربەدیارکەوت، ئەگەر ئەو کاتە قبووڵیان بکردبوایە، دابەشکردنەکە بۆ عەرەبان باشتر بوو، لە مایسی ١٩٤٨دا ئیسرائیل خۆی وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ راگەیاند. هاوسێ عەرەبەکان هێرشیان بردە سەر، وەک هەوڵێک بۆ رەتکردنەوەی دابەشکردنەکە. یەکەم شەڕ لە نێوان عەرەب و ئیسرائیلییەکاندا هەشت مانگی لە پەلاماردان و گەڕانەوە بۆ دواوە خایاند. وەک دیارە عەرەبەکان بە رێژەی ٤٠ بۆ ١، ژمارەیان لە ئیسرائیلییەکان زێتر بوو، وەلێ ئەوان نا رێک و پێک بوون، لە نێو خۆیاندا ناکۆک و پارچە پارچە بوون. دوای ناوبژیکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان و وەستانی شەڕ، ئەو ناوچەیە بە ئوردنەوە لکێنرا کە پێی، دەگوترا کەناری رۆژئاوا. میسرییەکانیش «غەززە»یان کەوتە بن دەست، وەلێ زۆربەی خاکی فەلەستین کەوتە بن دەسەڵاتی ئیسرائیلییەکانەوە. ئەوان زۆر لەوە زێتریان کەوتە دەست، لەوەی کە ئەگەر عەرەبەکان پرۆژەی دابەشکردنەکەی ساڵی(١٩٤٧)یان قبووڵ بکردبوایە.

ئەو شەڕە لافاوێکی لە پەنابەرە فەلەستینییەکان هێنایە ئارا، لەگەڵ هەست بەسووکایەتی کردن و بەرەنگار بوونەوەیەکی هەمیشەیی بیرۆکەی ئاشتی، عەرەبەکان نەیانویست ئەنجامی شەڕەکە قبووڵ بکەن. چونکە نەیاندەویست مەشرووعییەت بدەنە دامەزراندنی ئیسرائیل لەو بڕوایە بوون کات دەبێتە هاوپەیمانی ئەوان. سەرکردە عەرەبەکان باوەشیان بۆ هەستی گەلەکەیان کردەوە وئەو بڕوایەیان پەیدا کرد کە دەتوانن لە شەڕێکی دیکەدا ئیسرائیل تێک بشکێنن، لە راستیدا مەلیک عەبدوڵلای یەکەم، کە دواتر کوژرا، لە ساڵی ١٩٥١ هەوڵیدا پەیماننامەیەکی سەربەخۆ لە نێوان ئوردن و

ئیسرائیل مۆر بکا.

شەڕی دووهەم لە ساڵی ١٩٥٦دا روویدا. لە ساڵی ١٩٥٢، **جەمال عەبدولناسر** و ژمارەیەک لە ئەفسەرە گەنجە نەتەوەخوازەکان **مەلیک فاروقیان** لە میسر لەسەر تەخت هێنایە خوارەوە و خێرا چەکیان لە یەکێتی سۆڤیەت وەرگرت. هەوڵیاندا کەناڵی سوێس کۆنترۆڵ بکەن. بە زنجیرەیەک هێرشی پێشمەرگانە پەکی ئیسرائیلیان خست. پێشتر بینیمان کە بەریتانیا و فەرەنسا لە بارەی کەناڵی سوێسەوە زۆر نیگەران بوون، ئەگەری ئەوەی نەبادا جەمال عەبدولناسر دەست بەسەر رۆژهەلاتی ناڤین دابگرێ، دوچاری دڵەڕاوکێی کردن. بۆیە لەگەڵ ئیسرائیل رێککەوتن بۆ پەلاماری میسر بدەن. کەچی ولاتە یەکگرتووەکان یارمەتی بەریتانیای نەدا. ئەوە بوو شەڕەکە بەبڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆتایی هات و هێزی ئاشتیپارێز دابەزێندرا تا هەردوو لایەنە شەڕکەرەکە لە یەکتر جوێ بکاتەوە، وەلێ ئەو کاتە پەیماننامەی ئاشتی ئیمزا نەکرا.

شەڕی سێیەم لە نێوان عەرەب و ئیسرائیلدا، شەڕی شەش رۆژە بوو لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧دا، کە لە هەموو شەڕەکان گرنگتر بوو. نەخشەی رێڕەوی پێشکەوتنە سیاسییەکانی دوای خۆی گۆڕی. **عەبدولناسر** و فەلەستینییەکان بەردەوام ئیسرائیلییەکانیان نیگەران دەکرد. پێشمەرگەکان پەلاماری ئیسرائیلیان دەدا. هەروەها میسر گەرووەکانی «تیرانی» گرت، بەمەش رێگای دەریای سووری لە کەشتییەکانی ئیسرائیل بڕی. **عەبدولناسر** بە تەواوی خۆی بۆ جەنگ ئامادە کردبوو، وەلێ تارمایی شەڕێکی سووری- ئیسرائیلی دەبینی. وای گومان برد هەلێکی لە باری بۆ هاتووە بچێتە نێو جەنگەوە، بۆیە داوای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد هێزی ئاشتیپارێز لە سنوورەکانی ئەودا بکێشێتەوە. کاتێک ئیسرائیل بینی **جەمال عەبدولناسر** خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکات، بڕیاریدا چاوەڕوانی نەکات، بەڵکو دەستێکی خۆپارێزی بوەشێنێ، بۆیە ئیسرائیلییەکان لە تێک و پێک شکاندنی هێزی ئاسمانی میسری کە لەسەر زەوی بوو، دەست پێشخەریان کرد. بە تەنیا بە داگیرکردنی تەواوی بیابانی «سینا»وە نەوەستان، بەڵکو بەرزاییەکانی جۆلان لە سوریا و کەناری رۆژئاوای ئوردنیشیان داگیر کرد. ئەو کاتە دەوڵەتە گەورەکان خۆیان تێهەڵقورتاند، جەختیان لە هەردوولا کرد بۆ ئەوەی وەستاندنی تەقە قبووڵ بکەن. لە تشرینی دووهەمی ١٩٦٧دا، ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاری(٢٤٢) دەرکرد. کە داوای کرد ئیسرائیل لەو زەویانە بکشێتەوە بەرامبەر ئاشتی و دانپیانانی. وەلێ ئەو بڕیارە

به ئەنقەست هەندێک لایەنی نائاشکرای تێدا بوو. باسی هەموو زەوییە داگیرکراوەکانی نەدەکرد، بە تەنیا باسی زەوییە داگیرکراوەکانی کردبوو، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە هەندێک زەوی هەر لە بنەڕەتەوە داگیرکراو نین و پێویست ناکا بگەڕێنرێنەوە. هەروەها کاری فەلەستینییەکانیشی بە تەم و مژاوی هێشتەوە. ئەوانی کردە پەنابەر لە کاتێکدا پێویست بوو وەکو گەلێک و نەتەوەیەک دانیان پیابنرێ. بەم چەشنە مەسەلە بنەڕەتییەکە جارێکی تریش بەبێ چارەسەر کردن مایەوە.

چوارەم شەڕ، شەڕی لەبەر ڕۆیشتن «استنزاف» بوو. ئەو شەڕە نەختێک سووکتر بوو. لە ماوەی نێوان ١٩٦٩-١٩٧٠دا، بە یارمەتی سۆڤیەتییەکان، **عەبدولناسر** چەند کردارێکی پەڕینەوەی لە کەناڵی سوێس و تەنگاو کردنی ئەنجامدا. ئەو کارانە شەڕێکی ئاسمانی لە نێوان میسر و ئیسرائیل داگیرساند و لە دیماهیدا شەڕی ئاسمانی گەیشتە ڕێگایەکی داخراو.

شەڕی پێنجەم، «شەڕی تەکفیر» بوو، لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣دا. دوای مردنی **عەبدولناسر**، **ئەنوەر سادات** جێگای گرتەوە. **سادات** دەرکی بەوە کرد ناتوانێ ئیسرائیل تێک بشکێنێ، وەلێ هەستی کرد بەر ئەوەی هەر هەنگاوێکی پێکهاتنەوە بەرەو ئاشتی هەڵێنێ، هەندێک سەرکەوتنی دەروونی پێویستە. بۆیە بڕیاریدا لە کەناڵەوە هێرش بکات. وەلێ بەبێ ئەوەی هەوڵی ئەوە بدا هەموو «سینا» وەربگرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ سوورییەکان ڕێککەوت، هێرشێکی لە ناکاوی کرد. لە قوناغی یەکەمدا، شەڕ لە بەرژەوەندی میسرییەکاندا بوو. کەچی ئیسرائیلییەکان گەڕانەوە و هێرشێکی پێچەوانەیان کردەوە.

دەوڵەتە گەورەکان هەمدیس خۆیان تێهەڵقورتاندەوە و داوای وەستاندنی تەقەیان کرد. وەزیری هەندەرانی ئەمریکی«**هنری کیسنجر**» چووە مۆسکۆ، کاتێک لە مۆسکۆ بوو، سوپای ئیسرائیل ئابڵووقەی سوپای میسری دا. سۆڤیەتییەکان هەستیان کرد فریودراون، هێزەکانی خۆیان لە باشوور خستە ئامادە باشییەوەو. نامەیەکیان بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان نارد، تیایدا پێشنیاری ئەوەیان کرد، کە دەوڵەتە گەورەکان، بەهێزەکانی خۆیانەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خۆیان دەخالەت بکەن، وەڵامی ئەمریکییەکان ئەوە بوو، کە پلەی خۆ ئامادە کردنی ئەتۆمیان لە وڵات بەرزتر کردەوە! بۆیە سۆڤیەتییەکان وازیان لەم داوایەی خۆیان هێنا، هەروەها ئیسرائیلییەکانیش لە ژێر فشاری ئەمریکاییەکان دەورەی سوپای میسریان بەردا.

زنجیرەیەک مانۆری دیپلۆماتێکی بە دوای ئەو شەڕە داهات. کە تیایدا وڵاتە

یەکگرتووەکان دانوستانی لەسەر ئەوە کرد کەوا ئیسرائیل بەشێک لە هێزەکانی بکێشێتەوە. نەتەوە یەکگرتووەکانیش چاودێرەکانی خۆی لە بیابانی سینا و بەرزاییەکانی جۆلان بلاوکردەوە. کەچی ئەنجامی گرنگی ئەو شەڕە دواکەوت. لە ساڵی ١٩٧٧دا **ئەنوەر سادات** چووە ئیسرائیل و رایگەیاند کەوا میسر ئامادەیە بە تەنیا دانوستان لەسەر پەیماننامەی ئاشتی بکات. بە پێناوی کردنی «**جیمی کارتەر**»، لە ساڵانی ١٩٧٨-١٩٧٩ میسر و ئیسرائیل رێکەوتننامەی «کامپ دیڤید»یان گرێدا، کە سینای گەڕاندەوە بۆ میسر و رێگای بۆ ئەوە خۆشکرد کە گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکرێ ئۆتۆنۆمی بدرێتە کەناری رۆژئاوا. رێکەوتننامەی «کامپ دیڤید» ئەوەی دەگەیاند کەوا گەورەترین دەوڵەتی عەرەبیی لە هاوبەندی دژ بەئیسرائیل دەرچوو. گیانی نیشتمانپەروەرێتی میسری زاڵ بوو بەسەر بیرۆکەی نەتەوایەتی عەرەبدا. **سادات** هاوبەندیی نەتەوەیی عەرەبی تێکشکاند. کەچی دوای چەند ساڵێک بە دەستی موسڵمانە سەلەفییەکان، ئەوانەی بەرهەڵستی سیاسەتەکەیان دەکرد، کوژرا.

شەڕی شەشەم، پەلاماری ئیسرائیل بوو بۆ سەر لوبنان لە ساڵی ١٩٨٢دا. لوبنان شوێنی هاوسەنگییەکی زۆر ورد بوو لە نێوان دیان و موسڵمانە عەرەبەکاندا. موسڵمانە عەرەبەکان دابەش دەبن بۆ شیعە و سوننە و دروز. رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستین ئامادەییەکی گەورەی هەبوو لە لوبنان. هەروەها دیانەکانیش لە نێوخۆیاندا بۆ سەر تایفە و باڵی تر دابەش ببوون. لوبنان پێی دەگوترا: بەهەشتی سەقامگیر لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا. تاکە ناوچە بوو کە فرە ئایینی و سیاسی راستەقینەی تیابوو.

شەڕی نێوخۆیی، کە یەکێتی لوبنانی پارچە پارچە کرد، هەلی بۆ دەست تێوەردانی دەرەکی رەخساند، سوریا دەستی بە فەرمانڕەوایی کرد لە باکووری وڵات. لە ساڵی١٩٧٨دا، ئیسرائیل چووە ناو خاکی لوبنان تاوەکو گەیشتە رووباری «لیتانی». لە حوزەیرانی ١٩٨٢دا، وەزیری بەرگری ئیسرائیل «**ئارییل شارون**» بڕیاریدا لەوەش زیتر بڕوا. بەرایی رایگەیاند کە ئیسرائیل ٢٥ میل دەڕواتە ناو خاکی لوبنان بۆ پارێزگاری کردنی ناوچەکانی باکووری ئیسرائیل. وەلێ هێزەکانی ئیسرائیل بەرەو باکوور رۆیشتن، تا گەیشتنە بەیرووت و بۆ ماوەی (١٠) دە هەفتە ئابلووقەیان دا. ئەو ئابلووقەیە بووە سۆنگەی ئەوەی کەوا رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستین لە شارەکە بچێتە دەرەوە. سەرۆکی لوبنان **بەشیر جومەیل** کە دیان بوو، پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل ئیمزا کرد. وەلێ **بەشیر جومەیل** خێرا کوژرا و پەیماننامەکە بەکۆتا هات و لوبنان دوچاری ئاژاوەی زیتر بوو. لە ساڵی ١٩٨٥دا ئیسرائیلییەکان

هێزەکانیان لە زۆربەی خاکی لوبنان کێشایەوە، وەلێ بەردەوام بوون لە داگیرکردنی شریتی سنووری باشوور. هەرچەندە ئیسرائیل لە دەرکردنی رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستین لە بەیرووت و لە لوبنان سەرکەوتنی وەدەست هێنا. وەلێ ئیسرائیل ئەوەی وەدەست نەهێنا کە بەتەمابوو لە پەنای ئەو کارەوە بێتە دەستی، دوچاری هێرشی رۆکیتی بوو، لە زۆربەی توێژەکانی باشووری لوبنان.

ئەزموونی رۆژهەڵاتی ناڤین ئەوەمان بۆ دەردەخا، کەوا ئەو ململانێیە ناوچەییانەی لەسەر رەگەز و ئایین ونەتەوە دا بەندن، مەیلیان بەلای رق و کینەیەکی وادا وەردەچەرخێ، کە چارەسەرکردنی ئاستەنگ بێت. توندڕەوەکان یارمەتی یەکتر دەدەن دەوڵەتە عەرەبەکان لە هێنانە دی ئاشتی خۆیان دەگنخێنن، لەبەر ئەوەی نایانەوێ شەرعییەت بە هەبوونی ئیسرائیل بدەن. بەم هەڵوێستە رەتکردنەوەیە، شوێنی ئەو ئیسرائیلییانەیان پتەوتر کرد کە ئاشتیان لەگەڵ عەرەبەکان ناوێ. لە راستیدا توندڕەوەکان، هاوبەندییەکی راگوزەری وایان بەیەکەوە نا، کە تارادەیەکی زۆر کۆت و پێوەندی خستە پێی میانڕەوەکان، بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەک لە سالی ١٩٧٣ و ١٩٧٧دا سادات سەرەڕۆیەکی کرد، نرخی سەرەڕۆییەکەشی کوژرانی خۆی بوو. لە ساڵی ١٩٩٥ **ئیسحاق رابین**، لە سۆنگەی هەڵوێستەکانی لە پرۆسەی ئاشتی، ژیانی خۆی بە دەستی جولەکە توندڕەوەکان لە دەست دا. جیهانێکی توندڕەوی بەم چەشنە، ئاستەنگە تیایدا بگەنە بڕوا بە یەکتر کردن و هاریکاری دوولایەنە، لێرەدا «کێشەی زیندانییەکە» نموونەیەکی زۆر ورد بۆ سیاستەکانی ناوچەکە پێشکەش دەکات.

لە قۆناغی دووجەمسەرەدا، شەڕ لە رۆژهەڵاتی ناڤین، مەیلی کورت بوونەوەی هەبوو. لەبەر ئەوەی رۆڵی دەوڵەتە گەورەکان زۆر لەبەر چاو بوو، هەریەکێک لە دەوڵەتە گەورەکان لەلایەک لایەنگیری پیاوەکانی خۆی دەکرد، وەلێ بە ئەنقەست پیاوەکانی خۆی لە رادەیەک رادەگرت. ئەگەر بۆی دەرکەوتایە ئەوان، واتە دەوڵەتە گەورەکان بەرەو کەناری شەڕێکی ئەتۆمی پەلکێش دەکەن. فشار بۆ وەستاندنی تەقە لە دەرەوە دەهات، وڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥٦ لە رێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە جەختی کرد، لە ساڵی ١٩٦٧، وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت، هەردوولایان هێڵی تەلەفۆنی «گەرمیان» بەکارهێنا بۆ مەبەستی وەستاندنی ئاگر. لە ساڵی ١٩٧٣دا هەردوولا خۆیان تێهەڵقورتاند، لە ساڵی ١٩٨٢دا وڵاتە یەکگرتووەکان فشاری خستە سەر ئیسرائیل بۆ ئەوەی لە لوبنان بکشێتەوە. راستە شەڕی سارد لە زۆر حاڵەتدا جێ پێی ململانێی ناوچەیی زێتر دەکرد، کەچی لە ژێر

ئەو ململانێیەی وەکو تۆڕی سەلامەتی وابوو. لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی ساردا، دەوڵەتە بچووکەکان رووی خۆیان بەرەو نەتەوە یەکگرتووەکان وەرچەرخاند، داوای ئەوەیان کرد تۆڕی سەلامەتییان بۆ دابین بکات. وەلێ رادەی سەرکەوتنی رێکخراوی دەولی بۆ دابینکردنی تۆڕێک بۆ ئاشتی، کارێکە بۆ دوا رۆژ ماوەتەوە. لەبەر ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، دوای شەڕی سارد یەکەم تاقیکردنەوەی خۆی بڕی، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٠دا، عێراق پەلاماری کوێتی دا.

## شەڕی کەنداوی ساڵی ١٩٩١ و دوای ئەو

تەنگژەی کەنداو لە (٢) ئابی ١٩٩٠دا دەستی پێکرد، ئەو رۆژە «سەدام حوسێن» پەلاماری کوێتی دا. دەڵێین «سەدام حوسێن» پەلاماری کوێتی دا لەبەر ئەوەی تەنیا ئەو بوو بڕیارەکەی دا، نەک فەرماندەکانی سوپای عێراق، وەک لە پەلاماردان و شەڕەکاندا هەیە. عێراق بانگەشەی ئەوەی دەکرد کوێت قەوارەیەکی دروستکراوە و کولونیالستەکان گوراندوویانە، پێویستە وەک دەوڵەتێک نەمێنێتەوە. لە ساڵی ١٩٦١دا، عێراق بە سەرکردایەتی «عەبدولکەریم قاسم» هەوڵیدا دەست بەسەر کوێت دابگرێت، بەریتانییەکان سەنگراندیانەوە. پێشتر ئەو رایەمان بینی کە دەڵێ سنوورەکانی کولونیالیزم هیچ واتایەکیان نییە، وێران بوون و ئاژاوەیەکی توندی لە دووتوێی خۆی هەڵگرتووە، بۆ ناوچەکانی تر، لە جیهانی دوای ئیمپریالیزم. ئەمەش راڤەی ئەوە دەکا کە زۆر لە دەوڵەتەکانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان پاساو هێنانەوەی عێراقیان بۆ پەلاماردانەکە رەتکردەوە.

هۆی ئابوری و سیاسی لە ئارادا بوو کە پاڵی بە «سەدام حوسێن»ەوە نا ئەو هەڵوێستە وەربگرێ. عێراق دوای هەشت ساڵ شەڕ لەگەڵ ئێران، لە رووی ئابورییەوە تێکشکابوو، نزیکەی(٨٠) ملیار دۆلار قەرزار بوو کە ساڵانە بەرێژەی(١٠) ملیار دۆلار وەکو سوودی قەرزەکە زێدەی دەکرد، هاوکات هاوسێی کانێکی زێڕ بوو- کوێت کە یەدەگێکی مەزنی نەوتی هەبوو، لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە دانیشتوان. سەرباری ئەمەش عێراق لە سیاسەتی نەوتی کوێت نیگەران ببوو، لە سۆنگەی ئەو بڕیارانەی بۆ کەمکردنەوەی نرخ و زێدە کردنی هەناردنە دەرەوەی نەوت دەیدا. عێراق بیانگەی ئەوە بوو کوێت فەندوفێڵ لە رێکەوتننامەکانی «ئۆپیک» دەکات. هەریەک دۆلار لە نرخی یەک بەرمیل نەوت دابەزێ، عێراق ساڵانە یەک ملیار دۆلاری لە دەست دەچێ. بۆیە داگیرکردنی کوێتی بە چارەسەرێک بینی بۆ ئەژوارییە ئابورییەکانی عێراق.

هەرچی لەلایەنی سیاسییەوە بوو، ئەوا«سەدام حوسێن» دەربارەی ئاسایشی عێراق دوچاری دڵەڕاوکێیەک ببوو، لەو بڕوایەدا بوو هەموو دەیانەوێ پشتی وڵاتەکەی بشکێنن، لە ساڵی ١٩٨١دا، ئیسرائیل کارگەکانی ئەتۆمی بۆردومان کرد. لەگەڵ دارمانی یەکێتی سۆڤیەت، بۆی دەرکەوت کە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل بە هێزتر دەبن. لە وتارێکی خۆیدا لە عەممانی پایتەختی ئوردن لە شوباتی ١٩٩٠دا، گوتی: یەکێتی سۆڤیەت وا دادەڕمێ و چیتر ناتوانێ بەرەو رووی ئەمریکا و ئیسرائیل بێتەوە. «سەدام حوسێن» لەو بڕوایەدا بوو پێویستە ئەو رووبەروویان بێتەوە! بە ئەنقەست ژمارەیەک جووڵانەوەی کرد، ویستی ئەمریکاییەکانی پێ تاقی بکاتەوە. سەیر لەوەدایە وڵاتە یەکگرتووەکان دەیویست عێراق رازی بکاو بیگەڕێنێتەوە نێو کۆمەڵگای دەولی و وەک ئامرازێکی هاوسەنگیی کاریگەر، دژی هێزی ئێران بەکاری بهێنێ لە ناوچەکەدا.

سیاسەتی دژبەیەکی ئەمریکی، «سەدام حوسێن»ی بە هەڵە برد. لەو بڕوایەدا بوو دەتوانێ کوێت داگیر بکات بەبێ ئەوەی دوچاری کاررایی تۆڵە لێکردنەوەی ترسناک بێتەوە، لەمەشدا هەڵە بوو! یاخود وەک پێیەوە ناسراوە خراوی خەملاند. نەتەوە یەکگرتووەکان زنجیرەیەک بڕیاری دەرکرد کە سروشتی پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەڵی تیادابوو، دژی عێراق. کەواتە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەوانی تر بۆچی بەم چەشنە رەفتاریان کرد؟ یەکێک دەڵێ: نەوت لە پشت هەموو رووداوەکانەوە بوو. گومانی تیانییە کەوا نەوت، ناوچەی کەنداوی بە رادەیەکی ترسناک کردە ناوچەیەکی گرنگ، وەلێ تەنگژەکە زۆر گەورەتر بوو لەوەی کە بە تەنیا نەوت بێت، بۆ نموونە بەریتانیا بە رادەیەکی گەورە بەشداری جەنگی کرد، لە کاتێکدا هیچ نەوتێک لەکەنداو ناهێنێ.! هەروەها دڵەڕاوکێ بەرامبەر ئاسایشی بە کۆمەڵ و دەنگدانەوەی نوشوستی هێنان لە بەرامبەر وەستانی کاری دوژمنکارانە لە سییەکاندا لە ئارادا بوو.

سێیەم رەهەندیش هەبوو: شەڕی خۆپاراستن. لەبەر ئەوەی«سەدام حوسێن» چەکی کاولکاری بەرفراوانی دادەمەزراند، پرۆگرامی ئەتۆمی هەبوو، کە بە نهێنی کەرەستەی پێویستی بۆ دەهێنا، هەروەها چەکی کیمیاوی هەبوو، پرۆپاگەندەی ئەوەش دەکرا کەوا چەکی بایۆلۆژیشی هەیە. جائەگەر لە پاڵ ئەو چەکانەدا داهاتی نەوتی کوێتیشی هەبوایە، ئەوا دوای ساڵێکی تر جیهان خۆی لەبەردەم هەڕەشەیەکی عێراقی بەرفراوانتر و کاولکارانەتردا دەدۆزییەوە. هەندێک پێیان وابوو مادام شەڕ هەر دەقەومێ، ئەوا ئەمڕۆ شەڕ بکرێ باشترە نەک سبەی. هەندێکی تر وایان بینی شەڕ

پێویست نییە، لەبەر ئەوەی سزای ئابوری بەسە بۆ ئەوەی وا لە عێراق بکات هێزەکانی خۆی لە کوێت بکێشێتەوە. راستیەکەی پێچەوانەی ئەم رایە و رایەکەی تر بوو، چەسپاندنی ئاستەنگ بوو، زۆر ئاستەنگە کە بزانرێ سزای ئابوری شتێکی بەشێک دەکرد. ئەگەر هێزە هاوپەیمانەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ساتێک یاخود زێتر خۆی بگرتایە و نەجولایەتەوە؛ ئابلۆوقەی ئابوری لەسەر عێراق هەر لە سالّی (١٩٩٠)ەوە ئەوەی سەلماند کە شکستی هێناوە و هیچ سوودێکی نییە. لە کۆتاییدا شەڕ یەک مانگی خایاند، بەر لەوەی عێراق لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٠دا هێزەکانی بکێشێتەوە، **ئیدارەی بۆش** گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە سزای ئابوری سوودی نەماوە. لە تشرینی دووهەمدا ولاّتە یەکگرتووەکان هێزەکانی خۆی زێدە کرد، وەکو دەروازەیەک بۆ چوونە ناو شەڕ. کەواتە بۆچی «سەدام حوسێن» لە دوا چرکەدا رای نەکرد. یا بلێ هێزەکانی دەکێشێتەوە، یاخود رێگایەکی تر دەدۆزێتەوە بۆ چوونە دەرەوە؟ یەکێک لە هۆیەکانی خراپ خەملاندن بوو. وای هەست کرد ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرگەی زیانی زۆر گەورەی مرۆیی ناگرێ، وەک لە ئابی ١٩٩٠ بە بالّویزی ئەمریکای راگەیاند. لەو خەملاندنەش بووە قوربانیی کاردانەوەکانی شەڕی ڤێتنامی. هۆیەکی تر دەشێ خۆ بەزلزانین بێت. ئەو دوای ئەوەی دلّی شانۆی جیهانی داگیرکرد، توانای کیشانەوەی نەبوو.

شەڕ، پرەنسیپی ئاسایشی بە کۆمەلّی ژیاندەوە. دەشێ ببێتە هۆکارێکی سەنگراندنەوەش بۆ رووداوی تری لەم بابەتە. وەلێ وەک پێشتر بینیمان هەندێک پرسیاری تر هەبوون کە پەیوەست بوون بە رادەی تایبەتمەندی ئەو ململانێیە ناوچەییە.

شەڕ بەرهەمهێنانی چەکی کۆکوژی عێراقی کاولکرد، بەر لەوەی بگاتە پلەی بەکارهێنان. وەستاندنی تەقە، رێگای بە پشکنەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دا سەردانی عێراق بکەن و ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی و کیمیاوی تێک بشکێنن. وەلێ شەڕ ئەو ململانێیەی بە خۆوە گرت، کە لە سیاسەتە نیشتمانی و پەرت و بلاّوەکان و کۆمەلّگا لاواز و خۆجێیەکانی رۆژهەلاّتی ناڤین کەوتبۆوە.

لەگەلّ ئەمەشدا دوای شەڕ، حکومەتی ئیسرائیلی و رێکخراوی رزگاریخوازی فەلّەستین پێشکەوتنێکی گەورەیان لە رێگای ئاشتی و ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوانیان بە خۆیانەوە دی، ئیدارەی **بوش** ئەو نفوزەی بەکارهێنا کە لەو شەڕەدا وەدەستی هێنابوو بۆ ئەوەی فشار بخاتە سەر رێکخراوی رزگاریخوازی فەلّەستین و حکومەتی **ئیسحاق رابین** و حکومەتە عەرەبییەکان، بۆ ئەوەی لە کۆتایی

سالّی (١٩٩١)دا له مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا و له سالّی ١٩٩٢دا له واشتۆن کۆبنەوە. کاتێک ئەو گفتوگۆیانە گەیشتە ڕێگایەکی داخراو، له ئۆسلۆی پایتەختی نەرویج، له پشت پەردەوە، گفتوگۆ له نێوان بەرپرسانی حکومەتی ئیسرائیلی و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلّەستین بەڕێوە دەچوو، کە ئەمە ڕێکەوتننامەیەکی له نێوان هەردوولا لێ کەوتەوە. دوای ئەوە زنجیرەیەک ڕێکەوتننامەی تر راگەیەنران، بۆ کشانەوەی هێزەکانی ئیسرائیل له کەرتی غەززەو گوندو شارەکانی کەرتی رۆژئاوای فەلّەستینی. هەروەها ئیسرائیل دانی بە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلّەستین نا وەک نوێنەری شەرعی گەلی فەلەستینی و جلّەوی ئۆتۆنۆمی تەسلیم کردن، له دوای سالّی ١٩٩٢ەوە، بەر پرسیاریەتی ئاسایشی بە چەند قۆناغێک دایە دەست **یاسر عەرەفات** و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلّەستینییەوە.

هاوکات **مەلیک حوسێن**، مەلیکی ئوردن له سالّی ١٩٩٤دا، لەگەلّ حکومەتی ئیسرائیل گەیشتنە پەیماننامەیەک و له واشنتۆن ئیمزایان کرد، له ماوەی شەڕی کەنداو، ئوردن خۆی دێناو دەبرد لایەنگیری خۆی بۆ ئەو هاوپەیمانانێتیە رابگەیەنێ کە ولاّتە یەککگرتووەکان بەڕێوەی دەبرد. **مەلیک حوسێن** خوای لێ خۆش بێ، وای دەبینی کە ئاسایکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەلّ ئیسرائیل بەسە بۆ ئەوەی ولاّتە یەککگرتووەکان و دەولّەتە نەوتییەکانی رۆژهەلاّتی ناڤین، واتە دەولّەتەکانی کەنداو لێی رازی بن.

ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلّەستین له کاتی شەڕی کەنداودا لایەنگیری عێراقی **سەدام حوسێنی** دەکرد، له ئەنجامی ئەمەشدا یارمەتییەکی زۆری له دەست دا، کە له کوێت و سعودیە و دەولّەتە عەرەبییەکانی تر وەری دەگرت. بەرامبەر بە تەنگژەی دارایی ناچار بوو بەرهەلّستی کردنەکەی خۆی بۆ چارەسەری ئاشتییانە سووک بکات.

لەگەلّ ئەوەشدا هۆکاری ململانێ له رۆژهەلاّتی ناڤیندا هەرمایەوە، رای گشتی ئیسرائیلی له دانوستانەکانی ئاشتی و سیاسەتی دەست بەردار بوون له خاک، واتە خاک بەرامبەر ئاشتی، نارازی بوو. توندڕەوە ئیسرائیلییەکان، **ئیسحاق رابینیان** بە خائین له قەلّەم دا و له کۆتاییەکانی سالّی ١٩٩٥ دا کوژرا.

زۆربەی فەلّەستینییەکان سەیری حکومەتەکەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلّەستین و **یاسر عەرەفات** دەکەن، کەوا گەندەلّ بووە و ئارەزووی خۆسەپاندنی هەیە. بۆیە کەوتنە پشتگیری کردنی بەرهەلّستکارەکانی تر، وەکو بزووتنەوەی توندڕەوی حەماسی ئایینی کە هەولّیدەدا و هەولّدەدا کۆسپ بخاتە بەردەم پرۆسەی ئاشتییەوە.

ئەو تەقاندنەوانەی کە کۆمەڵە عەرەبییەکان دژی پرۆسەی ئاشتی ئەنجامیان دا، کاریگەرییان لەسەر هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٦ی ئیسرائیلی دا هەبوو. حکومەتەکانی ئەو ناوچەیە بە درێژایی ناوچەکانی رۆژهەلاتی ناڤین رووبەرووی بەرەنگار بوونەوەی نێوەخۆیی دەبنەوە. کە زۆربەیان هەرەشە لە بەرپابوونی شەڕێکی نێوخۆیی دەکەن، وەک ئەوەی لە جەزائیر و سوداندا روویدا(*).

پێشکەوتنەکانی دوای شەڕی کەنداو رەنگدانەوەی میکانیزمی تاک و دەوڵەت و سیستەمی دەولییە، کە لە ململانێیەکانی تردا بینیمان. لەسەر یەکێک لە ئاستەکان دەبینین تاکەکان، وەکو **یاسر عەرەفات و ئیسحاق رابین و مەلیک حوسێن**، بڕیاردەدەن کە دەبێ رێکەوتننامەی ئاشتی هەبێت، یاخود نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا پرۆسەیەکی ئاوا هیچ ئەنجامێکی بەرجەستەی لێ نەکەوتەوە. ئەگەر شەڕی کەنداو گۆڕانی لە سیستەمی دەولیدا نەهێنابووایە ئاراوە، هەروەها جەختی نێو خۆییش لەسەر حکومەتەکانی ئەو دەوڵەتانە، وەکو تەنگژەی ئابوری کە دوچاری ئوردن هاتبوو، هاوبەشیان کرد لە گەیشتن بەو دەرئەنجامانە.

زۆرجار دەوڵەتانی ناوچەکە بە رێگایەک رەفتار دەکەن کە لەگەڵ ئەو نموونە واقیعییەی سیاسەتی دەولیدا دەگونجێ، کە هەوڵ بۆ هێز و ئاسایش دەدات لە رکابەری کردن لەگەڵ دەوڵەتانی تردا. وەلێ یاسای دەولی و رێکخراوە دەولییەکان، یارمەتی دان لە دیاریکردنی شێوەی خەباتی سیاسی، هەروەکو نوێنەرە تاکەکان کردیان. هاوکات مەسەلەکانی ئایین و تایفەگەری و نەتەوایەتی و دواکەوتنی ئابوری و فشاری گەشەسەندنی دانیشتوان، وا لە ناوچەی رۆژهەلاتی ناڤین دەکەن، کە لە هەموو ناوچەکانی تری جیهان ئامادەتر بێ بۆ تەقینەوە سیاسییەکان.

---

(*) ئەو ململانێیانەی کاریگەرییەکی زۆر گەورەشیان لەسەر کوردستان هەبووە و هەیە، لەبەر ئەوەی کێشەی کورد یەکێکە لە کێشە زەق و ئاڵۆزەکانی رۆژهەلاتی ناڤین. ناونانی کێشەی فەلەستینی بە کێشەی رۆژهەلاتی ناڤین، نارەواییەکی زۆر دەرهەق بە کێشەی کورد دەکرێ. بە داخەوە نووسەر بە هیچ شێوەیەک ئاماژەی بۆ رۆڵی ئەو ناوچە گرنگە(کوردستان) نەکردووە، کە بابەتەکەی پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵدا هەیە.(و)

# هێزو پشت بەیەکتر بەستن

لە ماوەی دوای جەنگ (جەنگی جیهانی دووهەم) پشت بەیەکتر بەستنی ئابوری، بەخێرایی پەرەی گرت، وەلێ تەنگژەی نەوتی ساڵی ١٩٧٣، سەر لە نوێ پاڵی بە ململانێیە ئابورییەکە نایەوە بۆ نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە. هەندێک وا گومان دەبەن کە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، واتا هاریکاری کردن و ئاشتی، وەلێ بەداخەوە بەو سادەییە نییە. هەتاوەکو لە جیهانی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەشدا، ململانێیەکە بەردەوامە، لەبەرئەوەی هاوبەندییەکان هێندە ئاڵۆزن و شێوەی جیاجیای هێز لە ئارادایە. ململانێیەکان بەیاری شەترەنج دەچن لەسەر چەند تەختەیەک لەیەک کاتدا. ململانێیەکانی ئاخروئۆخری سەدەی بیستەم، هەم چەک و هەم دیپلۆماسی دەگرتەوە. ماوتسی تونگ، سەرۆکی چینی گوتی، هێز لە لوولەی تفەنگەوەیە. دوای تەنگژەی نەوتی ساڵی ١٩٧٣، جیهان دەرکی بەوە کرد کە دەشێ هێز لە بەرمیلی نەوتیشەوە بێ. هەندێک لە ریالیستەکان تەنگژەی نەوتی ١٩٧٣یان گەورە کردەوەو، ئەو تەنگژەیان بەو رووداوانە چواند کە لەساڵی ١٩١٤ دا ، یاخود ئەوانەی لە ساڵی ١٩٣٩دا روویاندا. هزرڤانی ریالیستی **هانز مورگنتاو** Hans Morg - Enthau. گوتی: ساڵی ١٩٧٣، وێنەی نەبووە لە مێژوودا، لەبەرئەوەی پەیوەندیی نێوان هێزی سەربازی و هێزی ئابوری کە بەکەرەستەی خاوەوە بەندبوو تێکدا.

تەنگژەی ١٩٧٣ پرسیارێکی گرنگی خستەڕوو. بۆچی بەهێزترین دەوڵەتی جیهان رێگایدا چەندین ملیار دۆلار بۆ وڵاتە بێ هێزەکان بگوێزرێتەوەو هێزی بەکارنەهێنا؟

لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا رووداوێکی بەم چەشنە بەئەندێشەی کەسدا نەدەهات، ئەو رۆژگارەی کە دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان باڵادەستیی سەربازی خۆیان بەکاردەهێنا، بۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانەی کەسەر ئێشەیان بۆ دەنانەوەو چیان بویستایە، وایان دەکرد. کەواتە لە ساڵی ١٩٧٣دا چ گۆڕابوو؟ ئەمە چاخێکی نوێی هێز نەبوو کە پابەند بێت بە کەرەستەی خاوو کارتیلات و لەیەک جیاکردنەوەی تەواو لە نێوان هەردوو هێزی سەربازی و ئابوری، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو هۆکارانە

هەموو لە چەند پەیوەندییەکی ئالۆزەوە تێک ئالآن بوون. جا ئەگەر ویستمان لە گۆڕانکارییەکانی سیاسەتی دەولی بگەین، پێویستە حسێو بۆ ئەوە بکەین کە چۆن دەشێ پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە ببێتە سەرچاوەی هێز.

## پرەنسیپی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە

پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، وەک هەموو زاراوە سیاسییەکانی تری چەشنی نەتەوایەتی و ئیمپریالیزم...، زاراوەیەکی چروک و فشۆڵەو بەزۆر شێوەی جیاجیا بەکاردەهێنرێ. سیاسەتوان و شرۆڤەوانان لە روانگەو بەمەبەستی جیاوە ئەو زاراوە سیاسییانە بەکاردەهێنن. سیاسەتوان، گەورەترین ژمارەی خەڵک لە ژێر ئالآکەی خۆیدا کۆ بکاتەوە. سەرکردە سیاسییەکان هەوڵ دەدەن واتاکان فەرامۆش بکەن و ئەو دەلالاتانە هەڵبهێنجن کە لەبەرژەوەندی گشتیدایە. «هەموومان رووبەڕووی یەک کێشە دەبینەوە، پێویستە هاریکاری یەکتر بکەین، بۆیە بەدوام کەون». لەلایەکی ترەوە شرۆڤەوان دەلالەتێک و دەلالەتێکی تر لێک هاوێر دەکات و بەشێوەیەکی باشتر لە جیهان دەگات. مەسەلەکانی خێرو شەڕ روون دەکاتەوە، ئەگەر روون کردنەوەکان زۆربن یاخود کەم، دەشێ ئاماژە بۆئەوە بکرێ وەک پەندەکە دەڵێ: ئێمە هەموومان لەنێو بەلەمێکداین. وەلێ گەمیەکە دەچێتە لەنگەرگایەک و ناچێتە یەکێکی تر. یاخود یەکێک هەیە سەوڵ لێدەدا، وەلێ یەکێکی تر رووی گەمیەکە بۆ ئەم یاخود ئەو رووگەیە وەردەچەرخێنێ، یاخود بێ بەرامبەر شوێنێک لە گەمیەکە بەکاردەهێنێ. بەواتایەکی تر، دەشێ پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە لەرووی ئایدیۆلۆژی و شرۆڤەکارییەوە بەکاربهێنرێ. پێویستە ئاگاداری ئەم دوو بەکارهێنانە جیاوازە بین. ئەو زاراوەیە دەبێ وەکو کردارێکی سیاسی کاری پێ بکرێت. دەڵێم: «من پشت بەخەڵکی تر دەبەستم، تۆ پشت بەخەڵکی دیکە دەبەستی، ئێمە پشت بە ئیدیکە دەبەستین، ئەوانیش فەرمانڕەوایی دەکەن».

پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، وەک وشەیەکی شرۆڤەکاری، ئاماژە بۆ ئەو حاڵەتانە دەکا کەوا نوێنەرانان و رووداوەکان، لە بەشی جیاجیای سیستەمدا، کار لە یەکتری دەکەن. ئەو جۆرە حاڵەتانەش لە خودی خۆیاندا، باش یاخود خراو نین. جا ئەگەر ژمارەیان زۆربوو یاخود کەم. بەکورتی لە پەیوەندییە کەسییەکاندا، پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، وا پێناسە دەکرێت کەوا شتێکە لەشێوەی فۆرمی ژن هێنان، کە ژن و مێرد تیایدا هەرێی ئەوە بەیەکتر دەدەن، لە خۆشی و ناخۆشیدا

بەیەکـەوە بژین. دەق پشت بەیەکـتـر بەسـتنی دوولایەنەش لە نێـوان گـەلاندا بەم چەشنەیە. فەیلەسووفی سەدەی هەژدەهەم **جان جاک روسو** Roussea ئاماژەی بۆ ئەوە کـردووە کـەوا پشت بەیەکـتر بەسـتنی دوولایەنە لەبەریەک کـەوتن و ملمـلانێ لەگـەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ و چارەسەرییەکی داناوە کە لەسەر لاتەریکی و جویێ بوونەوە بەندە. وەلێ لە جیهانی نوێماندا ئەمە لە تواناداا نییە. کاتێک وڵاتانی وەکو ئەلبانیا، یاخود مـیـانمار (بورمـای پێـشین) ئارەزووی دوورە پەرێزی و لاتـەریکی دەکـەن، نرخـێکی ئابوری بەهادار، دەدەن. ئاسان نییە دەوڵەتان، بەشەکانی تری جیهان تەڵاق بدەن.

## سەرچاوەکانی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە

چوار جیـاوازی، رەهەندەکـانی پشت بەیەکـتر بەسـتنی دوولایەنە رۆشن دەکـەنەوە: سەرچاوەکانی پشت بەیەکتر بەستن، سوودەکانی، لەیەک چوون و ئەو تێـچوونانەی کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە. دەشێ پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، رواڵەتی مەتریالی (واتە لەرووی سروشـتـەوە)یاخود کۆمەڵایەتـی (ئابوری یاخود سیـاسی یاخـود هزری) هەبێت. هەردوو رواڵەتـیش بە گــشـــتی لە هەمـــان کـــاتدا هەن. هاوێرکـــردن لە روونکردنەوەی پلەی هەڵبژاردنی ئەو حاڵەتانەی کە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، یاخود بەرامبەر، یارمەتیمان دەدات.

پشت بەیەکتر بەستنی سەربازی دوولایەنە، ئەو پشت بەیەکتر بەستنە دوولایەنەیە کە لە رکـابەرایەتی سـەربـازیدا پەیدا دەبێ. دوای پێـشـکەوتنی چەکی ئەتۆمی و ئەو توانا خـاپوورکـارییـە دوولایەنەی لێی کـەوتەوە، چەک رووێکی مـەتریـالی کـاریگـەری پەیداکرد. لەگەڵ ئەمەشدا هۆکارێکی دەرک پێکردنی گرنگی تر هەیە لە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە کە دەشێ گۆڕان لە روانگە، یاخود لە سیاسەت، ببێـتە سۆنگەی کـەمکردنەوەی چڕی پشت بەیەکـتـر بەسـتـنی دوولایەنە. بۆ نموونە: چەکی ئەتۆمی بەریتانی و فـەرەنسی، ئەمریکاییەکـانی دووچاری دڵەڕاوکێ نەکرد، چونکە دەزانن ئەو چەکـە خـاکی ئەمـریکای پێ دانابێـژرێ. لە رۆژئاواش بەهەمـان چەشن. لە کـۆتـایی هەشتـاکـان دڵەڕاوکـێـیـەکـەیان رەویەوە، دوای ئەوەی سـەرۆک **گـۆرباچۆف** «بۆچوونە نوێیـەکەی» لەمـەڕ سیاسەتی هەندەرانی سۆڤـیـەتدا راگەیاند. ئەو رۆژە ژمارەی چەکـە ئەتۆمیـیـەکـانی سۆڤـیـەتی گـرنـگ نەبوو، بەڵکو ئەوەی گـرنـگ بوو گـۆڕان بوو لە دەرک پێکردنی دوژمنکاری، یاخود نیـازەکانی سۆڤیەتی بوو.

دەتوانین پرەنسـیـپی پشت بەیەکـتـر بەسـتنی دوولایەنەی سـەربازی لەسـەر پشت

بەیەکتر بەستنی دوولایەنەی ئابوری، گشتگیری بکەین بەوەی کە ماددەیەکی سیاسەتی دەولی تەقلیدییەو رەگێکی کۆمەلآیەتی قولّی هەیە. پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەی ئابوری لە چەند رێگاچارەیەکی سیاسی پێک دێت کە پەیوەستە بە بەهاو تێچوون. نموونەش لەسەر ئەمە: لە کۆتایی حەفتاکاندا ترسی ئەوە هاتەکایەوە، کەوا کەم بوونی خۆراک، نەتوانێ پێویستییەکانی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان پڕ بکاتەوە. زۆر لە ولآتان کەوتنە کڕینی گەنمی ئەمریکایی، کە وای کرد نرخی خۆراک لە بازاڕە گەورەکانی ئەمریکا بەرزبێتەوە. نرخی کولێرەیەک لە ولآتە یەکگرتووەکان گرانتر بوو، لەبەرئەوەی بای وەرزی لە هیند بەدیۆم بوو، بەروبومی یەکێتی سۆڤیەت باش نەبوو. بۆیە دەبینین لە سالّی ١٩٧٣دا، ولآتە یەکگرتووەکان رێگای نەدا «فول صویا» بنێردرێ بۆ ژاپۆن. ئەمەش ئەوەی لێ کەوتەوە کەوا ژاپۆن پارەی خۆی لە چاندنی «فول صویا» لە بەرازیل وەبەربێنێ. دوای چەند سالێک هاوسەنگییەک لە نێوان خواست و خستنەڕوو هاتەدی. بۆیە وەزیری ئەمریکایی لەو قەدەغەکردنە زۆر پەژیوان بوونەوە، چونکە ئەمەی وای لە ژاپۆنییەکان کرد کە ئەوەی دەیانەوێ بەنرخێکی هەرزانتر لە بەرازیل بکڕن.

رێگاچارە کۆمەلآیەتییەکان، کەموکوڕی ماددی، زۆربەی کات بۆ ماوەیەکی درێژ کار لەسەر پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەی ئابوری دەکات. پێویستە هەمیشە لەکاتی توێژینەوە لە رێگاچارە کورتخایەنەکاندا بایەخ بەروانگەی رێگاچارە درێژ خایەنەکان بدەین.

## سوودەکانی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە

سوودەکانی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، بەوە دەردەبڕدرێن کە دەرئەنجامی سفرو دەرئەنجامی بێ سفرە. لەو حالّەتە دەرئەنجامەکە سفرە کە زەرەرەکەت، قازانجەکە بخوا، پێچەوانەکەشی هەر راستە. لە حالّەتەکانی دەرئەنجامی پۆزەتیڤدا، هەردوولامان قازانج دەکەین، لە حالّەتی دەرئەنجامی نێگەتیڤدا هەردوولامان زیان دەکەین. دابەشکردنی ژەمێک خۆراک دەرئەنجامی سفرە. دروست کردنی ژەمێک خۆراک گەورەترین دەرئەنجامی پۆزەتیڤە، بەردانەوەی بۆ سەر زەوی دەرئەنجامێکی نێگەتیڤە. هەردوو دەرئەنجامی سفرو بێ سفر لە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەدا هەیە.

هەندێک لە ئابوریزانە لیبرالیستەکان حەزدەکەن بەزمانی قازانجی هاوبەش مامەلّە

لەگـەڵ پشت بەیەکـتـر بەسـتنی دوولایەنەدا بکەن، واتە ئەو حـاڵـەتانەی کـە دەرئەنجـامەکـەیان پۆزەتیـڤە، کـە هەمـوو لایەک سوودمـەند دەبن و بەرەو باشتـر پێش دەکەون. ئاگادارنەبوونی ئەو شرۆڤەوانانە لە نایەکسـانی سوودەکان و ململانێیـەکان لەسەر دابەشکردنی ئەو دەسکەوتانەی کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە، وایان لێدەکات کەوا دەرک بەلایەنە سیاسییەکانی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە نەکەن.

راسـتە دەشێ هەر دوولایەنە قـازانج بکەن. بۆ نموونە ژاپۆن و کـۆریا، بازرگـانی بە کـوتاڵ و ئامـێری تەلەفزیـۆنەوە دەکـەن، وەلێ دەسـتکەوتەکـانی ئەم بازرگـانیـیـە چۆن دابەش دەکـرێن؟ هەتا ئەگـەر ژاپۆن و کـۆریا لەو بازرگـانیـیـە هەردوولا قـازانج بکەن، وەلێ ژاپۆن زێتر سوودمەند دەبێ و کۆریا کەمتر، یاخود بەپێچەوانەوە؟

دابەش کـردنی سوودەکـان - واتە ئەم یاخود ئەو لە دەستکەوتە هاوبەشەکە چەندەی دەست دەکـەوێت - حاڵەتی دەرئەنجامی سفـرە، ئەو لایەنەی دەسـتی کـەوتووی لەگەڵ لایەنی زیانمەند بەرامبـەر دەبێ. ئەنجام لە پشت بەیەکـتر بەسـتنی دوولایەنەی ئابوری، هەمـیـشـە ململانێی سیـاسی بووە. هەتاوەکو ئەگـەر ژەمـێکی گـەورەش هەبێ، خەڵک لەسـەرئەوە بەشەڕدێن کە کامـەیان گەورەترین لوقمەی دەست دەکەوێ. هەتاوەکو ئەگەر وڵاتانی پشت بەیەکـتر بەسـتوی ئابوری لە دەست کـەوتێکی هاوبەشـیش بەشـداربن، ئەگـەری دایسـانی ململانێ هەیە لە نێـوانیـاندا لەسـەر پشکێکی گـەورەتر لە دەستکەوتەکە.

هەندێک لە شرۆڤەوانی سیاسی دەکەونە هەڵەوە کاتێک پێیان وایە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە لە جیـهـاندا زێتـر دەبێ، هاریکاری، شـوێنی ڕکابەری دەگـرێتەوە، بیانگەشیـان ئەوەیە کەوا پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە سوودی هاوبەش دەگوڕێنێ، ئەو سوودانەش هانی هاریکاری کردن دەدەن. وەلێ پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەی ئابوری دەشێ وەکو چەکێک بەکاربهێنرێ - تەنگژەی نەوتی ١٩٧٣ بەبەڵگە وەرگرن، گومانی تیانییە پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەی ئابوری لە هەندێک حاڵەتدا لە هێز بەکـارترە، لەو رووەی کـەوا زنجـیـرەیەک گـۆڕانـکاری ورد، بەتێـچـوونی کـەمـتـر لەگـەڵ خـۆیدا دێنێ. لە هەندێک حـاڵـەتدا، دەوڵـەتان بایەخ بەوە نادەن کـە پشت بەیەکـتـر بەستنی دوولایەنە چ دەستکەوتێکی گەورەیان بۆ دەهێنێ، بەو رادەیەی کە بایەخ بەوە دەدەن کە ئەو دەستکەوتە گەورانە چ زیانێک لە دەوڵەتە ڕکابەرەکانیان دەدەن.

هەتـاوەکـو پشـت بەیەکـتـر بەسـتنی دوولایەنەی ژینگەییش دەشێ وەکـو چەکـێک بەکـاربهـێنرێ، وەک چۆن لە سـاڵی ١٩٩١ روویدا. کـاتـێک عـێـراق نەوتی لە کـەنداو

کـردو ئاگـری لە بیـرە نەوتەکـانی کـوێت بەردا. هەروەها دەشێ ملمـلانێ لەسـەر مەسەلەکانی ژینگەی دەولی بکەوێتەوە، نموونەی ئەمەش: ئەگەر پلەی گەرما لەسەر رووی زەوی بەرزبێتەوە کێ قازانج دەکاو کێ زەرەر؟ ئەگەر پلەی گەرما لە رێژەی خۆی دوو پلەی تر بەرزبووەوە، خـەڵکی دورگـەی مـالدیف، کـە لە رێکی رووی دەریان، هەروەها ئەو ئەفەریقاییانەی کە لەلێوارەکانی بیابانی گەورە دەژین، دووچاری ئازارو ژانێکی گـەورە دەبنەوە ئەگـەر دوورگـەکـان کـەوتنە ژێر ئاسـتی رووی دەریاوە، وەلێ هەندێک لە دانیشـتوانی سیبریاو کەنەدا، لە ئێستا باشتر دەبن، ئایا لەسەر ئەوانە پێویستە نرخی ئەوە بدەنەوە بۆ هێورکردنەوەی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای زەوی؟!

هەندێک لە شرۆڤەوانەکان لەو بڕوایەدان کە هەمیشە سیاسەتی تەقلیدی دەولی، دەرئەنجامەکەی سفر بووە. وەلێ ئەو خستنەرووە دەربارەی رابردوو رێگا ون کەرە؛ سیاسەتی تەقلیدی دەولی دەشێ بەگوێرەی نیازی یاریزانەکان دەرئەنجامی پۆزەتیڤانەی هەبێت. جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەی بسمارک، یاخود هتلەر ئەڵمانیا بەرێوەبەرێ. کـاتێک یەکـێکیـان هەوڵدەدەن وڵات گـەورە بکەن، وەک هتلەر کـردی، ئەوکـاتە سیاسەت بەراستی دەرئەنجامی سفر دەبێت - لایەک دەباتەوەو لایەک دەیدۆڕێنێ - وەلێ ئەگەر هەموو لایەک بۆ سەقامگیری هەوڵی دا ئەوکاتە دەستکەوتی هاوبەش لە تەرازووی هێزەکـان دێتەدی. بەرامبەر ئەمەش ، لە سیاسـەتی نوێی پشت بەیەکتر بەسـتنی ئابوری، چەند رووێکی دەرئەنجـامی سـفـری رکـابەرانە و چەند رووێکی دەرئەنجامی پۆزەتیڤانە هەیە.

لە سیاسەتی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەدا، لێک کردنەوەی کە کێهە خۆییەو (خۆجێیە) کێهە دەرەکییە، دووچاری شڵەژان دەبێ. نموونەش «فول صویا»، کە پێشتر باسکرا، مەسەلەیەکی نێوەخۆیی دەگرێتە خۆ کە پەیوەستە بە کۆنترۆڵکردنی هەڵئاوسان لە وڵاتداو هاوکات پەیوەستە بەپەیوەندی ئەمریکا لەگەڵ ژاپۆن و بەرازیلیا. یاخود با نموونەیەکی تر وەربگرین: دوای ئەوەی شۆڕشی ئێرانی لە ساڵی ١٩٧٩دا بەرهەمهێنانی نەوتی کەم کردەوە، حکومەتی ئەمریکا داوای لەهاووڵاتیانی خۆی کرد ژیرانە نەوت بەکاربهێنن و خێرایی ترومبێل لە (٥٥) میل لە کاتژمێرێکدا تێ نەپەڕێت، هاوکات ئامێرەکانی ئەرموستات دابخەن. ئایا ئەو مەسەلەیە سیاسەتی نێوەخـۆیی یاخـود دەرەکی بوو؟ ئایا وڵاتە یەکگرتووەکـان رێگای دەدا خـەڵووز لە کانەکانی ببرێ، ئەگەر هاتوو خەڵووز شتێک بوایە بۆ ناردنە دەرەوە؟ ئایا ئەوانەی خـەڵووزیان دەبرد ئەو تێچـوونە زیادەیان دەدا کـە بەهۆی وێران بوونی گـوندێکی

ڕۆژئاوایی ولایەتی فرجینیا دەکەوتەوە؟ پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە، مەسەلە نێوخۆیی و دەرەکییەکان بەتەواوی تێکەڵ دەکات. ئەوکارەی دەبێتە سۆنگەی سەرهەڵدانی هاوبەندییەکی ئاڵۆزترو شێوەی تێک پرژواتر لە ململانێ و ڕێگای جیاوازتر لە پێشان لە دابەشکردنی سوودەکان، لە ئارادابوو.

هەروەها پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە بەرێگای جیاجیا کار لە سیاسەتی نێوخۆییش دەکات. لە ساڵی ١٨٩٠دا، سیاسەتمەداری فەڕەنسی، کە هەوڵی دەدا دەستکەوتی ڕێژەیی وەدەست بێنێت، پێویستی بەوە هەبوو سیاسەتێک بگرێتەبەر کەرادەیەک بۆ پێشکەوتنی ئەڵەمانیا دابنێ. کەچی ئەمڕۆ سیاسەتی کۆسپ خستنە بەردەم گەشەسەندنی ئابوری ئەڵەمانیا، سوودی بۆ فەڕەنسا نییە. پشت بەیەکتر بەستنی ئابوری لە نێوان فەڕەنساو ئەڵەمانیا، واتای ئەوەیە کە باشترین شت کە فەڕەنسا پەنای بۆ بەرێ بۆ پێشکەوتنی ئابوری خۆی، گەشەسەندنی ئابوریی ئەڵەمانیایە. ئەمڕۆ لە بەرژەوەندی سیاسەتمەدارە فەڕەنسییەکانە کەوا ئەڵەمانیا لەڕووی ئابورییەوە پێشبکەوێ. تیۆری کلاسیکی هاوسەنگیی هێزەکان کە دەڵێ: ولاتی «س» تەنیا لەو ڕوانگەیەوە هەڵسوکەوت دەکات کەوا لە ولاتی (ص) یاخود هی تر بکات کە لە شوێنێکی تر هێزی بێ، تاوەکو سەردەستەیی و سەروەرێتی بۆ ئەو نەبێ، چیتر لەگەڵ کاتی ئێستادا ناگونجێ. لە گۆڕەپانی پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنەدا، ولاتان بەرامبەر ولاتانی تر بایەخ بەدەسکەوتی ڕەهاو دەسکەوتی ڕێژەیی دەدەن.

### تێچوونی بەیەکەوە سازان

تێچوونی بەیەکەوە سازان دەشێ هەستیارییەکی کورتخایەن، یاخود کەمە بەرگەگرتنێکی درێژخایەن بەخۆوە بگرێ. وشەی هەستیاری «الحساسیە» بۆ قەبارەی کاریگەری پشت بەیەکتر بەستنەکە و خێراییەکەیەتی واتە مەودای خێرایی گۆڕانکارییەکان لەکاریگەریی پشت بەستنەکەو خێراییەکەیدا. واتە مەودای کاریگەری خێرایی گۆڕانکارییە لە بەشێکی سیستەمدا، لەسەر هێنانە ئارای گۆڕانکاری لە بەشێکی تردا. بۆ نموونە لە حەفتاکاندا پروپاگەندەی ئەگەری گۆڕانکاری کرا لە نرخی تەمویل کردن (التمویل)، ئەوەبوو لە ڕۆژێکدا یەک ملیار دۆلار دەچووە نێو ئەڵەمانیاوە. هەروەها لە ساڵی ١٩٨٧دا بۆرسەی نیویورک کتوپڕ داڕما، لە ئەنجامی دڵەڕاوکێی بێگانان دەربارەی ڕێژەی سوودی ئەمریکایی و ئەوەی کە دەشێ لە

نرخی پشک و سەنەدات روویدا. ئەو هەموو شتە بەخێرایی روویدا و کێشانەوەی دراوی بێگانەکان زۆر کاریگەری لەسەر بازاڕی دراودا هەبوو.

لەگەڵ ئەمەشدا ئاستێکی بەرزی هەستیاری، وەکو ئاستی بەرزی نییە لە لاوازی بەرگەگرتندا. مەبەست لە لاوازی بەرگەگرتن (VULNERABILITY) تێچوونی رێژەییە بۆ گۆڕینی بونیادی سیستەمی هاوکۆکییەکە (پشت بەیەکتر بەستنی دوولایەنە). ئەوە کولفەی راکردنە لە سیستەم، یاخود گۆڕانی رێسای یارییەکەیە. مەرجیش نییە ئەو وڵاتەی لە هەمووان بێ هێزترە، هەستیاری کەمترە. بەڵکو ئەو وڵاتەیە کە لە هەمووان کەمتر بەرگەی تێچوون لە گۆڕانکاری بارەکە دەگرێت. لە ماوەی تەنگژەی نەوتی ساڵی ١٩٧٣دا وڵاتە یەکگرتووەکان پشتی بەهێنانی وزە بەست، بەشێوەیەک کە ١٦ ٪ی هەموو بەکاربردنەکەی پێکدەهێنا. کەچی ژاپۆن لەو ماوەیەدا بەرێژەی ٩٥ ٪ لە بەکاربردنی وزەدا، پشتی بەهێنانی ناوەوەی وزە لە دەرەوە دەبەست. وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەرامبەر خۆ لێ کێشانەوی نەوتی عەرەبی دووچاری حاڵەتێکی هەستیاری ببوو، لەو رووەی کە پەیوەست بوو بە بەرزبوونەوەی زۆری نرخی نەوت لە ساڵی ١٩٧٣، وەلێ وەکو ژاپۆن توانای بەرگەگرتنی لاواز نەبوو.

لاوازی بەرگەگرتن لە چەند پلەیەکدایە. کاتێک شای ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ لە سەرتەخت لابرا. ناردنە دەرەوەی نەوتی ئێران دووچاری ئاستەنگ بۆوە. ئەو رۆژە داخوازیی نەوت زۆر بوو، بازاڕ لەو پەڕی بەهەرمێنی دا بوو. لە دەستدانی نەوتی ئێران، وایکرد کەوا کۆی بڕی نەوت لە بازاڕی جیهانیدا بەرێژەی نزیکەی٥ ٪ دابەزێ، وەلێ ئەمە بووە هۆی بەرزبوونەوەیەکی زۆری نرخی نەوت. ئەوکاتە بازاڕ هەستیار بوو، کەمی نەوت، بەخێرایی بووە بەرزبوونەوەی نرخ. وەلێ ئەمریکاییەکان توانیان لە ٥ ٪ی بەکاربردنی خۆیان پاشەکەوت بکەن، کاتێک کەمێک ئامێری گەرم کردنەوەیان وەستاند و خێرایی ترومبێلەکانیان بۆ ٥٥ میل لە کاتژمێرێکیدا کەم کردەوە. لەمەدا ئەوە بەدەرکەوت کە وڵاتە یەکگرتووەکان هەستیارە، وەلێ توانای بەرگەگرتنی زۆر لاواز نەبوو، ئەوە بوو توانی بەو جۆرە کارڕاییە سادانە، زیانەکە وەلاوەبنێ.

لاوازی بەرگەگرتن بەشێوەیەکی زۆر پشت بەم کارراییە خۆپارێزیانە دەبەستێ. هەروەها مەسەلەکە پشت بەمەودای توانای کۆمەڵگاو وەرامدانەوەی ئەو گۆڕانکارییە خێرایانە دەبەستێ. نموونەی ئەوەش ژاپۆن لە وڵاتە یەکگرتووەکان لێ هاتوو تربوو لە وەرامدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانە. لەگەڵ ئەمەش نوێنەرە تاکەکان (دەوڵەتان)و

کۆمپانیا گەورەکان، هەریەکەیان سەیری بازاڕ دەکاو کەلوپەلەکان هەڵدەگرێ، بەو بڕوایەی ئەوا کەمی ئەو کەلوپەلانە تادێت زۆرتر دەبێت، لە ئەنجامی ئەمەش خواستن زۆر دەبێ. لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا پلەکانی لاوازی بەرگە گرتن بەو سادەییە نییە کە بۆ یەکەم جار بەرچاو دەکەوێ.

هەروەها مەسەلەی لاوازی بەرگەگرتن پشت بەهەبوون، یاخود نەبوونی ئەلتەرناتیڤ و سەرچاوەکانی دابین کردنی کەلوپەلی هەمەجۆر دەبەستێ. لە ساڵی ۱۹۷۰ **لیستربراون** Lyster brown، بەڕێوەبەری پەیمانگای چاودێری جیهانی نیگەرانی خۆی بەرامبەر پشت پێ بەستنی وڵاتە یەکگرتووەکان دەربڕی. بەو پێیەش توانای بەرگەگرتنی نەبوو بەرامبەر هێنانی کەرەستەی خاو. لە نێوان ۱۳ کەرەستەی خاوی پیشەسازی، وڵاتە یەکگرتووەکان نزیکەی ۹۰٪ ئەلەمنیۆم و کروم و مەنگەنیزو نیکلی لە دەرەوە دەهێنا، Brown پێشهاتی ئەوەی دەکرد کە بەهاتنی ساڵی ۱۹۸۵ وڵاتە یەکگرتووە شت لە دەرەوە زیتر بهێنێت و تاوەکو لەو سیانزە کەرەستە بنەڕەتیە (۱۰) یان بگرێتەوە، بەمەش پێشبینی ئەوەی دەکرد کە ئەمە لاوازیی بەرەنگاربوونەوەی ئەمریکا بەڕادەیەکی ترسناک زیتر دەکات. هاوکات هێزی ئەو دەوڵەتە دواکەوتوانە زیتر دەکات کە ئەو کەرەستانە دەنێرنە دەرەوە.

وەلێ لە هەشتاکاندا نرخی کەرەستەی خاو دابەزی! ئەی پێشبینییەکانی ئەو کابرایە چی لێهات؟ Brown ئەوەی لەیاد چوو بوو کە سەرچاوە ئەلتەرناتیڤەکانی کەرەستەی خاوو جۆری سەرچاوەکان و هەمەڕەنگیان بخاتە حسێب کردنەوە. ئەو شتەی نەیهێشت کەوا بەرهەمهێنەکان چۆنیان لاخۆش بێت وا نرخەکان بەرزبکەنەوە. پاشان تەکنولۆژیا رۆژبەرۆژ پێشتر دەکەوێ. کە ئەمە پاشەڕۆکانی دوێنێ دەکاتە سەرچاوەیەکی نوێ بۆ بەیانی. وای لێهات کۆمپانیاکان سەرلەنوێ پاشەڕۆکە فرێ دراوەکان پاک بکەنەوە. لەبەرئەوەی تەکنولۆژیا توانای ئەوەی هێنایە کایە پاقر (النحاس) لەو پاشەڕۆیانە هەڵبهێنجرێ، کە لەساڵی رابردوودا بە بێ کەڵک دەژمێردرا. هەروەها بەکارهێنانی پاقر (النحاس) لە کاتی ئێستادا بەهۆی بەکارهێنانی وایەری تر کە لە سیلیکون دروست دەکرێ و لە بنەڕەتەوە لە قوم دەردەهێنرێ، کەم بووەوە بۆیە وڵاتە یەکگرتووەکان لەبەر کەمی کەرەستەی خاو دووچاری لاوازی نەبوو، ئەمەش لەبەرئەوەی تەکنولوژیا سەرچاوەی تری ئەلتەرناتیڤی دابین کرد کە حسێوی بۆ نەکرابوو.

## پێکچوونی بەیەکەوە سازان

لەیەک چوون لێرەدا بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئاماژە بۆ پشت بەستنی هاوسەنگ دەکا بەرامبەر پشت پێ بەستنی ناهاوسەنگ. دەشێ کەمی پشت بەستن ببێتە سەرچاوەیەک بۆ هێز جا ئەگەر دوولایەنی سازو کۆکبوون، وەلێ ئەگەر یەکێکیان کەمتر پشتی بەوی تر بەست، ئەوەی کەمتر پشت بەوی دیکە دەبەستێ سەرچاوەی هێزی هەیە، تاوەکو هەردوو لایان بەهای پەیوەندییە هاوکۆکییەکە دەزانن. وەک چۆن توانای مانۆڕکردن لە هاوسەنگی بەیەکەوە سازان دەشێ ببێتە سەرچاوەیەکی هێز لە سیاسەتی دەولیدا. ئەو شرۆڤەوانانەی کە دەڵێن هاوکۆکی نایەتەدی تەنیا لەو حاڵەتانە نەبێت کە پشت بەستنەکە بەرامبەر یەکە، ئەوا ڕەفتاری سیاسی بایەخدارتر فەرامۆش دەکەن. ئەو جۆرە لەیەک چوونە تەواوە بەدەگمەن دێتە دی. وەک چۆن حاڵەتی نەبوونی هاوسەنگیی تەواو، کاتێک یەکێک لە لایەنەکان بەشێوەیەکی تەواو پشت بەلایەکەی تر دەبەستێ. لایەکەی تریش بەهیچ شێوەیەک پشت بەو نابەستێ. نەبوونی لەیەک چوون، کرۆکی سیاسەتی هاوکۆکییە.

لە یەک نەچوون زۆربەی کات بەگوێرەی جیاوازی مەسەلەکان جیاواز دەبێت. کاتێک وڵاتە یەکگرتووەکان لە هەشتاکاندا باج و سەرانەی کەم کردەوەو خەرجی زێدەکرد. بۆ هاوسەنگ کردنی بۆدجەی یەکێتییەکەی (یەکێتی فیدرالی) وای لێهات پێویستی بەسەرمایەی ژاپۆنی هێنراوبێت. هەندێک پێیان وایە ئەم حاڵەتە تارادەیەکی زۆر ژاپۆن بەسەر وڵاتە یەکگرتووەکاندا باڵادەست دەکا. وەلێ ڕووی ڕاستەقینەی تری دراوەکە ئەوەبوو کە ژاپۆن ئەگەر چیتر قەرزی نەدابوایە وڵاتە یەکگرتووەکان، ئەوا بەقەدەر ئازاردانی ئەمریکا، ئەو ئازاری خۆی دەدا. لە پاڵ ئەمەش سەرمایە گوزارە ژاپۆنییەکان، ئەوانەی پارەیەکی زۆریان لە وڵاتە یەکگرتووەکان خستبووەکار. لە ئەنجامی ئەوەی ئەگەر ژاپۆن کتوپڕ قەرزی بە ئەمریکا نەدابوایە. ئەوا ڕووبەڕووی دابەزینێک دەبوونەوە لە بەهای سەرمایەگوزارییەکەنیاندا. قەبارەی ئابوری ژاپۆنی، کەمێک لە نیوەی قەبارەی ئابوری ئەمریکایی گەورەتر بوو. ئەمەش واتا ژاپۆن پێویستی بەبازاڕەکانی ئەمریکاییە، نەک بەپێچەوانەوە، هەرچەندە هەردوولا پێویستیان بەیەکتر هەبوو. هەردوولایان سوودیان لەو بەیەکەوە سازان و بەیەکەوە گونجانە وەردەگرت. سەرباری ئەمەش مەسەلەی ئاسایش، بەپەیوەندییەکانی ژاپۆنی - ئەمریکاییەوە لکابوو. دوای جەنگی جیهانی دووەم، ژاپۆن توانا سەربازییەکانی خۆی گەشە پێ نەداو چەکی ئەتۆمی نەبوو، سیاسەتی دەوڵەتێکی بازرگانی گرتەبەر. بۆ

دابینکردنی ئاسایشی خۆی، لە پێناو هێنانەدی هاوسەنگیی هێز بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەت و چین لە ناوچەی رۆژهەلاتی ئاسیادا، پشتی بەئەمریکاییەکان بەستبوو، بۆیە کاتێک سەرەتای ناکۆکی لە نێوان ژاپۆن و ئەمریکا دەربارەی بازرگانی لە سالی ۱۹۹۰دا وەدەرکەوت، ژاپۆن دەست بەرداری هەندێک شت بوو. بۆ ئەوەی بونیاتی پەیوەندی ئاسایش لە نێوان هەردوولایاندا، لاواز نەبێ.

کاتێک لە هەندێک مەسەلەی جیاواز، نارێکی لە بەیەکەوە سازان دێتەئارا، لەوانەیە دەولەت هەولی بەیەکەوە لکاندن، یاخود بەیەکەوە نەلکاندنی مەسەلەکان بدا. جا ئەگەر سەیری هەموو مەسەلەکەت کرد وەک دەستێکێ یاری پۆکەرو هەموو گێمەکانت لەیەک کاتدا وازی کرد. دەشێ دەولەتێک هەموو بەبارمتەکردنەکان، یاخود زۆربەیان لەسەرمێزی خۆی - بباتەوە، دەولەتێکی تر بە بارمتەکردنەکان لەسەر مێزێکی تر بباتەوە. هەرچی بەیەکەوە لکاندن، یاخود لەیەک جوێ کردنەوەی مێزەکان ئەمە شتێکە بەرژەوەندی دەولەت بریاری لەسەر دەدات. بۆیە دەبینین زۆربەی سیاسەتەکانی بەیەکەوە سازان لەسەر بەیەکەوە لکاندن، یاخود رێگە لێگرتنیەوە بەندە. دەولەتان دەیانەوێ حوکم لەسەر بەیەکەوە سازان بدەن لەو بوارانەی کە تیایاندا بەهێزەو خۆی بپارێزێ لەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەریی حوکم پێکردن لەو بوارانەی کە بە شێوەیەکی رێژەیی تیایاندا بێ هێزە.

زۆربەی کات لەرێگای خشتەی کارەکانەوە، دیاریکردنی ئەو مەسەلانەی کە بابەتی توێژینەوەن، دەزگا دەولییەکان رێسای سەوداکردن و دەستبەندەکان لە پەیوەندییەکانی بەیەکەوە سازان، دروست دەکەن و هەولدەدەن دامودەزگا دەولییەکان بەکاربێنن بۆ دانانی ئەو رێسایانەی کەوا کار لە پرۆسەی گواستنەوەی قازانجەکان دەکات لە مێزێکەوە بۆ مێزێکی تر. وەلێ ئەوەی سەیرە لەوکارەدا دەشێ دامودەزگا دەولییەکان سوودی لایەنە هەرە لاوازەکانی هەبێت، بەوەی هەندێک مەسەلە لای خۆی بپارێزێ. کە دوور لە مێزی سەربازی کە دەولەتە بەهێزەکان کۆنترۆلیان بەسەرە، راژەی دەولەتە هەژارەکان دەکات. لەگەل ئەمەشدا مەترسی ئەوە هەیە کە یەکێک لە لایەنەکان (یاریزانەکان) هێندە بەهێزبێت کەوای لێ بکات، مێزێک یاخود زێتر وەربگێرێت. هەبوونی دامودەزگای جیاواز بۆ پارەوپوول و دەریاوانی و پیس بوونی ژینگەو بازرگانی - لە حالەتێک ئەو لایەنانەی لەرووی سەربازیەوە بەهێزن، دووچاری نوشوست هێنانێکی گەورەبن - مەترسی ئەوە لە دووتوێی خۆیدا هەلدەگرێ کە دامودەزگاکان مێزەکانی یەکتری بشکێنن. لەگەل ئەمەشدا، کاتێک ولاتە

یەکگرتووەکان و ئەوروپا، لە ساڵی ١٩٧٣دا لەسەر مێزی نەوتدا دۆڕاندنیان پەنایان بۆ باڵا دەستیی سەربازی نەبرد بۆ تێکشکاندنی مێزی نەوت، لەبەرئەوەی تۆڕێکی ئاڵۆز لە پەیوەندییەکان ڕێگەی ئەوەی لێگرتن، وەک دواتر دەبینین.

گەورەترین دەوڵەت هەمیشە لە گەمەی کۆنترۆڵکردنی بەیەکەوە سازانی ئابوری ناباتەوە، جا ئەگەر دەوڵەتە بچووکەکە، یاخود لاوازەکە، دووچاری دڵەڕاوکێ بوو زۆر بایەخی بەمەسەلەکەدا، لەوانەیە بە ئەنجامێکی باشەوە دەربچێ. نموونەی ئەمە وڵاتە یەکگرتووەکانە کە نزیکەی سێ چارەکی بازرگانی دەرەکی کەنەدای بەدەستەوەیە، لە کاتێکدا کەنەدا چارەکێکی بازرگانی دەرەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی بەدەستەوەیە. بۆیە کەنەدا زێتر پشت بەوڵاتە یەکگرتووەکان دەبەستێ، نەک بەپێچەوانەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبینین لە زۆربەی ناکۆکییەکان لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکاندا، کەنەدا دەیباتەوە. لەبەرئەوەی ئامادەیە گەفی کارڕایی تۆڵەکردنەوە لەلایەکەی تر بکات، وەک تاریفەی گومرگی و دانانی کۆت و پێوەندی وا کە بتوانێ وڵاتە یەکگرتووەکان بسەنگرێتەوە، بەڵام کەنەدیەکان دەیاندۆڕاند ئەگەر کارڕاییەکانیان ببونایەتە سۆنگەی بەرپابوونی ناکۆکییەکی تەواو ئەوا هەمیشە دەدۆڕان، باشتر وایە ناوەوە ڕووبەڕووی کارڕایی تۆڵەسەندنەوە ببنەوە. سەنگراندنەوە لە ڕێگای کۆنترۆڵکردنی بەیەکەوە سازانی ئابوری تارادەیەک بەسەنگراندنەوەی ئەتۆمی دەچێت، ئەگەر توانای کرداری و نیازی ڕاستەقینەی زیان لێدانی لەگەڵ دابوو. زۆربەی کات دەوڵەتە بچووکەکان دەتوانن یەک ڕێزی توندو ڕاستوێژی گەورەی خۆیان بەکاربهێنن، بۆ ئەوەی بەسەر لاوازی ڕێژەیی خۆیاندا زاڵ بن لە سازانی نا بەرامبەردا.

یەکێک لە وێنەکانی فراژی بوونی گەورەو سروشتی بەیەکەوە سازان، خۆی لە بڵاوبوونەوەی میساقی بازرگانیدا دەنوێنێ. یەکێتی ئەوروپایی لە ڕێککەوتنامە هەرە پێشکەوتووەکانەیە. بەتەنیا داوا لە دەوڵەتە ئەندامەکان ناکات کە دەست بەرداری هەندێک لەسەرووەرێتی ئابوریان ببن، بەڵکو لەمە ڕەت دەکات بۆ سەرووەرێتی سیاسی. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٤دا، وڵاتە یەکگرتووەکان و کەنەداو مەکسیک باوەڕی خۆیاندا بە ڕێکەوتننامەی بازرگانی ئازاد بۆ ئەمریکای باکور - NAFTA)، ئەم ڕێکەوتننامەیە بەدەنگ وەهاتنێکی بەهێزی لەلایەن مەکسیک و کەنەداوە بەخۆیەوە بینی، لەبەرئەوەی ئابوریەکەیان بەشێوەیەکی توند بە ئابوری شریکە گەورەکەیان: وڵاتە یەکگرتووەکانە بەندبوو. بەم ڕێگایە ئەم دوو وڵاتە توانای گەیشتنە بازاڕەکانی ئەمریکایان زێتر بوو و بەرهەمەکانی خۆیان نارده وڵاتە یەکگرتووەکان.

هەرچی. واتە وڵاتە یەکگرتووەکانە. ئەو پەیماننامەیە NAFTA یارمەتیدا بۆ فراوان کردنی چوارچێوەی هەناردەکانی و ڕێگای بۆ کۆمپانیا ئەمریکاییەکان ئاسان کرد لەکەنەداو مەکسیک کار بکەن.

ڕێکەوتنامەو پەیماننامەی لە شێوەی NAFTA، دەشێ بڵاوبوونەوەی بەیەکەوە سازان زێتر بکاو نابەرابەری لە پەیوەندییەکان کەم بکاتەوە. ڕازی بوونی وڵاتە یەکگرتووەکان بەبەشدارکردنی ئابوریەکەی لە ئابوری مەکسیکی وای لێدەکات هەندێک بەرپرسیاریەتی ئابوری مەکسیکی هەڵبگرێ. هاوکات ڕێگای ئەوەشی بۆ ئاسان دەکات کە بچێتە ناو ئەو ئابوورییەوە. کاتێک لە ساڵی ١٩٩٤دا بیسوی (دراوی سەرەکی مەکسیکی) مەکسیکی داشکا، ئیدارەی **کلنتون** لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٥ بەچەندین ملیۆن دۆلار، یارمەتیەکی بەرفراوانی پێشکەش کرد. لەکاتێکدا کۆنگریس ڕووبەڕووی ڕێگایەکی داخراو ببووەوە، سەبارەت بە بەزێدەکردنی خەرجی خزمەتگوزاریە نیشتمانیەکان وەکو چاودێری کردنی تەندروستی و ئەم بابەتانە، ئیدارەی ئەمریکی هیچ ڕێگا چارەیەکی تری شک نەبرد، جگە لەوەی کەوا پەلە بکا لە ڕزگارکردنی بیسو، کەواتە هەرچەندەی قەبارەی بەیەکەوە سازانەکە زێدەکە بکا، دەوڵەتە گەورەکان خۆیان لەبەردەم کاریگەریی پێشکەوتنە ئابوریەکانی دەرەوەی سنووری خۆیان دەبیننەوە.

## سەرکردایەتی کردنی ئابوری جیهانی

ئەو دەوڵەتەی لە هەمووان گەورەترە، بەزۆری ئەو، ڕێسای ئابوری دەولی دادەنێ. لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەنێو دەوڵەتە گەورەکاندا، بەریتانیای مەزن بەهێزترین ئابوری هەبوو. بانکی ئینگلترا دەستی بەو ڕێسایەوە گرت، کەوا دەبێ دراو، پشتیوانەی زێڕی هەبێ (واتە بەهای دراو بەزێڕ بێت -و)، بەمەش چوارچێوەیەکی بۆ سەقامگیربوونی باری دراوی دەولی هێنایەدی. هەروەها بەریتانیا ئازادی دەریاکانی بۆ مەبەستی بازرگانی و دەریاوانی سەپاند، کە بەهۆیەوە بازاڕێکی کراوەی گەورەی بۆ بازرگانی جیهانی خولقاند کە تاوەکو ساڵی ١٩٣٢ کاریگەری هەبوو. دوای جەنگی جیهانی یەکەم، لە ئەنجامی شەڕدا دژی ئەڵمانیای تەزاری، بەریتانیا زۆر بێ هێزبوو، وڵاتە یەکگرتووەکان بوو بەگەورەترین وڵاتی ئابوری لە جیهاندا. بەڵام ئەو خۆی لە کاروباری دەولی بەدوورگرت. لە ئاستێکی نزمتر لە قەبارەی خۆی وەک گەورەترین هێزی ئابوری لە جیهاندا ڕەفتاری دەکرد. کە دەبوایە ئەو سەرکردایەتی

جیهان بگرێتە دەست. هەندێک لە ئابوریزانەکان لەو بڕوایەدان کە ئەوەی باری گرانی بێ بازاڕی ئابوری لە سییەکاندا زێترکرد، خراوی سیاسەتی دراوی و نەبوونی سەرکردایەتی کردنێکی ئەمریکی بوو. بەریتانیا لەوە بێ هێزتر بوو کە ئابوری کراوەی دەولیی بپارێزێ و ولاتە یەکگرتووەکانیش لە ئاستی لێپرسراویەتی نوێی خۆیدا نەبوو.

دوای جەنگی جیهانی دووەم، وانەکانی سییەکان لەمێشکی سیاسەتوانە ئەمریکاییەکاندا بوو، بۆیە دام و دەزگای وایان دامەزراند کە ئابوری کراوەی دەولی بپارێزێ. سندوقی دراوی دەولی بەشێوەیەکی گشتی بۆ گەشەپێدانی ولاتان پارەوپوول بەقەرز دەدات، هەروەها یارمەتیان دەدات بۆ ئەوەی بەسەر ئەو ئەستەنگانەدا زاڵ بن کە بەرەو رووی تەرازووی پێدان، یاخود دانەوەی سوودی قەرزەکانیان دەبنەوە. سندوقەکە قەرزەکەی بەگوێرەی باری ولاتە قەرزکەرەکەو ئەو چاکسازیە ئابوریانەی دەیکات، رێک دەخات. وەک کەمکردنەوەی کەموکوڕی لە بودجەکەی و پاڵپشتی کردنی نرخەکان.

هەروەها بانکی دەولیش لە بواری پروگرامی گەشەپێداندا (هەروەها بانکی هەرێمیش هەیە بۆ ئاسیاو ئەمریکای لاتینی و ئەفەریقاو ئەوروپای رۆژهەلات GAT) قەرز دەداتە دەوڵەتە هەژارەکان. رێکەوتنامەی تاریفەی گومرگی و بازرگانیش چەند رێسایەکی بۆ بازرگانی ئازاد چەسپاندو لە زنجیرەیەک دانوستانی هەمەلایەنە بۆ کەمکردنەوەی بەربەستەکانی بازرگانی توانی رۆڵی خۆی بگێرێ. هەروەها رێکخراوی ئابوری و گەشەپێدان (OECO) کە یانەی دوانزە دەوڵەتە هەرە پێشکەوتووەکانە، بۆ هاو ئاهەنگی سیاسەتگەلی ئابوری دەولی دامەزراوە. هەر لە نێوەڕاستی حەفتاکانیشەوە، سەرکردەکانی حەوت دەوڵەتەکە، دوو لەسەر سێی ئابوری جیهانیان بەدەستەوەیە. (کۆمەڵەی حەوتەکە)، ساڵانە بەرێکی کۆدەبنەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر باری ئابوری لە جیهاندا. ئەو دامودەزگایانە یارمەتی سیاسەتی ئەو حکومەتانەیاندا کە مەبەستیان خێراکردنی پرۆگرامی گەشەپێدانە. ئەمەش بەیەکەوە سازانی ئابوری لێکەوتەوە. لە زۆربەی ساڵەکانی دوای ١٩٤٥ەوە، بازرگانی ساڵانە بەرێژەی ٩,٢٪ گەشەی سەندوە. واتە بەرێژەیەک کە لە کۆی زێدەبوونی بەرهەمهێنانی جیهانی زێترە. بازرگانی دەولی چەند جارە زێدەی کرد کە لە ٤٪ی کۆی بەرهەمهێنانی ساڵی ١٩٩٠ی پێکدەهێنا. کۆمپانیا گەورە فرە رەگەزنامەکان کە خاوەنی ستراتیژیەتێکی جیهانین، بایەخیان زۆربوو، هەروەها سەرمایەگوزاری دەولی، ساڵانە بەرێژەی نزیکەی ١٠٪ زێدەی کرد.

لەگەڵ ئەمەشدا لە جیهانی دەوڵەتی لێک جودادا، هەتا ئێستا گرفت لە ئیدارەی ئابوری نانەتەوەییدا هەیە. لە هەشتاکاندا وڵاتە یەکگرتووەکان قەرزاربوّوە، کاتێک ئەوەی رەتکردەوە کەوا باج بسەپێنێتە سەرخۆی بۆ ئەوەی قەرزە نێوەخۆییەکانی بداتەوەو پەنای بۆ قەرزکردن برد لە دەرەوە، هەندێک لە شرۆڤەوانەکان لەو بڕوایەدابوون کە ئەمە بەسە بۆ ئەوەی تەنگژەی سییەکان دووبارە بێتەوەو وڵاتە یەکگرتووەکان بەرەو داشکان بچێت وەک ئەوەی بەسەر بەریتانیا داهات، لە کاتێکدا ژاپۆن بووە دەوڵەتێکی ئابوری مەزنی نوێ. لەوە ترسان کەوا ژاپۆن لە نەوەدەکاندا بەهەمان خراو خەملاندنی ئەمریکاییەکان لە سییەکاندا، رەفتار بکاو ئەوە رەتبکاتەوە کە بازاڕەکانی خۆی بکاتەوە، یاخود سەقامگیری ئابوری دەولی دابین بکا، وەلێ ئەو حاڵەتە پێویست نییە، لەبەرئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان بەرەو دارمان و داخران لەسەرخۆی ناچێت. لایەکی گەورە لە مەسەلەکە دەوەستێتە سەرئەوەی کەچی لە بنەما گەورەکانی ئابوری و ئارەزووی حکومەتەکان روودەدات، لە هاریکاری کردن و دابین کردنی سەقامگیری سیستەمی ئابوری دەولی. هەرچۆنێک بێت سیستەمی سیاسی و ئابوری دەولی زۆر لەمە وردترو ئاڵۆزترە. هێشتا زۆر لە کەرتی ترو زۆر لە دەوڵەتان و مەسەلەکان و لەو نوێنەرانەی کەرتە تایبەتییەکان بەکون و کەبەرەکانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکدی سازان، خەریکن.

## ریالیزم و بەیەکەوە سازانی ئاڵۆز

جیهان چی لێ دێ ئەگەر سێ گریمانە سەرەکیەکەی ریالیزم پێچەوانە بۆوە؟ ئەو گریمانانە ئەوەن کە تەنیا دەوڵەتان نوێنەری باڵادەستن، هێزی سەربازیش ئامرازێکی زاڵ بووەوەو ئاسایشیش ئامانجی هەرە گەورەیە. ئەگەر پێچەوانەبوو ئەوا گریمانی سیاسەتی جیهانی جیاواز دەکەین:

١- دەوڵەتان تاکە نوێنەری سەرەکی نین، ئەو نوێنەرانەی کە لە چوارچێوەی سنووری ناوچەیی تێدەپەڕن، ئەوانیش نوێنەری گەورەن.

٢- هێز تاکە ئامرازێک نیە کە سەنگی هەبێت. باڵا دەستی ئابوری و بەکارهێنانی دامودەزگا دەولیەکان، ئەوانیش ئامرازی باڵا دەستن.

٣- ئاسایش ئامانجی هەرە گەورە نیە، خۆشگوزەرانی ئامانجی هەرە گەورەیە، دەتوانین سیفەتی «بەیەکەوە سازانی ئاڵۆز» بدەینە ئەو جیهانەی کە جیاوازە لە بیری ریالیزم. کۆمەڵناسەکان واژەی «شێوەی نموونەیی» بۆ «بەیەکەوە سازانی ئاڵۆز»

دادەنێن، ئەمە بیرۆکەیەکی.. لە خەیاڵ هێنراوەو لە جیهانی ریالستیدا هەبوونی نییە. بەیەکەوە سازانی ئاڵۆز - زۆر ئاڵۆز - ئەزموونێکی هزریە و رێگامان دەدا کەوا شێوەی جیاواز لە سیاسەتی دەولیدا بهێنینە بەرچاو.

هەریەکە لە ریالیزم و سازانی ئاڵۆز نموونەیەکی سادە، یاخود شێوەیەکی نموونەین. جیهان نزیکەی دەکەوێتە نێوانیانەوە. دەتوانین ئەوە روون بکەینەوە کە پەیوەندی نێوان وڵاتێکی دیاریکراو دەکەوێتە کوێ لە ماوەی نێوان ئەو دوو رەهەندەدا. رۆژهەڵاتی ناڤین لە رەهەندی ریالیزم نزیک ترە. وەلێ پەیوەندی لە نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا، یاخود پەیوەندی لە نێوان فەرەنساو ئەڵەمانیا لەکاتی ئێستادا لەخاڵی «بەیەکەوە سازانی ئاڵۆز» زۆر نزیک دەبێتەوە. بەگوێرەی پەیوەندییە دیاریکراوەکان لە نێوان کۆمەڵە دەوڵەتێک لە هێڵی ماوەی نێوان هەردوو رەهەندەکە. سیاسەتی جیاوازو شێوەی جیاواز لە ململانێ لە پێناو هێزدا، بەدیاردەکەوێ. لە راستیدا دەوڵەتان دەتوانن شوێنی خۆیان لە هێلەکەدا بگۆڕن. لە شەڕی سارددا، پەیوەندییەکانی ئەمریکا - سۆڤیەت، بەشێوەیەکی ئاشکرا لەخاڵی رەهەندی ریالیزم نزیکتربوون. وەلێ گۆڕانکارییەکانی **گۆرباچوف** وایان لەو پەیوەندییانە کرد کە بۆ شوێنێک بگوێزرێتەوە. کە نزیکەی دەکەونە ناوەڕاستی ریالیزم و بەیەکەوە سازانی ئاڵۆزەوە.

لە جیهانی راستەقینەدا، باشترین نموونە بۆ کارلەیەک کردن لە نێوان ریالیزم و بەیەکەوە سازانی ئاڵۆزدا، پەیوەندییەکانی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و چینی گەلییە. هاوردەی (استیراد) وڵاتە یەکگرتووەکان لە چین، لە هەناردەکانی تێپەڕاندووە. وەک چۆن لەگەڵ ژاپۆنیشدا وایە، ئەنجامیش کورت هێنانێکی گەورە لە بودجەی بازرگانی روو دەدا کە دەگاتە چەندین ملیار دۆلار. جا ئەگەر پەیوەندی بازرگانی دوولایەنە لە نێوان چین و ئەمریکا نا بەرابەر بن و لە بەرژەوەندی چیندا بڕوا بەڕێوە، ئەوا ئەمریکا ناکەوێتە ژێر کاریگەریی پیادەکردنی بازرگانی چینیەوە، لەبەرئەوەی دەتوانێ قەرەبووی زیانەکانی بکاتەوە لە جیاتی کڕینی کەلوپەلی چینی، کە لەشوێنی تری بیکڕێ. لەگەڵ ئەمەشدا گەورەیی قەبارەی بازاڕی چینی سەبارەت کەلوپەلی ئەمریکایی وخواستی خۆجێی ئەمریکی بۆ کەلوپەلی چینی ئەوە دەگەیەنن کەوا حکومەتی ئەمریکی ناتوانێ هیچ کارڕاییەک دژی چین وەرگرێ، لەبەرئەوەی شتێک هەیە کە تارادەیەک کۆت و پێوەند دەخاتە جولانەوەکانی، وەکو کۆمپانیا فرە رەگەزنامەکان و کۆمپانیا ئەمریکاییەکان کە جەخت دەخەنە سەر حکومەت بۆ ئەوەی

سزا نەسەپێنێتە سەرچین. بەهۆی ئەوەی لە بازرگانیدا پاک نییەو مافی مرۆڤ پێشێل دەکات.

### سیاسەتی نەوتی بان سنووری نەتەوایەتی

مەسەلەکان بەگوێرەی دووریان، یاخود نزیکیان لە گریمانەکانی دوو شێوە نموونەییەکە جیاواز دەبن. نەوت مەسەلەیەکە رووناکی دەخاتە سەر هەردوو بابەت: ریالیزم و بەیەکەوە سازانی نموونەیی «الواقعیه والتوافق المثالی». بەیەکەوە سازانی نموونەیی ناوچەیەک، لە چوارچێوەی ئەو رێساو پێوەرانە و دامودەزگایانەدا روودەدا کە پێی دەگوترێت «سیستەم یاخود REGIM». لە ماوەی سی سالی رابردوودا سیستەمی نەوتی دەولی دووچاری گۆرانکاری گەورە بووە. لە سالی ١٩٦٠ سیستەمی نەوت لەسەر مونوپولکردنی تایبەت دادەمەرزا. کە پەیوەندییەکی بەتینی بەحکومەتی دەولەتە بەکاربەرە گەورەکانەوە هەیە. ئەو رۆژگارە بەرمیلی نەوت بەدوو دۆلار دەفرۆشرا. حەوت کۆمپانیای فرە رەگەزنامەش لە ئارابوون. هەندێک جاران پێیان دەگوترا «حەوت خوشکەکە». ئەوانە بریاریان دەدا کە چەند نەوت بەرهەم بهێنرێ. نرخی نەوتیش پشتی بەو برە نەوتە بەستبوو کە کۆمپانیا گەورەکان بەرهەمیان دەهێنا. لەگەڵ قەبارەی خواستنی دەولەتە دەولەمەندەکان کە نەوتیان دەکری. کۆمپانیا فرە رەگەزنامەکانی بان سنووری نەتەوایەتی، ئەوان رادەی بەرهەمهێنان دیاری دەکەن، کاودانی دەولەتە دەولەمەندەکانیش نرخ دیاری دەکات و دەولەتە گەورەکانیش کە بەپێوەری سەربازی تەقلیدی لە هەمووان بەهێزترن خۆیان تێ هەڵدەقورتێنن، هەندێک جاران بۆ ئەوەی مانەوەی سیستەم دابین بکەن، نموونەی ئەمەش ئەوەبوو کە لە سالی ١٩٥٣ لە ئێران روویدا، کاتێک حکومەتی نیشتمانی هەولیدا شا لەسەر تەخت لاداو بەریتانیاو ولاتە یەکگرتووەکان بەنهێنی خۆیان تێهەڵقورتاند بۆ ئەوەی شا بگەرێننەوە سەربەخت، ئەو رۆژە سیستەمی نەوت لەسەر باری خۆی مایەوە.

وەلێ دوای سالی ١٩٧٣ گۆرانێکی گەورە لە سیستەمی نەوتی دەولی هاتەئارا. وای لێهات ئەو دەولەتەی نەوتی بەرهەم دەهێنا، هەرخۆشی رادەی بەرهەمهێنانی دیاری دەکرد. ئەمەش کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر نرخ هەیە. ئەمە لەکاتێکدا جاران بازاری دەولەتە بەکاربەرە دەولەمەندەکان تاکە لایەن بوو بریاری لەسەر دیاریکردنی نرخ دەدا، لە ئەنجامی ئەمەشدا وەرچەرخانێکی گەورە لە مەلبەندی هێزو سەروەت و

سـامـان لە دەوڵاتە دەوڵەمـەندەکـانەوە بۆ ئەو دەوڵەتانەی بەشـێـوەیەکی ڕێژەیی هەژاربوون، ڕوویدا.

لێکدانەوەی باو دەڵێ: ئەم وڵاتانەی کـە نەوت بەرهەم دەهێنن بوونە هاوپەیمان و ڕێکخراوی ئەو دەوڵەتانەی نەوت دەنێرنە دەرەوە «ئۆپێک»یان پێکهێنا. ئەژواری ئەو ڕاڤەکردنە لەوەدایە کە لەڕاستیدا ئۆپێک لە ساڵی ١٩٦٠دا دامەزرا، لە کاتێکدا ئەو گۆڕانکارییە پڕ مەترسیانە لە مەڵبەندی هێزەکان بەر لەساڵی ١٩٧٣دا ڕوویان نەدا. سەرباری هەبوونی ڕێکخراوی ئۆپێک نرخی نەوت لە دابەزین دابوو. کەواتە هۆی تر لە ئارادا هەیە. لێرەدا سێ ڕاڤەکردن هەیە بۆ ئەو گۆڕانکاریانە لە سیستەمی نەوتی دەولی: تەرازووی بەرفراوانی هێزەکان و تەرازووی هێزەکان لە مەسەلەی نەوتدا و دامودەزگا دەولیەکان.

ریالیستەکان پێیان وایە کەوا گۆڕان لە تەرازووی هێزەکان بەپلەی یەکەم بە هێزی سەربازیەوە بەندە. بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەستە بەکەنداوی فارسیەوە، کە ناوچەی بەرهەمهێنانی سەرەکی نەوتە لە جیهاندا. دوو گۆڕانکاری کاریان لەو تەرازووە «هاوسەنگیە» کرد: سەرهەڵدانی بزاڤی نەتەوەیی و هەڵوەشاندنەوەی کۆلۆنیالیزم. لە ساڵی ١٩٦٠دا هەموو دەوڵەتان سەربەخۆ بوون. لەگەڵ زێدەبوونی قەبارەی شەپۆلی نەتەوایەتی، مەترسی خۆ تێهەڵقورتاندنی سەربازی زێتر بوو. وای لێهات بەکارهێنانی هێز دژی دەوڵەتێکی ڕزگاربوو لە کۆلۆنیالیزم و بێداربوونەوەی نەتەوایەتی، شتێک بێت تێچوونی گران بێت. ئەو ڕۆژەی کە ئەمریکایی و ئینگلیزەکان لەساڵی ١٩٥٣دا خۆیان لەئێران هەڵقورتاند نرخێکی گەورەیان نەدا، وەلێ ئەگەر ئەمریکاییەکان لەساڵی ١٩٧٩دا هەوڵیان بدابوایە شا لەسەر تەخت بهێڵنەوە، نرخەکە گران دەبوو. یەکێک لەو هۆیانەی کە دەوڵەتە گەورەکان دوای ساڵی ١٩٧٣ بەرەو بەکولونی کردنی ئەو وڵاتانە نەچوون کە نەوت بەرهەم دەهێنن، گەورەیی ئەو نرخە بوو کە دەبوایە بیدەن، ئەگەر چەکیان بەکارهێنابوایە دژی ئەو گەلانەی کە لەهۆشیاربوونەوەیەکی نەتەوەیی دەژیان.

هەروەها گۆڕانی هێز «نفوز»ی بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانیش کاری لە هاوسەنگیی هێزەکان کرد لەکەنداوی فارسیدا. ئەو ڕۆژەی ڕێکخراوی ئۆپێک دامەزرا، بەر لەوکاتە بەریتانیا تارادەیەکی گەورە پۆلیسی کەنداو بوو.. لەساڵی ١٩٦١دا هەوڵێکی عێراق بۆ بەخۆوە لکاندنی کوێت شکست پێ هێنا. وەلێ لە ساڵی١٩٧١دا بەریتانیا لە ڕووی ئابورییەوە لاواز بوو، حکومەتی بەریتانیا ناچار

بوو ئیلتیزاماتە سەربازییە دەولیەکانی خۆی کەم بکاتەوە. هەر لەو ساڵەدا ئەو رۆڵەی کە پێی دەگوترا «رۆژهەلاتی سوێس»بە کۆتا هات. دەق ئەمەبە ساڵی ١٩٤٧ دەچێ، کاتێک بەریتانیا لەتوانایدا نەما رۆڵی خۆی وەک زلهێزێک لە رۆژهەلاتی ناڤیندا بپارێزێ. لەو ماوەیەدا وڵاتە یەکگرتووەکان لەرێگای «پرەنسیپی ترومان»ەوە بۆ یارمەتیدانی تورکیا و یۆنان هاتە پێشەوە. وەلێ وڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧١دا ئەو پایەی نەبوو کە شوێنی بەریتانییەکان بگرێتەوە وەک لە ساڵی ١٩٧٤دا ئەنجامیدا. ئەمریکا تا بن پیلی لەشەڕی ڤێتنام هاڵا بوو، ئامادە نەبوو لە کەنداویشدا خۆی تێکەڵ بەرۆڵێکی گەورەی سەربازی تر بکات. لەئەنجامی ئەمەشدا **نکسون و هێزی کسینجر** وەزیری هەندەرانی ئەمریکا ستراتیژیەتێکی ئەمریکییان دانا کە تارادەیەکی زۆر پشتی بە دەوڵەتە گەورەکانی ناوچەکە دەبەست. ئێران ئامرازی ئەو ستراتیژە بوو کە بۆ جێبەجێکردنی هەڵبژێردرابوو. سەرکردە ئەمریکاییەکان لەو بڕوایەدابوون کە دەتوانن ئێران وەکو پۆلیسێکی ناوچەیی لەشوێنی پۆلیسی بەریتانی دابنێن . بۆیە ئاڵا هەڵگرانی رێبازی ریالیستی، موژدەی ئەو گۆڕانکارییەیان دا لەنێو بونیاتی تەواوی هێزدا. بەتایبەتی ئەوەی بەتەرازووی هێزەکانەوە پەیوەست بوو لە کەنداو ، بەو پێیەی تەرازووی هێزەکان، گۆڕانکاری سیستەمی نەوتی لە کەنداو راڤە دەکا.

**رێگای دووهەم** بۆ راڤەکردنەکە، دەستکاریکردنێکی شێوەی ریالیزمە، کە پێ لەسەر دابەشکردنی هێز لەنێو خودی مەسەلە نەوتییەکەدا دادەگرێ، نەک کۆی بونیاتی سەربازی. گۆڕانکاری گرنگ لە بابەتی بونیاتی هێز هاتەکایەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان گەورەترین بەرهەمهێنەری نەوت بوو لە جیهاندا، وەلێ لە ساڵی ١٩٧١دا بەرهەمهێنانی نەوتی ئەمریکی گەیشتە چڵەپۆپە، پاشان هێنانی نەوت لە دەرەوە زێدەبوو، یەدەگی نەوتی ئەمریکی بەکۆتاهات. دەوڵەتە عەرەبییەکان، لە ماوەی شەڕی رۆژهەلاتی ناڤینی ساڵانی ١٩٥٦ و ١٩٦٧، هەوڵیاندا نەوت نەنێرنە دەرەوە، وەلێ ئەو هەوڵەیان شکستی هێنا. لەبەرئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان هێندەی نەوت بەرهەم هێنا کە بەشی هەموو ئەوروپای دەکرد، هەرکە نەوتی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٧١ گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی، دوای ئەوە وڵاتە یەکگرتووەکان دەستی بەهێنانی نەوت لە دەرێ کرد. هەتاوەکو جڵەوی هێز لە بازاڕی نەوت گوێزرایەوە وڵاتانی وەکو سعودیەو ئێران. چیتر وڵاتە یەکگرتووەکان وەک دابینکەری نەوت نەمایەوە کە لەکاتی پێویستیدا بۆ پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکان پەنای بۆ ببردرێ.

**ڕێگای سێیەم** بۆ ڕاڤەکردنی ئەو گۆڕانکارییانەی کە دوای ساڵی ١٩٧٣ بەسەر سیستەمی نەوتی داهاتن، پشت بەتیۆری ریالیزم نابەستێ، بەڵکو پشت بەرۆڵی دامودەزگا دەولیەکان دەبەستێ، بەتایبەتی کۆمپانیا فرەرەگەزنامەکان و ڕێکخراوی ئۆپێک. لەو ماوەیەدا.. حەوت خوشکەکە (حەوت کۆمپانیا گەورەکە - و )وردە وردە نفوزی خۆیان لە دەست دا. یەکێک لە هۆیەکانیش گرێدانی دەست بەندی خراو بوو لەگەڵ وڵاتە بەرهەمهێنەکاندا. کاتێک کۆمپانیایەکی فرەرەگەزنامە دەچێتە یەکێک لەو وڵاتانەی کە لەڕووی کەرەستەی سروشتییەوە دەوڵەمەندەو سەرمایەگوزاری نوێ لەوێ دەکا، ئەوا دەتوانێ دەستبەندی (صفقە)وا گرێ بدا کەوا پشکی گەورە لە داهاتە هاوبەشەکەی بەربکەوێ. وڵاتە هەژارەکان هاتنی ئەو کۆمپانیا گەورە فرەرەگەزنامانە بۆ گەشەپێدانی کەرەستەکانیان، بە هەلێک دەزانن بۆ ڕاستکردنەوەو باشکردنی باری ئابوری تەنانەت ئەگەر ٢٠٪ بۆ ئەو وڵاتەو ٨٠٪ بۆ کۆمپانیاکان بێ ئەوا ئەو دەستبەندە بە بەراوردکردن لەگەڵ پێشان بەدەسکەوتێک دەژمێردرێت. بەم چەشنە دەبینین کۆمپانیا فرەرەگەزنامەکان، کە سەرمایەو تەکنولۆژیاو گەیشتن بەبازاڕە دەولیەکان مۆنۆپۆل دەکەن و دەستبەند لەگەڵ دەوڵەتە هەژارەکان گرێ دەدەن و لە قۆناغەکانی یەکەمدا پشکی شێریان بەردەکەوێ، وەلێ بەتێپەڕبوونی کات، ئەو کۆمپانیایانە، بەبێ ئەوەی ئاگایان لێ بێ سەرچاوەی سامان دەگوێزنەوە ئەو وڵاتە هەژارانە (نەک لە دەروازەی چاکە کردنەوە) بەڵکو وەک ئەنجامێکی سروشتی بزاڤی کارکردن و بازرگانی. مەشق کردن بە بەکرێکارە خۆجێیەکان سعودیەکانی فێرکرد چۆن کێڵگەکانی نەوت و وێستگەکانی ڕەوانەکردنی نەوت و شۆستەکانی بارکردن بەڕێوەبەرن. وای لێهات ڕۆڵەکانی وڵاتە بەرهەمهێنەکان ئەزموونیان لە بواری ناردنە بازاڕو هی تر وەردەگرت.

لە ئەنجامی ئەمەدا وڵاتە هەژارەکان داوای دابەشکردنێکی باشتری قازانجەکان دەکەن. لە ڕابردوودا کۆمپانیاکان هەڕەشەی خۆ کێشانەوەیان دەکرد. وای لێهات وڵاتە هەژارەکان هەڕەشەی ئەوە بکەن کە خۆیان پرۆسەی بەرهەمهێنانەکە دەگرنە دەست. بەتێپەڕبوونی کات، هێزی کۆمپانیا فرەرەگەزنامەکان دەتوێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لە بەرهەمهێنانی کەرەستەی خاودا کاردەکەن. لە بواری گرێدانی دەستبەندیش لەگەڵ وڵاتە بەرهەمهێنەکان دەکەونە پایەیەکی لاوازترەوە. ئەمەیە «دەستبەندی خراو» بەدرێژایی ماوەی ١٩٦٠-١٩٧٣، کۆمپانیا زەبەلاحەکان تەکنولۆژیاو لێهاتوویيان دەگواستەوە وڵاتە هەژارەکان. بەشێوەیەک وای لەو وڵاتانە کرد خۆیان پرۆسەکانی

نەوتی خۆیان بەڕێوەبەرن.

هاوکات گەشەی تریش هاتە ئارا. کۆمپانیای تری فرەرەگەزنامەی نوێش هاتنە نێو بازاڕی نەوتییەوە. بەمەش «کچە مامی بچووک» چوونە پاڵ «حەوت خوشکەکە»وە. هەرچەند ئەو کۆمپانیایانە بەقەد حەوت خوشکە زەبەلاحەکە نەبوون. کەچی بەو رادەیە گەورەبوون کە وایان لێ بکات دەستبەندی تایبەتی خۆیان لەگەڵ وڵاتە نەوتییەکاندا گرێ بدەن. بەم چەشنە وای لێهات هەر وڵاتێک بیەوێ لەژێر چەپۆکی حەوت خوشکەکە دەربچێت، دەتوانێ گرێبەند لەگەڵ کۆمپانیای بچووکتر ببەستێ. بەمەش توانای کۆمپانیا گەورەکان بۆ سەوداکردن لاوازتر بوو.

هەرچی لەسەر ئاستی دامودەزگاییەوەیە، ئۆپێک وەک کارتێلێکی نەوتی توانای کاریگەری کەمێک زێتر بووە. ئەو کارتێلانەی بڕی کەلوپەلەکان کۆنترۆڵ دەکەن، دیاردەیەکە هاوکاتی پیشەسازی نەوت. وەلێ ئەو هەڵسووڕاندنە لەرابردوودا بەپێی هەندێک ڕێککاری تایبەتی لە نێوان حەوت خوشکەکە ئەنجام دەدرا. کارتێلەکانیش بەشێوەیەکی گشتی بەدەست کێشەیەک دەناڵێنن. چونکە کاتێک بازاڕ تارادەیەک بێ هەرمێن دەبێ و نرخ دادەبەزێ، ئارەزووی فریودان لە قەبارەی بەرهەم هێنان لەکایەدا دەبێ. کاتێکیش نەوت کەم دەبێتەوە، کارتێلەکان بەباشترین شێوە کاردەکەن. وەلێ کاتێک نەوت لەرادەی پێویستە زۆرتر دەبێت، خەڵک پەنا بۆ کەمکردنەوەی نرخ دەبەن، بۆ ئەوەی رادەی بەشی هەرە گەورەی فرۆتەنییان بەرکەوێ. بەتێپەڕبوونی کات هێزەکانی بازاڕ دەیانەوێ دەوری کارتێلەکان کەم کەنەوە.

ئۆپێک هەوڵێکە بۆ ئەوەی کارتێلەکان لە تایبەتییەوە ببێتە حکومی و نوێنەرایەتی ئەو وڵاتانە بکات کە نەوت دەنێرنە دەرەوە. ئۆپێک، لە بەراییدا، زەحمەتەکی زۆری دیت تا خۆی سەپاند، چونکە نەوت لە بازاڕەکاندا زۆربوو. لەبەرئەو زۆربیە، دەوڵەتانی ئۆپێک پەنایان بۆ فریودان دەبرد بۆ ئەوەی بەشێکی گەورەی بازاڕ خۆیان بێننەدی، لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە ساڵی ١٩٦٠ تاوەکو سەرەتای حەفتاکان ئۆپێک نەیتوانی نرخ بسەپێنێ. وەلێ دوای کەمبوونەوەی کەلوپەلی نەوتی، رۆڵی ئەو ڕێکخراوە زێدەبوو لە فراوان کردنی توانای دەوڵەتانی ئەندام لەسەر سەوداکردن و هەماهەنگکردنی تواناکانیان.

شەڕی ساڵی ١٩٧٣ لە رۆژهەڵاتی ناڤین سەنگێکی دا بەرێکخراوی ئۆپێک و گلۆپی سەوزی بۆ داگیرساند تا هێزی خۆی بەکاربهێنێ. دەوڵەتە عەرەبییەکان لەو شەڕەدا لەبەر هۆی سیاسی نەوتییان بڕی، وەلێ ئەو هەڵوێستە کاودانێکی وای

خولقاند کەوا راژەی نفوزی ڕێکخراوەکەی کرد. ئێران کە ولاتێکی عەرەبی نەبوو، وەک لە شوێنێکی دیکە گوترا پۆلیسی کەنداو بوو فەرمانەکانی لە ئەمریکا وەردەگرت. وەلێ شای ئێران نرخی نەوتی چوار هێندە زێترکردو دەولەتەکانی ئۆپێکیش ڕێچکەی ئەویان گرت. راستە ئەو ڕێکخراوە نەیتوانی بە بەردەوامی نرخەکان بەبەرزی بهێلێتەوە، وەلێ بەهۆی هاوبەندی ئۆپێکەوە، نرخی نەوت زۆر لەسەرەخۆ دادەبەزێ.

کەچی لە هەمان تەنگژەدا، هۆکاری هەرە گرنگی دامودەزگایی، رۆلی کۆمپانیاکانی نەوت بوو لە (لەکەمکردنەوەی ژانەکە) لە هەمان تەنگژەدا، لەیەکێک لە بۆنەکاندا، هێنری کیسنجر گوتی: دوورنییە ولاتە یەکگرتووەکان چەک بەکاربهێنن ئەگەر رووبەڕووی هەولی «خنکاندن»بووەوە. عەرەبەکان ئەو نەوتەی بۆ ولاتە یەکگرتووەکانیان دەنارد بەرێژەی ٢٥ ٪ کەم کردەوە. هەروەها ناردنە دەرەوەی نەوت بەرێژەی ١٥ ٪ دابەزی. وەلێ کۆمپانیا نەوتییەکان ئەوەیان لەبەرچاوگرت کە ولاتێک لە ولاتێکی تر زێتر دووچاری ئازارەکە نەبێت، بۆیە ئەو نەوتەی بۆ بازاڕی جیهان دەنێردرا سەرلەنوێ دابەشکرایەوە. کاتێکیش ولاتە یەکگرتووەکان ٢٥ ٪ لە هەناردەی نەوتی عەرەبی لە دەستدا. کۆمپانیاکانی نەوتی فەنزویلی و ئەندەنووسی قەرەبوویان بۆکردەوە. کۆمپانیاکان بەشێوەیەک کاریان بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکە کرد، کە دەولەتە دەولەمەندەکان تەنیا ٧-٩ ٪ لە نەوتی هێنراویان لە دەستدا، واتە زۆر لە خالی «خنکاندن» کەمتر.

کۆمپانیاکان بۆچی ئەمەیان کرد؟ ئەمەیان بۆچاکەخوازی نەبوو، کۆمپانیا گەورە فرەرەگەزنامەکان ئامانجیان ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژ گەورەترین قازانج وەدەست بێنن، بۆیە سەقامگیری و بازاڕێکی کراوەیان گەرەکە. ئەوان لەو حالەتانە دەترسن کەولات نەوتی تیا خۆمالی دەکات. بۆ نموونە سەرۆک وەزیرانی بەریتانی (**ئەدوارد هیث**) داوای لە سەرۆکی کۆمپانیای نەوتی بەریتانی BP کرد، کە نەوت بەتەنیا بفرۆشێتە بەریتانیا، نەک ولاتانی تر، سەرۆکی کۆمپانیاکە بەرپەرچی دایەوەو گوتی ئەگەر ئەو بەگوێرەی ئەو فەرمانە کاربکا، ئەوا ولاتان، کۆمپانیای نەوتی بەریتانی خۆمالی دەکەن، کە ئەمەش مالی کۆمپانیاکە وێران دەکات. بۆیە سەرۆک وەزیران لە بڕیارەکەی خۆی پەژیوان بووەوە. کۆمپانیاکانی نەوت هەولدەدەن سەقامگیری بازاڕ بهێننەدی، نەک دلڕەقانە ئازاری هیچ ولاتێک بدەن، چونکە لە بنەڕەتەوە ئەو کۆمپانیایە پشت بەرێسای قازانجێکی گەورە بۆ ماوەیەکی درێژ دەبەستن . بەمەش

بەکەمکردنەوەی هەڕەشەی خنکاندن، ئەگەرەکانی بەکارهێنانی چەکی کەم کردەوە.

بەکورتی نەوت، وێنەی مەسەلەیەک دەکێشێ کە دەکەوێتە نێوان شێوە نموونەییەکان لە ریالیزم و بەیەکەوە سازانی ئاڵۆز. گۆڕانکاریش لە هەرسێ رەهەندەکە (هاوسەنگیی هێزەکان - بونیاتی مەسەلەی هێز- دامودەزگاکان لە نێو ناوچەی نەوت) یارمەتیمان دەدات لە راڤەکردنی ئەو جیاوازییە گەورەیەی کە لەنێوان سیستەمی نەوتی ساڵی ١٩٦٠ و سیستەمی نەوتی دوای ساڵی ١٩٧٣دا هەیە.

## نەوت وەک سەرچاوەیەکی هێز

لەساڵی ١٩٧٣دا نەوت وەک چەکێک تا چەند هێزوتوانای هەبوو؟ عەرەبەکان بەکەمکردنەوەی بەرهەمی نەوت و قەدەغەکردنی هەناردنی نەوت بۆ ئەو دەوڵەتانەی دۆستی ئیسرائیل بوون، توانیان مەسەلەکەی خۆیان بخەنە ریزی پێشەوە بەگوێرەی سیاسەتی ئەمریکی. هەروەها تارادەیەک توانیان هاوپەیمانێتی نێوان ژاپۆن و ئەوروپاو ولاتە یەکگرتووەکان بشلەژێنن. بۆیە فەرەنساو ژاپۆن بۆ ئەوەی برە نەوتی خۆیان بپارێزن هەڵوێستی سەربەخۆیان نواند. هەروەها چەکی نەوت، هانی ولاتە یەکگرتووەکانی دا رۆڵێکی گەورەتری پێکهێنانەوە ببینێ بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی عەرەبی- ئیسرائیلی، ئەمەش دوای (شەڕی رۆژی تۆبەکردن - حرب يوم الغفران)، وەلێ لەلایەکی ترەوە، چەکی نەوت، سیاسەتی بنەڕەتی ئەمریکای لە رۆژهەلاتی ناڤین دا نەگۆڕی. ئەمریکاییەکان لەهیکرا هاوپەیمانییەتیان لەگەڵ ئیسرائیل نەگۆڕی بۆ ئەوەی پاڵپشتی مەسەلەی عەرەبی بکەن. راستە نەوت سەرچاوەیەکی هێزەو کاریگەری خۆی هەیە، کەچی بەو رادەیە بەهێز نەبوو کەوا لە ئەمریکاییەکان بکات سیاسەتی خۆیان پێچەوانە بکەنەوە.

چەکی نەوت بۆچی کاریگەری زۆرتری نەبوو؟ بەشێک لە وەلامەکە لە ئاڵوگۆڕی بەیەکەوە سازان دایە.. سعودیەکە بووە بەیەکەم ولات لە بازاڕی نەوتیدا سەرمایەگوزاری زۆر گەورەی لە ولاتە یەکگرتووەکاندا هەبوو. جائەگەر سعودیە ئابوری ئەمریکی زۆر ئازار بدابوایە، بەرژەوەندییە ئابورییەکانی خۆیشی دووچاری ئازار دەکردەوە، سەرباری ئەمەش لە بواری ئاسایشدا، سعودیە پشتی بە ئەمریکا دەبەست. پاشان ولاتە یەکگرتووەکان تاکە ولات بوو کە دەیتوانی هاوسەنگییەکی هێزی سەقامگیر بۆ ماوەیەکی درێژ لە ناوچەی کەنداودا دابین بکات، سعودیە دەرکی بەم راستییە دەکرد بۆیە هەوڵی دەدا زێدەڕۆیی نەکات لە بەکارهێنانی چەکی نەوتدا.

رۆڵی بەکارهێنانی هێز (هێزی چەک) وەک سەرچاوەیەکی هێز لە تەنگژەی نەوتی ساڵی ۱۹۷۰دا چ بوو؟ چەک راشکاوانە بەکار نەهات. خۆتێهەڵقورتاندنی سەربازیش نەبوو چونکە حاڵەتی «خنکاندن»ەکە روویندابوو. لە سەرەوەی ئەمەش سعودیە سودی لە مسۆگەرکردنی ئاسایش بۆ ماوەیەکی درێژ وەرگرتبوو، کە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆی دابین کردبوو. بەم چەشنە هێز لە پەنای پەردەوە رۆڵی خۆی بینی. پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆش لە نێوان بەیەکەوە سازانی ئاسایشی و بەیەکەوە سازانی نەوتی لە ئارادابوو. بەکارهێنانی هێز بەئاشکرا خەرجی زۆری دەویست، وەلێ وەک سەرچاوەیەکی هێز لە پشت پەردەوە رۆڵی خۆی بینی.

## نوێنەرە ناخۆجێییەکان

یەکێک لە ئادگارەکانی ململانێی ئابوری خۆی لەو رۆڵە دەنوێنێ کە نوێنەرە ناخۆجێییەکان - ئەو نوێنەرانەی نوێنەرایەتی هیچ دەوڵەتێک ناکەن و لەو دیوی سنوورە دەولییەکانەوە کاردەکەن - پێی هەڵدەستن. سیاسەتی تەقلیدی دەولی لە رێگای دەوڵەتەوە سەیر دەکرێ. ئێمەش هەندێک دەستەواژەی ئامادەکراو بەکاردەهێنین وەک (ئەڵەمانیا ئەلزاسی دەویست) یاخود (فەرەنسا لە بەریتانیا دەترسێ)، ئەو کورتکردنەوەیە، ئاسان کردنەوەیەکی بەسوودە. بەتایبەتی لە ماوەی کلاسیکیی سیاسەتی دەولیدا. لە سەدەی هەژدەهەمدا پاشا بەنێوی دەوڵەتەوە داخاوت. ئەگەر **فریدریکی گەورە** شتێکی بۆ پروسیا بویستبوایە. وەها داخاوت کە ئەو پروسیایە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا، وای لێهات چینی دەستە بژێر دەستی بەسەر بڕیارەکانی سیاسەتی هەندەراندا داگرت. وەلێ تا بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم، دیپلوماتێکی ئەوروپایی تارادەیەک، لە خۆتێهەڵقورتاندنی وەزارەت دووربوو. سەرباری ئەمەش، لە ماددەی کلاسیکی سیاسەتی دەولیدا، خشتەی کارەکان تارادەیەکی گەورە سنووردابوو. مەسەلەکانی ئاسایشی سەربازی لە پێشەوەی هەمووان بوون، چارەسەرکردنەکەشیان لە دەست وەزارەتی هەندەراندا بوو.

بەدرێژایی چەند سەدەیەک نوێنەرە ناخۆجێییەکان رۆڵێکی چلۆنەتیان بینی. وەلێ ئەو گوێزرانەوە چەندایەتییەی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم بەخۆیەوەی بینی، ئاماژە بۆ گۆڕانێکی گرنگ دەکات لە سیستەمی دەولیدا. لە جیهانی بەیەکەوە سازانی بەرفراواندا، خشتەی کاری بەرفراوانتر لە پێشتر دەبینین. وەک پێدەچێ هەموو دەیانەوێ بەشداری لە نواندنەکە بکەن. بۆ نموونە لە وڵاتە یەکگرتووەکان

دەبینین، هەر ئاژانسێکی خۆجێیی، کەمێک رۆڵی دەولیشی هەیە. وەزارەتی کشتوکاڵ بایەخ بەخۆراکی دەولی دەدات، ئاژانسی پاراستنی ژینگە بایەخ بەبابەتی بارانی ترشاوی و زێدەبوونی پلەی گەرمای زەوی دەدات، پاسەوانی کەنارەکان بایەخ بەکاری فڕێدانی پاشەڕۆکانی ئەتۆمی لە ئۆقیانووسەکان دەدات، هەروەها وەزارەتی بازرگانی بایەخ بەبازرگانی دەولی و وەزارەتی خەزێنە بایەخ بەنرخی حەواڵەکان دەدات. جا وەزارەتی هەندەران ئەو هەموو مەسەلەیە کۆنترۆڵ ناکات. هەر نووسینگەیەک لە حکومەتی ئەمریکیدا، وەزارەتێکی بچووکی هەندەرانی خۆی هەیە. بەراستی ئەگەر سەیری نوێنەری دیپلۆماتیکی ئەمریکی بکەین لە هەندەراندا، ئەوە دەبینین کەوا ژمارەیەکی کەم لەو ئەمریکاییانەی کار لە زۆربەی باڵوێزخانەکان دەکەن، پەیوەندیان بە وەزارەتی هەندەرانەوە هەیە.

لە بەیەکەوە سازانی ئاڵۆزدا کۆمەڵگاکان لە زۆر خاڵدا کار لەیەکتر دەکەن. پاشان لەهەر دووریانێک یاخود لای هەر پۆلیسێک لەو دوریانانە، بزاڤی ترافیک بەردەوام هەیە. ئەو کار لەیەکتر کردنانە لە رێگای سنووری دەوڵەتان و ویلایەتەکاندا لە دەرەوەی کۆنترۆڵی دەزگای ناوەندی سیاسەتی هەندەراندایە، ئەوەیە کە پێی دەگوترێت پەیوەندییە ناخۆجێییەکان. کە ئەمەش زۆر شت بەخۆوە دەگرێ و بەتەنیا ناوەستێتە سەر کۆچ کردن و گوێزرانەوەی سەرمایە بەخێرایی لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکی تر، کە ئەمە رۆژانە لە بۆرسەکانی جیهانیدا روودەدا، هەروەها ئاودیوکردنی چەک و ماددەی بێ هۆشکەرو هەندێک جۆری تر لە تیرۆر. حکومەتەکان دەتوانن هەوڵ بدەن ئەو چالاکییانە کۆنترۆڵ بکەن. ئەمەش لە حاڵەتەکانی تیرۆرو قاچاغچێتیدا (الارهاب والتهریب) کارێکی زۆر بەپەلەیە، وەلێ ئەو کۆنترۆڵ کردنە لە زۆربەی کاتدا زۆرگران دەوەستێ. بۆ نموونە یەکێتی سۆڤیەت بەزەبری هێز، پەیوەندی لەسەر سنوورەکانەوە کۆنترۆڵ کرد، ئابورییەکەی بەدەست ئەمە زۆر پەریشان بوو. **میانمار** Myanmar لە بەرامبەر بازاڕەکانی جیهاندا دەرگای لەسەر خۆ داخست. بینی لە ئەنجامی ئەمەدا ئابورییەکەی دادەڕمێ.

زمانی کورتکردنەوە (الاختزال) کە لە ماوەی کلاسیکیدا بەکەڵک بوو. لە کاودانی بەیەکەوە سازانی پلە بەرزو بەبوونی ئەم هەموو نوێنەرە ناخۆجێیە دووچاری رێگا لێ ون کردنمان - دەکات. ئێمە هەندێک شت دەڵێین وەکو «اختزال»وایە (ژاپۆن لەسەرهێنانە ناوەوەی زۆرتر رازی بوو) یاخود (ئەمریکا بەرهەڵستی داواکردنی زێتری مولکدارییەتی کردنی کیشوەری (جرف قاری) کرد. وەلێ ئەگەر بەوردی لە کارەکە

رامـاین ئەوە دەبینین کۆمـپـانـیـا ژاپۆنـیـیـەکـان لەو سنووره جوولانەوە بۆ ئەوەی زیتـر شمەک بنێرنە دەرەوە یاخود هاوولاتییە ئەمریکاییەکان لە سالۆنە دەولیەکاندا هەولی گەورەیان دا بۆ ئەوەی پێناسەی فراوانتر بۆ «کیشوەری» «الجرف القاري» بخرێتەڕوو.

لێک هالانی بەرژەوەندییەکان، شتێکە هەمیشە لە سیاسەتی دەولیدا هەیە و لە مەسەلە ئابورییەکان و کۆمەلایەتییەکاندا بەرفراوانترە وەک لە مەسەلەکانی ئاسایشی تەقلیدی سەربازی. زۆربەی کات مەسەلەی ئاسایش دەبێتە دلەڕاوکێیەکی دەستەجەمعی. بێگومان مانەوەی تێکڕای گەل بەزیندوویی، چاکەی هەموو کۆمەلەکەیە. هەرچی مەسەلە ئابوری و کۆمەلایەتییەکانە ئەوا خەلک بەو شێوەیە لە دەوریان کۆنابنەوە، لەبەرئەوەی جیاوازی بەرژەوەندییەکانی تیادا زۆر بەرفراوانترە. بۆیە دەبینین، رێگای قەدبڕی تەقلیدی بەس نییە بۆ وەسف کردنی پرۆسەی سیاسی لە ژێر رۆشنایی وەدیارکەوتنی بەیەکەوە سازانی ئابوری و دەرکەوتنی مەسەلە ئابوریەکان لە خشتەی کاری سیاسی دەولیدا.

با هەمدیس بابدەینەوە سەر مەسەلەی نەوت. سالی ۱۹۷۳ دەولەتە بەکاربەرەکان نرخێکی نزمیان دەویست و دەولەتە بەرهەمهێنەرەکانیش نرخێکی بەرز. بەرهەمهێنەرە بچووکەکانی نەوت لەتکساس، هەرگیز لەوە دلتەنگ نەبوون کە ئۆپێک نرخی نەوت بەرز بکاتەوە، چونکە بەرژەوەندییەکانیان وەکو بەرژەوەندی عەرەبەکان دابوو، نەک وەکو بەرژەوەندی ئەو بەکاربەرانەی کە لە هەرێمی نیوئینگلاند (New England) لە سەرمان رەق ببوونەوە. هەروەها بەرهەمهێنەرانی وزەی ئەتۆمیش پێشوازییان لە بەرزبوونەوەی نرخی نەوت کرد. لەبەرئەوەی دەرگای لەبەردەم وزەی ئەتۆمیدا دەکردەوە کە ببێتە وزەیەکی رکابەر. پیشەسازی داتەپیوی خەلووزی ئەوروپایی و کرێکارە بێکارەکانی کانەکان، ئەوانیش شادمان بوون بە بەرزبوونەوەی نرخی نەوت. ئەوانەی بانگەشەی پاراستنی ژینگەش دەکەن کەمتر لەوان پێشوازییان لە بەرزبوونەوەی نرخی نەوت نەکرد، لەبەرئەوەی لەو بڕوایەدا بوون کە ئەمە بەکاربردنی نەوت و پیس بوونی ژینگە کەم دەکاتەوە. بەم چەشنە دەبینین لە ناوەوەی ئەو ولاتانەی نەوت بەکاردەبەن. لە بەرانبەر بەرزبوونەوەی نرخی نەوتدا، بەرژەوەندی زۆر جیاواز هەیە. لە حالەتی بەیەکەوە سازانیشدا، سیاسەت زۆر جیاواز بەدیاردەکەوێ، کاتێک تارای بەرژەوەندی نیشتیمانی و ئاسایشی نیشتمانی لەسەر لادەدەین.

یەکێک لەو هۆیانەی کە دەولەتانی بەکاربەری نەوت پەنایان بۆ کارڕایی توندڕەوانە نەبرد، وەکو بەکارهێنانی هێز، ئەوەیە کەوا گەورە سیاسەتمەدارانی ئەو

ولاتانه، بەیەکەوه سازانی هەستیاریان، که نرخی وزەی بەشێوەیەکی زۆر بەرزکردەوه، بەشتێکی باش دەزانی. هاوبەندییەک له ئارادابوو که سنووری نەتەوایەتی دەبەزاندو پێشوازی له بەرزبوونەوەی نرخی نەوت دەکرد.

بێگومان هەبوونی بەرژەوەندی دژبەیەک لەنێو یەک ولاتدا شتێکی نوێ نییه. سیاسەتی سەدەی نۆزدەهەمی ئەمریکا، سیمای ناکۆکی لەسەر باجەکان و ناکۆکی نێوان جوتیارەکانی باشوورو ئەوانەی خەریکی پیشەسازی بوون له باکوور پێوەبوو، کەواته شتێکی نوێ نییه ئەگەر جیاوازی لەنێو یەک ولاتدا ببینین، سیاسەتی نێوەخۆیی هەمیشه بەقەد سیاسەتی هەندەران گرنگه، وەلێ فراوان بوونی رێژەی بەشداربوان له سیاسەتی نێوەخۆیی ئەو گرنگییه زێتر دەکات له سەرەوەی ئەمەشدا هەندێک بەرژەوەندی خۆجێیی بەشێوەیەکی راستەوخۆ، توانای بەردەوام بوون و کار له یەکتر کردنیان لەگەڵ بەرژەوەندی تری ولاتانی دیکەدا گەشه پێدەداو جۆرێکی جیاواز له سیاسەتی جیهان گەشه پێدەکا. ئەگەر خەڵک له کۆمەڵگای (١) ویستیان فشار بخەنەسەر حکومەتی (٢).. داوا له حکومەتی (١) دەکەن، که لەگەڵ حکومەتی (٢) گفتوگۆ بکا. وەلێ لەو پەیوەندییانەی که سنووری نەتەوایەتی دەبەزێنن خەڵک له کۆمەڵگای (١) بەشێوەیەکی راستەوخۆ فشار دەخەنه سەر حکومەتی (٢)، یاخود بەشێوەیەکی راستەوخۆ فشار دەخەنه سەر خەڵک له کۆمەڵگای (٢).

کاتێک دەربارەی سیاسەتی بەیەکەوه سازان داخێوین، پێویسته گریمانی ئەوه نەکەین که هەموو شتێک دەکەوێته چوارچێوەی نموونەی تەقلیدیی پەیوەندییەکان له نێوان حکومەتێک و حکومەتێکی تردا. یەکێک له ئادگارە دیارەکانی بەیەکەوه سازانی ئاڵۆز سەرباری دەوڵەتان، بایەخی نوێنەرەکانی تره.

قەدبڕلێدانی تەقلیدی هەڵه نییه. بەڵکو هەتاوەکو بەگوێرەی سیاسەتی خۆسازاندنیش، وەک باشترین خەملاندنی سەرەتایی دەمێنێتەوه. بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەتان نوێنەره گەورەکانن، وەلێ ئەگەر بەتەنیا بایەخت به دەوڵەتاندا، رێگای ئەوه ون دەکەیت که سیاسەتی خۆسازاندن بزانی، بەکورتی دەڵێین: دەوڵەتان وەک گرنگترین نوێنەر لەسیاسەتی دەولی دەمێننەوه.

## ئەرێ بەڕاست
## سیستەمێکی جیهانیی نوێ لە ئارادایە؟

### نموونەی جێگرەوە لە ئایندەدا، دەوڵەتی ناسیۆنالیستی و دواڕۆژی ململانەی دەولی

لە کاودانێکی ئاهەنگئامێزی بە شان و شکۆدا، سەرۆک کۆمار و مەلیک و سەرۆکی حکومەتەکانی جیهان گفت و بەڵێنیان دا کە گیروگرفت و ئاریشەی مرۆڤایەتی چارەسەربکەن و لەگەڵ داهاتنی ساڵی ٢٠١٥ دا، بۆ ناردنی منداڵان بۆ قوتابخانە و قوتارکردنی ملیۆنان خەڵک لە هەژاری و دەستکورتی هەوڵبدەن.

دانوستاندن لە نێوان دەوڵەتان و نەتەوە یەکگرتووەکاندا بۆ جاڕدانی هەزارەی (سێیەم)، چەند حەفتەیەکی خایاند تا بەو فۆرمۆلە سازشکارییە، گەشبینەوە دەربچێ.

جاڕنامەی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێ: «سەرباری بەرپرسیی جیاجیای هەریەک لە ئێمە بەرانبەر کۆمەڵگەکانی خۆمان، هەموومان دان بە بەرپرسیاریی بە کۆمەڵی خۆمان دادەنێین لە بەرانبەر کۆمەک کردن و پشتگیری کردنی پرەنسیپەکانی کەرامەت و یەکسانی و دادپەروەریی مرۆڤایەتی لەسەر ئاستی جیهان...».

لوتکەی جیهانی کە لە کۆتایی حەفتەی یەکەمی مانگی ئەیلولی ٢٠٠٠ دا بە کۆتا هات و زێتر لە ١٥٠ پێشەوا بەشدارییان تێدا کرد، گفت و بەڵێنیان دا کە گۆڕانکاریی یەکلاکەرەوە بەدی بهێنن و ئارمانجی وایان بۆ خۆ داناوە کە رێژەی ئەوانەی رۆژانەیان لە دۆلارێک کەمترە، نیوە بەنیوە کەم بکەنەوە، هەروا هەمان شت سەبارەت بە ئاوی خواردنەوەی پاک و دانانی سنوورێک بۆ بلاوبوونەوەی ئایدز و نەساغیی کوشندە.

**جارنامەی کۆمەڵەی گشتی ئەو بوارانەی گرتۆتەوە:**

١- بەهاو پرەنسیپەکان: کە تیایدا جەخت لەسەر بەرپرسیی بە کۆمەڵ کراوەتەوە سەبارەت بە پابەند بوون بە پرەنسیپەکانی کەرامەتی مرۆڤایەتی و یەکسانی و ویژدان و دەستگرتن بە پرەنسیپ و ئامانجەکانی بەڵێننامەی (میثاق) نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

٢- پاراستنی ئاشتی و تەنایی دەولی، هەوڵدان بۆ چەککردن، دوورخستنەوەی گەلان لە کارەسات و بەڵای شەڕی ناوەکی و دەرەکی، ڕێزگرتن و زێتر باڵا دەستی و سەروەریی قانوون چ لە سەر ئاستی ناو وڵاتان خۆیان چ لەسەر ئاستی دەولی.

٣- نەشونماکردن، نەهێشتنی هەژاری.

٤- پاراستنی ژینگە، رزگارکردنی ئەو هەسارەیەی ئێمە لە چالاکی و کاری زیانبەخش، بەرەنگار بوونەوەی بە بیابان بوون و هۆکارەکانی وشکەساڵی.

٥- پاراستنی مافەکانی مرۆڤ، دیموکراسی، بەرەنگار بوونەوەی زەبروزەنگ بەکارهێنان دژی ژنان، گرنگی دان بە کولتووری لە یەکدی بورین، فراوان کردنی بازنەی هاوبەشی کردن، دابینکردنی ئازادی رادەربڕین و ئەسپابەکانی راگەیاندن.

٦- پاراستنی خەڵکانی بێ توانا و دەسەڵات بە تایبەتی منداڵان و خەڵکی سیڤیل، ئەوانەی دووچاری کارەساتی سروشتی و جینوسایدو ململانە و کێشەی چەکدارانەو لە پڕو ناکاو بوونەتەوە.

٧- دابینکردنی پێداویستییە بنچینەییەکانی ئەفریقیا، پتەوکردن و کۆمەک کردن بە بنیادە سیاسی و دەزگاییەکانی دیموکراسییە تازە سەرهەڵداوەکان و بەرەو پێشەوە بردنی گەشەکردن بۆ لە ناوبردنی هەژاری.

٨- بەهێزکردنی UN لە ڕێگەی چاککردنی دام و دەزگا جیاجیاکانیەوە، پتەوکردنی دەوری دادگەی دادی دەولی، بەکارهێنانی داهاتەکان بە شێوەیەکی باشتر، پتەوکردنی هاریکاری نێوان UN و پەرلەمانە نیشتمانییەکان بەو پێیەی UNماڵی هاوبەشی سەرجەم ماڵبات و خێزانی مرۆڤایەتییەو ناکرێ دەسبەرداری ببین.

ناکرێ ئاوات و ئومێدی UN بێتە جێ بەجێ کردن بەبێ هاریکاری دەولی و کاری هاوبەشی بە کۆمەڵ، ئەمەش وا دەخوازێ کە زلهێزان بە تایبەتی ئەمریکا، هەوڵ و کۆششێکی لە رادەبەدەر بدەن بە شێوەیەک کە لەگەڵ سەروەری و دەوری ئەمریکا لە پێوەندیی دەولی بگونجێ بەو پێیەی کەیەکە پێشەوایە لە دنیادا.

بۆمان هەیە بپرسین ئایا ئەمە ئەو ئەلتەرناتیڤەیە کە سیستەمی نوێی جیهانی پێ دەگوترێ؟ ئایا ئەمە لەگەڵ ئایدیای پووکانەوەی دەوڵەتی نیشتمانی لە سایەی جیهانگیریدا رێک دێتەوە؟ ئایا ململانەی نوێی دەولی چۆن رێگەی خۆی دەدۆزێتەوە؟

ئایا پێوەندی لە نێوان کارایی و هەرێمگیری و شوێنگەگەری و ئایدیای فیدرالیزمی جیهانی و دەوڵەتی نیشتمانی و پلورالیزم و هەمەجۆری نیشتمانی هەیە بەتایبەتی لە دەیەی نۆهەدەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و هەزارەی نوێدا کە UN ویستی دەستی پێ بکات!؟

ئایا ئەمە گەڕانەوەیە بۆ تێگەی کۆتایی مێژوو یان ئەوە بازدانێکی نوێیە بەسەر ئایدیای ناسیۆنالیستی و تێزەکانی سەروەریی کلاسیکدا؟ ئاخیرەکەی دەپرسین ئەرێ سیستەمێکی نوێی جیهانی لە گۆڕێ دایە؟

«مەفهووم»ە جیاجیاکانی ئەو سیستەمە کامانەن؟ لەم باسەدا هەوڵدەدەین وێنەیەکی نوێ سەبارەت بە دەوری هێز لە ئایندە و تاودانەوەی ئەمە بە هاوبەندیی لەگەڵ پەرەسەندنی ئابوری دەولی بخەینەروو!!.

## ئایا سیستەمێکی جیهانی، نوێیە؟

سیاسەتی دەولیمان وا پێناسە کرد: «سیاسەت بە لە ئارا نەبوونی ئاغایەکی گشتی». ئەم پێناسەیە ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە سیاسەتی دەولی، بۆ خۆ خزمەتکردنە. دەوڵەتان رووبەڕووی ئاریشەی تەناهی دەبنەوە کە هێز دەورێکی گەورەی تێدا دەبینێ، وێڕای هەبوونی دەستئاوێژی جودا جودای وەک تەرازووی هێزەکان و قانوونی دەولی و رێکخراوی دەولی(UN)، بەڵام ئەمانە ناکارن رێگە لە سەرهەڵدانی ئاشوب و شەڕوشۆڕ بگرن. هێشتا مەنتیقی ململانەی دەولی هەر وەکو توسایدیدس وەسفی کردووە «لە هەندێ ناوچە و کون و قوژبنی جیهانی هاوچەرخدا کاری پێدەکرێ».

لەگەڵ بە کۆتاهاتنی شەڕی سارددا، قسەو باس لەسەر دەرفەت و توانای هاتنە ئارای سیستەمێکی تازەی جیهانی گەرم بووە، بەڵام ئەو دەمە ئەم ئایدیایە تا رادەیەک هەر وەکو دواتر دەبینین، لێڵ و تەم و مژاوی بوو. بەڵێ سیستەمێکی نوێی جیهانی هەیە، ئەگەر لە روانگەی هەرەسهێنانی سیستەمی دووسەرەی دوای شەڕی دووەمی جیهانەوە سەیری بکەین. ئەم سیستەمە لە چوارچێوەی سیستەمی «دەوڵەتی

ئانارشیستی» دابوو. مەرج نییە ئەم سیستەمە سیستەمێکی دادپەروەرانە بووبێ. هەندێ بڕوایان وایە سیستەمی نوێی جیهانی واتە ڕاکردن و خۆدزینەوە لە گرفتەکانی سیستەمی دەوڵەتی ئانارشیستی. ئایا دەکرێ جیهانێکی وەها بێتە ئاراوە؟ مێژوونووسی بریتانی **ئەرنۆلد توینبی** Arnold Toynbe لە سەرەتای شەڕی ساردا نووسیویە و دەڵێ« ناشێ دەوڵەتی نیشتمانی و قلیشانەوەی ئەتۆم هەردووکیان لەسەر هەمان هەسارەدا بەیەکەوە بژین و هەڵبکەن» بەرای **توینبی** لە جیهانی دەوڵەتانی خودان سەروەریدا، شەڕ لوتکە و چلەپۆپەی شێوەکانی دیفاع لە خۆکردنە و بۆمبی ئەتۆمیش لوتکەی چەک و چەکسازییە، چار نییە دەبێ یەک لەو دووانە لە ناو بچێ».

هەمیشە لە رابردوودا، دەوڵەتی ئەقلیمی لە ئارادا نەبووە، کەواتە هیچ پێداویستییەکیش نییە کە لە دوارۆژ لە ئارادا هەبێ. لە سەردەمی توسایدیدسەوە، یەکەی سیاسی جودا جودا و سیستەمەکانی دەوڵەت لە ئارادا بوون، بەڵام دەوڵەتی ئەقلیمیی گەورە بەو پێیەی بناغەی یەکەمینی سیاسەتی دەولییە، تەنیا لە دوای سەردەمی ڕێنسانسەوە، پەرەی گرت.

شەڕی ۳۰ ساڵە لە سەدەی حەڤدەهەمدا، هەندێ خەسڵەت و سیمای شەڕی فیودالسیتی پێوە بوو، بەم پێیە ئەوە دوا شەڕی دەرەبەگایەتی و یەکەمین شەڕوشۆڕی دەوڵەتی ئەقلیمی بوو. دەوڵەتی مەزنی ئەقلیمی، وەکو ئێستاکە دەیناسین، بۆ ماوەی سێ تا چوار سەدە دەزگایەکی هەژمونگەر بووە لە سیاسەتی جیهانیی نوێدا.

چەند هزرڤانێکی ئایندەگەرا پێشبینی دارمانی دەوڵەتی ئەقلیمیان کردووە و سیستەمە نوێیە جیهانییەکەی ئەوان لە ناوە خۆیدا ئەو بنیادانەی تێدایە کە بەسەر ئاریشەی ئەنارشیستیدا زاڵ دەبن. لە شەڕی دووەمی جیهانەوە تا هەنوکە، (٤) هەوڵ و تەقەلای گەورە بۆ پەرەدان بەو ئالتەرناتیڤە نەدراوە کە باز بەسەر دەوڵەتی نیشتمانیدا دەدا. وەک نموونەی سیاسەتی جیهانی.

## فیدرالیزمی جیهانی World Fedralism

فیدرالیزم یەکێکە لە ئایدیا هەرە دێرینە کلاسیکییەکانی ئەورووپی و ڕێگەچارەیەک بۆ ئاریشەی ئانارشیزم پێشکەش دەکا: واتە دەوڵەتان رازی بن کە واز لە خۆ پڕ چەک کردنی نیشتمانی بهێنن و ئەندازەیەک لە کۆنترۆڵی حکومەتێکی ناوەندی پەسند بکەن. بە زۆری بانگەشەکارانی فیدرالیزم لەگەڵ ئەو ڕێگەیە بەراوردی دەکەن کە ۱۳ کۆلۆنیەکەی ئەمریکا لە سەدەی هەژدەهەمدا یەکیان گرت.

هەندێ کەس پێیان وایە کە مێژوو پەرەسەندنێکی بەرەو یەکەی مەزنتری تۆمار کردووە، بەڵام فیدرالیزم لە سەدەی بیستەمدا هێشتا وەک نەخشەیەکی تەواو سەرکەوتوو، خۆی نەچەسپاندووە.

ئاشتی تاکە شتێ نییە کەخەڵکی رێزو قەدری بگرن. چونکە ئاشتی هەمیشەیی مەگەر وەک **ئەمانویل کانت** دەڵێ: لە گۆڕدا مەیسەر ببێ، دەنا هەرگیز پێک نایەت. خەڵک، دادپەروەری، خێروبێری کۆمەڵایەتی و سەربەخۆبوونیان دەوێ و متمانە بە پاراستنی (حماية) جیهانی ناکەن. سەرباری هەندێ، خەڵکێکی کەم باوەڕیان بە سوود و کەڵکی چارەسەری فیدرالی و توانای فیدرالیزم بۆ چارەسەرکردنی گرفتی جەنگ هەیە. مەرج نییە دەربازبوون لە دەوڵەتی نیشتمانی، کۆتایی بە شەڕ بهێنێ تەنانەت ئەگەر سیستەمی ئانارشیستی دەولی، بەرپرسیاریی پاژەکی هەلایسانی شەڕوشۆڕیشی بەئەستۆوە بێ، زۆربەی ئەو شەڕانە کە لەم ساڵانەی دواییدا هەڵگیرساون، شەڕی ناوەکی بوون سەبارەت بە دەوڵەتانەوە.

**کارایی** Functionalism

بەهۆی ئەو قسورو کێماسیەی لە فیدرالیزمدا هەیە، ئایدیای کارایی پەرەی پێدرا. کارایی کە لە چلەکاندا بووە بە ئایدیایەکی گەلێری، هەوڵیدا بیسەلمێنێ کە هاریکاری کۆمەڵایەتی و ئابوری، زامنی دروست بوونی وەها کۆمەڵگایەکە کە باز بەسەر سنووری نیشتمان دەدات و شەڕوشۆڕ لە بەین دەبا. ئیدی مەسەلەی سەروەری ناوی لەنێو ناواندا نامێنێ. وێڕای کە قاوغ و قەپێلکە فۆرمالییەکەی دەوڵەت هەر دەمێنێ، بەڵام ناوەڕۆکە شەڕخوازانەکەی بەتاڵ و ڤالا دەکرێ. وەک ئەوەی کارایی لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهاندا، هانی سەرهەڵدانی هەندێ ئاژانسی تایبەتمەندی UN ی دا وەک FAO و WHO و هی دیکە.. تاڕادەیەک ئەمڕۆ کارایی هەیە لە جیهانێکی پڕاوپڕ بەرژەوەندی لە ئەودیو سنووری نیشتمانی و NGO و کۆمپانیا فرە رەگەزەکان و شتی تری لەم بابەتە. بەڵام «کارایی» نەشیا خۆی وەک نەخشەیەکی تێروتەسەلی «سیستەم»ێکی جیهانی بسەلمێنێ و زۆربەی دەوڵەتان راڕان لە وەلامدانەوەی خێراو توندی خۆ سازاندن، نەبادا هەندێکیان بالادەستی خۆیان بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنن.

## **هەرێمچیاتی** Regionalism

لە پەنجاکان و شەستەکاندا، ئاوێتە و تێکەڵبوونی ئەقلیمی بە هەرمێن کەوت.

**جان مۆنێ** Jean Monne ی سەرۆکی دەستەی پلاندانانی فەرەنسایی پێی وابوو چارەسەرێکی کارا لەسەر ئاستی ئەقلیمی خۆی لە بەیەکەوە گرێدانی فەرەنساو ئەڵەمانیا دەبینێتەوە کە رێگە لە سەرهەڵدانەوەی ئەو ململانێیانە دەگرێ کە هەردوو شەری یەکەم و دووەمی جیهانیان لێ کەوتەوە. ساڵی ۱۹۵۰ ئەوروپا کاری بە پرۆژەی **شومان** Schumann plan کرد و هەردوو پیشەسازیی خەڵووز و پۆڵای ئەوروپایی یەکخست. دوای ساڵی ۱۹۵۷ پەیماننامەی رۆما، بازاری هاوبەشی ئەوروپای پێکهێنا، ئەمە هەنگاوێک بوو بەرەو پێشەوە بۆ کەمکردنەوەی بەربەست و کۆسپی بازرگانی و کۆمەڵێ سیاسەتی کشتوکاڵی و ئابوری بەیەکەوە گونجاند کە ساڵی ۱۹۹۲ یەکێتی ئەوروپی لێکەوتەوە. هەروەها لە جێگەی دیکەشدا دیتمان چۆن هەوڵیان دا لە چاو هەرێمچیاتی ئەوروپی بکەنەوە. لە هەوڵە هەرە دیارەکان، دامەزرانی رێکخراوی نەفتا Nafta بوو لە نیوە رۆژئاوای گۆی زەویدا.

لەگەڵ ئەوەشدا ساڵی ١٩٦٥ **جەنەراڵ دیگۆل**، دوای ئەویش **مارگرێت تاتچەری** سەرۆک وەزیرانی بریتانیا لە هەشتاکاندا، رادەیەکیان بۆ مەودای پەرەسەندنی تێکەڵاوبوونی ناوچەیی دانا. لە ناوەراستی نەوەتەکاندا، وڵاتانی یەکێتی ئەوروپی سەبارەت بە دەستەهەڵگرتن لە سەروەریی بۆ بەرژەوەندی حکومەتێکی ئەقلیمی، نەک هەر هاوهەڵوێست نەبوون بەڵکو تەواو دردۆنگ و رارا بوون، بەڵام ئەوروپا، سەرەرای کە هێواش هێواش بەرەو یەکێتی فیدرالی دەبزوێ، وەک خۆی نەماوەو گۆراوە. هەروەک دەڵێن رەنگە هەموو ئەوروپاییەکان لە هەمان بەلەمدا بن، بەڵام بەلەمەکان کە شەپۆلی جیاجیا بەم لاو بەولایان دادەدا، هەنوکە خزاونەتە پاڵ یەک و هاتوونەتە باریەک.

## **شوێنگەگەرایی** Ecologism

لە نەوەتەکاندا شوێنگەگەرایی تەرزە ئومێدو هیوایەکی نوێی سەبارەت بە هاتنە گۆرێی جۆرێکی دیکەی لە سیستەمی جیهانی، لەگەڵ خۆیدا هێنا. **ریچارد فۆک** Falk Richad لە کتێبی (ئەم هەسارە هەرەشە لێکراوە)دا وای بۆچووە کە دەشێ دوو شت ببنە بنەمای سیستەمێکی نوێی جیهانی: زیادبوونی گرنگیی نوێنەرە نائەقلیمییەکانی ناو سنووری نیشتمانی و زیادبوونی بەیەکەوە سازان و بەیەکەوە

گـونجـان لە ژێر فـشـاری قـات و قـڕیدا. **فـۆک** پێی وایە لە دێهـاتەوە بەرەبەرە پەرەسـەندنێک هەیە، بەهاو نەریت و خـوو خـدەی مـیللی ئەوتۆ هەن لە سـەرووی دەوڵەتی نیشتمانییەوە، دوژمنایەتی کردنی کۆلۆنیالیزم، دوژمنایەتی کردنی راسیزم، زیادبوونی هاوسانی و هاوسەنگیی شوێنگەیی چارنییە کە نەک هەر دەبێتە مایەی بەهێز بوونی هەڵوێستی زۆرینە لە نەتەوە یەککگرتووەکاندا، بەڵکو دەبێتە هۆی دروست بوونی سیستەمێکی نوێی مامەڵە کردن لەگەڵ سەرچاوە سروشتییەکان لە جیهانی ئەمرۆماندا کە لە کەمیان داوە. ئاکامی کۆتایی، ئەوەیە کە زەبت و رەبتی ئاشتی و دادپەروەری و هاوسەنگیی شوێنگەیی و بنەماگەلی شێوەیەکی نوێی سیستەمی جیهانی، دروست دەبن.

وێڕای ئەوە **فـۆک** سـەبارەت بە لە کـەمـیـدانی سـەرچاوەکـان سـەرچیخ چووە و لە توانای تەکنەلۆجیای تازەی بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو لە کەمیدانە، کەمکردۆتەوە. لەوەش زیاتر، بزاڤە لادێییە میللییەکانی- ئەمریکایی- وا بە ئاسانی بە پیر ئایدیای هاریکاریی بان سنوورەکانەوە ناهێن. مەیل و خولیای ناوچەیی کە هێز و گوڕێک بەو بزووتنەوانە دەدەن، حەز بە هەماهەنگی دەولی ناکەن.

هێشتا دەوڵەتی نیشتمانی کۆن نەبووە و کاتی بەسەر نەچووە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئەو چوار نموونەیە پێشبینیان کردبوو، ئەوانەی بڕوایان بە هەرەسهێنانی ئەو دەوڵەتە (مەبەست دەوڵەتی نیشتمانییە) هەیە بەڵگە و بیانوو پاساوی ساکاریان بە دەستەوەیە. ئەوانەی دەڵێن دەوڵەتی نیشتمانی وەک جاران قایم ومـوکم نییە و رۆکێت دەتوانێ سنوورەکان ببڕێ و بە ماوەیەکی کورت تا هوندرِ ولاتان بڕوا، وەک چۆن باروت و سەربازی پیادە توانیان بچنە ناو قەڵاو قوللەی سەدەکانی ناوەڕاستەوە و بەسەریەکیان دابڕوخێنن، ئا ئاواش رۆکێتی نوکلیاری، دەوڵەتی نیشتمانی کردۆتە جۆرێکی کۆنینە. بەڵام خەڵک سێ شتیان لە دەزگا سیاسییەکانی خۆیان دەوێ: تەنایی ماددی- بەراست خێرو خۆشی ئابوری و پێناسەی کۆمەڵایەتی- نیشتمانی. دەوڵەتی نیشتمانی کە رژێمە دیکتاتۆری و توتالیتارییەکان حوکمیان ناکەن، ئەو پێداویستییانەیان دابین کردووە کە هیچ دەزگایەکی دیکە پێی دابین نەکراوە. کۆمپانیا فرە رەگەز و فرەناسنامەکان و رێکخراوە دەولییەکان هێزو توانای ئەوتۆیان نییە کە تەنایی و شەرعییەتی پێویست بۆ دروستکردنی پۆرگ و خاڵی پێ چەقاندنی ناسنامەی نیشتمانی، پەیدابکەن. ئا ئاوا دەوڵەتی ئەقلیمی و گرفتەکانی، وەک کێشەیەکی ناوەندی لە سیاسەتی دەولی دەمێننەوە، وێڕای نەریتێکی کۆنینەی هەوڵ و تەقەلادان بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێک.

## ناسیۆنالیزم و وەلاتانی سنووری نەتەوایەتیی

ناسیۆنالیزم و فرە نەتەوەیی دەبنە دوو هێزی رکابەری یەکتر لە جیهاندا.

جیهان، گۆڕانگاریی شۆڕشگێرانەی لە بواری تەکنەلۆجیادا، بە تایبەتی لە گەیاندن Comunication و گواستنەوەدا بەخۆیەوە دەبینێ، دنیا بە شێوەیەک لە شێوەکان گچکە دەبێتەوە. دام و دەزگای گەورەی دەولی، مینا کۆمپانیا فرە ناسنامەکان، بەرهەمهێنانی ئابوری لەسەر بنەمایەکی جیهانی رێکدەخەن و ستراتیجگەلی جیهانی دەگرنە پێش. بەلاّم لە هەمان کاتدا خەلّکێکی زۆریش کاردانەوەی نەتەوەیی لە بەرانبەر گۆڕانکارییە بەلەز و خێرایەکاندا، دەنوێنن.

گەیاندن رووی جیهان دەگۆڕێ و دیپلۆماسی لە کاتێکی راستەقینەدا رەوتی خۆی دەگرێ و هەوالّی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئێش و ئازاری خەلّک لە هەر گۆشەو کەنارێکی دووری جیهاندا، لە رێگەی«شاشە»ی تەلەفزیۆنەوە دەگاتە مالّەکانمان و رای گشتی دەورێکی بالاّو دیار لە دارشتنی بریاری نیشتمانی و دەولیدا دەگێرێ. تەنانەت پێش هاتنە ئارای تۆڕی هەوالّی دەولی، هزرڤانی کەنەدی، **مارشال ماک لوهان** Marshal Mc Luhan گوتویە: گەیاندنی مۆدێرن، جیهانی کردۆتە گوندێکی بچکۆلّە. بەلاّم پێکچواندنی جیهان و گوند، خاپاندنێکی تێدایە، چونکە هێشتا ناسنامەی سیاسەتی جیهانی، ناسنامەیەکی کزو چروکە. خولیای نیشتمانی لە زۆربەی دەڤەرێن جیهاندا بەرەو بەهێزبوون دەچێ نەک لاوازبوون. لە باتی ئەوەی کە جیهان، وەک «گوند»ێک ببینین، دەبینین «گوندان» لەهەر جێگەو قوژبنێکی دنیادا زێتر ئاگایان لەیەک و دوو هەیە.

## کۆتایی مێژوو

هەندێ شرۆڤەوان دەلّێن: کەرتبوون و بلۆکبەندی و لێکهەلّبرانی ئایدیۆلۆجی گەورە، وەک فاشیزم و شیوعییەت، بەرپرسن لە شەمزین و بێ سەرو بەریی ژیانی هاکەزایی باو و میانەرۆ. سەنعەت، خەلّکی لە گوندەکان یان لە کۆمەلّگە بچووکەکان هەلّکەندو وای لێ کردن کە ببنە هێزێکی ئامادەو یەدەگ بۆ سازدان لەلایەن بزاڤە ئایدیۆلوجییە گەورەکانەوە. بەلاّم سەرمایەداریی لیبرالی بە تێپەڕبوونی کات، ساغی کردەوە کە زۆر سەرکەوتووترە لە بەرهەمهێنانی رادەیەکی بەرزتری خێرو خۆشی و بەشداری پێکردنی هاوولاتیاندا. کۆتایی هاتنی شەری سارد، بالاّدەستی و سەروەریی سەرمایەداریی لیبرالیمان بە گوێدا دەچرپێنێ. هەنوکە سەرمایەداری لیبرالی تاکە

ڕکابەرێکی وای نییە کە هێزێکی ئایدیۆلوجی گەورەی لەپشت بێ.

مێژوو بە کۆتا هات، وەک دەردەکەوێ، لە ڕوانگەی هزرڤانانێکی لە بابەتی **فرەنسیس فۆکویاما**[1] هەروا ئەوانەی کە پێیان وایە ڕووداوەکان بزوێنەری مێژوون. بەڵام دوای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، وا تەماشا ناکرێ کە کۆتایی مێژووە بەڵکو وەکی دیکە گەڕانەوەی مێژووە. گەڕانەوەی مێژوو واتا هەلومەرجی زۆر سروشتی تر لە جاری جاران، کە بەتەنیا لێکهەڵبڕان و دابەشبوونی ئایدیۆلوجی ناتوانێ ململانەی لە سیاسەتی دەولیدا لێ بکەویتەوە. سەرمایەداریی ئازاد- لیبرالیزم- ڕکابەری زۆری هەیە با ڕکابەران پەراگەندە و پەرت و بڵاویش بن. (چین) ڕێگە دەدا لە دەڤەرەێن باشووری ڕۆژئاوادا بە تایبەتی لە هۆنگ کۆنگ و کواندۆنگدا، سەرمایەداری بۆ خۆی بژی، بەڵام سیاسەتی (چین) و ئایدیۆلۆجییەکەی نەتەواو لیبرالییەو نەتەواو سەرمایەدارییە.

لە ناوچەو دەڤەری دیکەدا، فەندەمێنتالیزمی ئایینی ئامبازی ڕێساو پراکتیکی سەرمایەداریی لیبرالی دەبێتەوە. ئێمە جارجار هەموو بزانە ئوسوڵییە ئیسلامییەکان بە یەک چاو سەیر دەکەین ، بەڵام بزاڤ و جووڵانەوەی ئوسوڵی ئیسلامی زۆر و زەوەند هەن. بۆ نموونە جیاوازی گەورە لە نێوان تێزەکانی جەزایری و سعوودی هەن و هیچ شتێ بەیەکەوە کۆیان ناکاتەوە تەنیا یەک شت نەبێ ئەویش کاردانەوە و بەرنگاربوونەوەی سەرمایەداریی لیبرالیی عەلمانییە.

وەڵام و ڕکابەری هەرە گەورەی سەرمایەداری لیبرالی پاش کۆتایی شەڕی سارد، ناسیۆنالیزمی ئیتنییە. وەک دەبینین مەیل و خولیای نیشتمانی بەرەو توندی و هەڵچوون دەچێ، مەبەست مەیل و خواستی خەڵکانێکی خودان سەروسیمای ئیتنی وێکچووە بەرەو جەختکردنە سەر ناسنامەی هاوبەش، بەڵام مەیلی نیشتمانپەروەری چ شێوەیەک بە خۆیەوە دەگرێ، شتێکی دیکەیە. هەروەک پێشتر دیتمان زۆر شت لە ژێر ناونیشانی نیشتمانپەروەریتی تێکەڵ و پێکەڵ دەکرێ و تێک دەتریجێندرێ. کارێکی بەسوودە ئەگەر سەیری جیاوازی نێوان ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئەورووپای ڕۆژئاوا بکەین. بۆ ماوەی نیو سەدە لە ژێر باڵی حوکمی شیوعی لە ڕۆژهەڵاتدا، ململانێی نیشتمانی و ئیتنی لە جێگەی خۆی ڕەق ببۆوە.

---

(١) بروانە: فرانسيس فوكوميا، نهاية التاريخ وخاتم البشر (القاهرة، مركز الاهرام للترجمة والنشر، ١٩٩٣) ترجمة احمد حسين امين.

بە کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و نەمانی هەژمونیی سۆڤیەت، زۆر لەو گرژیانە لەباری بەستەڵەکیەوە هاتنە دەرێ. نموونەی ئەمە، رکی کۆنینەی نیوان سرب و کروات لە یۆگۆسلاڤیا کەوتەوە روو پاش کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و روخانی حکومەتی شیوعی لە وڵاتەکەدا. کۆڕوکۆمەڵێکی زۆری ئیتنی لە ناو سنوورەکانەوە بە درێژایی ئەوروپای رۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەتی جاران هەڵقولان و گوڕوتینیان بە ململانەی ئیتنی و ژیانەوەی نیشتمانی بەخشییەوە.

ئەمە پێچەوانەی باری ئەوروپای رۆژئاوایە، ئەو وڵاتانەی کە مەیل و خولیای نەتەوەیی دەمارگیرانە و هەڵوێستی دوژمنکارانەیان هەبووە، خۆیان لە ناو کۆمەڵگەیەکی گەورەی ئەوروپی دیتەوە، تەنیا بەریتانیای راڕاش بە دەنگ هێڵەپانەکانی یەکێتی ئەوروپییەوە چوو. لە کاتێکدا ئەوروپای رۆژئاوا دوژمنکاری و رک و کینەی کۆنینە لە بیر دەکەن و یەکدەگرن، دەوڵەتانی ئەوروپای رۆژهەڵات لاپەڕەی رک و دوژمنکارییە کۆنەکان هەڵدەدەنەوەو تازەی دەکەنەوە، ئەمە چۆن لێک دەدرێتەوە؟

رەنگە بەشێکی لێکدانەوەکە لە نەشونما کردنی ئابوری خۆی ببینێتەوە. کاتێ گوزەرانی خەڵک باش دەبێ، رک و کینە و دوژمنکاری کەم دەبێتەوە. لەوانەیە لایەنێکی دیکەی لێکدانەوەکە خۆی لە دیمۆکراسی ببینێتەوە. کاتێ دەرفەت بە خەڵک دەدرێت ئازادانە رەفتار بکەن، ئەوا عەقڵ و هۆش بەسەر سۆز و ئەندێشەدا زاڵ دەبێ. توانراوە بە هۆی کارو کردەی دیموکراتیانەوە هەندێ رک و کینەی کۆن وەلا بندرێ-سەرنجی ئەم دەست و ئەو دەست پێکردن و ئەو دیالۆگە بدە کە لە پاش شەڕی دووەمی جیهانەوە لە ئەڵەمانیای رۆژئاوادا روویداو بووە هۆی گۆڕانی پرۆگرامی خوێندن و دامەزراندنی تێگەیشتنێکی نوێ بۆ مێژووی ئەڵەمانیا. هەروا روویێکی دیکەی وەڵام ئەوەیە کە بوونی چەندین دامەزراوەی ئەقلیمی کە وڵاتانی ئەوروپییان لە چوارچێوەیەکی فراوانتری ئەوتۆ کۆکردۆتەوە کە بوار و دەرفەتی لە بەردەم بیروبۆچوونی تەسک و پەڕگیری نیشتمانی نەهێشتۆتەوە.

بەڵام تەنانەت لە ئەوروپای رۆژئاواشدا، رۆحی نیشتمانی نەمردووە و کاتی بەسەر نەچووە. ئەوروپیایەکی زۆر نایانەوێ ناسنامەی نیشتمانی خۆیان بە تەواوی لەناو ناسنامەیەکی ئەوروپاییدا بتوێننەوە. هێشتا ئاسەواری ترس و خۆف لای فەرەنگ و ئەڵەمانان ماوە. هۆیەکی لایەنگیریی فەرەنگان بۆ ئاوێتە بوونی ئەوروپی، حەزو ئارەزووە بۆ راکێشانی ئەڵەمانەکان بۆ لای خۆیان. سەرباری ئەوەش زۆر لە ئەوروپاییە رۆژئاواییەکان حەز بە چارەی مشەختان ناکەن و لە کۆچڕەوی خەڵک لە باکووری

ئەفـریقـیـاو ئەوروپای ڕۆژهەڵات دەترسن. لەشکر و سوپای داگیـرکـەر لە خـواروو و ڕۆژهەڵات لە بەلەنگاز و هەژاران کـە وەک تاکـەکـەس دەچنە ئەوێ، پێک دێن. حـزبە ڕاسترەوەکان لە ئەوروپای ڕۆژئاوا بە مەسەلەی ترس لە بیانی Xenophobia دەگرن و زەنگی وریابوونەوە لێدەدەن کە کێشە و ئاریشـەی دەمارگیریی نیشـتمانی بە تەواوی لە ئەوروپای ڕۆژئاوا بە کـۆتا نەهاتووە. هێشـتـا مـەسـەلەی سەروەریی نیشـتـمـانی، کەمایەتیەکی دەوڵەمەند لـە زۆرینە هەژارەکە لە جـیـهـاندا دەپارێزێ. لەگـەڵ ئەوەشدا جیاوازی لە نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا جیاوازییەکی گەورەیە.

### ئەودیو سنووری نەتەوایەتی Transnationalism

دیوەکەی تری پارەکـە چییە؟ گەیاندن کـە سنووری نیشـتـمـانی بەزاندووە و بڕیوە، دەرفـەت و هەلـێکی باشی بۆ زۆرتر زانین خـولـقـاندووە کـە چ لە ناوچەکـانی دیکەی جیـهـاندا دەگـوزەرێ و شـیـانێکی گـەورەتر بۆ ڕێکخـستنی کـارەکـان لـەسـەر بناغـەیەکی جیـهـانی دەرەخـسـێنێ. بەهێـزترین شـێـوەگـەلی ئەو ڕێکخـسـتنە، کـۆمـپـانیـا فـرە ناسنامەکانە، کۆمپانیای بان سنووری نیشتمانی لە ڕێگەی سەرمایەگوزاریی لە دنیادا و قـازانج کردن لە پاژی لـێک ئایری بازێری جیـهـانیدا، تەرزێک لە ئابوریی جیـهـانی بەرهەم دێنێ و دەوڵەتان بۆ ڕاکـێـشـانی سـەرمـایەگـوزاری دەولی، ڕکـابەرایەتی یەکـتـر دەکەن. بەشـێکی گـەورەی بازرگـانیی دەولی لە ڕێگەی کـۆمـپـانیـا فـرە ناسنامـەکـانەوە دەکرێ. کـۆمـپـانیـای Honda لە ئەمریکا نەک لە ژاپۆن ترۆمـبێل پتر دروست دەکـا و پاشـان بۆ ژاپۆنی بار دەکـا و دەنێـرێ. بە واتـایەکی دیکە ئەمـریـکـا، «تصـدیر»ی ترۆمبێلی ژاپۆنی دروستکراو لە ئەمریکا وەک بەرژەوەندییەکی نیـشـتـمانی ئەمریکی ناسـیـوە. ڕەوشـەکـە لەگـەڵ کـۆمـپـانیـای IBMیش کـە هەرە گـەورەترین کـۆمـپـانیـای بەرهەمـهـێنەری کـۆمـپـیـوتەری گـەورەیە لە ژاپۆن بەهەمـان شـێـوەیە. کـۆمـپـانیـای IBM لێـتـوژینەوە و دیراسـەتەکـانی لە ژاپـۆن دەکا و کـارزانی ژاپۆنی کارپێدەکا، ئەمـەش وای لە مـامـۆسـتـای ئابوری سـیـاسی، **ڕۆبرت ڕاسین** Raich Robert کـردووە کـە بپـرسێ «ئێـمـە کـێین»؟ ئەمـریکاییـەکـان پێ لەسـەر پێناسـە و ناسنامـەی بەڕێوەبەرایەتی کـۆمـپـانیـاکە یان پێ لە سەر ئەو شـوێنەی کـە کـۆمـپـانیـاکـە تۆژینەوەکـانی لێ دەکـاو کـۆمـپـیـوتەری لێ بەرهەمدێنێ دادەگرن؟ ڕایش پێی وایە بەرژەوەندی خەڵـکـانێکی لە ناو سنووری ئەمریکادا دەژین زۆر گرنگترە لە کـۆمـپـانیـایەکی ئەمریکی کە لە ژاپۆندا کار دەکـات. ڕەخنەگران وەڵامی دەدەنەوە و دەڵێن: ڕایش زۆر دوورتر لەوەی کە ئێـسـتـا

پێویسته سەیری دوارۆژ دەکا. لە زۆرینەی کۆمپانیا فرە نەتەوەکاندا، ناسنامەیەکی نیشتمانی باڵادەستەو سێ لەسەر چواری بەرهەمی ئەمریکی هی ئەو کۆمپانیایانەیە کە بنکەی بەڕێوەبەرایەتییەکەیان لە ناو ئەمریکایە. وێڕای ئەوەش ئەو تەرزە بیرکردنەوەیە سەبارەت بە دوارۆژ، شایانی گرنگی پێدانە. ئەو سەرمایەگوزاریانەی لە سنووری نەتەوەیی دەپەڕنەوە، بەشداری لە تێکەڵپێکەڵ کردنی ناسنامەکان و تەمومژاوی کردنی ئەم پرسیارەدا دەکەن «ئێمە کێین»؟ ئەگەر بەیەکەوە سازانی شوێنگەمان خستە سەر ئەوا شیانی ئەوە هەیە کە کار لە دیدو تێڕوانینە تایبەتەکان بکا سەبارەت بە گرفت و ئاریشەی زەمینی.

گۆڕانکاریی تەکنەلۆجی و گەشەی ئابوری جەخت لەسەر کێشە و ئاریشە شوێنگەییەکان دەکەنەوە و فشار بۆ سەر سەرچاوەکانی دەهێنن وەک: ئۆقیانووس و کەش و هەوا و کیشوەری جەمسەری باشوور و هەمە جۆری بایۆلۆجی کە وەک کۆمۆنی زەوی سەیر دەکران، لە سەدەی رابردوو حکومەتان زێتر لە ١٧٠ بەڵێننامەی ژینگەییان مۆر کردووە کە تایبەتن بە بابەتی نیگەران ئامێزی هاوبەش لە نێوانیاندا: راوە ماسی، بارانی ترشاوی و وردە وردە کەمبوونەوەی چینی ئۆزۆن و پاراستنی ئەو گیانلەبەرانەی کە رووەو نەمان دەچن و جەمسەری باشوور و پیسبوونی ئۆقیانووسەکان. ٣/١ی ئەو بەڵێننامانە لە دوای کۆنگرەی یەکەمی شوێنگەیی UN-ەوە کە لە ساڵی ١٩٧٢ لە ستۆکهۆلم بەسترا، مۆر کراون. کۆنگرەیەکی دیکەی گرنگی UN لە بارەی شوێنگەوە ساڵی ١٩٩٤ لە بەرازیل بەسترا. لەو گیروگرفتە شوێنگەییانەوە، چەندان رێکخراوی نا حکومەتی سەریان هەڵدا کە چالاکییەکانیان سنووری نیشتمانیان بەزاندووە و زۆربەی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان لە سیاسەتی ناوخۆیاندا نیگەرانی توند و روو لە زیادبوون سەبارەت بە ژینگە دەردەبڕن.

بەڵام چ روو دەدا ئەگەر هەماهەنگی لە نێوان کاردانەوەی وڵاتاندا نەبێ؟ بۆ نموونە ژاپۆن هەڵوێستێکی زۆر ئاڵۆزتر لەوەی ئەمریکا دەنوێنێ. سەرمایەگوزاریی ژاپۆنی لە ئەمریکا چوار هەندەی سەرمایەگوزاری ئەمریکاییە لە ژاپۆندا. ئەگەر ئەمریکا، ژاپۆن لە بازاڕی خۆی دووربخاتەوە، بە ئاسانی خۆی لەبەردەم کۆمپانیای نالیهاتوودا دەبینێتەوە کە ناتوانن لەسەر ئاستی جیهان رکابەری بکەن. گرفتی سیاسەتگەلی خۆپارێز ئەوەیە کە بە قەدەر ئەوەی زیان لە بەرژەوەندەکانی لایەنی دیکە دەدا، زیانیش بە بەرژەوەندەکانی دانەرانی ئەو سیاسەتە خۆی، دەگەیەنێ. لەوما لە نەوەدەکاندا ئەمریکایی و ژاپۆنییەکان کەوتنە دانوستاندنەوە سەبارەت بە کەندو کۆسپی ناوخۆیی

لە بەرانبەر بازرگانیدا. ئەمریکا سەبارەت بە مەسەلەیەک کە لە چوارچێوەی قەزای ژاپۆنی دابوو، فشاری خستە سەر ژاپۆن، چونکە قانوونگەلی ژاپۆنی ئەوتۆ هەن کە قەوارەی کۆگای هەرە گەورە(سوپەر مارکێت) و هی دیکەیش دیاری دەکەن کە سنوورێک بۆ بەشداریکردنی ئەو کۆمپانیایانە دادەنێن لە بواری سیستەمی دابەشکردندا. هەندێ سیاسەتوان و بەکاربەری ژاپۆنی بەم فشارەی ئەمریکای خۆشحاڵ بوون چونکە بە قازانجی بەکاربەری ژاپۆنی بوو، لە بەرانبەردا حکومەتی ژاپۆنیش فشاری خستە سەر ئەمریکا بۆ راستکردنەوەی کورتهێنانی بودجەکەی. بە واتایەکی دیکە ژاپۆنی و ئەمریکاییەکان لەگەڵ مەسەلەی پەراوێز کەوتوودا مامەڵەیان نەکردووە، بەڵکو لەگەڵ کاروباری ئەوتۆ کە پێوەندیان بە سەروەریی قەزاوە هەبووە، لە هەردوو وڵاتدا. هەندێ چاودێر لە بەرانبەر ئەو کاروکردانەدا نیگەران بوون و دەڵێن هەرچەند یەکێکیان فشار بۆ سەر مەسەلە ناوخۆییە هەستیارەکانی لایەنی دیکە بهێنێ، ئەوا لایەنی دیکە زێتر توورە دەکا. لێرە ئەم بەیەکەوە گونجانە، ئاریشەی پتری لێ دەبێتەوە. بەواتایەکی دیکە چەندەی ئەمریکا فشار بخاتە سەر ژاپۆن کە بەشێک لە بازاڕی خۆی ئاواڵەو بکاتەوە، هەندێ لە ژاپۆنەکان بەم فشارە کەیفیان ساز دەبێ و، هەندێکی دیکەشیان بە خولیا و مەیلی ناسیۆنالیستانە وەڵامی ئەو فشارە دەدنەوە.

لیبرالیستەکان وا وەڵامی سیاسەتی خۆپارێزی دەدەنەوە کە ئەو سیاسەتە خولیای هەڵچووی ناسیۆنالیستی سەرکوت ناکاو نە ئەو دەستکەوتانەی لە بەیەکەوە گونجاندن هاتوون و نەئەو لێهاتووییەی کە لەرکابەریی دەکەوێتەوە، لە دەست نادا.

دەکرێ بە کورتی بڵێین تەکنەلۆجیا بازاڕێکی ئەوتۆی دروست کردووە کە کۆمپانیا فرە رەگەزەکان دەتوانن سەرمایەو دارایی و پارەو پولی خۆیان لەسەر ئاستی دنیا بخەنەگەڕ، بەڵام بەشێکی دانیشتوان کاردانەوەی نەتەوەییان دەبێ، کارلێک یان راکێش راکێشی نێوان ناسیۆنالیزم و بازدان بەسەر سنووری نەتەوەییدا دەبێتە سیمای سەرەکی سیاسەتی جیهانی.

## بڵاوبوونەوە Proliferation

مەسەلەیەکی دیکەی هاوبەند بە بازدان بەسەر سنووری نەتەوەییدا، بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆجیایە. لە مەسەلەی پترۆلدا(زێڕی رەش) دیتمان چۆن کۆمپانیاکان بەبێ ئەوەی ئەنجامەکەی بزانن، شارەزایی و پسپۆڕییان گواستەوە وڵاتە نەدارو هەژارەکان.

هەروا دەکرێ تەکنەلۆجیا لە رێگەی بازرگانی و قاچاخچێتییەوە بگوازرێتەوە، راستییەکەی ئەوەیە، تەکنەلۆجیا بە تێپەڕبوونی کات لە سنوورەکان دەپەڕێتەوە.

بڵاوبوونەوەی ئەم تەکنەلۆجیایە چ لە تەنایی دەکا؟ بەلانی کەمەوە هەنوکە (٢٠) دەوڵەت هەن شیانی ئەوەیان هەیە چەک و چۆڵی (هەموو شت وێرانکەر) بەرهەم بێنن. تەمەنی تەکنەلۆجیای چەکی کیمیاویی نزیکەی (١٠٠) ساڵێکە. تەمەنی تەکنەلۆجیای چەکی ئەتۆمی و رۆکێتی خۆهاوێژ نیو سەدەیەکە. راستە سیاسەتی سنووردانان بۆ بڵاوبوونەوە تا رادەیەک رێگەی لە بڵاوبوونەوەی چەکی نوکلیاری گرتووە، بەڵام ئاریشەی بڵاوبوونەوە بە هەرەسهێنانی سۆڤیەت تەشەنەی کردوەو کۆنترۆڵ بەسەر ئەو وڵاتانەی کە جاران لە فەلەکی سۆڤیەت دەسووڕانەوە لاوازبووە و لە ئاکامدا بۆتە مایەی ئەوە کە تەکنەلۆجیا دزە بکا بۆ دەرەوەو بەدەست تیرۆرستان بگات.

پێش هەرەسهێنانی سۆڤیەت، (٨) دەوڵەت چەکی نوکلیاریان هەبوو، (٥) لەو دەوڵەتانە بە رەسمی لە «بەڵێننامەی ١٩٦٨ی سنووردانان لەبەردەم بڵاوبوونەوەی چەکی نوکلیاریدا» جاڕیان دابوو کە چەکی نوکلیاریان هەیە ئەوانیش: ئەمریکا و سۆڤیەت و بریتانیا و فەڕەنساو چین بوون. سێ دەوڵەتی دیکەش لەسەر ئاستی دەولی ناسرابوون کە بە نهێنی چەکی نوکلیاریان دروست کردووە، ئەوانیش: ئیسرائیل و پاکستان و هندستان بوون. خۆشییەکەی ئەوەیە ئەوددەمە ٣٠ دەوڵەتی دیکە دەیانتوانی چەکی نوکلیاری دروست بکەن، بەڵام لە خۆڕا دروستیان نەکردبوو. بەم واتایە سێ یان چوار هەندەی ژمارەی راگەیاندراو لە دەوڵەتان دەتوانن ببنە خودان چەکی نوکلیاری. ئەمەیش بە تەواوی لەگەڵ ترس و بیمی **سەرۆک کنیدی** تێکی نەدەکردەوە لە کاتی مۆرکردنی بەڵێننامەی سنووردانان لەبەردەم تەجرەبەی نوکلیاری ساڵی ١٩٦٣دا، کە ژمارەی وڵاتانی خودان چەکی نوکلیاری لە کۆتایی حەفتاکاندا بگاتە زێتر لە (٢٥) دەوڵەت.

لەبەرچی چەکی ئەتۆمی زۆرتر بڵاونەبۆوە؟ لە جیهانێکی ئانارشیستدا کە لە دەوڵەتی خودان سەروەری پێکهاتبێ، بوونی چەکی نوکلیاری، شێوەی کۆتایی پشت بەستن بەخۆیە. بەهەر حاڵ، ئەم پرسیارە، سێ وەڵامی سەرەکی هەیە: یەکێکیان ئەو پاکتانایە کە لە ماوەی شەڕی ساردا هاتنە دامەزراندن و دەوڵەتە گەورەکان بەڵێنیان دابوو کە ئاسایش و تەنایی هاوپەیمانەکانیان دابین بکەن. نموونەی ئەمە، ئەڵەمانیاو ژاپۆن چەکی نوکلیارییان دروست نەکرد، چونکە ئەمریکا گەرەنتی تەنایی دابوونێ.

ئەم دوو وڵاتە بە پێویستیان نەدەزانی چەکی نوکلیاری تایبەت بە خۆیان بەرهەم بهێنن لە سایەی گفت و بەڵێنی ئەمریکایی کە لێنەدەگەڕا هیچ دەوڵەتێک بە چەکی نوکلیاری هەڕەشە لەو دوو دەوڵەتە بکا. هەروا پەیمانەکان بەلای هەندێ لە دەوڵەتە گچکەکانەوە شتێکیان دەگەیاند. لەوانە کۆریای خواروو و تایوان دەستیان کرد بە دروستکردنی چەکی نوکلیاری وەختێکی بۆیان دەرکەوت، ئەمریکا پاش شەڕی ڤیتنام لە ئاسیا دەکشێتەوە، بەڵام هەردووکیان راوەستان کاتێ ئەمریکا قایل نەبوو، بەڵێنی پێدان کە هەمیشە پارێزگاریان لێ دەکات. هەمان شت سەبارەت بە یەکێتی سۆڤیەت رێگەی بە هاوپەیمانە ئەوروپاییە رۆژهەڵاتییەکانی خۆی و کرێگرتەکانی لە جیهانی سێیەمدا نەدا چەکی نوکلیاری پەرەپێبدەن. هۆی دیکە هاوکاری دەوڵەتە گەورەکان بوو لە قۆناغی یەکەمی سەردەمی نوکلیاریدا، هەڵوێست لە چەکی نوکلیاری، هەڵوێستێکی رکابەرانە بوو.

زلهێزان ویستیان تەکنەلۆجیای نوکلیاری بۆ بەدەستهێنانی خاڵی زێتر لە رکابەریی ئایدیۆلۆجی بەکاربهێنن. لە ساڵی ١٩٥٣ دا سەرۆک **ئایزنهاوەر** بەرنامەی(ئەتۆم لە خزمەتی ئاشتی) لە کەشێکی پڕ هات و هاواردا راگەیاند کە دەیەویست یارمەتی دەوڵەتانی دیکەی پێ بدا بۆ پەرەپێدانی تەکنەلۆجیای نوکلیاری تایبەت بە خۆیان بۆ مەبەستی ئاشتیخوازانە. **ئایزنهاوەر** جەختی لەسەر رووی جوانی ئەتۆم دەکردەوە بۆ ئەوەی خاڵی زیاتر بۆ ئەمریکا بەدەست بهێنێ. بە هەمان شێوە سۆڤیەت، یارمەتی نوکلیاری پێشکەش بە چین کرد. بەڵام بە داهاتنی ساڵی ١٩٦٨، شیانی ئەوە پەیدا بوو کە سۆڤیات و ئەمریکا تا رادەی رێککەوتن، هاوکاری یەکدی بکەن سەبارەت بە رێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی نوکلیاری. ساڵی ١٩٧٧، ئەمریکاییەکان و سۆڤیەتییەکان و(١٣) دەوڵەتی دیکە «کۆمەڵەی کەرەستەی تەکنەلۆجیای نوکلیاری»یان پێک هێنا تا ئەو کۆمەڵەیە رێنوێنی دابنێ کە دەشێ چ جۆرە تەکنەلۆجیایەکی نوکلیاری بنێردرێتە دەرەوە.

هۆی سێیەم، بوونی بەڵێننامە و دامەزراوەکانە. زێتر لە (١٧٠) دەوڵەت بەڵێننامەی قەدەغە کردنی بڵاوبوونەوەیان مۆرکردووە و رێککەوتوون کە پەرە بە چەکی نوکلیاری نەدەن یان چەکی نوکلیاری لە بواری تردا بەکاربهێنن و دەوڵەتە نا نوکلیارییەکان رازی بوون کە پشکێنەرانی ئاژانسی دەولیی وزەی ئەتۆمی لە ڤێنا سەر لە دامەزراوە نوکلیارییە ئاشتیخوازەکانیان بدا تا لە خراپ بەکار نەهاتنیان دڵنیابن، بەڵام ئیسرائیل و هندستان و پاکستان و هەندێ دەوڵەتی گرنگی دیکە ئەم

بەڵێننامەیان مۆر نەکردو هەندێ لایەنی دیکەش کە مۆریان کردبوو، دەستی دەستیان بە ئاژانسی دەولی کردووە.

پاش کۆتایی هاتنی شەڕی سارد هەندێ شت کە لە پشت سنووردانان بوون بۆ بڵاوبوونەوەی چەکی نوکلیاری گۆڕان. گەرەنتی پەیمانەکانی سۆڤیەت نەما و پرسیارێ سەبارەت بە مەودای بەردەوامبوونی پەیمانی ئەتلەنتی سەری هەڵدا. دوو پرسیاری راشکاو لەبەردەم جیهانی دوای شەڕی ساردا هاتنەکایەوە: ئایندەی پەیمانەکان و زەمانەتی تەنایی. ئایا تەکنەلۆجیای نوکلیاری لە یەکێتی سۆڤیاتی جارانەوە دزە دەکات بۆ بازاڕو بڵاودەبێتەوە؟ **کینیث ولتز** دەڵێ: بڵاوبوونەوەی چەکی نوکلیاری هۆکاری سەقامگیرییە، چونکە وا دەکات بەرپەرچدانەوەو سەنگرانەوە شیاو بێ. ئەگەر چەکی نوکلیاری رێگر بووبێ لەوەی شەڕی سارد نەبێ بە شەڕێکی گەرم ئەدی لەبەرچی باندۆرە سیحرئامێزەکەی، پارێز و نیزام لە ناوچەکانی دیکەی دنیادا وەک رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خوارووی ئاسیا دروست نەکات؟ گرفتی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە بە تەواوی پشت بە نموونەیەکی ژیرانەی بەرپەرچدانەوەو سەنگرانەوە دەبەستێ، بەڵام ئەگەر ئیحتمالی ئەوە هەبێ، هەڕەشەیەکی نوکلیاریی راستەقینە لە دوای شەڕی ساردا لە دەست دەربچێ، ئەوا نموونەی ئاقڵانە کە بنەمایەک بۆ پێشبینی مسۆگەرئامێز دەرەخسێنێ، دەکەوێتە دەرەوەی ئەم بابەتەوە. زۆر لەو وڵاتانەی کە پاش ئەوەی چەکی نوکلیاری دروست دەکەن، بە ناسەقامگیری ناسراون بەهۆی کودەتا و دابەش دابەشی سەربازییەوە. چەکی نوکلیاری لە ئەمریکا و سۆڤیەت، دەزگای تەکنەلۆجی وردیان هەبوو کە بۆ دەستگەیاندنە ئەو چەکانە، پێویستی بە رێنوێنیی دەسەڵاتی باڵا هەبوو.

بەڵام زۆر لەو دەوڵەتانەی کە بەم ساڵانەی دوایی بوونەتە خودان چەکی نوکلیاری، ئەم دەزگا هەستیارانەیان نییە. کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆجیا لەودیو سنوورەکانەوە رەنگە ببنە هۆی زێتر بەکارهێنانی چەکی نوکلیاری لەلایەن دەوڵەتە تازە داهاتووەکانەوە کە دەیانەوێ بە پلەیەکی مەترسیدارتر بێنە ناو پێشبڕکێی نوکلیاری وەک لە نیوەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا باوبوو. یەکێ لە هەرە مەترسیدارترین هەڕەشەکانی پاشەڕۆژ ئەوەیە کە چەکی ئەتۆمی وێرانکار بکەوێتە دەست تیرۆریستە دەولییەکانەوە.

## ئایا نیزامێکی تازەی جیهانی هەیە؟

دەبێ لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمیندا، شێوەی نیزامی جیهانی لە هەمبەر بزاڤ و جوولەی هێزە دژ بەیەکەکاندا چۆن بێ؟

لە ساڵی ۱۹۹۱دا **سەرۆک بۆش** گوتی: شەڕی کەنداو بەتەنێ پێوەندی بە دەوڵەتێکی بچووکەوە نییە، ئەمە ئایدیایەکی مەزنە.. نیزامی تازەی جیهانی، «ڕێگەیەکی تازەی مامەڵە کردنە لەگەڵ نەتەوەکانی دیکەدا... چارەسەرکردنی بە ئاشتییانەی ناکۆکییەکان و هاریکاریکردنە دژی دەستدرێژی و کۆنترۆڵکردن و کەمکردنەوەی جبەخانەی جەنگی و کۆنترۆڵکردن و مامەڵە کردنێکی عادیلانەیە لەگەڵ هەموو خەڵک»دا.

ئەو وشانەی جۆرج بۆش بۆ سازدانی رای گشتی و بۆ پشتگیری کردنی حکومەتێکی لیبرالی ڕووەو جەنگ، ڕەنگ ڕێژکرابوون هەروەک چۆن چوارده خاڵەکەی وودرو **ولسون** Woodrow Wilson یان چوار ئازادییەکەی **فرانکلین رۆزڤلت** Franklin Roosevelt کاری خۆیان کرد، بەڵام کاتێ جەنگ دوایی دێت و واقیع خۆی دەسەپێنێ، خەڵک دەهێنرێنە سەر ئەو باوەڕە کە ئاکامی بێ ئومێدانەی شەڕ هاوجووت نەبووە لەگەڵ بەهایەکی باڵادا.

## تێگەی جودا جودای سیستەمی جیهانی

بەڕاستی، کۆتایی شەڕی سارد، نیزامی جیهانی گۆڕی، بەڵام ئەو پڕوپاگەندانەی کە دەڵێن نەوەدەکان سپێدەی«نیزامێکی تازەی جیهانی» بوون، هەموو ئەو ڕێگایانەی کە خەڵک وشەی«نیزام» یان پێ لێک دەدایەوە، ئەو پڕوپاگەندانەیان لە بنەوە هەڵتەکاند. واقیعییەکان پێیان وایە کە شەڕوشۆڕ لە ئاکامی هەوڵ و تەقەلای دەوڵەتانەوە پەیدا دەبێ بۆ بەدەستهێنانی هێز و تەنایی لە جیهانێکی بە ئاژاوەدا، یان لە جیهانێکدا کە تەرەفێکی باڵا بەرەڤان نییە لە بابەتی نیزام جگە لە پرەنسیپی بەرژەوەندی زاتی و هێزی چەک.

لەو سەرەتاگەیەوە نیزام وا لێک دەدرێتەوە کە پەیکەرێکە یان شێوەیەکی دابەشکردنی هێزە لە نێوان دەوڵەتاندا. لیبرالەکان بەرەو ڕوویان دەبنەوە و دەڵێن: ململانەکان و ڕێگە گرتن لەو ململانێیانە بە تەنیا هاوسەنگیی هێزەکان بڕیاریان لە سەر نادەن، بەڵکو بنیادی ناوەخۆی دەوڵەتان و بەها و پێناسە و سراکتۆرە مەدەنییەکان و شارستانێتی و ئەو دامودەزگا دەولییانەی ئەرک و کاریان

چارەسەرکردنی کێشەکانە، بڕیاریان لەسەر دەدەن. لیبرالەکان بە پێچەوانەی واقیعییەکانەوە وای دەبینن کە دامەزراوەی وەک UN پێیان دەکرێ هاوکار بن لە سەرهەڵنەدانی ململانە لە ڕێگەی سەپاندنی نیزام بەهۆی هێور کردنەوەی ئاواتەکان و دروست کردنی هەستی بەردەوام بوون کە هاریکاری کردنی یەکتر ئاکامێکی چەند لایەنەی دەبێ لە ئایندەدا. ئا ئاوا لەدیدی لیبرالەکانەوە نیزام بەندە بە بەهای وەک دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ وەک چۆن بەندە بە دامەزراوەکانەوە. بەڵام نیزام لەدیدی ئەوانی دیکەوە ناوەڕۆکێکی بەدخوازانەی هەیە.

سیستەمی نوێی جیهانی لە دیدی داکۆکیکاران لە دانیشتوانە ڕەسەنەکان -Nati vists یان کۆڕو کۆمەڵی نیشتمانی وەک **پات روبرتسن** Robertson Pat لە ئەمریکاییان، **جان ماری لوپین** Jean Marie Le Pen لە فەرەنسا، ئاماژەیەکە بۆ بوونی پلانێک کە پارەگۆڕ و سیاسەتوانە مەزنەکان دەیچنن بۆ دەستبەراگرتنی جیهان. خاوەن ئەم بیروڕایانە دەڵێن کۆمپانیا زلە فرە نەتەوەکان و بازێرە داراییەکان لە وڵ ستریت و لە ندەن و تۆکیۆ، باندێک پێک دێنن کە لەسەر حسابی ئەوانی دیکە دەوڵەمەند دەبن. هەندێ ناوەندی ئوسوڵی ئیسلامی پێیان وایە ئەو نیزامە تەواو تێگەیەکی ڕۆژئاواییە و مەبەست تەنیا دەستبەراگرتنی جیهانی غەیرە ڕۆژئاوایی و لە ناوبردنی ئیسلامە.

ئەو تێگە جودا جودایانە وا دەگەیەنن کە (سیستەمی نوێی جیهانی) بە زەحمەت پێناسە دەکرێ. هیچ کام لەو (٣) قوتابخانە فیکرییە ناتوانێ بە خۆی لە هۆیەکانی ململانە لە جیهانی ئێستا بگا. قوتابخانەی ڕیالیستی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هاوسەنگیی هێزەکان پێویستە بەڵام بەس نییە لە کاتێکدا پێوەرەکانی سەروەریی دەوڵەت بە هۆی گۆڕانکارییە درێژخایەنە کۆمەڵایەتییەکانەوە دادەخورێن.

ئەو ڕایەی کە دەڵێ ئاشتی باڵی بەسەر دیموکراسییەکانی لیبرالیدا کێشاوە، ڕایەکی ڕاست و وردە، بەڵام ڕاچێتێکی گشتی نییە لە کاتێکدا ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتان بە هەندێ دەوڵەتی زلهێزیشەوە، دیموکراسی لیبرالی نەبن.

سیستەمی شەڕی ساردی دوو جەمسەرە، جۆرێ لە سەقامگیری دروست کردبوو. ڕاستە کە (شەڕی سارد) بەشداری لە تەشەنەکردنی ژمارەیەک ململانە(لە جیهانی سێیەمدا) کرد بەڵام ململانەی ئابوری کە ئەمریکا و ئەوروپا و ژاپۆنی گرتبۆوە بە هۆی ترسی هاوبەش لە هەڕەشەی سوپایی سۆڤیەت کپ ببۆوەو جڵەوی دابەشکاریی ئیتنی تاڵ و تیژ گیرابۆوە، بەهۆی بوونی سۆڤیەتی لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا. کۆتایی هاتنی

سیستەمی دوو جەمسەرە، کۆتایی بە ململانێ نەهێناوە، ئەوەی رووی داوە ئەوەیە کە ململانەکان سەرچاوەی دیکەیان بۆ پەیدا بووە.

## وێنەکانی هێز لە دوا رۆژدا

لە سەردەمی توسایدیدسەوە، مێژوونووسان و چاودێرە سیاسییەکان تێبینی ئەوەیان کردووە، راگوێزانی خێرا خێرای هێز- دەسەڵات- یەکێکە لە هۆیە سەرەکییەکانی ململانەی نێوان زلهێزان.

گۆزە گۆزی هێز، هۆیەکی بنیادیی قوڵی ململانەی دەوڵەتە مەزنە تازەکانە لە باری مێژووییەوە. لە نێویاندا رابوونی ئەڵەمانیا پێش شەڕی جیهانی و رابوونی نسبیانەی ئەمریکا و سۆڤیەت و ئەو رکابەریەی لە نێوان ئەو دووانەدا کەوتەوە لە دوای شەڕی دووەمی جیهانەوە. هاورایەک هەیە سەبارەت بەوەی کە ماوەی دوای شەڕی سارد، ماوەی راگواستنی بلەز و خێرای هێزە. پیلەکەو مشتومڕێکی فراوان هەیە سەبارەت بە قەوارە و سەختی و دژواریی گۆڕانکارییەکان و ئەم مشتومڕەش بەڵگەی ئەوەیە کە ناکرێ حوکم بەسەر سروشتی هێزە بزوێنەرەکانی گۆڕانکاریدا بدرێ کە سەرچاوەیەکی گەورەی ململانەن.

یەکێ لە رایەکان دەڵێ(فرە جەمسەری)یە. ئەگەر زاراوەی فرە جەمسەری بەراوردێکی مێژوویی لەگەڵ سەدەی نۆزدەهەم بگرێتە خۆی، ئەوا تا رادەیەکی زۆر زاراوەیەکی دەست خەڵەتێنە. ئەم نیزامە لەسەر هاوسەنگیی هێزی پێنج دەوڵەتی گەورەی نزیکە یەک لە هێز، بنجی داکوتا بوو، لە کاتێکدا دەوڵەتە گەورەکان لە دوای شەڕی ساردەوە لە هاوکاری کردنی یەکتر دووربوون. لە ساڵی ۱۹۹۰ەوە روسیا بلەزتر و دوورتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا، هەرچەندە هێشتا جبەخانە(کۆگا ) نوکلیارییەکەی ماوە، تەپی و داڕووخا. (چین) وەک چاوەڕوانیان نەدەکرد خێرا هەستایەوە سەرپێ و بۆ ماوەیەکی درێژ دوو هەندە گەشەی ئابوری کرد، ئەڵەمانیا و ژاپۆن بە مانای وشە نەبوونەتە دوو زلهێز هەروەک لە ساڵی ۱۹۹۰دا هەندێک پێشبینیان بۆ دەکرد، ئەمریکا ، زلهێزێکی راستەقینەی بە کردەوەیە لە هەموو رەهەندەکانی هێزدا.

ئەم راستییە وای لە هەندێک کردووە کە گریمانەی وابکەن کە جیهان لە لایەن یەک جەمسەرەوە(جەمسەرێکی باڵا دەست) هەڵدەسوورێ. هەندێ لە چاودێران پێیان وایە کە شەڕی کەنداو ئاماژە بۆ دەسپێکی ئاشتییەکی ئەمریکی Pax Americana دەکا کە جیهان، باڵا دەستیی میانەڕۆی ئەمریکی پەسەند دەکا. رەنگە ئەمریکا تاکە

دەوڵەتێکی زلهێز بێ بەڵام ئەمە کۆنترۆڵکردنی لێناکەوێتەوە کە ئاکامەکەی پاوانکردنی هێزە. چونکە زۆر ئارمانجی گرنگی سیاسی و ئابوری وتەناهی هەن کە ئەمریکا بە تاقی تەنیا ناتوانێ بەدیانبهێنێ. هێزی سەربازی تا رادەیەکی گەورە تاک جەمسەرییە و ئەمریکا تاکە ولاتێکە کە چەکی نوکلیاری ئەوتۆی هەیە کە ئەمسەر و ئەوسەری کیشوەران دەکا، ئەمە بێ لە هێزێکی گەورەی هاوچەرخی ئاسمانی و دەریایی و زەمینی کە توانای بڵاوبوونەوەی بە دنیادا هەیە. بەڵام هێزی ئابوری، (٣) جەمسەرەیە، هەرچەندە ئەمریکا و ژاپۆن و ئەوروپا ٣/٢ی بەرهەمی جیهانیان بەدەستەوەیە، گەشەکردنی (چین) دەبێتە هۆی ئەوەی کە هێزی ئابوری ببێتە چوار جەمسەرە لە سەرەتاکانی هەزارەی سێیەمدا.

بەڵام لە بواری پێوەندییەکاندا کە لە سەرووی سنووری نیشتمانی هەرێمایەتییەوەیە، لە دەرەوەی کۆنترۆڵی حکومەتان دایە و نوێنەری هەمە جۆری تێدان: پارەدار و پارەگۆڕەوە تا تیرۆریستان. هێز بەسەر پانتایەکی فراواندا دابەشکراوە. با هەندێ نموونە بهێنینەوە. ئەو نوێنەرانەی لە بازاڕەکانی سەرمایەی دەولیدا بۆ خۆیان کار دەکەن، بە رێگایەکی ئەوتۆ نرخی سوود دیاری دەکەن کە بتوانن کۆنترۆڵی ئابوریی ئەمریکایی بکەن. بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆجیا لەو دیو سنوورە ئەقلیمییەکانەوە، هێزو شنگی تێکدەرانەی دەوڵەتە هەژارو کزو لاوازەکان زێتر دەکا. چەند مەسەلەیەک لەسەر ئاستی دەولی لە گۆڕێ دان:

- بازرگانیی موخەدەرات، نەخۆشیی ئایدز، کۆچکردن، بەرزبوونەوەی گەرمای زەوی - رەگ و ریشەی کۆمەڵایەتییان لە ولاتێک زیاتر هەیە و دەپەڕنەوە ئەو دیو سنوورەکانەوەو تارادەیەکی گەورە لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتاندان. مادامەکێ رێ و شوێنی کلاسیکی سەربازی و ئابوری تەواو بێ چارەن لە رووبەڕوو بوونەوەی ئەو گرفتانەدا، ئەوا هیچ دەوڵەتێکی زلهێز بەتەنیا لە توانایدا نییە ئەو گرفتانە چارەسەر بکا.

هەندێکی دیکە دەڵێن: جیهان لە دەوری سێ بارستەی ئابوری: ئەوروپاو ئاسیاو ئەمریکای باکوور کۆدەبێتەوە، بەڵام بە بوونی گۆڕانکاری تەکنەلۆجی جیهانی و زۆربوونی ژمارەی نوێنەران لە دەرەوەی بارستەکاندا: کۆمپانیا گەورە فرە رەگەزەکان و کۆڕو کۆمەڵی ئیستنی، بەرەنگاری توانای ئەو بارستانە بۆ لە ناوەخۆگرتنی چالاکییەکانیان دەبنەوە...

لەکاتێکدا هەندێ لیبرالیست بۆچوونێکیان هەیە کە گوایا هێزی ئابوری جێگەی

هێزی سەربازی گرتۆتەوە وەک شێوازێکی ناوەندی لە سیاسەتی دەولیدا.

ئەم بۆچوونە زێدەڕۆییەکی تێدایە، بەڵام مرۆڤ بیر لە شتێکی دیکە ناکاتەوە کە ئەو شتەی نەبێ. ریالیستەکان راست دەکەن کە دەڵێن هێشتا ئامرازگەلی ئابوری ناتوانێ رکە لەگەڵ هێزی سەربازیدا بکەن لە تاسیری بەزۆرەملێ و بەرپەرچدانەوەدا. سزای ئابوری کە UN سەپاندوویە نەیتوانی عێراق ناچار بکات لە ساڵی ١٩٩٠دا لە کوێت پاشەکشە بکات و نەتوانی جۆنتای میلتاریستی لە هایتی لە دەسەڵات لاببات لە نێوان ساڵانی ١٩٩٣ و ١٩٩٤دا.

دابەشکاریی ئێستای هێز، پێکهاتەیەکی لە هەموو ئەو وێنانە هەیە (لە بەیەکەوە سازانێکی فرە ئاستدا). هیچ (هرم)ێک نییە بەتەنیا وەسفی سیاسەتی جیهانی بکات کە بە یاری شەترەنجی سێ رەهەند دەچێ. هێز لەسەر ئاستی سەربازیی تارادەیەکی گەورە تاک جەمسەرەو ئەمریکا هەرە بەهێزەکەیەتی، پانتایی ئابوری لە ناوەڕاست دایەو دابەشکارییەکی سێ جەمسەرەی هێز خۆی دەنوێنێ، بەڵام پانتایی بەیەکەوە سازان لەودیو سنوورە هەرێمایەتییەکانەوە، کە لەبنەوەی (هرم)ەکەیە، سیمای بڵاوبوونەوەی هێزی پێوە دیارە.

هیچ کام لەو پێکهاتە ئاڵۆزانە چ مانایەکی نامێنێ ئەگەر هێزی سەربازی وەک پارەوپول بگۆڕێ و ئەم دەست و ئەو دەست بکاو جێ گۆڕکەی پێ بکرێ و بتوانێ بڕیاری دوائەنجام لە هەموو بوارەکاندا بدات. بەڵام هێزی سەربازی لە باری پێشبینیکردنی دوا ئەنجامەوە کزو لاوازە بەبەراورد لەگەڵ پانتایی ئابوری و سازان لەگەڵ سیاسەتی ئێستای دەولیدا. ئەمریکا لە هەر وڵاتێکی دیکە پتر جانتای جیاجیای سەرچاوەکانی هێزی هەیە، بەڵام نیزامی ئێستای جیهانی بەتەنیا بەدەست ئەمریکاوە نییە.

ئەم پێشبینکردنانە ئەوە دەسەپێنن کە دەوڵەت وەک یەکە رەگەزی بڕیاردەی پێوەندییە دەولییەکان دەمێنێتەوە. رەنگە ئەم گریمانەیە نادروست و چەوت بێ، هەندێک بڕوایان وایە کە رەوشی سیاسەتی جیهانی لە چەند دەیەی ئایندەدا، زۆرتر لەسەر دەستی (شارستانێتی)یە گەورەکانەوە دیاری دەکرێ کە تیایدا دنیای ئیسلامی جارێک، دنیای مەسیحی رۆژئاوایی و دنیای چینی و دنیای هیندۆسی رەت دەکاتەوەو جارێکی دیکەیش شەڕ لەگەڵ ئەم دنیایانەدا دەکا. لەهەمبەردا، دنیای هیندۆسی، هەڵوێستێکی خۆپارێزو خۆ دوورگرتنی لە پاکستانییەکان و دراوسێیە بەنگالییە موسڵمانەکانی هەیە. لەکاتێکدا ناتەبایی لە نێوان چین و رۆژئاوا دەمێنێ

لەمەڕ مەسەلە ستاندارەکانی وەک مافەکانی مرۆڤ و کێشە ستراتیجییەکان. لەگەڵ ئەوەشــدا هەندەی ملمـــلانەی ئیـــتنی و نەتەوەیی و تایەفی لەناو خـــودی ئەو شارستانێتییە گەورانە خۆیاندا هەیە، هەندە ململانە لەنێوان ئەو شارستانیانەدا رووی نەداوە. لە زۆر پارچەو جێگەی دنیادا بەتایبەتی لە ئەفریقیاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاستدا، بەهۆی هەرەسهێنانی دەوڵەتەوە، ئەو ململانێ کۆمەڵایەتییانەی باسیان لێوەکرا روو لە زیادبوونن. کاتێ ململانەکان سەرهەڵدەدەن، هەوڵدەدرێ بەهۆی ناسیۆنالیزمی ئیتنی و فەندەمێنتالیزمی ئایینییەوە، ئاژاوەچێتی لە بەین ببرێ، دەوڵەتە کزو کەنەفتەکانیان لە ژێر فشاردا هەرەس دێن.

خەڵکێکی زۆر ئاماژە بۆ کاریگەریی (شۆڕشی کۆمپیوتەرو راگەیاندن) کە ناکرێ پێشبینی بکرێ، دەکەن و وای دادەنێن کە ئەم باندۆرانە، سەروەری و ناسیۆنالیزم تارادەی توانەوەو نەمانی دەوڵەت، سەرلەبەر هەڵدەوەشێننەوە. مادامەکێ خەڵک دەستیان بەراگەیاندن و میدیای جیهانی رادەگا، کولتووری کۆمەڵایەتی و حکومەتان ناکارن (ولاء)ی ئەندامانیان بۆ خۆ پاوان بکەن.

(ولاء)اتی خەڵک لەسەر بەرژەوەندیی هاوبەش نەک لەسەر ئینتیمای ئیتنی یان زمان یان ناسیۆنالیزم دادەمەزرێ و شتێکیش لەمبارەیەوە بەدی هاتووە.

ئینتەرنێت واتە زایایەکی ژاپۆنی لە شاری ئۆزاکا دەتوانێ بەئاسانتر پێوەندی بەزانایەکی دیکەی کورد لە کوردستان بکات لەوەی کە پێوەندی بە هاوسێیەکەی لە ولاتەکەی یان هاوشارییەکی خۆی بکا. لەم بارەوە شۆڕشی گەیاندن -Communica tion دیارییەکە بۆ مەزهەبی سوودگەرایی Functionalism لەگەڵ ئەوەشدا بەدەگمەن ئەم پەلەو تیپە کۆمەڵایەتییانە دەکەونە ململانەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ دەوڵەتدا، نازانین کە ئاخۆ تا تەرازووی بەرژەوەندیی هاوبەش قورستر دەبێ یان تا تەرازووی (ولاءات)ی ئیتنی و ئایینی و نیشتمانی؟

گومانی تێدا نییە کە تەکنەلۆجیای نوێ، سروشتی هێز دەگۆڕێ. زانین لەهەر وەختێک زیاتر بۆتە هێزێکی هەرە گەورە. ئەو ولاتەی کە زۆرتر لە ولاتێکی دیکە ئامادەیە سەرکردایەتیی شۆڕشی راگەیاندن بکا بەهێزتر دەبێ لەهەر ولاتێکی دیکە. ئەو ولاتەی کە لە ئاسۆی ئایندەدا خۆی نیشاندەدا، ئەمریکایە.

تەکنەلۆجیای گرنگی گەیاندن و راگەیاندن وەک ئێستگەی سایەدیی فەزایی و پەخشی راستەوخۆ و دەزگای کۆمپیوتەری هەرە خێرا، ئەرکی رێگەگرتن لە پێکدادان پێش ئەوەی بتەقێتەوە ئاسان دەکاو رێگەنادا چەکی تەقلیدی و ناتەقلیدی

بڵاوبێتەوەو پێوەندی لە نێوان رکابەرە خەتەرەکان درێژە پێدەدا. هەروا راستە تەکنەلۆجیا تواناو شنگی نوێنەرە سەربەخۆکان (جگە لە دەوڵەتان) جا کۆڕو کۆمەڵی تیرۆریستی بن یان کۆمپانیای مەزن، زیاد دەکا بۆ شلەژاندنی سیاسەتی دەولی و پەخش کردنی نیازو مەرامەکانیان بەدنیادا.

## زیندانی تێگە کۆنەکان

دنیای دوای شەڕی سارد، دنیایەکی تاک و تەواو بێ وێنەیە. ئێمە بەئاشکرا هەوڵدەدەین تێگەیشتنی خۆمان سەرکوت بکەین و ناچاری بکەین خوازراوە تەقلیدییەکان و جەمسەرگەرییە ماکیاڤیلییەکانی قبووڵ بێ و کاریان پێ بکا. هێز بۆتە فرە رەهەند و ستراکتۆری ئاڵۆزتر و دەوڵەتان بە ئاسانی دزەیان بۆ دەکرێ. ئەم ئاڵۆزییە سەربارە واتە دەبێ جیهان لەسەر زێتر لە هاوسەنگییەک رابوەستێ.

تێڕوانینی واقیعی بۆ جیهان پێویستە، بەڵام بەس نییە چونکە ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە درێژخایەنانەی کە بەهێواشی بەسەر دنیادا هاتوون ناخاتە حسابی خۆیەوە. دوور لە بنەماو رێساکانی ویستڤالیا West phalia لە ساڵی ١٦٤٨دا پاش (٣٠) ساڵی کێشەو شەڕە دووکەو شەڕە ئایین، دەوڵەتانی ئەورووپایی لەسەر بەڵێننامەی ئاشتیی ویستڤالیا[٢] رێککەوتن بەمەرجێ حوکمڕان بەکردەوەو بەبێ رەچاوکردنی مەیل و ئارەزووی میللی، ئایینی دەوڵەت هەڵبژێرێ. رژێم لەسەر سەروەریی دەوڵەتان نەک سەروەریی گەلان دامەزرا، هاوسەنگیی میکانیکی دەوڵەتان، کە وەک تۆپە بۆشەکانی بلیارد مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتاندا دەکا، بەدرێژایی سەدەکان بەهۆی گەشەکردنی هەستی نیشتمانی و زیادبوونی بەشداری میللی سواو داخورا، بەڵام پێوەرەکانی سەروەریی دەوڵەت وەک چۆن بوون، هەر ئاوا مانەوە.

ئێستا خێرایی گەشەکردنی گەیاندن لە سنووری هەرێمایەتی و کۆچ و بەیەکەوە سازانی ئابوری هۆکاری بلەزخەرن لە داخورانی تێگەی کلاسیکی و فراوان بوونی درزو کەلێنی نێوان ستانداردو واقیع.

ئەم وێناکردنە، تای تەرازوو بەلای تێگەی لیبرالی دادەخات کە بانگەشە بۆ کۆمەڵێکی جیهانی لە گەلان و دەوڵەتان و رژێمێک کە لەسەر بەهاو دامەزراوەو هێزی سوپایی دامەزرابێ، دەکا. ئەو بیروڕا لیبرالیانەی کە رۆژێ لە رۆژان وەک

---

(٢) ویستڤالیا: بەبەشی رۆژئاوای ئەڵمانیا دەگوترێ و کۆلونیا لە شارە هەرە گرنگەکانیەتی

بیروڕایەکی خەیاڵئامێزی نەزۆک سەیر دەکران، وەک بانگەشەی فەیلەسووفی ئەڵمانی (**ئەمانوئیل کانت**) بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی دیموکراسیگەلی ئاشتیخواز، ئەمڕۆ بەجێ گەیاندنیان بەدوور نازاندرێ. چونکە زانایانی سیاسەت دەڵێن بەکردەوە دیموکراسییەکان شەڕی یەکدی ناکەن، بۆ نموونە گفتوگۆ سەبارەت بە یەکێتی ئەڵمانیا، واقیعییەکان و لیبرالەکانی بەگژیەکدا کردەوە.

واقیعییەکان پێیان وابوو کە ئایندە بۆ ئەوروپایە، هەرچی لیبرالەکان بوون ئەم شیکردنەوەیان ڕەتکردەوە، چونکە ئەو ڕاستییە فەرامۆش دەکەن کە ئەڵمانیای نوێ دیموکراتییەو بەقوڵی لەگەڵ هاوسێیە ڕۆژئاواییەکانی لە ڕێگەی دام و دەزگاکانی یەکێتی ئەورووپییەوە، تێک ئالقاون.

ئەم تێگە لیبرالییانە سەبارەت بەنیزام بەتەواوی شتێکی تازە بابەت نین، نیزامی شەڕی سارد پێوەرو دامەزراوەی خۆی هەبوو با دەوریشیان سنووردار بووبێ. لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانیدا، **ڕۆزفلت و ستالین و چەرچل** لەسەر پێکهێنانی UN کە لەسەر دابەشکردنی فرە جەمسەری هێز دامەزرابوو، ڕێککەوتن و دەبوایە ئەنجوومەنی ئاسایشی هەڵتۆقیو لە UN، پرەنسیپی تەناهی بەکۆمەڵ و دەستدرێژی نەکردنە سەر دەوڵەتە بچووکەکان، بسەپێنێ، ئەمە لە کاتێکدا هەر پێنج دەوڵەتە مەزنەکە مافی ڤیتۆیان هەبوو.

تەنانەت ئەم فۆرمۆلە کورتەی ڕوانگەی دامەزراوەیی **وورد ولسۆن** سەبارەت بەنیزام بەهۆی دوو جەمسەرییەوە لە کەندو کۆسپ ڕزگاری نەبوو، دەوڵەتە گەورەکان ڤیتۆیان لە دژی یەک بەکارهێناو دەوری UN کەمبۆوەو بووە ناردنی چاودێران بۆ چاودێریی کردنی ئاگربەس لە جیاتی بەرسنگ گرتنی دەستدرێژکاری. وەختێکی هێزی سۆڤیەت دادەڕما، ئەوجا سیاسەتێکی تازە کە لەسەر هاوکاریکردن لەگەڵ ئەمریکا دامەزرابێ، پەیڕەوکرا، ئەو ژی بەسەپاندنی تەناهی بەکۆمەڵی دەولی دژی عێراق، ئەمە پێ و قدومی نیزامی نوێی جیهانی نەبوو بەئەندازەی ئەوەی کە زڤرینەوەی ڕوویێک لە ڕووەکانی سیستەمی دامەزراوەیی لیبرالی بوو کە دەبوایە لە ساڵی ١٩٤٥ - ەوە بکەوتبایە واری جێبەجێکردنەوە.

وەک چۆن شەڕی کەنداو ڕوویێکی تێڕوانینی لیبرالییانەی بۆ سیستەمی جیهانی ژیاندەوە، ئاواش دەمامکی لەسەرکزی و لاوازییەک لە تێگەی لیبرالی هەڵماڵی. پرەنسیپی تەناهی بەکۆمەڵ کە بەڵگەنامەی UN، سەپاندبووی، بەسەر ئەو دەوڵەتەدا پێڕەو دەکرێ، کاتێ سنوور دەبەزێنێ نەک کاتێ دەوڵەت، هێز دژی گەلانی ناو

دەوڵەتەکە خۆی بەکاردەهێنێ.

لیبرالەکان بەبانگەشەکردن بۆ پرەنسیپەکانی دیموکراسی و مافی چارەی خۆنووسین، دەیانەوێ خۆیان لەم ئاریشەیە بدزنەوە با لە گەلان بگەرێین لەنێو دەوڵەتەکانی خۆیاندا لە رێگەی دەنگدانەوە چارەنووسی خۆیان هەڵبژێرن ئەگەر بیانەوێ لەو دیو سنوورەکانەوە بپارێزرێن. بەڵام ئێمە بینیمان مافی چارەی خۆنووسین بەو سادەییە نییە. کێ بڕیار دەدا کە کێ مافی چارەی خۆنووسینی هەیە؟ کەمتر لە ١٠٪ لە دەوڵەتانی ئێستای دنیا لەرووی ئیتنییەوە هاوچەشنن، ٧٥٪ی دانیشتوانی نیوەی ئەو ژمارەیەی دەوڵەتان سەر بەیەک ئێتنۆسن. زۆربەی دەوڵەتانی سۆڤیاتی جاران، کەمینەی گەورەیان تێدایەو لەگەڵ دەرو دراوسێیەکانیاندا لەسەر تخوب ناکۆکییان هەیە. کیشوەری ئەفریقیا کە نزیکەی ١٠٠٠ گەلی تێدایە، لە ٥٠ دەوڵەت کۆبوونەتەوە. لەکەنەدا زۆربەی دانیشتوانەکەی فەرەنسی زمانن داوای بارێکی تایبەت بۆ هەرێمی کیبیک دەکەن و هانی جیابوونەوەی ئەو هەرێمە لە کەنەدا دەدەن. ئەگەر ئەو دەوڵەتە فرە ئیتنۆسانە، فرە زمانانە، بخرێنە بەرباس و لێکۆڵینەوە، زەحمەتە ئەم کارە بگاتە کۆتایی. لە جیهانێکی ئاوادا ئۆتۆنۆمی خۆجێی و چاودێری دەولی بۆ پاراستنی مافی کەمینەکان، هەندێ گفت و بەڵێن لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ، بەڵام سیاسەتی پشتەوانی کە مافی چارەی خۆنووسینی نیشتمانی لێنەکەوێتەوە، رەنگە گێچەڵ و پشێوی و ئاژاوەیەکی دەولیی هەراو و مەودا فراوانی بەدوادابێ.

## پەرەسەندنی سیستەمێکی دووڕەگی جیهانیی

ئیدی کەواتە چۆن دەکرێ نیزام بەتێگەی کلاسیکیی کە دابەشکردنی هێزە لە نێوان دەوڵەتانی خودان سەروەریدا، بپارێزرێ و لە هەمان کاتدا بە ئاراستەی ئەو دامودەزگایانەی لەسەر پرەنسیپی «دادپەروەری لە نێوان خەڵکدا» دامەزراون، جووڵە بکرێ. دامودەزگای دەولی هێدی هێدی (لەدوای ویستڤالیا) بەو ئاراستەیە گەشە دەکەن. ساڵی ١٩٤٥، هەردوو بەندی ٥٥، ٥٦ی بەڵێننامەی UN بەرپرسیاریەتییەکی بەکۆمەڵیان خستە ئەستۆی دەوڵەتانەوە سەبارەت بە هەند هەڵگرتنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە سیاسییەکان. تەنانەت پێش دەرچوونی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش لە ساڵی ١٩٩١دا کە لە دوای شەڕی کەنداوەوە رێگە بەدەست خستنە ناو کاروباری عێراق دەدەن، راسپاردەکانی UN سەبارەت بەسەپاندنی سزا بەسەر رژێمی رەگەزپەرستی لە خوارووی ئەفریقیا، پێشینەیەک بوون

سەبارەت بە خونەگرتنی تەواو بە دەقەکانی بەلێننامەی UN لەمەڕ حاکمیەت و سەروەرییەوە. لە ئەوروپا، ڕێککەوتنامەی هلسنکی، مافەکانی کەمایەتییەکانی بەقانوون ڕێکخست و وای کرد کە پێشێلکردنەکان بخرێنە بەردەم کۆنگرەی تەناهی و هاریکاریی ئەورووپی CSCE و ئەنجوومەنی ئەورووپی EC ەوە. قانونی دەولی بەرە بەرە گەشە دەکا. لە ساڵی ١٩٩٥دا «پەیمانگای قانوونی ئەمریکی» بەم شێوەیە پێناسەی قانوونی دەولی کردووە «بنەماو پرەنسیپگەلێکی ئاوان... کە ڕەفتاری دەوڵەتان و ڕێکخراوەکانی دەولی ڕێکدەخەن» پاش ٢٠ ساڵان، پارێزەرانی پەیمانگاکە ئەم دەستەواژەیەیان لێ زیادکرد «هەروا پێوەندی دەوڵەتان و ڕێکخراوەکانی دەولی و کەسان ڕێکدەخەن». بەم شێوەیە مافەکانی تاکەکەس و کەسایەتییەکان وا مامەڵەیان لە تەکدا دەکرێ کە لەوە زێترن بەتەنیا بەرۆکی نیشتمانی بگرن و لە سنووری نیشتمانیدا قەتیس بکرێن.

سووکایەتیی کردن و پێشێلکردنی ئەو پرەنسیپانە لە زۆر ناوچەی دنیادا ئەگەر لەزۆربەی نەبێ بەبێ سزا تێدەپەڕێ. بەرپاکردنی شالاوی دەستێوەردانی چەکدارانە لە لایەن زۆر لایەنەوە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بابەتە هەڵانە- بۆ هێنانەوە سەربارە ڕاستەکەی - دەبێتە پرەنسیپی ئاژاوە کە کەم زیانتر نییە.

بەڵام دەخاڵەت کردن وەک دیتمان، بەپلەی جیاواز هەیە. ڕەنگە شێوەی هەنگاوگەلی وا بەخۆیەوە بگرێ کە بەلانی کەمەوە لە نێوان ئاخاوتن و ڕێ و شوێنی ئابوری سنووردار و پەلامار و داگیرکردنی فراوان مەودا لە شێوە بالآکانیدا. دەخاڵەتکردنی سنووردارو پێشێلکردنی سەروەری لەلایەن کۆمەڵە دەوڵەتێکەوە بەرەبەرە لە زیادبوون دایە بەبێ ئەوەی لە ئاکامی کتوپڕ دابەشکردنی هێز لە نێوان دەوڵەتاندا درزی تێ بکەوێ.

ڕەنگە ئەنجوومەنی ئاسایش لەمەودایەکی بەرفراوانتردا بەپێی فەسڵی حەفتەم لە بەلێننامەدا بجوولێتەوە ئەگەر دیتی زەبروزەنگی ناوخۆیی یان پەرەپێدانی چەک و چۆلی وێرانکەری هەمەلایەن دەبێتە هۆی هەڕەشەیەکی بەرفراوان بۆ سەرئاشتی لەناوچەکەدا. ئەم بەرەنگاربوونەوانە تارادەیەک لاستیکین و بەتێپەڕبوونی کات لاستیکی تر دەبن. لە هەندێ باری تردا ڕەنگە کۆمەڵە دەوڵەتێک لەسەر بنەمایەکی هەرێمایەتی بجوولێنەوە وەک چۆن نایجیریاو دەوڵەتانی تر هێزیان بۆ لایبریا نارد لە چوارچێوەی بازاڕی هاوبەشی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەفریقیا لە ساڵێ ١٩٩٠دا -EC . WAS

پرەنسیپ و دامودەزگای ناتەواوی لەم بابەتە دەرفەتێکی هەراو بۆ زەبروزەنگی ناوخۆ و نادادپەروەری لە نێوان خەڵکدا دەهێڵنەوە. بەڵام ریسوایی ئەخلاقی لەوە کەمتر دەبێ ئەگەر دارێژەرانی سیاسەت بەهێزی چەک هەڵەکان راست بکەنەوە یان لە بەرانبەردا بەبێ هەموار کردن بگەڕێنەوە سەر نیزامی ویستفالیا. دەبێ لیبرالەکان دەرک بەوە بکەن کە گەشەکردنی نیزامێکی نوێی جیهانی کە نیزامی ویستفالیا پشتەوشار بکا پێویستی بە دەیان و سەدان ساڵ هەیە و دەبێ ریالیستەکانیش لەوە بگەن کە پێناسە کلاسیکییەکانی هێزو بنیاد بەزاراوەی تەواوی میلتیاری کە گۆڕانگارییەکانی دنیای بەیەک گەیاندن و نەشونما کردنی پێوەندییەکانی بان سنووری ئەقلیمی، بەجێیان هێشتوون.

## بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژ

چ جۆرە جیهانێکت دەوێ تیایدا بژی؟ لە جیهانێکی بەئاژاوەدا، بەو واتایەی کە لە سەرەتادا باسم کرد و نیزام لەسەر هاوسەنگیی هێزەکان لە نێوان دەوڵەتاندا دامەزرابێ کە واقیعییەکان بانگەشەی بۆدەکەن یان لەسەر دامودەزگا پەرەسەندووەکان وەک لیبرالەکان دەڵێن. ئەم نیزامە هەرگیزاو هەرگیز دادپەروەرانە نابێ. دادپەروەری و نیزام زۆر جاران بەیەکەوە هەڵناکەن، تەنانەت لە مەسەلەکانی مافی چارەی خۆ نووسینیشدا، کامەیان گرنگترە: سنوورەکان بپارێزی یان بایەخ بە مرۆڤایەتی بدەی کە سەروەریی ئەقلیمی تێدا پێشێل دەکرێ؟ ئەم رێگایانە چ لە پرەنسیپەکانی نیزام دەکەن؟ ئاسان نییە ئەو تێزانە لەگەڵ یەک بسازێن.

گومان لەوە دا نییە گۆڕانگاری هەر دەبێ، روبرت کلفن Robert Gliphin پێی وایە سیاسەتی دەولی دووهەزار ساڵ دەبێ نەگۆڕاوە و توسایدیدس هیچ زەحمەتیەک نابینێ لە تێگەیشتنی جیهانی ئەمڕۆدا.

هەرچەندە لەوێ زوو لە رەوشەکە دەگا بەڵام ئەگەر بێتە ئەورووپای رۆژئاوا رەنگە زەحمەتی زۆرتر ببینێ سەبارەت بە تێگەیشتنی پێوەندیی نێوان فەرەنسا و ئەڵەمانیا. لە ئاستی دنیادا، شۆڕشێکی تەکنەلۆجی لە ئارادایە بۆ پەرەپێدانی چەکی نوکلیاری و نەشونما کردنێکی گەورەی بەیەکەوە سازانی ئابوری و بەدەرکەوتنی کۆمەڵێکی جیهانی کە ئاگاییەکی لە رادەبەدەری ئەوتۆی سەبارەت بە بەهای دیاریکراو هەبێ کە لەسەررووی سنووری نیشتمانییەوەن. سەیر لەوەدایە فەیلەسووفی سەدەی هەژدەهەم، کانت، بە دیدی لیبرالانەی خۆی بۆ سیاسەتی دەولی، گۆڕانگاری لەم چەشنەی رەچاو

کردبوو، پێشبینی کردبوو کە مرۆڤ لە ماوەیەکی درێژخایەندا پەرە دەگرن و لەبەر سێ هۆ شەڕ بەلاوە دەنێن: زیادبوونی توانای کاولکارانەی شەڕ و نەشونما کردنی بەیەکەوە سازانی ئابوری و پەرەسەندنی ئەوەی کە ناوی لێنابوو (حکووماتی کۆماری)و ئێستا ئێمە بە (دیموکراسی لیبرال) ناوی دەهێنین.

بۆ ئەوەی لە دنیای ئێستامان بگەین دەبێ لە هەردوو تێروانینی واقیعییانە و لیبرالییانە بۆ سیاسەتی دەولی بگەین. ئێمە پێویستیمان بە رامان هەیە لە هەردوو تەرزی ئایدیالی لە هەمان کاتدا. نە واقیعییەت و نە بەیەکەوە سازانی ئالۆز لە واقیعدا نین. هەردووکیان، تیزی ئایدیالیستین، ریالیزم دنیا وا دەبینێ کە دەوڵەتان بۆ تەناهی و خۆ پاراستن، هێز بەکاردەهێنن.

ئەگەر ئەم فۆرمولەیە ئاوەژوو بکەینەوە، وێنەی بەیەکەوە سازانێکی ئالۆز دەردەکەوێ. نوێنەران لێرەدا دەوڵەتان نین، ئامرازەکانی ئابوری و ئامانجەکانی خێرو خۆشی کۆمەڵایەتی لە تەناهی گرنگترن. ئەو دوو تێڕوانینە لە مەفهوومەکاندا لەرووی یەک رادەوەستن کە لە رێگەیانەوە دەتوانین پێکە جیاوازەکانی پێوەندییە راستەقینەکانی جیهان دیاری بکەین. تێگەیشتنی هەردوو تێڕوانین کارێکی گرنگە بۆ حاڵی بوون لە سیاسەتی دەولی لە دنیایەکی گۆڕاودا.

ئەمە بەرەو رووی هەندێ پرسیاری کۆتاییمان دەکاتەوە کە تا چەند دوارۆژ بە رابردوو دەچێ؟ تا چ مەودایەک ئەوروپا بۆ ئاینده دەگەڕێتەوە؟ ئایا شەڕ لە نێوان ئەمریکا و چیندا دەقەومێ؟ ئەدی لە نێوان شارستانییەتەکاندا؟ جیهانی دوو جەمسەرە بە کۆتا هات، بەڵام ناشبێتە جیهانێکی تاک جەمسەر لە ژێر هەژمونی ئەمریکا؟ جیهان لە باری ئابورییەوە فرە جەمسەرە و لەگەڵ نەشونمای ناسیۆنالیزمدا، هێز و توان بڵاو دەبێتەوە و بەیەکەوە سازان زۆرتر دەبێ و نوێنەرانی بان سنووری نیشتمانی، پڕ بایەختر دەبن. دنیای تازە رێک و پێک و بە تەکوز نابێ و دەبێ خۆمانی لەگەڵ رابهێنین.




ژمارە (١) نەخشەی سنووری ئیمپراتۆریای یۆنانی - جیهانی یۆنانی کۆن (٥٥٠پ.ز)




| Division | Men | Horses | Guns | Machine Guns |
|---|---|---|---|---|
| British | 18,000 | 5000 | 76 | 24 |
| German | 17,500 | 4000 | 72 | 24 |
| French | 15,000 | 5000 | 36 | 24 |

ژماره (٢) دابەشکردنی هێزە سەربازییەکان لە ئەوروپا پێش ساڵی ١٩١٤ - دابەشبوونی هێزی سەربازی پێش ساڵی ١٩١٤




ژماره (٣) دابەشبوونی هێزی دەریایی و بنکەکان لە ئەوروپا پێش ساڵی ١٩١٤- هێزو بنکە دەریاییەکان لە ئەوروپا پێش ساڵی ١٩١٤




ژماره (٤) ناوچەی بەلقان و چاوتێبڕینی ڕوس و مەجەرییەکان - ناوچەی بەلقان ساڵی ١٩١٤




ژماره (٥) پلانی شفلین و مەشقکردنەکانی ساڵی ١٩١٤ - مەشق و پلانی شفلینی ساڵی ١٩١٤




ژمارە (٦) پلان دانانی هەر سێ بیردۆزەکان و هۆی هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی




ژماره (٧) ئەو زەوییانەی ئەڵمانیا لە دەستیدان لە دوای پەیمانی فرسایی ١٩١٩




ژمارە (٨) زیانەکانی گیانیی ئەوروپا لە شەڕی جیهانی یەکەم
١٩١٨ - ١٩١٤

ژمارە (٩) پەرەسەندنی شەڕی جیهانی دووەم لە ئەوروپا




ژمارە (١٠) هێرشی ئاسمانی ئەڵمانی بۆ سەر مەملەکەتی یەکگرتوو ١٩٤٠
ئاب/تشرین یەکەم ١٩٤٠

